# که لێرەوە
# سەیری ژیانی خۆم ئەکەم

بەرگی یەکەم ١٩٦١-١٩٨٩

# که لێرەوە سەیری ژیانی خۆم ئەکەم
## بەرگی یەکەم ١٩٦١-١٩٨٩

ناوی نووسەر: دکتور فایق محەمەد گوڵپی

بابەت: بیرەوەریی

تایپ: دکتور فایق محەمەد گوڵپی

هەڵەچن: هەورامان محەمەد

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد

نۆرەی چاپ: ٢٠١٨

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

نرخ: ٧٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی تاران

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٥٥٥ )ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

ئەم کتێبە لە سەر ئەرکی
(مهاباد شێخ حەمەئەمین) هاوسەری دکتۆر فایق محەمەد گوڵپی
چاپکراوە

بیرەوەری

# كە لێرەوە
# سەیری ژیانی خۆم ئەكەم

## بەرگی یەكەم ١٩٦١-١٩٨٩

دكتور فایق محەمەد گوڵپی

## پێشکەشە بە:

١. شەهیدانی بنەماڵەکەم باوکم شەهیدی سەر دەبابە، مام ئەسکەندەرم شەهیدی زیندان. نامیقی برام و فازلی پوورزام شەهیدانی شەڕی براکوژی. دایکم و تاریقی برام و رووخۆشی براژنم و رەوەندی برازام، شەهیدانی کیمیابارانی هەڵەبجە. ٢. هاوڕێ شەهیدەکانم. ٣. شەهیدانی هەر چوار پارچەی کوردستان. ٤. ئەو مرۆڤانەی لە پێناوی ئازادی و مافی مرۆڤ و دادپەروەریدا تێدەکۆشن و قوربانی دەدەن.

## پێزانین: ڕێز و پێزانینم بۆ بەڕێزان:

١. هەڤاڵ کویستانی ئەدیب و پێشمەرگە.
٢. عەبدوڵلا عەلی کەریم نووسەر و پێشمەرگە.
٣. دکتورە مەهاباد کامل مامۆستای زمانی کوردی لە زانکۆی سلێمانی پێداچوونەوەیان بە نووسینەکەدا کردەوە و لە رووی زمانەوانی و دارشتندا هاوکاریان کردم.
٤. فەرید ئەسەسەرد، سەرپەرشتیاری ئینسکلۆپیدیای (ی. ن. ک).

## دەروازە:

چونکە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و پیشەییم، رەنگدانەوەی بارودۆخی تایبەتی کوردستان بووە، تۆمارکردنی یاداشتی ویستگە گرنگەکانی ژیانم، بەشێکی مێژووی تێکۆشانی پڕ لەکێشەی گەلی کورد پێکدەهێنێت.

لەسەرەتای ژیانمدا، باوکم بوو بە پێشمەرگە، لە شۆڕشی ئەیلولدا شەهید بوو، لەنزیکەوە ئاگاداری رووداوە هەستیارەکانی شۆڕش بووم، سیاسەتی سەرکردایەتی پدک و شۆڕشم بە لاوە پەسەند نەبوو، دوور لە بەرژەوەندی تایبەتی، بەپێچەوانەی کلتوری خێڵەکی کوردستانەوە، لە تەمەنی مێرمنداڵیدا، پشتم لە سیاسەتی شۆڕشی ئەیلول کرد.

هەر لە سەرەتای ژیانمەوە، بەرامبەر پێوانەکانی کۆمەڵگەی کلاسیک و رەشبینی، شەرم راگەیاند، لەبنەماڵەیەکی هەژاری گوند بووم، زوو هەتیو کەوتم، بە بێ پشتیوانی مادی و مەعنەوی، قۆناغەکانی خوێندنم تەواو کرد، تا بووم بە پزیشک چەندان ئاستەنگی ئابوریم خستەلاوە.

دوای ئەوەی زانکۆم تەواوکرد، دوای وەرگرتنی بڕوانامەی بەکەلوریۆس لەزانستی پزیشکی گشتیدا، لەبری ئەوەی دەست بەژیان و گوزەرانێکی خۆش بکەم، بۆخۆم بژیم و خانەوادە هەژارەکەم بحەوێنمەوە، بەپێچەوانەی کلتووری باوی پێکهاتەی پزیشکانەوە، خەباتی پێشمەرگایەتیم هەڵبژارد، وەک پزیشکێکی پێشمەرگە، رووم لەشاخ و گوندەکانی کوردستان کرد، دەستم بە چارەسەری بریندارو نەخۆشی پێشمەرگە و، خەڵکی هەژاری کوردستان کرد.

بەپێچەوانەی کلتووری باوی خێزان و بنەماڵەوە، بووم بە پێشمەرگەی هێزێکی سیاسی، چەند مانگێک لەوەوبەر، لەشەڕی براکوژیدا، ئەو هێزە سیاسیە برایەکی شەهید کردبووم، لە باتی ئەوەی بۆ تۆڵەی براکەم بگەڕێم، دژی ئەو هێزە شەڕ بکەم، لە ریزی پێشمەرگەکانی ئەو هێزە سیاسیەدا چەکی پێشمەرگەیەتیم هەڵگرت. ئاخۆ باری دەروونیم لە پێشمەرگایەتیدا چۆن بووبێت؟ چۆن هاوسەنگیم لەنێوان بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوندی تایبەتی خۆم و، بەرژەوەندی خانەوادەکەم و حزبەکەمدا راگرتبێت؟

که سێک بووم لەگەڵ بنەماڵەکەمدا، لەگەڵ بەرپرسانی پدک و شۆڕشی ئەیلولدا، لەگەڵ بەرپرسەکانی ینک و شۆڕشی نوێدا، ژیانم پڕ لەناکۆکی و ململانێ و پێکدادان بووە، ڕووبەڕووی چەندان گیروگرفت بوومەتەوە، هەموویانم بە هەڵە زانیوە، خۆم بە ڕاست زانیوە، بەڵام لەسەر بنەمای ململانێ و یەکگرتن، لەتێکۆشان سارد نەبوومەتەوە، نە خۆم ڕادەستی ڕژێمی داگیرکەر کردەوە، نە خۆم ڕادەستی سیاسەتی چەوتی سەرکردەکان کرد، بە بەردەوامی لەبەرەی گەلدا بووم.

کەسێک وەک پزیشک و پێشمەرگە، لە ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨دا، کیمیاباران و ئەنفالی دیبێت، خانەوادەکەی بە چەکی کیمیاوی کۆمەڵکوژ کرابێت، هەزاران بریندار چەکی کیمیاوی چارەسەرکردبێت، خۆی چەند جارێک بەچەکی کیمیاوی بریندار بووبێت، شاهیدێکی زیندووی جینۆسایدی گەلی کورد بێت، وردبوونەوە لە ژیانی ئەو کەسە، بەقۆناغێکی هەستیاری خەباتی گەلی کوردت ئاشنات دەکات.

کەسێک ساڵی ١٩٧٥ شکستی شۆڕشی ئەیلولی دیبێت، ساڵی ١٩٨٨ پاشەکشەی سەربازی و سیاسی شۆڕشی نوێی دیبێت، ئاگاداری هۆکارەکانی ئەو شکستانە بێت، بەهەستی خۆی تامی هەڵسانەوە و دووبارەکردنەوەی شکستەکانی کردبێت، خوێندنەوەی لاپەڕەکانی ژیانی، شارەزابوونە لەمێژووی سەرکەوتن و شکستی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، هەوڵدانە بۆ ڕێگری لەدووبارەبوونەوەی شکستەکان.

لەنووسینەوەی ئەم یادەوەرییەدا، هەوڵمداوە خۆم بەکات و شوێنەوە پابەند بکەم، بەڵام لەهەموو بابەتەکاندا نەمتوانیوە ئەوە ڕەچاو بکەم، بۆ ئەوەش، هۆکاری تایبەت هەن، پەیوەندی بەئاستی وەبیرهاتنەوەی ڕووداوەکانەوە هەیە، ئایا ڕووداوەکانم وەک خۆی لەبیر ماوە یان پێشوپاشم کردوون. هۆکاری بابەتی هەیە، کە پەیوەندی بەباسی بابەتەکەوە هەیە، بۆ نموونە کە باس لەشێوەی شەڕی ناوخۆی ڕانەگەینراو (تیرۆری هزری و جەستەیی) دەکەم، هەمووی پێکەوە باس دەکەم، بەدواداچوونی کاتم ڕەچاو نەکردوە،

شوێنم ڕەچاو نەکردوە. کە باسی پەیداکردنی دەرمان و بەکارهێنانی دەرمان دەکەم، خۆم بەکات و شوێنی تایبەتەوە نەبەستۆتەوە.
لەنووسینەوەی یادەوەرییەکاندا، بەتەنیا ڕووی گەشی خۆم و هەڵویستی جوانی بەرپرسەکانم نەخستۆتەڕوو، هەردوو دیوی جوان و ناشیرینی، ژیان و تێکۆشانی  خۆم و هاوڕێ و بەرپرسەکانم نیشانداوە. لە نووسینەوەی ئەم یادەوەرییەمدا، تەنها باسی خۆمم نەکردووە، باسی سەدان پێشمەرگەو کادر و شەهید و بریندارم کردووە.
لە نووسینەوەی یادەوەرییەکانمدا، سەرباسی زۆرم داناوە، ئامانجم ئەوەیە سەرنجی خوێنەر بۆ هەستیاری بابەتەکە راکێشم.
کاتێک باس لەپێشمەرگەو کەسایەتی و سەرکردەکانی شۆڕشی گەلی کورد دەکەم، وشەی شەهیدو رەحمەتی  بەکارناهێنم، لەبەرئەوەی ئەو کارەکتەرانە لەو کاتەدا لەژیاندا ماون، بۆ ئەوانەشی لە خۆم گەورەتر بوون یان بەرپرسم بوون کاک و بەڕێزم بەکارنەهێناوە، ئەوە ئەتەکێتی نووسینە، بێڕێزیی نییە.
لەهەڵسەنگاندنی رووداوەکاندا، بێجگە لە بۆچوون و ئەزمونی تایبەتی خۆم، سوودم لەفەلسەفەی مارکسیزم  و هزری سیاسی عەبدوڵلا ئۆج ئالان وەرگرتووە.
ئەم کتێبە بەشی یەکەمی یادەوەرییەکانمە، ئەو بەشەیە کە من تیایدا بڕیاری سیاسیم بەدەست نەبووە، بڕیارم بۆ هاتووەو جێبەجێم کردووە، یان بە بڕیارەکە رازی نەبووم.
ئەم کتێبە، یادەوەریی تەمەنی منداڵی و مێرمنداڵی و گەنجیمە، سەردەمی بەرخۆدانمە بەرامبەر بەسیاسەتی شۆڤێنی رژێمە تۆتالیتاریەکانی عێراق. بەو هیوایەی بتوانم بەشی دووەمی یادەوەرییەکانم تۆمار بکەم، لەبەشی دووەمی یادەوەرییەکانمدا، لەڕووی تەمەنەوە هەڵکشاوم، لەسەردەمێکدایە گەلی کورد لەهەرێمی کوردستاندا بۆتە خاوەن دەسەڵات، منیش لەئاستێکی سنورداردا بڕیار بەدەست بووم.
ناوم (فایەق محەمەد ئەحمەد)ە، بەپیشە پزیشکم، ساڵی ١٩٨١ کۆلێژی پزیشکی  زانکۆی مووسڵ-م، تەواوکردووە، ساڵی ١٩٩٨--٢٠٠٠ لە زانکۆی

سلێمانی لە بەشی نەشتەرگەری گشتیدا، بڕوانامەی ماستەرم بەدەستهێناوە، ساڵی ٢٠١٢-٢٠١٣، لە زانکۆی ئەدنبەرە بڕوانامەی MRCS بە دەست هێناوە.

وەک پزیشکی پسپۆڕی نەشتەرگەری گشتی، لە دوای راپەڕینەوە تا ئەمرۆ لە نەخۆشخانە حکومییەکانی شاری سلێمانیدا بە خۆبەخشی کار دەکەم.

لەساڵی ١٩٨٢-١٩٩١پێشمەرگە بووم، دوای راپەڕین ئەندامی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان بووم، ساڵی ٢٠٠٠-٢٠٠١ بەڕێوەبەری گشتی تەندروستی سلێمانی بووم، ساڵی ٢٠٠٢ لەبەر هەڵویستی سیاسی جیاوازم لە پەرلەمان دەرکرام. ساڵی ٢٠٠٤ -٢٠٠٨ سەرۆکی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان( پ چ د ک) بووم. لەکاتی نووسینەوەی یادەوەرییەکانمدا، شەست ساڵ تەمەنم بەڕێکردووە.

لەمنداڵیدا حەزم دەکرد زوو گەورە ببم، حەزم دەکرد بەگەورەتر لەتەمەنی خۆم مەزندەم بکەن، پێش ئەوەی ریشم لێبێت، زوو زوو گوێزانم بە روومەتما دەهێنا، بۆئەوەی ریشم لێبێت و گەورە دەرکەوم. کە گەورەبووم، حەز دەکەم گەنج ببمەوە، حەزم لە پیری نییە، بەڵام سەری خۆم بۆیە ناکەم بۆئەوەی لە خۆم گەنجتر دەرکەوم، حەز دەکەم کەس پرسیاری تەمەنم لێنەکات، بەڵام ئەگەر پرسیاریشم لێبکەن، وەڵامی راست دەدەمەوە.

تەمەن دوو جۆرە، جۆری یەکەم تەمەنی کرۆنۆلۆجیە، واتە تەمەن ژمارەی ساڵی ژیانی کەسەکەیە، چەند ساڵە لەدایکبووە، ئەوە تەمنیەتی. جۆری دووەمی تەمەن، تەمەنی فسیۆلۆجیە، واتە تەمەن بەگوێرەی چالاکی و توانای جەستەیی و هزری مرۆڤ پێوانە دەکرێت. کەسی وا هەیە بەتەمەن گەورەیە، بەڵام لەچالاکی و بەرهەمهێناندا توانای زۆرە، ئەو کەسە لەڕووی فسیۆلۆجیەوە گەنجە. کەسی واش هەیە بەتەمەن گەنجە، بەڵام توانای چالاکی کەمە، ئەو کەسە بەپیر دەناسرێت. من بە تەمەنی فسیۆلۆلجی گەنجم.

لەژیانمدا حەزم بەپاشناو (لەقەب) نەکردووە، بەتایبەتی پاشناوێک، بەناوی ناوچەو خێڵ و گوندەوە بێت، بەڵام ئەزموونی ژیان وایلێکردم، کە بەلامەوە ئاسایی بێت بەفایق گوڵپی بانگ بکرێم، هۆکارەکانیشی ئەمانەن:

١. ساڵی ١٩٦٣، باوکم لەشۆڕشی ئەیلولدا شەهید بوو، بەشەهید حەمە گوڵپی ناسراوە، باوکمم زۆر خۆشدەویست، بۆ پاراستنی ناوی باوکم، پێمخۆش بوو بە فایق حەمە گوڵپی بناسرێم.

٢. دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ کە گەڕامەوە کوردستان، لەبەڕێوەبەرایەتی تەندروستی سلێمانی، سەیری فایلی خۆمم دەکرد، فایلی من لەگەڵ فایلی دکتۆرێک بەناوی د. فائیق محەمەد ئەمین، پزیشکی ددان تێکەڵ ببوو. کاتێک کلینیکی پزیشکیم لە شەقامی گوران لە سلێمانی دانا، جارجار نەخۆش سەردانیان دەکردم و داوایاندەکرد ددانیان بۆ بکێشم، وایاندەزانی من دکتور فایقی پزیشکی ددانم، دکتور فایقیش هەمان کێشەی منی هەبوو، زۆرجار نەخۆش سەردانیان دەکرد، داوایان لێدەکرد نەشتەرگەری فتقیان بۆ بکات. بۆیە بەو ئەنجامە گەیشتم بۆ جیاکردنەوەی ناوو پیشە وەک یەکەکان، پاشناو پێویستە.

٣. ساڵی ٢٠٠٣دوای ڕوخانی رژێمی سەدام، هەندێک بەڵگەی رژێمی روخاوی بەعس بڵاوکرانەوە، ناوی ئەو کەسانەی تێدابوو کە ئەندام و دۆستی حزبی بەعس بوون، یەکێک لەوانە کەسێک بوو بەناوی د. فایق محەمەد ئەمین، من ئەوکات سەرۆکی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (پ چ د ک) بووم، حزبە دەسەڵاتدارەکان کەوتنە خۆیان، بەو هیوایەی ئەوە ناوی من بێت. ئامۆزایەکی خۆم بەکادرانی پدک ـی وتبوو، ناوی سیانی ئەو فایق محەمەد ئەحمەدە، فایق محەمەد ئەمین نییە، ئامۆزاکەم ئەو حزبەی بێئۆمێد کرد.

یەکێک لەکادرەکانی ینک، بەوپەڕی کەیفەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی ئەرێ ناوی سیانی تۆ چییە، وەڵامم دایەوەو وتم، من ناوی باپیرەم ئەحمەدە، ئەمین نییە، خۆشم ینک-م بێئۆمێد کرد. دەرکەوت ئەو فایق ناوە پزیشک نییە،

دکتۆرای لەزانستی کشتوکاڵدا هەیە، مامۆستای یەکێک لەزانکۆکانی کوردستانە، دیسان بەو ئەنجامە گەیشتم بۆ جیاکردنەوەی ناوو پیشە وەک یەکەکان، پاشناو پێویستە.

٤. گوڵپ، گوندێکی گەورەی باشووری کوردستانە، لەساڵی ١٩٣٣ قوتابخانەی سەرەتایی تێدا کرابووەوە، لەحەفتاکانی سەدەی بیستەوە، قوتابخانەی ناوەندی تێدابوو. لەساڵی ١٩٧٠ کارەبای بۆ راکێشرابوو. قوربانیەکی زۆری بۆ شۆڕشی کورد داوە، ساڵی ١٩٧٨ رژێمی بەعس رایگواست و تەختی کرد، ئەوکاتە (٢٣) کەسی گوڵپی پێشمەرگە بوون، کاتێک گوڵپ تەختکراو راگوێزرا (٤٥٠) ماڵ بوو، ، بەلام تا ئێستا ئاوەدان نەکراوەتەوە.

# ١

# له بەهەشتی سۆسەکانەوە
# بۆ دۆزەخی گوڵپ

لەگوندی گوڵپ لەدایک بووم، لەبەرئەوەی باوکم بوو بەپۆلیس، گوڵپی بەجێهێشت، لەبنکەی پۆلیسی گوندی سۆسەکان دامەزرا، یادەوەرییم لەسۆسەکانەوە دەستپێدەکات، سۆسەکان گوندێکی بچوکی ناوچەی هەورامانە، پێش ئەوەی بگەیتە تەوێڵە، کەوتوتە لای راستی رێگەکەوە، رووی کردۆتە گوندی شۆشمێی رۆژهەڵاتی کوردستان، لەبەرئەوەی لەگوندی سۆسەکانەوە سنوری وڵاتی ئێران دیارە، بنکەیەکی پۆلیسی حکومەتی عێراق، لەسەر گردێکی گوندی سۆسەکان دروستکرابوو، چاودێری سنورەکانی ئێرانی دەکرد.

لەدیوی هەورامانی رۆژهەڵاتی کوردستانەوە، گوندی شۆشمێ هەمان تایبەتمەندی گوندی سۆسەکانی هەیە، رووی لە باشووری کوردستان کردووە، بۆیە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە، پادگایەکی پۆلیسی ئێران، نزیک بەگوندی شۆشمێ، دروستکرابوو، چاودێری سنوری عێراقی دەکرد.

سۆسـەکان و شۆشـمێ، دو گونـدی سـنوری باشـورو رۆژهـەڵاتی کوردسـتانن، هێـزە ئەمنیـەکانی عێـراق و ئێـران، لـەوێوە چـاودێری وردی پەیوەندی نێوان کوردانی باشـورو رۆژهـەڵاتی کوردسـتان دەکـەن، لـەوێوە رێگری لەیەکێتی نەتەوەیی نێوان ئەو دوو پارچەیەی کوردستان دەکەن.

**چەتە**[1]:

لـەکۆڵانەکانی گونـدی سۆسـەکاندا لەگـەڵ منـداڵان یـاریم دەکـرد، دایکـم بـانگی کـردم بچمـە ماڵـەوە، لەبـەر چێژی یارییەکە، گوێم بـەبانگ و هـاواری دایکـم و برسـێتی خـۆم نـەدەدا، دایکـم کـە زانـی بـەگوێی ناکـەم و ناچمـە ژوورەوە، پەنای بۆ چەکێکی ترسێنەر برد، وتی:

وەرە ژورەوە، ئەگـەر زوو نـەیەیتـە ژوورەوە، چەتـە بڵاوبوونەتـەوە، چەتەکان دەتگرن و دەتخۆن.

نـاوی چەتـە ترسـاندمی، یـاری کۆڵانم بەجێهێشـت، وە ژوور کەوتـم. ئیتـر چەتەم وەک دێو دەهاتە بەرچاو، زۆر حەزم دەکرد بزانم چەتە چییـە؟ چۆنـە؟ بۆ منداڵ دەخوات؟ رۆژێک باوکم بەهەڵەداوان بۆ ماڵـەوە گەڕایەوە، بـەدایکمی وت:

زوو خـواردنم بـۆ ئامـادە بکـە، دەبێـت بەپەلـە بچـم بـۆ تەوێڵـە، حکومـەت بڕیاری دەستگیرکردنی حاجی ئەولەو حاجی ئازیزو مـام تـایری دەرکـردووە، بـەتاوانی ئـەوەی پەیوەندییان بەچەتەکانـەوە هەیـە، بڕیارەکە لای منـە، دەبێت بیبـەم بـۆ بنکـەی پۆلیسـی تەوێڵـە، بـەڵام پـێش ئـەوەی بچمـە بنکـەی پۆلیسـی تەوێڵـە، دەبێـت ئـەوان ئاگـادار بکەمـەوە، تـا خۆیـان بشـارنەوە و دەسـتگیر نەکرێن.

بۆم دەرکەوت حاجی ئەولەو هاوڕێکانی، پەیوەندییان بەچەتەکانـەوە هەیـە، بۆیە حکومەت بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ دەرکردوون، هەر لەوەشـەوە زانیم کە باوکم لەگەڵ چەتەکاندا هاوسۆزە، بەو هۆیەوە کەمێک ترسـم لە چەتە کەم

١ چەتە: رژێمی عێراق بە پێشمەرگەی دەوت چەتە.

بووەوە. دواتر بۆم دەرکەوت، ناوی چەتە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە، بەسەر پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلولدا دابڕاوە.

باوکم لەقوتابخانەی گوندی گوڵپ فێری خوێندن و نوسین ببوو، سوودی لەو خوێندەوارییەی وەرگرتبوو، بەنووسەری (کاتبی) بنکەی پۆلیسی سۆسەکان دامەزرابوو، لەڕێگەی خوێندەوارییەکەیەوە، زانیاری لەسەر جمووجووڵی حکومەت هەبوو، نووسراوی پۆلیسخانەی سۆسەکانی دەخوێندەوە، لەڕێگەی خوێندەوەی نووسراوێکەوە، زانیبوی کە بڕیاری دەستگیرکردن بۆ حاجی ئەولەو هاوڕێکانی دەرچووە، دواتریش دەرکەوت کاتێک باوکم پۆلیس بووە، لەڕێگەی حاجی ئەولەوە پەیوەندی بەڕێکخستنی پدک کردووە، بەنهێنی کاری بۆ کردووە.

**هاوارى ڕەشاد:**

ڕەشاد یەکێک لەو منالانەی گوندی سۆسەکان بوو کە ڕۆژانە پێکەوە یاریمان دەکرد، ڕۆژێکیان ڕەشاد لەماڵی خۆمان بوو، دەستمان بە یاری کرد، وتم با بەنۆرە بچینە ناو سندوقی نوێنەکانەوە، کە ڕەشاد چووە ناو سندوقەکە، دەرگای سندووقەکەم لەسەر داخست، دوای ماوەیەک ویستم دەرگای سندووقەکە بکەمەوە، دەرگای سندووقەکەم لێ عاسی بوو، هەرچیم کرد دەرگای سندوقەکەم بۆ نەکرایەوە، ڕەشاد بۆ ماوەیەک لەسندووقەکەدا مایەوە، داوای دەکرد دەرگای سندوقەکەی بۆ بکەمەوە، منیش نەمتوانی بیکەمەوە، ڕەشاد دەستی بە هاوار و گریان کرد، هەر هیچم بۆ نەکرا ، ئیتر دەنگی نەما، لەبەر گەرماو لەبەر کەمی هەوا بوورابووەوە. لەو کاتەدا دایکم لەکانی گەڕایەوە، کە دیمەنەکەی بینی، پەلاماری دەرگای سندوقی داو شکاندی، ڕەشادی هێنایە دەرەوەو لەمردن ڕزگاریکرد.

هەموو گیانی ڕەشاد لە ئارەق هەڵکێشرابوو، ڕەنگی مردنی لێ نیشتبوو، بەرامبەر بە ڕەشادی هاوڕێم، هەستم بەهەڵەیەکی گەورە دەکرد، دایکیشم چەند جارێک بەسەرمدا قیژاندی، لێم توڕەبوو. ئەو هەڵەیە، کاریگەریی لەسەر بەجێهێشتم، بۆئەوەی لەئایندەدا ئاگاداربم، هەستیار بم، لەکاتی یاری و هەڵسوکەتی ڕۆژانەدا، لە ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسیدا، زیان بەخۆم و بە دەورووبەرم نەگەیەنم.

## گومان:

پرسیارێک کە لەگەڵ تەمەنم و پێوانەی کۆمەڵایەتییدا یەکینەدەگرتەوە، ئەو پرسیارە بوو کە لەدایکمم کرد، بەجوانی بیرم نایە هیچ بۆنەیەک بوو؟ یەکێک لەبراکانم لەدایک ببوو؟ یان ژنی دراوسێمان منداڵی ببوو؟ پرسیارم لەدایکم کرد وتم:

ژن لەکوێوە منداڵی دەبێت؟ لەو کاتەدا نازانم دایکم سەیری چی دەکرد؟ ، یان خەریکی چی بوو؟، سەری بەرز نەکردەوە، سەیری منیشی نەکرد، وتی:

ژن لەناوکیەوە منداڵی دەبێت. بڕوام بەوەڵامەکەی دایکم نەکرد، بەڵام لەو کاتەدا وەڵامە راستەکەشم بەتەواوی نەدەزانی، گومانم هەبوو، ئەو وەڵامەی دایکم وای لێکردم، تا ئەمڕۆش گومان لەسەر زۆربەی وەڵامەکان دابنێم.

## تەریقبوونەوە:

منالّی دووەمی خێزانەکەمان بووم، دایکم دەیوت پێش تۆ کچێکمان هەبوو، ناوی گەردە بوو، دوای لەدایکبوونی بەچەند مانگێک، نەخۆش کەوت و مرد، من و گەردە لەگوڵپ لەدایکبووین، سێ براکەی ترم لەسۆسەکان لەدایکبوون.

ئەگەر بەگوێرەی کات و شوێن، بەراوردی ژیانی منداڵی خۆم بکەم، ساڵانی ژیانی منداڵیم لەسۆسەکان، خۆشترین کاتی ژیانم بوو، ئەوکات باوکم لەژیاندا بوو، من کورە گەورەی ماڵ بووم، باوکم دەستی دەگرتم، لەبۆنەو جەژندا، لەسەردانی ماڵاندا، لەگەڵ خۆی دەیبردم، نازی دەدامێ. باری ئابووریمان باشبوو، لەبیرم نایە دایکم و باوکم لەسەر بوون و نەبوونی پێویستی ژیان، لەسەر خواردن و شتی تر قسەیان کردبێت. پەیوەندیمان لەگەڵ خەڵکی گوندەکەو لەگەڵ خزماندا زۆر باش بوو، پورێکی دایکم شوی بەحاجی ئەولەی سۆسەکانی کردبوو، چەند کوڕیکی باشی هەبوو، عەزیز، جافر، نەزمی، نەریمان و بەرزان. عەزیزو جافر لەمن گەورەتربوون، بەردەوام دەستیان بەمنەوە بوو، هاوکارییان دەکردم.

بەهارو هاوین دەچوینە ناوباخ، باخی تەلانەگەورێ وەک بەهەشت وابوو، یادگارییەکانی مندالیم لەژێر سێبەری دارەکانی تەلانەگەورێدا، لەدیمەن و خورەی ئاوی ژێر دارەکانیدا، قەت لەبیر ناچێتەوە.

هەر لەمنالیەوە حەزم لەقوتابخانەو خوێندن دەکرد، پێش ئەوەی تەمەنم بگاتە شەش سال سەردانی قوتابخانەم دەکرد، حەزمدەکرد ببم بەقوتابی، بەڕێوەبەری قوتابخانە وەک گوێگر لەقوتابخانە وەریگرتم. رۆژانە لەگەڵ قوتابیەکانی گوندی سۆسەکاندا، شیری گەرم و سێوی شیرین و ئاودارمان دەخوارد، ئەو سەردەمە حکومەت شیرو میوەی بۆ قوتابیانی قوتابخانەکان دابین دەکرد، ئێستەش چێژی ئەو شیرە گەرمە، ئەو سێوە شیرینانە، لەناو دەم و لەبن زمانمدا ماوەتەوە.

جافری پورزام لەڕووی تەمەنەوە، سالێک لەمن گەورەتربوو، لەگەڵ ئەو دەچوم بۆ قوتابخانە. رۆژێکیان، نازانم لەپۆلدا زۆر ماینەوە، یان ئاوو میوەو شیری زۆرم خواردبووەوە، هەستم کرد خۆم تەڕ کردووە، کەوتمە جوولە، نەمدەزانی چیی بکەم، جافر بە بارودۆخەکەی منی زانی، دەستی بەرزکردەوە وتی:

مامۆستا کوڕەکەی پوورم خۆی تەڕکردووە، ئیزنم بدەن با بیبەمەوە، مامۆستاش رازی بوو، لەگەڵ جافر گەڕاینەوە بۆ مالەوە، دایکم جلەکانی گۆڕیم ، ئەوە یەکەم یادەوریمە کە تیایدا هەستم بەتەریقبوونەوە کردبێت.

کاتێک بووم بەپزیشک، کە دایکان باسی ئەو جۆرە نەخۆشییەی منالەکانیان دەکرد، دەیانوت منالەکە شەرم دەکات بێت بۆ لای دکتۆر، یەکسەر مندالی خۆمم بیردەکەوتەوە، زوو لەقسەی دایکەکان تێدەگەیشتم.

**باوکتان چەتەیە:**

دایکم وتی مالمان دەگەڕێتەوە بۆ گۆلپ، من نەماندەزانی باوکم بۆچی بڕیاریدا مالەکەمان لە سۆسەکانەوە بگوازێتەوە بۆ گولپ.

دوای چەند رۆژێک، بەمالەوە بەرەو گولپ گەڕاینەوە، لەگولپ خانومان هەبوو، چوینە ناو خانوەکەی خۆمان. لە گولپیش رۆژ لەدوای رۆژ باسی

چەتە گەرمتر دەبوو، ژمارەی پێشمەرگە زیادی دەکرد، کاتێک ژنانی لادێ دەچون بۆ سەر کانی، هەواڵی هەمەجۆرو زانیارییان دەگۆڕییەوە، بەیانییەکی زووی هاوین، خەریک بوو خەو بەریدەدام، لەژێر لێفەکەوە بۆ دەوروبەری خۆمم دەڕوانی، دایکمم بینی، بەشپرزەیی لەکانی گەڕایەوە، بەتوڕەییەوە تەنەکە ئاوەکەی سەر شانی دانا، بەرەو رووی ئێمە هات، هاواری کرد، هەستن هەستن باوکتان بووە بەچەتە.

دایکم زۆر نیگەران بوو، منیش کە ئەوم بە نیگەرانی بینی، کەمێک لەگەڵیدا هاوسۆز بووم، کەمیکیش دڵم بە چەتەبوونی باوکم خۆشبوو، لەبەرئەوەی نیوەی گیانم لەچەتە دەترسا، نیوەکەی ترم چەتەی خۆشدەویست. لەچەتە دەترسام لەبەرئەوەی دایکم بەگیانلەبەرێکی وەک ئەژدیها وێنای دەکرد، وامدەزانی چەتە ئازاری منالان دەدات، چەتەم خۆشدەویست، لەبەرئەوەی باوکم بەباشی باسی چەتەی دەکرد، ئێستا باوکیشم بووە بەچەتە.

دوای ئەوەی باوکم بوو بەچەتە، ئینجا بۆم روونبۆوە کە هۆکاری گواستنەوەی ماڵمان لەسۆسەکانەوە بۆ گوڵپ چی بووە، باوکم بەرنامەی دانابوو پەیوەندی بەپێشمەرگەوە بکات، بەباشی زانیبوو ماڵەکەمان بگەڕێتەوە بۆ گوڵپ، لەبەرئەوەی گوڵپ بنکەی پۆلیسی حکومەتی تێدا نییە، ئەگەر بۆ کاری پێشمەرگایەتیش لەئێمە دووربکەوێتەوە، لەگوڵپ خزم و کەسوکاری خۆمان ئاگایان لێمان دەبێت.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی پەیوەندی کردنی باوکم بەپێشمەرگەوە، باسی چۆنیەتی راکردنی باوکم و کەریم هاواری، لەپۆلیسخانەی سۆسەکان دەستپێکرد، "بەشەو لەکاتی ئێشکگرتندا، لەسەربانی بنکەی پۆلیسخانەکە، بەگوریس، بەخۆیان و چەکەکانیانەوە، خۆیان شۆڕکردبویەوە بۆ سەر زەوی، لەپۆلیسخانەکە دوورکەوتبوونەوە، پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کردبوو"

دوای ئەوەی باوکم پەیوەندی بە پێشمەرگەوە کردو سەردانی کردینەوە، چەند برینێکم لەلەپی دەستیدا بینی، گوریسەکە بریندار کردبوو، تا ئەو کاتە سارێژ نەببوو. دواتر بۆمدەرکەوت، باوکم و کەریم هاواری، هەوڵی

زۆریاندابوو بۆئەوەی پۆلیسخانەکە رادەستی پێشمەرگە بکرێت، پۆلیسەکان ببن بەپێشمەرگە، بەڵام باشچاوشەکەیان بەوە رازی نەببوو.

دوای ئەوەی باوکم و هاورێکەی بوون بەپێشمەرگە، یەکەم کاریان هەوڵی گرتنی پۆلیسخانەی سۆسەکان بوو، بۆیە هەر زوو پۆلیسەکانی سۆسەکانیش کەوتنە خۆیان، پۆلیسخانەکەیان بەجێهێشت، بەرەو هەڵەبجە رایانکرد. کە هێزی پێشمەرگە بەوەی زانی، کەوتنە شوێنیان، ژمارەیەک پۆلیسیان لیدەستگیرکردن، ژمارەیەکیشیان لەشاخەکانی تاوێرەو شنرویوە رایانکرد، گەیشتنەوە هەڵەبجەو پەیوەندیان بەحکومەتەوە کردەوە. لەوکاتەوە هێزی پێشمەرگە، دەستی بەسەر پۆلیسخانەکانی تەوێڵەو سۆسەکان و بیارەدا گرت.

**چەتە ماچم دەکات:**

کە باوکم بوو بە پێشمەرگە، چاوەڕوان بووم زوو بگەڕێتەوە، پەلەی ئەوەم بوو بزانم پێشمەرگە چۆنە؟ لەو سەروبەندەدا، رۆژێک وتیان چەتە هاتوون بۆ گوڵپ، ئەو رۆژە لەگەڵ مامم بەرەو ناو باخ دەڕۆیشتین، لەرێگە پرسیاری چەتەم لە مامم کرد، مامم کە هەستی کرد من لەچەتە دەترسم، دڵی دەدامەوە، لەو کاتەدا کە من و مامم لەسەر چەتە قسەمان دەکرد، گوێم لەدەنگی چەند کەسێک بوو، لەناو باخەکەوە بەرەو لای گوند دەهاتن، دەنگەکە نزیک بووەوە، سێ کەس گەیشتنە لامان، دوکەس لەوانە چەکیان بەشانەوەبوو، فیشەکدانیان لەقەدیان بەستبوو، کەسی سێیەم مامێکی ترم بوو، کە منیان بینی، مامم وتی:

ئەوە کوڕەکەی کاکمە، ئەوانیش دانەوییەنەوە، دەستیان کردە ملم، ماچیان کردم، لەو کاتەدا هەستم بەدڵنیایی کرد، تا ئەمڕۆش لەبیرم نەچۆتەوە، لەباتی ئەوەی چەتە بمخوات، وا چەتە ماچم دەکات، دڵم دەداتەوە، لەو کاتەوە ترسم لەچەتە شکا، هەموو گیانم پڕبوو لەخۆشەویستی بۆ چەتە.

ئەو دوو پێشمەرگەیە کە یەکەم جار بینیمن، ناویان عەلی شیعە و عەلی کوور بوو، خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان بوون، ماوەی چەند ساڵێک بوو، لەباشوری کوردستان دەژیان.

دوای ماوەیەک باوکم گەڕایەوە بۆ لامان، ئەوکاتە لەناو باخدا بووین، یەکەم جار بوو باوکم بەجلی پێشمەرگەوە ببینم، تفەنگێک لەشانیدا بوو، هەر ئەو تفەنگە بوو کە کاتی پۆلیسی هەڵیدەگرت، دواتر تێگەیشتم ئەو تفەنگە پێنجتیرە، دوو ریز فیشەکلۆخی لەسەر قەدی بەستبوو، خنجەرێکی لەلاقەبرخەی گیرکردبوو، دەمانجەیەکیشی لەسەر فیشەکلۆخەکەوە بەستبوو، دوربینێکیشی لەملکردبوو، لەهەمووی جوانتر ئەو کلێتە مەرەزە سوورە بوو، کە لەبری مشکی و جامەدانە، لەسەری نابوو. کە ئەو دیمەنەی باوکمم بینی، بەتەواوی ترسم لەچەتە شکا، لەو کاتەوە بەتەواوی پێشمەرگەم خۆشویست.

**داستانی زەڵم:**

ناوی پێشمەرگە شوێنی چەتەی گرتەوە، دوو کەسی تری خەڵکی گوڵپ، عەبدوڵڵا فەتاح و عەلی کاکەخان، چەکی پێشمەرگایەتیان هەڵگرت، هەردووکیان دەنگیان خۆش بوو، بەهەورامی گۆرانیان دەوت، دوای شەهید بوونی باوکم، عەبدوڵڵا وازی لەپێشمەرگایەتی هێنا. لەگەڵ گەشەکردنی شۆڕشی ئەیلول و زۆربونی ژمارەی پێشمەرگەدا، سەدان کەس لەگەنجانی گوڵپ، چەکی پێشمەرگایەتیان هەڵگرت.

رۆژێک باوکم لەشەڕیکی ناوچەی بەمۆ گەڕایەوە، باسی ئەوەی دەکرد گولە تۆپێک لەنزیکیەوە تەقیوەتەوە، دەنگی تەقینەوەکە کاری کردۆتە سەر بیستنی، وەک جاران گوێی لەدەنگ نابێت. دواتر کە باسی شەڕو بۆردومان دەهاتە پێشەوە، دەمبیست ئەوانەی لەبۆردومانەکەوە نزیک بوون، وەک باوکمیان بەسەر هاتووە، هەستی بیستنیان لاواز بووە. بۆمدەرکەوت ئەوە جۆرێکە لەبرینداربوونی پەردەی گوێ، بەهۆی دەنگی بەرزی تەقینەوەکانەوە روودەدات. کە بووم بەپزیشک و پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد، یەکێک لەجۆرەکانی بریندار بوونی پێشمەرگە، تەقینی پەردەی گوێ بوو.

دواجار کە باوکمم دی، شەوێکی هاوینی لادێ بوو، بۆ خەوتن چووبووینە سەربان، دایکم داوای لەباوکم دەکرد واز لەپێشمەرگایەتی بێنێت، باوکم بەو داواکارییەی دایکم رازی نەدەبوو، دایکم دەیوت:

دەکوژرێیت، چوار منداڵت هەیە، کێ بەخێویان دەکات، دیسان دایکم بەباوکمی دەوت: پیمنالێی تۆ بۆ کێ ئەمە دەکەیت؟ باوکم وەڵامی دایکمی دایەوە، وتی:

بۆ کوردی دەکەم، بۆ خۆمی دەکەم، بۆ کوڕەکەمی دەکەم، بۆ کوڕی کوڕەکەمی دەکەم، ئیتر دایکم بێدەنگ بوو.

گەورەترین کارەساتی تراژیدی ژیانم، شەهیدبوونی باوکم بووە، تا ئەمڕۆش هەر پێشمەرگەیەکی خێزاندار، یان هەر هاوڵاتیەکی خێزاندار، گیان لەدەستدەدات، موچڕکێکی تاڵ بەگیانمدا دێت، وێنای ژیانێکی دۆزەخیی وەک ئەوەی خۆم، بۆ جگەرگۆشەکانی دەکەم.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٣ دا، ناوچەی هەورامان و خورماڵ، لەگەڵ بەشێکی شارەزور، لەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەدا بوو، قەزای هەڵەبجە بەدەست حکومەتی عێراقەوە بوو، بەڵام بەشێوەی نافەرمی، پێشمەرگەش لەو شارەدا دەسەڵاتی هەبوو.

ناوبەناو لەنێوان حکومەت و سەرکردایەتی ئەو کاتەی شۆڕشدا، گفتوگۆ دەکرا، پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی حکومەت، لەیەک نزیک دەبوونەوە، پێشمەرگە دەچووە ناو شار، دوای ماوەیەک جارێکی تر، ناکۆکی درووستدەبوو، شەڕ دەستپێدەکردەوە.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەسەڵاتی شۆڕشی ئەیلول پەرەی دەسەند، پێشمەرگە دەستی بەسەر پانتایی فراوانتردا دەگرت، بەمەبەستی شکستپێهێنانی پێشمەرگەو دووبارە داگیرکردنەوەی ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەستی هێزی پێشمەرگەدا بوون، هاوینی ١٩٦٣، سوپای عێراق، هەڵمەتێکی سەربازی بۆ سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان دەستپێکرد.

لەو کاتەدا زەعیم سدیق[٢]، سەرپەرشتی هەڵمەتە سەربازییەکەی پارێزگای سلێمانی دەکرد، پێش ئەوەی زەعیم سدیق، بەسوپاوە هێرش بکاتە سەر

---

٢ زەعیم سدیق: فەرماندەی لیوای بیستی سوپای عێراق بوو.

ناوچەی شارەزورو هەورامان، لەسلێمانی و دوکان و کۆیە، هێرشی کردبوو، بۆ چاوترساندنی خەڵکی کوردستان، چەند کۆمەڵکوژییەکی ئەنجامدابوو.

لەسلێمانی، کۆمەلکۆژییە بەناوبانگەکەی ٩-حوزەیرانی ئەنجامدابوو، دواتر پەلاماری ناوچەکانی دوکان و کۆیەی دابوو. لەمانگی ئابی ١٩٦٣ دا، هێرشی بۆ سەر شارەزوورو هەڵەبجە دەستپێکرد.

بەرپرسانی هێزی پێشمەرگەی ناوچەکەش، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپاکەی زەعیم سدیق، ئامادەکارییان دەکرد:

١. هێزی پێشمەرگە، لەدەورووبەری ڕێگەی سەرەکی سەیدسادق-هەڵەبجە-خورماڵ، سەنگەریان لێدا، خۆیان بۆشەڕ ئامادە کرد.

٢. لەسەر گردەکانی نزیک ڕێگاکە، وەک گردی چەقلاوە، چەکی ڕەشاشیان دامەزراند، ئەوکاتە ڕەشاشی برێن، چەکی قورسی دەستی پێشمەرگە بوو.

٣. هێزی بەرگری میللی-یان ئامادەکرد، هێزی بەرگری میللی ئەو کەسە مەدەنیانە بوون کە چەکیان هەبوو، وەک پێشمەرگە لەپەل و دەستەدا ڕێکنەخرابوون، پەروەردەی سەربازییان نەدیبوو، بەلام لەکاتی شەڕدا، پاڵپشتی پێشمەرگە بوون و هاوکاری پێشمەرگەیان دەکرد.

لەگوڵپ چەند کەسێک وەک هێزی بەرگری میللی، بۆ شەڕی پردی زەڵم بانگ کرابوون، لالۆ ئەحمەد[٣]، حاجی ڕەحمان، حاجی ئەحمەد دزلی، وەک بەرگری میللی بەشداری شەڕی پردی زەڵمیان کرد.

لەسەر ڕێگەی سەرەکی سەیدسادق - هەڵەبجە، شەڕ لەنێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەدا دەستپێکرد، هەواڵی بەرگریی هێزی پێشمەرگە دەگەیشت، دەیانوت پێشمەرگە ڕێگە نادات، سوپای عێراق، لەسەیدسادقەوە بەرەو هەڵەبجە پێشڕەوی بکات. ئەو هەواڵە دڵی خەڵکی خۆشکردبوو، بەلام بەرگری پێشمەرگە، لەقرچەی هاویندا، لەناو دەشتێکی تەختدا، لەسەر ڕێگەی هاتوچۆی ئۆتۆمبێلدا، بەتوانایەکی سەربازی سەرەتاییەوە، بەرامبەر

٣ لالو ئەحمەد: باپیرم، باوکی باوکم بوو .

بەسوپایەکی گەورەی وڵاتێک، بۆ ماوەیەکی درێژ ئاستەم بوو. ئەوە یەکەم جاربوو هێزی پێشمەرگە، لەگەڵ سوپای عێراقدا، شەڕی بەرەیی بکات.

دوای تێپەڕبوونی چەند رۆژێک بەسەر شەڕی بەرەیی دەستەویەخەی بەناوبانگی پردی زەڵمدا، وردەوردە هاوسەنگی شەڕ، بەسودی سوپای عێراق شکایەوە، هەندێک لەبەرپرسانی پێشمەرگەی ئەوکاتە، بەرەی شەڕیان چۆڵکرد، هەندێک لەپێشمەرگەکانیش تا دوا هەناسە شەڕی مان و نەمانیان لەگەڵ سوپاکەی زەعیم سدیقدا کرد.

بەگوێرەی هەواڵەکان لە١٩٦٣/٨/١٢، لەشەڕی پردی زەڵمدا بەباوکمەوە، ١٢ دوانزە پێشمەرگە شەهید بوون، بەڵام لەیادەوەریی پەنجا ساڵەی باوکمدا، کە لەئابی ٢٠١٣ لەهەڵەبجە بۆمانگێڕا، تەنها ناوی ٩ شەهیدم بەردەستکەوت.

ئەو رۆژەی هەواڵی شەهیدبوونی باوکم هات، من لەگەڵ یاسینی پورە قەتێ، لەناو توتنندا بووم، یاسین پاچەکۆڵەی بۆ دەکردین، منیش سەیری دەستیم دەکرد بۆئەوەی پاچەکۆڵە فێرببم.

ئەوکاتەی هەواڵی شەهیدبوونی باوکم بەمن و یاسین گەیشت، یاسین دەستی شل بوو، پاچەکە لەدەستی کەوتە خوارەوە، دەستی بەباوکەڕۆ کرد، من منداڵبووم هەستم بەئازاری هەتیوکەوتن نەدەکرد، هەستم بەئازاری لەدەستچوونی باوکم نەدەکرد، نەدەگریام.

**مازیت مارانێ:**

کە من و یاسین بەرەو ناو باخ گەڕاینەوە، سەیر دەکەم لە ژێر کەپری ناو باخەکەی ماڵی باپیرەمدا، هەموو خزمان شیوەن دەکەن، قوڕ دەپێون، تائێستا دیمەنی شیوەنی دوو کەس لەخزمەکانم بیر نەچۆتەوە، حامیدی مامی باوکم، هەردوو دەستی لە کەلەکەکانی گیرکردبوو، دەهاتوو دەچوو، فرمێسکی دەڕشت، دەیوت حەمەلە باوکەڕۆ، مازیت مارانێ، واتە حەمە باوکەڕۆ پشتت شکاندم.

دیمەنی دووەم، شیوەنەکەی پورە سوڵتانم بوو، کە لەوەی مام حامید زۆر کاریگەرتر بوو، پرچی خۆی و سەرشانەکانی بەقوڕ سواخ دابوو، رەنگی

شێتی لێ نیشتبوو، خەریک بوو هەناسەی لێدەبڕا، هاواری دەکرد، هۆ برا شیرینەکەم. بێجگە لەپوورە سوڵتان، ژمارەیەکی تری ژنانی خزم، قوڕیان پێوابوو، منیش بەبێ هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆ، بەلایاندا هاتووچۆم دەکرد، سەیرم دەکردن، بەشداری ماتەمینی و گریانی خزمەکانم نەدەکرد. هەندێک لەخزمەکان منیان لەباوەش دەگرت، ماچیان دەکردم.

شیوەن و ماتەمینی باوکم چەند رۆژێکی خایاند، لەکۆتا رۆژەکانی ماتەمینیەکەدا، ناجحی برام کە لەهەمووومان منداڵتربوو، یەکەم قسەی کرد، لەبەرئەوەی خواردنێکی گەرم بەردەستی کەوت، وتی: ئای سوتانێ، واتە ئای سووتام، ئەو قسەیەی ناجح، یەکەم روداوبوو دوای شەهیدبوونی باوکم، کە کەمێک سەرقاڵی کردین.

**تەرمەکەیان راکێشا:**

شەهیدبوونی باوکم تایبەتمەندی هەبوو، لەشەهیدەکانی تر جیابوو، لەو دوانزە پێشمەرگەیەی، لەداستانی پردی زەڵمدا، بەدەستی سوپاکەی زەعیم سدیق شەهید کرابوون، تەرمی هەموویان لەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوو، تەرمەکانیان بینرانەوە، گەیەنرانەوە ژێر دەسەلاتی هێزی پێشمەرگە، لەزێدی خۆیاندا نێژران. تەرمی باوکم کەوتە دەستی هێزەکانی سوپای عێراق، لەپردی زەڵمەوە تا سەیدسادق، بەدوای دەبابەدا رایانکێشا، چەند رۆژێک لەسەر شەقامێکی سەیدسادق تەرمەکەیان هێشتەوە، نەیاندەهێشت کەس بینێژێت، بۆئەوەی خەڵکی پێ چاوترسێن بکەن.

کاتێک خەڵکی سەیدسادق، لەتەرمەکە نزیک ببوونەوە، پرسیاریان لەفەرماندە سەربازییەکانی سوپا کردبوو، بۆچی تەرمی ئەو پێشمەرگەیەتان تا ئێرە راکێشاوە؟ بۆچی رێگە نادەن تەرمەکە بنێژرێت؟ فەرماندەکە وەلامی دابوونەوە: "ئەم چەتەیە شەڕی سەختی لەگەڵ هێزەکانی سوپادا کردووە، کاتێک فیشەکی پێنەماوە، بەخنجەر هەڵیکوتاوە سەر دەبابەیەک، ئەگەر دەبابەیەکی تر فریا نەکەوتایە، تەقەی لێنەکردایە، دەبابەکەی دەگرت، بۆیە تەرمەکەیمان بەشوێن دەبابەدا راکێشا."

بەهۆی قارەمانییەکەی باوکمەوە، سەربازو فەرماندەکانی سوپای عێراق، وای بۆچووبوون کە ئەم کەسە فەرماندەی هێزی پێشمەرگەیە، بۆیە بۆ شکاندنی وورەی هێزی پێشمەرگە، تەرمەکەیان تا سەیدسادق راکێشابوو.

سێ رۆژ تەرمی باوکم لەسەر شەقامێکی سەیدسادق مایەوە، لەسەر چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ تەرمەکەدا، هەر جارەو هەواڵێک دەهات، رۆژێکیان هەواڵێکمان بۆ هات کە سەربازێکی خەڵکی گوڵپ بەو ناوەدا رەت بووە، کە تەرمەکەی بینیووە، قسەی ناهاوسەنگی کردووە. هەواڵێکی ترمان بۆ هات، کە سیخورێکی حکومەت بەناوی هەورێشە[٤] دەچێتە سەر تەرمەکەی باوکم، جگەرەیەک دەکات بەدەمییەوە. هەمووی هەفتەیەکی پێنەچوو، لەسەر رێگەی هەڵەبجە- سەیدسادق، پێشمەرگە کەمینیان بۆ ئەو سیخورە دانا، هەر لەوێدا بەسزای گەل و شۆڕشیان گەیاند.

هەواڵێکی ترمان بۆ هات، تەرمەکەی باوکم بۆنی کردووە، خەڵکی سەیدسادق نیگەران بوون، چونکە فەرماندەی سوپا رێگەیان نادات تەرمەکە بنێژن.

دوای سێ رۆژ لەمانەوەی تەرمەکە لەسەر شەقامێکی سەیدسادق، تەرمەکە تێکچوو، مامۆستایانی ئاینی، پیاوچاکانی سەیدسادق، هەوڵێکی زۆریاندا، فەرماندەی سەربازگەکە رازی بکەن، لەگورستانی سەیدسادق تەرمەکە بنێژن.

دوای چەند مانگێک، لەشوباتی ساڵی ١٩٦٤دا، بۆ ماوەیەکی کورت شەڕ لەنێوان پێشمەرگەو سوپای عێراقدا راگیرا، خزمان ئەوەیان بەدەرفەت زانی، روفاتەکەی بگوێزینەوە، بەهاوکاری خەڵکی سەیدسادق، ئارامگاکەیمان دۆزیەوەو هەڵمانداتەوە، روفاتەکەی باوکم تەنیا ئیسقانەکانی مابوو، خستیانە دارەمەیتێکەوە، هێنامانەوە بۆ گوڵپ و ناشتمان.

کاتژمێرەکەی دەستی باوکم لەکار نەکەوتبوو، کاتژمێرەکامان دەرهێنا، بۆ ماوەیەک کردمە دەستم، کاتێک بوومە قوتابی پۆلی شەشی سەرەتایی، رۆژێک لەگەڵ قوتابیەکانی هاوڕێمدا یاریم دەکرد، کاتژمێرەکە لەدەستم کەوتە خوارەوەو شکا.

---

٤ هەورێشە وشەیەکی هەورامیە، بە واتای کەرویشک دێت، لەقەبی سیخورێکی کوردی ئەو دەڤەرە بوو.

**ناکۆکی کۆمەڵایەتی:**

دوای چەند ڕۆژێک لەشەهیدبوونی باوکم، ناکۆکی و دەمەقاڵێ لەنێوان دایکم و خزمە نزیکەکانی باوکمدا دروستبوو، لەوکاتەدا من نەمدەزانی ناکۆکییەکە لەسەر چییە، دیاربوو لەسەر دەسەڵاتبوو، بەڵام دەبوو لەو ناکۆکییەدا، لایەنگیری لایەکییان بکەم، دژی لایەکەی تر بوەستمەوە، لۆجیک ئەوەیە من لایەنگیری دایکم بم، دژی بەرەی ماڵی باپیرم بوەستمەوە، هەر واشمکرد، بەڵام لەبەرئەوەی من لەسێ براکەی ترم گەورەتربووم، سەرەڕمی، ناکۆکی و دەمەقاڵێکان بووم.

لەکۆمەڵگەکاندا چەندین ڕێساو بەرنامەی چارەسەری کێشەی کۆمەڵایەتی هەن، خەڵکانی دڵسۆز پەنایان بۆ دەبەن، بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکی و ساردییانەی، کە لەنێوان دایکم و ماڵی باپیرەمدا دروستبوون، هەوڵێکی کۆمەڵایەتی خێڵەکی درا، دایکم شووی بە یەکێک لەمامەکانم کرد. پاش ماوەیەکی کورت، مامم و دایکم لەیەکتر جیابوونەوە، بەو شێوەیە ئەو هەوڵە نەک هەر کێشەکانی چارەسەر نەکرد، کێشەکانی فراوان و قوڵتر کرد.

پرسیارم لەدایکم کرد، وتم:

بۆچی لەگەڵ مامم پێکەوە هەڵتان نەکرد؟، بۆچی جیابوونەوە؟ ، دایکم وتی:

من هەر لەسەرەتاوە حەزم بەو کارە نەدەکرد، دواتریش مامت هەموو ڕۆژێک داوای دەکرد، قاڵیەکانی بدەمێ بیانفرۆشێت، کاسبییان پێوەبکات، منیش بڕوام پێی نەبوو بتوانێت کاسپی بکات، دەترسام قاڵیەکان بفرۆشیت، پارەکەی بخوات و دەستمان ببڕێت.

ئەو کارە بۆ ئەوە کرا کە پەیوەندیی خێزانی لەنێوان منداڵەکانی شەهید حەمەگوڵپی و ماڵی باوکیدا ئارام و سەقامگیر بکرێت، بەڵام بەسەرنەکەوتنی ئەو کارە، هێندەی تر پەیوەندی نێوان من و دایکم لەگەڵ ماڵی باپیرەمدا تێکچوو، لەوکاتەوە بەکەمی پەیوەندی من و دایکم، لەگەڵ ماڵی باپیرەم ئاسایی بووە.

لەناکۆکییەکانی نێوان دایکم و ماڵی باپیرەمدا، لایەنگری دایکم بووم، بەڵام لەهەمانکاتدا، لەگەڵ دایکیشم ناکۆکیم هەبوو، ئەوان هەریەک لەلای خۆیەوە، بەگوێرەی بۆچوون و بەرژەوەندی خۆیان، بەگوێرەی رێسای کۆمەڵایەتی ئەوکاتە، داوایندەکرد ئەو کارە بکەم، ئەویتر نەکەم، منیش هەر لەمناڵییەوە، خاوەن راوبۆچوونی خۆم بووم، ئەوەی خۆم بەڕاستم دەزانی دەمکرد، ئەوەشی بەڕاستم نەدەزانی، بەگوێم نەدەکردن و نەمدەکرد.

**هەرە مەشکە:**

لە قوتابخانەی گوڵپ دەستم بە خوێندن کرد، وەک خوێندکارێکی زیرەک ناوم هەبوو، لەگوندەکانی نارنجلەو گەچێنەو باخەکۆن و سەرگەت، نزیک گوڵپ، قوتابی دەهاتن بۆ قوتابخانەی گوڵپ، دوو کەس لە قوتابیانی گوندی نارنجلە، ناویان نامق و عوسمان بوو، هاوپۆلی من بوون، ئەوانیش زیرەک بوون، لەسەر نمرە لەگەڵ مندا کێبڕکێیان دەکرد، نامق بوو بە ئەندازیار، عوسمان زوو وازی لەقوتابخانە هێنا.

بە هۆی شەڕی نێوان پێشمەرگەو سوپای عێراقەوە، ناو بەناو دەرگای قوتابخانەی گوڵپ دادەخرا، لەوکاتانەداو لە پشووی هاوینیشدا، ماڵی باپیرەم داوایان لێدەکردم بەرخ و کاریان بۆ بلەوەڕێنم، دایکم دەیوت ببە بە گاوانی گوند، بەڵام من نەک هەر بە گوێم نەدەکردن، بەڵکو لێشیان تووڕە دەبووم، خوێندن و تەواوکردنی قوتابخانە، یەکێک لەئاواتە بنەڕەتیەکانم بوو، زۆر حەزیشم لەکاری شەتل لێدان و پاچەکۆڵەو شریت لێدانی توتن دەکرد، لەو کارانەدا، لەمناڵە سەرکەوتوەکانی گوڵپ بووم، کاری توتنەوانی خۆمانم دەکرد، وەک کرێکاریش، کاری شەتڵ لێدان و پاچەکۆڵەو گەڵاشکێن و شریت لێدانم، بەکرێ بۆ خەڵک دەکرد.

یەک لەو ئیشانەی تر کە حەزمدەکرد بیکەم، دارهێنان بوو، چەندین جار لەگەڵ کوڕو کچانی گوڵپدا بەکۆڵ دارم هێناوە، هەندێک لەکچە هاوکارەکانم دەنگیان خۆشبوو، بەهیەو مینا، دوو لەو کچانە بوون کە لەمن گەورەتر

بــوون، لــەکاتی کۆکردنــەوەی چیلکــەو کــۆڵکردنی داردا، گۆرانیــان دەوت، هاوکاری منیشیان دەکرد.

کـوڕە گەنجـەکانی گونـدی گوڵـپ، لـەپایزدا بەگوێـدرێژو هێسـتر، بەشـەو دەچـوون بـۆ شـاخی شـەڵواندر، کـە ڕۆژیـان لێدەبووەوە، داریـان دەبـڕی، لەوڵاخـەکانیان بـار دەکـرد، دەیانهێنایـەوە بـۆ گونـد، وشـکیان دەکـردن، بـۆ خۆگەرمکردنەوەی زستان و ناندروستکردن و چێشتلێنان، بەکاریاندەهێنان.

منـیش حەزمـدەکرد وەک ئـەو کوڕانـە، کـەرێکم هـەبێت، داری پێبهێـنم، لەبەرئـەوەی منـداڵ بـووم، دایکـم کـەری بـۆ نـەدەکڕیم. دەرگـای قوتابخـانە داخرابـوو، کەڵکەڵـەی دارهێنـان بەتـەواوی لەسـەری دابـووم، مـاڵی بـاپیرەم کەرێکی بچوکیـان هـەبوو پێیـان دەوت هەرەمەشـکە[5]، بەردەوام داوام لە مـاڵی باپیرەم دەکرد ئـەو کـەرەی خۆیـانم بـدەنێ، با بیبـەم بۆ دارهێنـان، ئـەوانیش ڕازی نەدەبوون، دەیانوت تۆ منداڵی ئەو کارەت پێناکرێت.

جارێکیــان هەوڵمــدا هەرەمەشــکە بــدزم و بیبــەم بــۆ دارهێنــان، مامــە ئەسکەندەرم کە دوو ساڵێک لەمن گەورەتر بوو، هەرەمەشکەی لێشـاردمەوە، هەموو گەوڕی ماڵی باپیرەم گەڕام، هەرەمەشکەم نەدۆزیەوە، گەوڕی چەندان ماڵی تر گەڕام، لە درەنگانی شەودا هەرەمەشکەم دۆزیەوە، بەڵام ئـەو شـەوە، تـا مـن هەرەمەشـکەم دۆزیـەوە، دارهێنـەرەکانی گوڵـپ، دەرچـوون و منیـان بەجێهیشت.

دواتــر مــاڵی بــاپیرەم ناچــارکرد هەرەمەشــکەم بــدەنێ، چەنــد جارێــک بەهەرەمەشـکە چـووم بـۆ دارهێنـان، لەبەرئـەوەی منـداڵ بـووم، لەدارهێنانـدا سـەرکەوتو نـەبووم، داری بارەکـەم کـەمبوون، درێژبـوون، بـە خـواروخێچی بارمـدەکردن، کـە دەگەیشـتمەوە نـاودێ، خـەڵک بەکـەرو بارەکـەم پێدەکـەنی، منیش نیگەران دەبووم و لێیان تووڕە دەبووم.

---

٥ هەرەمەشکە، وشەیەکی هەورامیە، بە واتای گوێدرێژیک دێت قەبارەی هێندەی مەشکەیەکە.

**گرنگی خوێندن:**

ماوەیەک لە ناو پیڕی دارهێنەرەکانی گوڵپدا بووم، لەپڕ وتیان قوتابخانە دەکرێتەوە، من یەکسەر لەپیڕی دارهێنەران لامدا، بەرەو لای دەستەی قوتابخانەو خوێندن گەڕامەوە. لەوکاتەدا گفتوگۆ لەناو گەنجەکانی گوڵپدا دروستدەبوو، هەندێکیان دەیانوت قوتابخانە باشە، هەندێکیشیان دەیانوت قوتابخانەو خوێندن سوودی نییە، دارهێنان کارکردنە، دارهێنان باشە.

من لەو کەسانە بووم کە قوتابخانەم بەپێویست دەزانی، هەرچەندە دایکم حەزی دەکرد من ببم با گاوان، ماڵی باپیرەم دەیانویست من ببم بەشوانی بەرخەل[6]، هەندێک لەو گەنجانەی دژی قوتابخانە دەوەستانەوە، حەزیان دەکرد منیش وەک ئەوان هەر خەریکی دارهێنان بم. بەڵام لەناخی خۆمدا ئیرادەیەک هەبوو، بەرامبەر بەو هەموو مەیل و ئاراستە جیاوازانە دەوەستایەوە، درێژەی بەئارستەی خوێندن تا سەرکەوتن دەدا.

دایکی دایکم ناوی خەدیجە بوو، ئافرەتێکی جوان و لەسەرخۆو ژیر بوو، منی زۆر خۆشدەویست، بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم، جار جار بانگی دەکردم، نان و کەرەی دەدامێ، دەربارەی گوڵپ و کەسایەتییەکانی قسەی بۆ دەکردم.

باسی زوڵمی شێخەکانی گوڵپی بۆ دەکردم، کە چۆن دەستیان بەسەر زەوی و کانیاوەکانی باوکیدا گرتووە، باسی وەهابی پوورە سەفیەی بۆ دەکردم، چۆن خوێندنی کۆلێژی بازرگانی تەواوکردووە، چۆن بەڕۆژ خوێندوویەتی و بەشەو لەهۆتێل کاری کردووە.

باسی ئەو سەربازە گوڵپیانەی بۆ دەکردم کە پێش ئەوەی بچن بۆ سەربازی، چەندە هەژارو نەدار بوون، بەڵام کاتێک پەیوەندییان بەخزمەتی سەربازییەوە کردووە، فێری نووسین و خوێندنەوە بوون، سەرمایەیان پێکەوە ناوە، دەوڵەمەندبوون، ئێستا کەسێتی دیاری گوندن، نموونەی حەمەی لەیلێی مێردی پورم و مەحمود خوامرادی بۆ دەهێنامەوە.

---

٦ بەرخەل بە واتای لەوەڕاندنی کۆمەڵێک بەرخ دێت.

کاتێک لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی موسڵ دەمخوێند، لەقۆناغی پێنجەمدا، پرۆفیسۆر فەخری دەباغ، مامۆستای زانستی دەروونی، پرسیارێکی لەگروپەکەمان کرد، وتی کێ دەزانێت قوتابخانەی دووەمی فێربوون چییە؟ کەس نەیزانی، من لەو کاتەدا بیرم لەقسەکانی نەنکم کردەوە، کە کاتی خۆی باسی گرنگی سەربازی بۆ کردبووم، ئازایەتیم دا بەخۆم، دەستم بەرزکردەوە، وتم:

العسکریە، واتە خزمەتی سەربازی، وتی:

کولش زێن، واتە زۆر باشە، ئیتر هەموو خوێندکاری گروپەکە، بەسەرسوڕمانەوە سەیریان کردم.

کاتی خۆشی باوکم، چەند جارێک باسی حەمەکەریم هەورامی بۆ کردبووم، کە چەندە کەسێکی ئازاو کۆڵنەدەر بووە، چۆن درێژەی بەخوێندن داوە، چۆن بۆ خوێندن چووەتە میسر، لەڕادیۆی میسر باسی دۆزی کوردی کردووە. خوێندەوارییە سەرەتاییەکەی باوکیشم، کە لەپۆلیسەکانی هاوڕێی و لەبراکانی جیای دەکردەوە، وایلێکردبووم خوێندن بەئامانجی سەرەکی بزانم. توتنەوانی و دارهێنان، وەک خۆ سەرقاڵکردن، یان وەک دابینکردنی بژێوی، لەپێناو تەواوکردنی خوێندندا، بەرنامەیەکی ستراتیجی ژیانم بوو.

دەتوانم بڵێم ئیرادەی خۆم، راوبۆچونی نەنکم و باوکم، لەو هۆکارانە بوون کە من بەمنداڵی ستراتیجی خوێندم بۆ خۆم دارشت، لەقۆناغی سەرەتایی قوتابخانەدا سەرکەوتوو بووم، فێری نووسین و خوێندنەوە بووم.

**لالۆ حەمەو مامۆستا برایم:**

لەتەمەنی منالیمدا، کەسە باشەکانی گوندەکەمم لەکەسە خراپەکان جیادەکردەوە، خزمە باشەکانی خۆمم لەخزمە بێکەڵکەکان جیادەکردەوە، حاجی غەفور پورزای باوکم بوو، ئەوکات کاسبی دەکرد، هەر جارێک منی بدیبایە، یەک دوو کەلە شەکری دەدامێ، دەیوت بیبەرەوە بۆ ماڵەوە بیخۆن. حاجی محەمەدی ئولکەریم، خاڵی دایکم بوو، دوکاندار بوو، هەر کە منی دەبینی رووی خۆشی دەدامێ، نوقڵ و چکلێتی دەدامێ، هەردوو نەنکم ، دایکی

باوکم و دایکی دایکم لەگەڵمدا باش بوون، خۆشیاندەویستم، بەڵام هەردوو باپیرەم، قەت رووی خۆشیان نەدەدامێ، هاوکاریان نەدەکردم.

سانەی پورە حەیاتێ برای ئامۆژنم بوو، لەخاڵ و مامەکانم بۆ من نزیکتر بوو، زۆر بڕوام پێی بوو، زۆر جار ئامۆژگاری دەکردم و هاوکاری دەکردم.

ئەو قسانەی لەسەردەمی منالیمدا لەگوڵپ بۆمدەکران، هەندێکیانم وەردەگرت، دژی هەندێکی تریان دەوەستامەوە. لالۆ حەمەو مامۆستا ئیبراهیم باوک و کوڕیکی گوندی گوڵپ بوون، بۆ هەموو بابەتەکان خاوەن بۆچوونی تایبەت بوون، بەرەوانی بۆچوونەکانی خۆیانیان دەردەبڕی، باش تێیاندەگەیاندم، بۆچوونەکانیانم بەلاوە گرنگ بوو، گوێم لێ دەگرتن، تا رادەیەک پابەندی بۆچوونەکانیان دەبووم.

دوو یادەوەری لالۆ حەمەم لەبیرە، کە کاریگەرییان لەسەر دانام، یەکەم یادەوەریی ئەوەبوو، رۆژێکی مانگی رەمەزان، لەکاتێکدا خەڵکی گوند بەرۆژوو بوون، من لەنزیک چایخانەکەی گوڵپدا وەستابووم، گوێم لەقسەی خەڵک دەگرت، پارووییەکم بەدەستەوە بوو دەمخوارد، لەو کاتەدا لالۆ حەمە قسەی بۆ خەڵکی گوند دەکرد، لایەکی کردەوە، منی بینی لەڕەمەزاندا نان دەخۆم، لێم تووڕە بوو، شریخاندی بەسەرمدا، وتی: ئەوە راست نییە، نابێت جارێکی تر ئەو رەفتارە دووبارە بکەیتەوە. لەبەرامبەر تووڕەبوونەکەدا، بێدەنگ بووم، دەستم لەخواردن هەڵگرت، لەهەمانکاتدا ئەو تووڕەبوونەی لالۆ حەمە، وانەیەکی دادام، کە ئاگام لەهەست و نەستی خەڵک بێت، زیانی روحی بەکەس نەگەیەنم.

قسەیەکی تری لالۆ حەمە کاریگەری سیاسی لەسەر ژیانم دانا، رۆژێکیان پیاوێکی گوڵپی لەناو خەڵکدا قسەی دەکرد، لالۆ حەمە قسەی ئەو پیاوەی بەدڵ نەبوو، لەبەرامبەریدا هەڵیدایەوە، بەتەوسەوە وتی هههههههههها ئیبراهیم ئەحمەد قسەی کرد، دواتر دەرکەوت کاتێک لالۆ حەمە سەردانی هەڵەبجەی کردووە، لەوێ ئیبراهیم ئەحمەدی دیووە، قسەی بۆ کردووە، لالۆ حەمە کەوتۆتە ژێر کاریگەری قسەکانی ئیبراهیم ئەحمەدەوە. ئەو وەسفەی لالۆ حەمە بۆ ئیبراهیم ئەحمەدی کرد، وای لەمن کرد بەشوێن بۆچون و بەرهەمە

ئەدەبی و سیاسییەکانی ئیبراهیم ئەحمەدا بگەڕێم، یەکەم بەرهەمی ئەدەبی سیاسی، کە خوێندمەوە، ڕۆمانی ژانی گەلی ئیبراهیم ئەحمەد بوو.

مامۆستا ئیبراهیم، کوڕە تاقانەی خالۆ حەمە بوو، قوتابخانەی سەرەتایی لەگوندی گوڵپ تەواوکردبوو، لەسلێمانی خانەی مامۆستایانی تەواوکردبوو، مامۆستای قوتابخانەی گوڵپ بوو. مامۆستا ئیبراهیم وەک باوکی بەرەوانی قسەی دەکرد، لێکدانەوەی بۆ ڕووداوەکانی دەورووبەری هەبوو، لەکاتی خوێندندا، مامۆستا ئیبراهیم کەوتبووە ژێر کاریگەری سیاسەتی حزبی شیوعی، ببوو بەئەندامی حزبی شیوعی عێراق. لەقوتابخانەی گوڵپ وانەی ئینگلیزی پێدەوتینەوە، زۆرجار لەقوتابخانە، لەدوکان و لە چایخانەکانی گوڵپدا، دەربارەی باری سیاسی گشتی، دەربارەی شۆڕشی ئەیلول، قسەی بۆ دەکردین، یەک لەو قسانەی مامۆستا ئیبراهیم کە زۆر کاریگەری لەسەر ناخی من کرد، لێکدانەوەی تاوانە دزێوەکانی عەبدولوەهاب ئەتروشی بوو، عەبدولوەهاب فەرماندەیەکی سەربازی شۆڕشی ئەیلول بوو، لەدەڤەری هەورامان و هەڵەبجە چەندان کەسی بێتاوانی بەبێ دادگایی کردن کوشت. مامۆستا ئیبراهیم، ئەوکات باسی ئەوەی بۆ دەکردین، کە نابێت خەڵک بەبێ دادگاییکردن بکوژرێت، بۆچوون و ڕەخنەکانی مامۆستا ئیبراهیم، لەسەر شۆڕشی ئەیلول، یەک لەو هۆکارە سەرەکیانە بوو، کە لەمنداڵیەوە، دەستم بەڕەخنەکردنی بەرپرسەکانی پارتی و شۆڕشی ئەیلول کردو هەر لەمنداڵییەوە لەحزبەکەی باوکم دوورکەوتمەوە، چوومە بەرەی نەیارانی حزبەکەی باوکمەوە.

**بژێوی:**

من کوڕە گەورەی ماڵەوە بووم، سێ براکەی ترم لەمن بچوکتر بوون، هەمووومان قوتابی بووین، بەبێ هاوکاری، توانای بەردەوامی خوێندنمان نەبوو، هەمو ساڵێک خزمەکانمان لەزەویەکی خۆماندا، چەند دۆنمێک زەویان بەگەنم بۆ دەچاندین، بەرهەمی گەنمەکە بەشی ئەوەی دەکرد، ساڵانە بیکەین بەئارد، نانی خۆمانی پێ دابین بکەین.

بەرهـەمهێنانی تـوتن لەئیشـی گـەنم ئاسـانتربوو، تـوتن لەپشـوی هاوینـەی قوتابخانـەدا، کـاری لەسـەر دەکـرا، کاتێـک کـە پشـووی هاوینـەی قوتابخانـە دەهـات، بـەخۆم و براکـانم، سـاڵانە چەنـد دۆنمێـک زەویمـان بـۆ تـوتنکردن بـەکاردەبرد، لـەپایزدا بەرهەمەکـەیمان دەفرۆشـت، لـەوێش هەنـدێک پارەمـان دەستدەکەوت، بەشێکی تری پێویستیەکانی ژیانمان پێدابین دەکرد.

شۆڕشی ئەیلول، بەدوو شێوە هاوکاریی دەکردین، هاوکاری یەکەم مانگی چوار دینار بوو، لەئابوونەی ڕێکخراوی هەورامانی پدک بۆمان کۆدەکرایـەوە. کادرێکی ڕێکخراوی پارتی هەبوو، ناوی حەبیبی کادر بوو، پیاوێکی کەڵەگەتی مشـکی بەسـەری کولـەباڵ لەبـەری باڵابـەرزی روخۆشـی سـورو سـپی بـوو، خـــەڵکی بیـــارە بـــوو، تفـــەنگێکی هۆڵەنـــدی لەشـــاندا بـــوو. بەرپرســـی ڕێکخستنی گوندەکانی ناوچەی هەورامان بوو، هەموو سەری مانگێک گەشتی ڕێکخسـتنی دەکـرد، کۆبوونـەوەی بەئەنـدامانی پـارتی ئـەو گوندانـە دەکـرد، ئابوونـەی لێوەردەگرتن، کاتێک لەسـەرگەت و دەرەیمـەڕ دەگەڕایـەوە، لەگـەڵ ئەندامە پارتیەکانی گوندی گوڵپ کۆبوونەوەی دەکرد. بەرپرسـی ڕێکخسـتنی گوندی گوڵپ پیاوێکی روخۆشی لەسـەرخۆ بوو، نـاوی مـەحمودی مینـە بـوو، دواتـر سـەردانی مـاڵی خـوای کـردو نـاوی گـۆڕا بـەحاجی مـەحمود، کاتێـک حەبیبی کادر دەگەیشتەوە گوڵپ، لەگـەڵ مـەحمودی مینـە کۆدەبووەوە، چـوار دینارەکەی بۆ ئێمە دەنارد.

شێوەکەی تری هاوکاری شۆڕشی ئەیلول، سەرانەی نانەواخانەکەی گوڵـپ بوو، گوڵپ نانەواخانەیەکی لێبوو، موڵکی خاڵی دایکم بوو، پێش ئـەوەی بـاوکم شـەهید بێت، پێش ئـەوەی سـەرانە لـەخاڵۆ حەمـەڕەزا بسـێنین، کـە دەچوومـە نانەواکـەی، خـاڵۆ حـەمەڕەزا هـەموو گیـانی بـۆ دەکـردم بەپێکـەنین، بـەخۆڕایی کـولێرەی دەدامـی، بـەڵام لەوکاتـەوە کـە شـۆڕش بڕیاریـدا خـاڵۆ حەمـەڕەزا مانگانە چەند دینارێک بەئێمە بدات، خاڵۆ حەمەڕەزاو مناڵـەکانی، وەک دوژمـن سـەیریان دەکـردین. ئـەو ماوانـەی سـەرانەی نانەواخانەکـەمان وەردەگـرت، بەڕێکەوت چەندجارێک بەنزیک مالی خاڵۆ حەمەڕەزادا تێپەڕیم، خـوا دەزانێـت ژنەکـەی و کچەکـەی چیـان پێدەوتین، هـەرچی خـراپ بـوو، بەرامبـەر بەئێمـە

بەدەمیاندا دەهات، بیرم نایەت پارەکەمان چۆن پێدەگەیشت، بەڵام ئەو پارەیە لێماندەبوو بەژەهری مار. منداڵێکی بزێو بووم، قسەی نابەجێم قبووڵ نەدەکرد، بەڵام هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی وەڵامی قسەکانی خاڵۆژن و کچەکەی بدەمەوە، لەبەرئەوەی هەستم دەکرد، ئەو سەرانەیەی لەنانەواخانەکەی خاڵۆ حەمەڕەزا وەریدەگرین، رەوایەتی تێدا نییە.

دەتوانم بڵێم لەدوای شەهیدبوونی باوکم، تا گفتوگۆی ١١ ئازاری ساڵی ١٩٧٠ باری ئابوریمان خراپ نەبوو، حزب و شۆڕش لێیان دەپرسینەوە، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی رێکەوتنی یانزەی ئازارو زیادبوونی پێویستی ئێمە بۆ خوێندن و هاتنەپێشەوەی خەڵکی نوێ و هەلپەرست بۆ ناو شۆڕش و حزب، هەڵوێستی بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلول، بەرامبەر بەبنەماڵەی شەهیدانی وەک ئێمە، بەخراپی گۆڕانی بەسەردا هات و فەرامۆش کراین.

دوای بەیانی ١١ ئازار، هاوکارییەکەی حزب و سەرانەکەی خاڵۆ حەمەڕەزا بڕان، لەباتی ئەوە مووچەی شەهیدانەی حکومەتی عێراقمان وەردەگرت، شەهیدانەکە کەم بوو، بەگوێرەی یاسا، بڕێک لەو شەهیدانەیە، بۆ دایک و باوکی باوکم دەگەڕاییەوە، هەندێکی بۆ ئێمە دەمایەوە، خەرجی ئێمەش زۆر ببوو، لەبەرئەوە شەهیدانەکە بەشی نەدەکردین، دووچاری کێشەی دارایی بووین.

# ٢
# هەڵوێستەکانی منداڵیم

**تاوانەکانی عەبدولوەهاب ئەتروشی**

دوای شەهیدبوونی باوکم، بەپرسەکانی هێزی پێشمەرگە، جارجار سەردانیان دەکردین و هاوکارییان دەکردین، دوای ساڵی ١٩٦٤ ، کە لێکترازانی سیاسی و دووبەرەکی لەناو ڕیزەکانی شۆڕشدا دروستبوو، زۆربەی بەرپرسەکانی ئەو دەمەی ناوچەی هەورامان، لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی بوون، لە پدک جیابوونەوە، ناوچەی هەورامانیان بەجێهێشت.

وەک منداڵێک کە باوکی شەهیدبێت، پێشمەرگەم خۆشدەویست، کە پێشمەرگە دەهاتنە گوڵپ، لێیان نزیک دەبوومەوە، حەزم بەتێکەڵاویان دەکرد، بەڵام ئەو بەرپرسە نوێیانەی پێشمەرگە کە هاتنە ناوچەکە، لەگەڵ بنەماڵەی شەهید حەمە گوڵپیدا ساردبوون.

جارێکیان لقی کەمال هاتە گوڵپ، لەسەربانی چایخانەکەی گوڵپ، لەسێبەری دارتوەکەدا دانیشتبوون، منیش لەنزیکیانەوە دانیشتم، لەکەمال ورد دەبوومەوە، کەمال گوێی بەکەس نەدەدا، هەر باسی پاڵەوانێتی خۆی دەکرد، لەو تەمەنەدا حەزم بەو هەڵسوکەوتانەی نەدەکرد.

دوای ماوەیەک بۆ کارێکی تایبەت لەگەڵ دایکم سەردانی بیارەمان کرد، سەردانی کەمالمان کرد، دایکم داوای لێکرد لەکارێکدا هاوکاریمان بکات، کەمال زۆر بێزاربوو، بڕوای بەهیچ نەمابوو، لەبەرچاوی خۆم، بەدایکمی وت: واز لەو داواکارییە بێنە، برۆ بۆ خۆت شوویەک بکە. بەو قسەیە زۆر نیگەران بووم.

پاش ماوەیەک هەواڵی یاخیبونی کەمالی سەرلق و رەشەی ساڵحەی سەرپەل بڵاوبووەوە، وا باس دەکرا کە لەنێوان کەمال و عەبدولوەهاب ئەتروشیدا، کێشە دروستبووە، کەمال لەدژی عەبدولوەهاب یاخی بووە. عەبدولوەهاب داوای لەکەمال و هاوڕێکانی کرد، ئەگەر واز لەیاخیبون بێنن و بگەڕێنەوە، سەرکردایەتی شۆڕش دەیانبەخشێت.

کەمال بڕوای بەقسەکەی عەبدولوەهاب کرد، گەڕایەوە بۆ بیارە، رەشەی ساڵحە خەڵکی گوندی خەرپانی بوو، لەلقەکەی کەمال سەرپەل بوو، بڕوای بەبەڵێنەکەی عەبدولوەهاب نەکرد، کەمالیشی ئاگادار کردبووەوە نەگەڕێتەوە، رەشەی ساڵحە پێیوابوو عەبدولوەهاب فێڵیان لێدەکات و دەیانکوژێت.

کەمال بەگوێی هاورێکەی خۆی نەکرد، دەستی لەیاخی بوون هەڵگرت، گەڕایەوە بۆ بیارەو خۆی تەسلیم کردەوە، هەر کە گەیشتەوە، عەبدولوەهاب زیندانی کرد، پاش ماوەیەک بارەگای بارزانی داوای گواستنەوەی کەمالیان کرد بۆ زیندانی سەرکردایەتی، لەکاتی گواستنەوەیدا، بروسکەیەکی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول هات، داوای دەکرد کەمال بکوژن، عەبدولوەهاب لەناوچەیەکی سنوری پێنجوێن کەمالی کوشت.

کەمال کوژرا، رەشەی ساڵحە لەسەر یاخیبوونەکەی بەردەوام بوو، کە بینی عەبدولوەهاب بەبڕیاری سەرکردایەتی کەمالی کوشت، رەشەی ساڵحە پەیوەندی بەحکومەتی عێراقەوە کرد، بوو بەیەکێک لەسەرۆک جاشە رق لەدڵەکانی ئەو سەردەمە، لەسەدان شەڕو کەمین دانانـدا، دژی هێزی پێشمەرگە بەشداری کرد.

باوکی کەمال ناوی ئەحمەد بوو، بە(ئەحە روش) ناسرابوو، بەپیاوێکی ئازاو چاو نەترس ناوی دەرکردبوو، عەبدولوەهاب زۆر دەترسا لەتۆڵەی

کوشــتنی کوڕەکەیـدا، ئەحــە روش بیکوژێــت و تــۆڵە بکــاتەوە، بۆیــە دوای کوشـتنی کـەمال، عەبـدولوەهاب بـاوکی کەمـالی زینـدانیکرد، پـاش ماوەیـەک ئەویشی کوشت. عەبدولوەهاب کەسێکی پیاوکوژ بوو، خـەڵکی زیندان دەکرد، بەبێ لێکۆڵینەوەو دادگاییکردن، پاش ماوەیەک دەیکوشت.

ماوەیەک دوای کوشتنی کەمال و باوکی، دوو کەسی تری خـەڵکی بیارەی کوشت، بەهۆکاری ئەوەی کوڕی یەک لەو پیاوانە، رومانەی خستۆتە ناو ماڵی بەرپرسێکی پێشمەرگە، ئەو گەنجەی کە رومانەکەی هاویشتبوو، رایکرد بۆ لای جەلالییەکان، نەکەوتـە دەسـت عەبدولوەهاب، لـەباتی کوڕە هەڵهاتووەکە، عەبــدولوەهاب بــاوک و مــامی کوڕەکــەی زینــدانیکرد، دوای ماوەیــەک هەردووکیانی کوشت.

لەبەرامبــەر تاوانــەکانی عەبدولوەهابـدا خــەڵکی ناوچــەی هەورامــان زۆر نیگــەران بــوون، بــەڵام نەیانــدەتوانی ســنوورێک بــۆ کردەوەکــانی دابنــێن، رۆشنبیرانی ئەوکاتەی ناوچەی هەورامان، لەسەر کردەوەکانی عەبدولوەهاب، لەسـنورێکی تەسـکدا قسـەیان دەکـرد، مـن منـداڵ بـووم، مامۆسـتا ئیبـراهیم بەردەوام لەسەر تاوانەکانی عەبدولوەهاب قسەی بۆ دەکردین، دەیوت نابێت بەناوی شۆڕشی کوردەوە، تـاوانی وا ئـەنجام بدرێت، خـەڵکیش لەبەرامبەریدا بێدەنگ بێت.

**بارزانی و رۆژهەلاتی کوردستان :**

سیاسـەتی داگیرکەرانی کوردسـتان، بەرامبـەر بـەماف و ئازادییـەکانی گـەلی کـورد، سـتراتیجی و درێژخایەنـە، یـەک لەپایـە بنەڕەتییـەکانی ئـەو سیاسـەتە، دروستکردنی دووبەرەکی و بەشەڕدانی شۆڕشگێڕانی پارچەکانی کوردستان بـووە. لەسـەردەمی کۆمـاری کوردسـتاندا، ئەوکاتـەی مـەلا مسـتەفا بـارزانی، بەهێزێکـەوە لەباشـوری کوردسـتانەوە، بـۆ پشـتیوانی شۆڕشــی رۆژهــەلاتی کوردسـتان، بـەرەو مـەهاباد بـەڕێکەوت، رژێمـی شاهنشـاهی ئێران، هەوڵیدا، بــارزانی بــەلای خۆیــدا ڕابکێشــیت، بۆئــەوەی دژی کۆمــاری کوردســتان بـەکاربهێنێت، ئەوکاتـە بـارزانی، بەداواکارییەکـەی شـای ئێـران رازی نەبـوو،

بەخۆی و هێزەکەیەوە، پشتیوانی کۆماری کوردستانی کرد، بەرنامەکەی ئێرانی جێبەجێ نەکرد.

دوای رووخانی کۆماری کوردستان، جارێکی تر ئێران داوای لەبارزانی کرد، ببێتە هاوکاری شای ئێران، دژی رۆژهەلاتی کوردستان کاربکات، ئەمجارەش بارزانی بەداواکەی ئێران رازی نەبوو. کاتێک بارزانی لەسنوری عێراق-ئێران- تورکیا نزیکبووەوە، عێراق و تورکیا داوای خۆبەدەستەوەدانیان لێکرد، بارزانی سەری بۆ سیاسەتی حکومەتی تورکیاو حکومەتی عێراق دانەنەواند، لە ئاوی ئاراس پەڕییەوە، لەیەکێتی سۆڤیەتی جاران مافی پەنابەری وەرگرت، تا بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ عێراق، لەیەکێتی سۆڤیەت مایەوە[٧].

کە شۆڕشی ئەیلول دەستپێکرد، هەڵویستی مسەتەفا بارزانی، بەرامبەر بەشۆڕشی گەلی کورد، لەپارچەکانی تری کوردستاندا گۆڕانی بەسەرداهات، کەوتە ناو داوی، سیاسەتی حکومەتی ئێرانەوە.

ساڵی ١٩٦٧ لەرۆژهەلاتی کوردستان، حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) چالاک کرایەوە، دەستی بەبزوتنەوەیەکی سیاسی و چەکداری کرد، بەبیانوی ئەوەی ئێران دۆستی شۆڕشی ئەیلولە، بارزانی سنوری بۆ چالاکی سیاسی و پێشمەرگانەی حدکا دانا، لەژێر کاریگەری سیاسەتی بارزانیدا، هەندێک لەبەرپرس و تێکۆشەری رۆژهەلاتی کوردستان، لەدژایەتیکردنی رژێمی شای ئێران، ساردبوونەوە، پەیوەندییان بەشۆڕشی ئەیلولەوە کرد، ئەحمەد تەوفیقی سکرتێری حدکا و هەژار موکریانی شاعیر، کەوتنە ژێر کاریگەری سایسەتی بارزانی و دەستیان لە خەباتی رۆژهەلاتی کوردستان هەڵگرت.

ژمارەیەک لەتێکۆشەرانی تری رۆژهەلاتی کوردستان، بڕوایان بەو بیانوانەی بارزانی نەکرد، درێژەیان بەخەباتدا. ئەو چالاکوانە سیاسییانەی رۆژهەلاتی کوردستان، کە درێژەیان بەخەباتی سیاسی دا، بارزانی دەستی

---

٧ عەلائەدین سوجادی، مێژووی راپەرینی کورد، لاپەرە١٤١-١٥٩ ، چاپخانەی مەعاریف-سەقز ساڵی ١٩٥٩.

بەدژایەتییان کرد، لەلایەن بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلولەوە کرانە ئامانج، سەرەتا سولەیمانی موعینی دەستگیرکراو شەهید کرا. لەناوچەی هەورامان، عەبدولوەهاب ئەتروشی مەلا ئاوارەی دەستگیرکرد، ویستی رادەستی رژێمی ئێرانی بکاتەوە، مەلا ئاوارە داوای لێکردن، خزمەتێکی سادەی بکەن، لەباتی ئەوەی رادەستی رژێمی ئێرانی بکەنەوە، بیکوژن. عەبدولوەهاب داواکەی مەلا ئاوارەی جێبەجێکرد، لەنێوان تەوێڵەو شۆشمێدا، مەلا ئاوارەی شەهیدکرد.

چالاکوانێکی تری سیاسی رۆژهەڵاتی کوردستان، ناوی قادر شەریفی بوو، عەبدولوەهاب زۆر هەوڵیدا دەستگیری بکات، تا رادەستی ئێرانی بکاتەوە، بەڵام ئەو کارەی بۆ جێبەجێنەکرا، بۆیە پیاوکوژێکی ناردە سلێمانی، بەدەمانچە، قادر شەریفی شەهید کرد.

هەڵویستی سەرکردایەتی پارتی و شۆڕشی ئەیلول، دژی شۆڕشگێرانی رۆژهەڵاتی کوردستان، یەکێک لەهۆکارەکانی تربوو کە لەمنداڵییەوە لەپارتی دوورکەوتمەوە.

**جەلالی و مەلایی:**

ساڵی ١٩٦٤ لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، دووبەرەکی لەناو پدک دا دروستبوو، باڵی مەکتەبی سیاسی بەسەرۆکایەتی سکرتێری پارتی، ئیبراهیم ئەحمەد، کە زۆرینەی توێژی رۆشنبیرو خەڵکی ناوچەی سۆرانی لەگەڵ بوو، لەکۆنگرەی ماوەتدا جیابووەوە، لەئەنجامی پارچەبوونی پدک دا، هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلولیش دابەشبوو، بارزانی ئەو جیابوونەوەیەی باڵی مەکتەب سیاسی پێهەرس نەکرا، هێزێکی کۆکردەوە، هێرشی کردە سەر بارەگای مەکتەب سیاسی لە ماوەت، باڵی مەکتەبی سیاسی بەرگەی هێرشی هێزەکەی بارزانی نەگرت، بەرەو سنوری ئێران هەڵهاتن، خۆیان رادەستی ئێران کرد.

بارزانی لەئێران شوێنیان کەوت، شەڕی سیاسی لەگەڵ کردن، دڵی حکومەتی ئێرانی لێکرمێ کردن، بۆیە باڵی مەکتەبی سیاسی ناچاربوون، بگەڕێنەوە کوردستان، ژمارەیەکیان وەک عەلی عەبدوڵڵاو نوری شاوەیس،

لەگەڵ بارزانی ئاشتبوونەوە، لە ناو پدک دا، دەستیان بەتێکۆشان کردەوە. ژمارەیەکی تریان وەک ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی، بڕوایان بە بەڵێنەکانی بارزانی نەکرد، لەگەڵ حکومەتی عێراق ڕێکەوتن، لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقدا، وەک پارتی شۆڕشگێر، دەستیان بەکاری سیاسی و سەربازی کرد.

لەبەر هەژموونی مستەفا بارزانی، بەسەر باڵی ڕاستڕەوی پدک دا، ئەو باڵە بە ناوی مەلا مستەفاوە دەناسرا، پێیان دەوت مەلایی. لەبەر هەژموونی جەلال تاڵەبانی بەسەر باڵی چەپڕەوی پدک دا، ئەو باڵەش بەناوی مام جەلالەوە دەناسرا، پێیان دەوت جەلالی.

هەردوو باڵی پدک، کە ناوی مەلایی و جەلالیان لێنرا، هێزی چەکداریان هەبوو، شەڕی نێوان هەردوو باڵەکە دەستیپێکرد، بە شەڕی جەلالی و مەلایی ناسراوە.

لەمێژووی نوێی تێکۆشانی گەلی کوردا، ئەو شەڕە ناوی شەڕی براکوژی لێنرا، لەساڵی ١٩٦٦، تا بەیانی ١١ ئازار ١٩٧٠درێژەی کێشا، هەزاران ڕۆڵەی کوردی بێتاوان، لەو شەڕەدا شەهیدو بریندار بوون، ئەو شەڕە چارەسەری دۆزی ڕەوای گەلی کوردی دواخست، لەڕووی ئابوورییەوە کوردستانی وێرانکرد، لەڕوی کۆمەڵایەتییەوە، دوژمنایەتی لەناو کۆمەڵگەی کوردستاندا درووستکرد، تا ئەمڕۆش ئاسەواری نەرێنیی ئەو شەڕە، لەهزری خەڵکی کوردستاندا نەسڕاوەتەوە، لەکات و شوێنی جیاوازدا، ئەو شەڕە بەشێوەی جیاجیا خۆی دووبارە دەکاتەوە.

شەڕی جەلالی و مەلایی، نزیکەی چوار ساڵی خایاند، ناوچەی هەورامان و شارەزوریشی گرتەوە، جەلالییەکان بەپشتگیریی سەربازی و لۆجستی سوپای عێراق، هەوڵیاندەدا، دەست بەسەر ئەو ناوچانەی هەوراماندا بگرن، کە لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلولدا بوو، چەند جارێک هێرشیان بۆ ناوچەی هەورامان کرد، هەرچی بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلول بوون، کە دەیانبینی توانای مرۆیی و سەربازی خۆیان بەشی وەڵامدانەوەی

جەلالییەکان ناکات، هاوکاریی مرۆیی و سەربازی و لۆجستیان، لەئێران وەردەگرت، دژی جەلالییەکان بەکاریان دەهێنا.

لەسنوری هەڵەبجەو شارەزور، مەلاییەکان لاواز ببوون، زۆرجار هێرشی جەلالییەکان لەناوچەی هەورامانی قەڵای مەلایی نزیک دەبووەوە، بەڵام لەبەر سەختی ناوچەکە، لەبەر هاوسنوری ناوچەکە لەگەڵ ئێراندا، هێرشی جەلالییەکان، لەسنوری هەوراماندا شکستی دەخوارد.

رۆژێکیان جەلالییەکان هێرشیان بۆ سەر گوڵپ هێنا، گەیشتنە دامێنی گوندەکە، شەڕ دەستیپێکرد، جەلالی لەدامێنی گوند، لەخوار باخەکانی گوڵپەوە تەقەیان دەکرد، مەلایی لەسەر بەرزاییەکەی گوڵپ، کە پێیدەوترێت قەڵاتێ، تەقەیان لەجەلالییەکان دەکرد، بۆماوەی چەند کاتژمێرێک، گوند کەوتە ژێر ئاگربارانی جەلالی و مەلایی، تا ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو، زۆربەی فیشەکەکان بەسەر سەری خەڵکی گوڵپدا تێدەپەڕین، خەڵکی گوند لەناو خانوەکاندا مانەوە، خۆیان لەشەڕەکە پاراست، من و چەند منالێک نەچووینە ماڵەوە، لەبن دیواری خانووەکانی گوڵپدا خۆمان حەشاردابوو، سەیری شەڕەکەمان دەکرد، ئێوارەی ئەو رۆژە مەلاییەکان لەبیارەوە هێزیان بۆ هات، جەلالییەکان پاشەکشەیان کرد.

ئەو رۆژە گولەیەکی وێڵ[8] بەر ملی دایکم کەوت، وزەی تیانەمابوو جەستەی ببڕێت، تەنها کەمێک پێستی ملی سوتاند، بێجگە لەو برینە سووکەی دایکم، کەس لەشەڕەکەدا زیانی بەرنەکەوت، لایەنە شەڕکەرەکانیش، بەبێ زیان بۆ بنکەکانی خۆیان گەڕانەوە.

**ئەگەر جەلالی بێت من کوشتوومە:**

شەڕەکەی گوڵپ کۆتاییهات، پێشمەرگەکانی ناوچەی هەورامان، دستیان بەقایمکردنی شاخ و گردۆڵکەکانی نێوان گوڵپ و شارەزور کرد، بۆئەوەی رێگە لەئەگەری هێرشی تری جەلالییەکان بگرن. رۆژێکیان لەبیارەوە

---

٨ گولەی وێڵ : واتە ئەو گولەیە ئاراستەی ئەو کەسە نەکراوە، بە رێکەوت بەریکەوتوە.

ڕەشاشێکی دۆشکەیان هێنا، ئەوە یەکەمجاربوو پێشمەرگە ببێتە خاوەنی دۆشکە، منالآنی گولّپ لەدۆشکەکە نزیکبووینەوە، عەدەد دۆشکەکە ناوی شێخ نووری بوو، چەند پێشمەرگەیەکی تری لەگەڵدا بوو. هێندە لەگولّپ نەمانەوە، دۆشکەکەیان لەپشتی ولآخێک بارکرد، بەرەو سێتەپان[9] ڕۆیشتن، ئیمەش شوێنیان کەوتین. شێخ نووری دەستی بەتەقەی کوێرانە کرد، لەهەر شوێنێک تارماییەکی بدیبایە، بەدۆشکەکە تەقەی لێدەکرد، دوربینیشی پێبوو، جارجار بەدوربینەکەی سەیری ئەو شوێنانەی دەکرد کە فیشەکی پێوە دەنا، لەگەڵ تەقەکردندا دەیوت، ئەگەر ئەو تارماییە جەلالی بێت، ئەوە من کوشتومە، ئەگەر ئەو تارماییە هاولآتی بێت، ئەوە من نەمکوشتوە، ئێمەش بەو قسانەی شێخ نوری پێکەنین دەیگرتین. لەوکاتەوە جیاوازیی نێوان مەرگی هاولآتی و مەرگی کەسی چەکدار لەشەڕدا، لەناو هزرمدا جێگیربووە.

ماوەیەکی نەبرد هەواڵ بلآوبووەوە، کە عەبدولوەهاب ئەتروشی شێخ نوری زیندان کرد، پاش ماوەیەک شێخ نوری ڕەمی کرا، بەلآم نەمانزانی شێخ نوری لەبەرچی کوژراوە، من لای خۆمەوە بۆ مەرگی ئەو عەدەد دۆشکە ڕووخۆشە، زۆر نیگەران بووم، هێندەی تر ڕقم لەعەبدولوەهاب ئەتروشی هەستا.

**چریکی ئێران[10]:**

مەلاییەکان کە بینیان ئەگەری هێرشی جەلالییەکان بۆ سەر ناوچەی هەورامان زۆربووە، هێزەکەی خۆیان بەشی بەرگری ناکات، هێزێکی گەورەی چریکی ئێرانیان هێنا، بنکەی سەرەکی چریکەکان لەدەرەوەی گوندی گولّپ، لەسەر کانییەکەی چنازەرکێ بوو، چریکەکان قەڵەخانی بوون، سمێڵیان گەورە بوو، بەشێوە زمانی کرماشانی قسەیان دەکرد. ڕۆژانە لەگەڵ منالّەکانی گولّپ،

---

٩ سێتەپان: سێتەپان سێگردی بەدەم یەکەوەیە، لەبەردەمی گولّپدا یە، بەسەر دەشتی شارەزورو گوندەکانی ئاوایی ڕۆستەم بەگ و دێکۆندا دەڕوانێ ، بۆ پاراستنی گولّپ و ناوچەی هەورامان، شوێنێکی ستراتیجی بوو.

١٠ چریک هاوشێوەی جاشی عێراق بوون.

سـەردانی چریکـەکانمان دەکـرد، بێجگـە لەسـمێڵە زلـەکانیان و جـۆری قسـەکانیان، ئـەو برنجـەش کـە لێیانـدەنا، جێی سـەرنجی خـەڵکی گونـد بـوو، لەمەنجـەڵی زۆر گـەورەدا، بـەئاگری دار برنجیـان لێدەنا، لێواری سـەرقاپی مەنجەڵەکـەیان بەهـەویر دەگـرت، برنجـەکـە زۆر بـەتام بـوو، زۆربـەی کـات لـەنانخواردنی نیـوەڕۆدا، منـداڵانی گوڵـپ میـوانی چریکـەکان بـووین، دەمـە کەوگیرێک برنجیان دەداینێ و دەمانخوارد.

پـاش ماوەیـەک چریکـەکان گوڵپیـان بەجێهێشـت، ڕۆژێکیـان هـەواڵ بڵاوبـووەوە، جەلالییەکـان لە نزیـک هەڵەبـجە، دەسـتیان بەسـەر بنکەیەکـی پێشمەرگەدا گرتووە، لەو بنکەیەدا ژمارەیەک چریکی ئێرانی لێبووە، هەندێکیان کوژرابوون، ژمارەیەکیش دەستگیرکرابوون، دیلەکانیان بەبەندی بـەناو شـاری هەڵەبجەدا گێڕا، بۆئەوەی نیشانی بدەن، مەلاییەکان پیاوی ئێرانن.

**فاخر مێرگەسووری:**

لەشەڕی کوشتن و بەدیلگرتنی چریکە ئێرانیەکاندا، مەلاییـەکان شکستیان خـوارد، لـەڕووی سـەربازی و سیاسـی و جەماوەرییـەوە، کاریگـەری نەرێنیـی لەسـەر مەلاییەکان بەجێهێشت، بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی هێرشـی جەلالییـەکان، بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلول، پەنایان بۆ تـاکتیکێکی تـر برد. هێزێکی تایبـەتی پێشمەرگەی ناوچەی بارزانیان هێنا، فاخر مێرگەسـوری بەرپرسـی ئەو هێـزە بوو، بارەگای هێزەکە لەگوڵپ بوو، هێزەکەی فاخر، دۆشکەیەکی دژە ئاسمانی هێنـابوو، لـەنێوان نارنجڵـەو گوڵپـدا دایانمەزرانـد، ئـەو دۆشـکەیە چەنـد پێشـمەرگەیەکی ئـازای لەسـەر بـوو، ئێـوارە نـەبوو فڕۆکـەی سـوپای عێـراق هێرش نەکاتـە سـەر ناوچـەی هـەورامان و دۆشکەکە ڕووبـەڕووی فڕۆکـەکان نەبێتەوە، دیمەنێکی سەربازی جوانیشی بۆ ئێمەی بینەر دەنەخشاند.

فـاخر مێرگەسـوری برایـەکی هـەبوو نـاوی عـەلۆ بـوو، عـەلۆ بەرپرسـی کارگێڕی هێزەکە بوو، هـەر ئێوارەیـەک هێزەکە لە ئەرکدا نەبوایـە، دنیـا ئـارام بوایە، پێشمەرگەکان لەحەوشەی قوتابخانەکەی گوڵپدا، دەستیان بـەگۆرانی و

هەڵپەڕکێی بادینانی دەکرد، لەکاتی گۆرانی و هەڵپەڕکێدا، زۆرترین خەڵک بۆ سەیرکردنیان دەهات، منیش لەو کاتەوە، زۆر حەزم لەهەڵپەڕکێی بادینییە.

هێزە تایبەتەکەی فاخر مێرگەسوری، پارسەنگی هێزی بەلای مەلاییەکاندا شکاندەوە، وەک جاران جەلالییەکان بۆیان نەدەکرا هێرش بکەن، هێرشەکان پێچەوانە بوونەوە، پێشمەرگەی مەلایی دستیکرد بەهێرش بۆ سەر بنکەی جەلالییەکان، چەندینجار بە چاوی خۆم بینیم کە هێزەکەی فاخر، بەرەو شارەزور دەچوو، بەهاوەن بۆردومانی سەنگەرو بنکەی جەلالییەکانی دەکرد.

لەساڵانی دواییدا، فاخر مێرگەسوری و بنەماڵەکەی، لەلایەن بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلولەوە دەستگیرکران، دوای هەرەسی ئازاری ١٩٧٥، فاخر مێرگەسوری و باوکی و براکانی، لەلایەن بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلولەوە، شەهید کران.

**تۆپبارانی هەڵەبجە:**

لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییدا بووم، بۆ تاقیکردنەوەی بەکەلۆری، چووم بۆ هەڵەبجە، ئەو ماوەیەی لەهەڵەبجە بووم، لەماڵی پووری باوکم مامەوە، ماڵیان لەگەڕەکی کانی عاشقان بوو، یەک لەکچەکانی پوورم، ماڵی لەگەڕەکی سەرا بوو، هەموو ئێوارەیەک ماڵی خۆیانی چۆڵدەکرد، دەهاتن لە گەڕەکی کانی عاشقان دەمانەوە، تا بەر هێرشی تۆپبارانی پێشمەرگە نەکەون. شەوانە پێشمەرگەکان لەشاخی شنرویەوە، گەڕەکی سەرای هەڵەبجەیان تۆپباران دەکرد، لەبەرئەوەی فەرمانگەکانی حکومەت، ماڵی بەرپرسەکانی جەلالی، لەگەڕەکی سەرای هەڵەبجە بوون.

دواتر بۆم رونبووەوە، کە لەماوەی رابوردوودا، بەهۆی تۆپبارانی پێشمەرگەی مەلاییەوە، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی مەدەنی هەڵەبجە شەهیدبوون، گۆڕستانێکی تایبەتیان بۆ دروستکردوون، ناوی نراوە گۆڕستانی شەهیدان.

عەزیز ئەتروشی، فەرماندەی تۆپخانەی پێشمەرگەی مەلایی بوو، لەتۆڵەی تۆپبارانەکانی هەڵەبجە، شەوێکیان جەلالییەکان، لەکردەیەکی پارتیزانیدا،

خۆیان گەیانده سەر شاخی شنروێ، دەستیان بە سەر سەنگەرەکەی عەزیز ئەتروشیدا گرت، هەر لەوێدا عەزیز ئەتروشیان کوشت، ئەو چالاکییەی جەلالییەکان دەنگیدایەوە، خەڵکی هەڵەبجەش بەو چالاکییە دڵخۆشبوون، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی کە تۆپبارانی دەکردن، بەسزای گەل گەیشت.

**گەڕەکی مەڵکەندی:**

لە قوتابخانەی گوڵپ خوێندنی سەرەتاییم تەواوکرد، بۆ دەستپێکردنی قۆناغی خوێندنی ناوەندی، لە سلێمانی لە ماڵی مام حەمەشەریفم بووم، ماڵی مامم لەگەڕەکی مەڵکەندی نزیک شەقامی ئیبراهیم پاشا بوو، لەخانویەکدا ژورێکیان بەکرێ گرتبوو، لەو خانووەدا بەخاوەن ماڵەوە، سێ ماڵی تێدا دەژیان. خاوەن ماڵەکە ناوی محەمەدی کاشی بوو، خێزانەکەشی ناوی رابعە بوو، بەکاک محەمەدو باجی رابعە بانگمان دەکردن، ئەو ژن و پیاوە، لەناو خۆیاندا زۆر تەباو گونجاو بوون، پەیوەندییەکی باشیشیان لەگەڵ ماڵی ماممدا هەبوو، لەگەڵ منیشدا زۆر باش دەجووڵانەوە، مناڵێکیان هەبوو ناوی رزگار بوو، مامیشم کوڕیکی هەبوو ناوی سەلام بوو، هەردوو کوڕەکە لە من مندالتربوون، رابعە و محەمەد، هێندەی مناڵەکەی خۆیان، من و سەلامیان خۆشدەویست. دەیانزانی من باوکم شەهیدە، بەردەوام بەزەردەخەنەو پێکەنین و قسەی خۆش، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردم، هەواڵی قوتابخانەو نمرەی وانەکانیان لێدەپرسیم، هانیان دەدام باش سەعی بکەم و هاوکارییان دەکرم.

**تۆ زەلامیت یان هەورامیت ؟ :**

ساڵی ١٩٦٩پۆلی شەشەمی سەرەتاییم تەواوکرد، لەقوتابخانەی ناوەندی شۆڕش، لەسلێمانی وەرگیرام، قوتابخانەی شۆڕش لەگەڕەکی کانی ئاسکان بوو، ماڵی مامم لەگەڕەکی مەڵکەندی بوو، کاتێک چوومە قوتابخانەی شۆڕش، هەندێک قوتابیم ناسین، ماڵیان لەمەڵکەندی بوو، پێکەوە دەچوین بۆ قوتابخانەو دەگەڕاینەوە.

لەکۆڵانی گەڕەکیشدا، ژمارەیەک هاوڕێم هەبوون، ئازادو موئەیەد نزیکترین هاوڕێم بوون، ئازاد خەڵکی سلێمانی بوو، موئەیەد خەڵکی دهۆک بوو، باوکی کارمەندی حکومەت بوو، لەسلێمانی دەژیان. ناکۆکی ناوچەیی و شێوەزار لەنێوان من و ئازادو موئەیەددا نەبوو. ئێوارەیەکیان درەنگ لەقوتابخانە گەڕامەوە، گەیشتمەوە نزیک ماڵی مامم، مناڵەکانی گەڕەکم بینی وەک ڕۆژانی تر بە ئارامی دانەنیشتبوون، شپرزە دەهاتنە بەرچاوم، پێش ئەوەی بگەمە لایان، ئازاد بانگی کردم، وتی:

ئەری تۆ زەلامی یان هەورامیت؟ ، موئەیدیش هەندێک گاڵتەی بەهەورامی کرد، لەدڵی خۆمدا وتم: بەخوا ئەمڕۆ سلێمانی و دهۆک گەلەکۆمەکێ لەهەورامان دەکەن، منیش بەرامبەر بەو قسە ناشیرینەی ئازاد، هەڵوەستەیەکم کرد و وتم:

هەرچی هەم هەستە وەرە ئێرە، بەڵام خۆم بۆ شەڕ ئامادە نەکردبوو، لەبەرئەوەی ئازاد هاوڕێم بوو، ڕۆژەکانی تر بەئاسایی هەڵسوکەتی لەگەڵ کردبووم، چۆن ئەمڕۆ بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات، وا هاوار دەکات، بەلامەوە سەیربوو، تێنەدەگەیشتم. پێشتر دیبووم کاتێک دوو کەس بیانویستایە شەڕ بکەن، کەمێک قڕەقڕیان دەکرد، جنێویان بەیەکدی دەدا، پاڵیاندەنا ئینجا پەلاماری یەکتریان دەدا، کەچی ئازادی دراوسێ، هاوڕێکەی دوێنێ، کە قەت بەبیرمدا نەدەهات ڕۆژێک لەڕۆژان شەڕم لەگەڵ بکات، کە من وتم هەرچی هەم هەستە وەرە ئێرە، یەکسەر بەرەو رووم هات، بەبێ پێشەکی، بێئەوەی یەک قسەی تر بکات، بۆکزێکی کێشا بەناو چاوانمدا، کە لێیدام منیش دەستمکردەوە، بەڵام تا من دەستمکردەوە، کار لەکار ترازابوو، کە چوومە ماڵەوەو سەیری ناوچاوانی خۆمم کرد، هێندەی هەڵماتێک ناوچاوانم هەڵئاوسابوو، دوای مانگێک ئینجا ئاوسانەکەی نیشتەوە.

ئیتر لەو ڕۆژەوە، فێری شەڕی بێ پێشەکی بووم، هەرکەسێک لەسلێمانی سووکایەتی بەهەورامی بکردایە، یان قسەیەکی بەرزو نزمی لەگەڵمدا بکردایە، بەقسەو جنێو وەڵامم نەدەدایەوە، بێ پێشەکی، وەک چۆن ئازاد لەمنی سرەواند، منیش لەوانەم دەسرەواند.

ئیتر لەوکاتەوە، من بەکەسێکی شەڕانی ناوم دەرکرد، لەقوتابخانەی ناوەندی، لەئامادەیی، لەکۆلێژی پزیشکیدا، لەپێشمەرگایەتیشدا، تا دوای راپەڕینیش هێشتا بەفەلسەفەکەی ئازاد وەڵامی ناحەزانی خۆمم دەدایەوە. دوای راپەڕین لەدوو کاتی جیاوازدا، بەهادین نوری و نەوشیروان مستەفا لەسەر رەفتارە توندەکەم رەخنەیان لێگرتم، منیش وردەوردە وازم لەو رەفتارە توندە هێنا.

ئەو لێدانەی ئازاد نەک فێری پەرچەکرداری توندی کردم، لەڕووی دەرونییەوە ئازاری زۆری دام، بەدوای هۆکاری لێدانی بۆکسەکەدا دەگەڕام، دوای گەڕان و لێکدانەوەش، بۆم روونبووەوە، کە هزری ناوچەگەری و شارچیەتی و خێڵایەتی، سەرتاپای ژیان و هەڵسوکەتی تاکەکانی کۆمەڵی کوردستانی گرتۆتەوە، خەڵکی شار بەبێ هۆکار، رقیان لەخەڵکی لادێ دەبێتەوە، سۆرانی بەبێ هۆکار رقی لەهەورامی و کرمانجی دەبێتەوە، هەورامی و کرمانجی بەبێ هۆکار رقیان لەسۆرانی دەبێتەوە، هەمووشیان رقیان مرۆڤ و سرووشت دەبێتەوە، ئەم رەفتارە ناشیرینانەی کۆمەڵی کوردستان، بەبەردەوامی لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە، زەق کراونەتەوە.

دوای رەفتارە ناشیرینەکەی ئازاد، چەندین جاری تریش، رووبەڕووی سوکایەتیکردن بەهەورامان و هەورامییەکان بوومەوە، چەندینجار بینیم کە خەڵکی ناوچەکانی ترو ئەو پێکهاتەو کلتورانەی، وەک هەورامی کەمینە بوون، سوکایەتیان پێدەکرێ و دەچەوسێنرێنەوە.

لەساڵانی داوییدا، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە بڵێم، پێشکەوتنی هەر تاک و پێکهاتەیەکی کوردستان، لەسەر هەڵویستی بەرامبەر هەورامی و ژن وەستاوە، لای هەر کەسێک باسی ژنت کرد، یان باسی هەورامیت کرد، ئەگەر زەردەخەنەی نەهاتێ، گاڵتەی پێنەکرد، ئەوکەسە تاکێکی دیموکرات و شارستانییە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو شەڕەدا فێری توندوتیژی بووم، بەڵام لەهەمانکاتدا، لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ، یەک لەهەڵویستە بنەڕەتییەکانی ژیانم، هەوڵدانە بۆ لاوازکردن و بنبڕکردنی هزری ناوچەگەری و شارچییەتی، لەبەرئەوەی بەدەردێکی کوشندەی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردستانی دەزانم.

**یەکێتی قوتابیان و پێشمەرگایەتی:**

لە پۆلی یەکی ناوەندیدا، چەند کەسێک هاوڕێم بوون، یەکێک لەوانە عەلی بوو، رۆژێکیان عەلی بانگی کردم، وتی:

بۆ لەناو ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان (یقک)دا ئیش ناکەیت، منیش بەبێ دوودڵی، رەزامەندیم نیشاندا، سەرەتا نەمدەزانی ئەو یەکێتی قوتابیانە سەر بەکێیە، دواتر کە بە ئەندام وەرگیرام و کۆبوونەوەیان پێکردم، دەرکەوت ئەوە یەکێتی قوتابیانی جەلالییەکانە، کاتێک تێگەیشتم کە یەکێتییەکەی من سەر بەجەلالییەکانە، لەدڵەوە نیگەران بووم، بەڵام هیچ پەرچەکردارم نیشان نەدا، دوای ئەوەی پەیوەندیم بە یقک کرد، چەوسانەوەی ناوچەگەریتی بەرامبەرم کەمبووەوە، ئەندامانی یقک داکۆکیان لێدەکردم و لەتانەو تەشەر دەیانپاراستم.

لەحەفتاکانی سەدەی بیستدا، عەلی و باوکی، بوون بەپێشمەرگەی شۆڕشی گوڵان، لەڕوداوێکی ناڕووندا، عەلی و باوکی (حەمە کۆڵنەدەر)، لەلایەن بەرپرسانی سەرکردایەتی کاتی پدک وە کوژران.

دوای عەلی، دلاوەری ئەحمەد مەجید پەیوەندیی پێوەکردم، دلاوەر هاوپۆلی خۆم بوو، دوای قۆناغی ناوەندی چەند جارێکی تر لەگەڵ دلاوەر یەکترمان بینیەوە، ساڵی ١٩٨٢ کە بوومە پێشمەرگە، دلاوەرم، لەپێشمەرگایەتیدا بینیەوە.

دوای دلاوەر، سەلاح رەشید بەرپرسیارێتی شانەکەمانی وەرگرت، کاتێک بووم بەپێشمەرگە، دەرکەوت سەلاح رەشید بەرپرسی پەیوەندییەکانی ینک-ە لەئەڵمانیا.

قوتابیەکی تر، لەپۆلی یەکی ناوەندیدا، هاوپۆلم بوو، ناوی سەلاح رانیەیی عەلی رەسوڵ بوو، لەبەرئەوەی باوکی ناوی رانیەیی بوو، ناوەکەی لەمێشکمدا جێی گرتبوو، تا ساڵی ١٩٨٢ کە بوومە پێشمەرگە، سەلاحم نەبینیەوە، رۆژێک لەنەخۆشخانەی شەهید دکتور بەختیار خەریکی پشکنینی نەخۆش بووم، چەند پێشمەرگەیەک هاتن بۆ نەخۆشخانە، یەکێکیان بەمام سۆران بانگ دەکرا، لەو مام سۆرانە وردبوومەوە، سەیرم کرد ئەوە سەلاح رانیەیی عەلی رەسوڵە، لێی نزیک بوومەوە، وتم:

کاکە تۆ سەلاح رانیەیی عەلی رەسوڵ نیت، سەرەتا دەیویست بڵێت ئەو نییم، کەمێک وەستاو وتی: تۆ کێیت؟ وتم: من فایقم، لەپۆلی یەکی ناوەندی لەقوتابخانەی شۆڕش پێکەوە بووین.

دوای راپەڕین رۆژێک مام سۆرانم بینی، وتی: دەزانی مەلا کرێکار کێیە؟ ، وتم: نەوەڵا نازانم، وتی چۆن، ئەویش لەقوتابخانەی شۆڕش هاوپۆلی خۆمان بوو، ناوی نەجمەدین بوو، لەشوعبەکەی تربوو، لە گەڕەکی ئێمە بوو لەمەجید بەگ.

**کاتژمێرەکەی نەوزاد:**

مامۆستا قوتابی فێری پەروەردەو زانست دەکات، بەلام هەندێکجار، مامۆستاش هەڵە دەکات، رۆژێکیان مامۆستای وانەکەمان نەهاتبوو بۆ قوتابخانە، وانەمان نەخوێند، لەپۆلەکەدا، بەئارەزووی خۆمان قسەمان دەکرد، دیاربوو قسەکانمان سەری لەپۆلەکانی تر تێکدابوو. لەوکاتەدا مامۆستا ئەنوەر مەرقوس بەتوڕەییەوە خۆی کرد بەپۆلدا، بەبێ پرسیارو لیکۆڵینەوە، وتی:

دەست بگرن، ئێمەش لەپی دەستمان بۆ راگرت، یەکی دارێکی لێداین، لەپۆلەکەماندا تەنیا یەک قوتابی کاتژمێری لەدەستدا بوو، ناوی نەوزاد بوو، نەوزاد نەک هەر کەم دوو بوو، بەردت بەسەریدا بدایە دەنگی نەدەکرد، بەشداری ئەو ژاوەژاوەی ئەو رۆژەی پۆلی نەکردبوو، مامۆستا دارێکی بەلەپی دەستی ئەویشدا کێشا، دارەکە بەر کاتژمێرەکەی کەوت، کاتژمێرەکە پارچە پارچە بوو، بەشکانی کاتژمێرەکەی نەوزاد، هەمومان دڵتەنگ بووین،

لەداخی شکانی ئەو کاتژمێرە تاقانەیەی پۆلدا، ئازاری لەپی دەستمان لەبیرچووەوە، بەڵام نەمانتوانی دژی شکاندنی کاتژمێرەکەی نەوزاد هیچ بکەین. لەدڵی خۆمدا دەموت ئەگەر ئێستا لەگوڵپ بوومایە، دژی ئەو لێدانە نارەوایە، دژی شکاندنی کاتژمێرەکەی نەوزاد چالاکییەکم دەکرد.

شکاندنی کاتژمێرەکەی نەوزاد بەداری دەستی مامۆستا، رووداوەکەی گوڵپی بیرهێنامەوە:

کاتێک لەگوڵپ قوتابی قۆناغی سەرەتایی بووم، رۆژێکی بەهار، لەنزیک گوند سەعیم دەکرد، کتێبم بەدەستەوەبوو، دەمخوێندوەو لەخۆمم دەپرسیەوە، کتوپڕ سوارڕۆیەک[11] لەتەنیشتمەوە وەستا، بەڕێوەبەری قوتابخانە دابەزی، زلەیەکی لێدام و بەجێیهێشتم، دواتر بۆمدەرکەوت، بەڕێوەبەر مەی خواردۆتەوە، بەسەرخۆشی لەمنی داوە.

بەو رەفتارەی بەڕێوەبەری قوتابخانەی گوڵپ، زۆر نیگەران بووم، بیرم دەکردەوە دەبێت شتێک بکەم، سزای رەفتارەکەی بەڕێوەبەر بدەم، هەر ئەو ئێوارەیە، پێش بانگی مەغریب، دەمەو تاریکی، چوومە سەربانێکی بەرز، بەبەرچاوی خەڵکی گوڵپەوە کتێب و دەفتەرەکانی خۆمم لەگەڵ خۆم بردە سەربانەکەو ئاگرم تێبەردان. خەڵکی گوند گڕی سوتانی دەفتەرو کتێبەکانیان بینیم، زانیان ئەو کردارەی من پەرچەکرداری رەفتارەکەی بەڕێوەبەر بووە. دەترسام بەرامبەر بەو کارە بەڕێوەبەر سزام بدات و لەقوتابخانە دەرمبکات، بەڵام بۆ رۆژی دوایی، بەڕێوەبەر بانگی کردم، دەفتەرو قەڵەم و کتێبی نوێی دامێ، منیش هەستم کرد کە کارێکی باشم کردووە، سەرکەوتووبووم.

**بەیانی ١١ ئازار:**

لەسلێمانی قوتابی پۆلی یەکی ناوەندی بووم، شەوانە پێشمەرگە دەهاتنە ناو شار، تەقەیان لەبنکەی پۆلیس و بنکەی هێزەکانی ئاسایشی رژێمی عێراق دەکرد، هەندێکجار تەقەیان لەبارەگای جەلالییەکانیش دەکرد. جەلالییەکان

---

١١ سوارڕۆ: بە دیالۆگی کرمانجی سەروو بە واتای ئۆتومبێل دێت.

بــەرەو پووكــانەوە دەچــوون، مەلاییــەكان بــەرەو بــەهێزی دەچــوون، دوای ماوەیـەک دەنگوباسـی گفتوگۆی نێوان حكومـەتی عێراق و مەلاییـەكان بـەناو خەڵكدا بڵاوبووەوە. هـەواڵی گفتوگۆ راست دەرچوو، رێكـەوتنی ١١ ئازاری ١٩٧٠نێـوان حكومــەتی عێــراق (ســەدام حســەین)و شۆڕشــی ئــەیلول (مــەلا مستەفا)ی لێكەوتەوە.

كە مەلا مستەفاو حكومەتی عێراق رێكەوتن، جەلالییەكان چالاكیـان نـەما، دەركـەوت یـەک لەمەرجـەكانی مـەلا مسـتەفا بـۆ رێككـەوتن لەگـەڵ حكومـەتی عێراقدا، هـەڵوەشانەوەی حزبی شۆڕشگێری كوردسـتان و هێزی چەكداریی جەلالییەكان بووە.

بەبۆنـەی بـەیانی یانزەی ئازارەوە، خـەڵكی سلێمانی رۆژانە دەرژانە سـەر شـــەقامەكان و شـــاییان دەگێـــڕا، رۆژێـــک نارنجۆكێكیـــان فڕێدایـــە نـــاو شـاییگێڕەكانەوە، بیـرم نایـەت شــەهیدو برینـدار چەنـد بـوو، بـەڵام لایەنـە بەرپرسـەكانی پۆلیس و ئاسایش، هـەر زوو ئـەو كەسـەیان دەسـتگیركرد، كە تاوانەكـەی ئـەنجام دابـوو. دەرچـوو كەسـێكی سـەر بە جـەلالییەكان بـووە، بە بەیانی یانزەی ئازارو رێكەوتنی مـەلا مستەفاو حكومـەتی عێراق نیگەران بووە.

دوای چەند رۆژێک لەدەستگیركردنی تاوانبارەكە، سزای لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، حكومەت خـەڵكی سلێمانی ئاگاداركردەوە، تاوانبارەكە لەبـەردەركی سەرا هەڵدەواسرێت، با خەڵک بێن پرۆسەی هەڵواسینەكە ببینن. منیش چووم بـۆ بــەردەركی ســەرا، بەبەرچاومــەوە تاوانبارەكــە هەڵواســرا، لــەدوای ئــەو رووداوە، هیچ توندوتیژییەک لەسلێمانی روونەدا.

هەر ئەو ساڵە، بەرپرسـانی شۆڕشـی ئـەیلول، ژمارەیـەک كەسایەتی خێڵـی چەرمەگایان دەعـوەت كرد، لەرێگەدا كـەمینیان بۆ دانـان، پێش ئـەوەی بگەنـە بارەگــای ســەركردایەتی، هــەر هــەموویان كوشــتن. بــەگوێرەی دەنگوباســی ئەوكاتــە، پیلانگێــڕی كوشــتنی چەرمەگاییــەكان، لەتۆڵــەی كوشــتنی دوو پێشــمەرگەی بارزانیـدا بـوو، كـە لەســەردەمی شــەڕی جــەلالی و مەلاییـدا، لەناوچەی سورداش، بەدەستی چەرمەگاییە جەلالییەكان كوژرابوون.

**کوڕی شەهید:**

دوای بەیانی یانزەی ئازار، هەموو کەس باسی ڕێککەوتنەکەی دەکرد، بەدەستکەوتێکی مێژوویی دەبینرا، ڕۆژێکیان قوتابیانی پۆلی یەکی ناوەندی، باسی ئەوەیان دەکرد، کە بەگوێرەی بەندێکی ڕێکەوتنی بەیانی ١١ ئازار، کوڕی شەهیدەکانی شۆڕشی ئەیلول، بۆیان هەیە لەکۆلیژو پەیمانگەکانی وەزارتی ناوخۆو بەرگریی عێراق وەربگیرێن و ببن بەمفەوەزو ئەفسەر. ئالەوکاتەدا بۆ یەکەمجار، لەناو قوتابییەکاندا وتم:

من کوڕی شەهیدم، هەموو بەسەرسامییەوە سەیریان کردم، چاوی ڕێزیان پێداگێڕام، یەکێک دەیوت بونییەی لەشت بۆ زابتی لەبارە، یەکێکی تر دەیوت زابتی هەر لەخۆت دێت و هیتر.

تا گفتوگۆ لەنێوان شۆڕش و حکومەتی عێراقدا نەکرا، ڕیکەوتنی ١١ ئازار ڕانەگەینرا، من نەمدەوێرا بەکەس بڵێم باوکم شەهید بووە، هەر کەسێکیش پرسیاری باوک و دایکمی بکردایە، خۆم لەوەڵامەکەی دەدزییەوە. پێش ئەوەی بڕۆم بۆ سلێمانی بۆ خوێندن، لەگوڵپ ئامۆژگاری کرام، باسی باوکم نەکەم، نەڵێم شەهید بووە، نەوەک حکومەتی عێراق بمناسێت و دەستگیرم بکات، بەڵام کە دۆخەکە ئاسایی بووەوە، بەیانی یانزەی ئازار دەرچوو، بۆ یەکەمجار لەناو هاوپۆلەکانمدا، خۆم ئاشکرا کرد.

دوای ئەوەی قوتابییەکان زانییان من کوڕی شەهیدم، هەڵویستیان بەرامبەرم گۆڕا، لەکوڕە هەورامییەوە بووم بەکوڕە شەهید، چیتر وەک جاران بەقسەی نابەجێ هەستیان بریندار نەدەکردم.

**نامەکە:**

دوای شەهیدبوونی باوکم، ماڵی باپیرەم دەیانویست من و دایکم و براکانم، بەگوێرەی ڕێنمایی و ئامۆژگاری ئەوان بجووڵێینەوە، چۆنیان بوێت وامان بەکاربێنن، هەر لەسەرەتاوە دایکم بەو کۆت و بەندەی ئەوان ڕازی نەبوو، منیش بەو کۆت و بەندەی ماڵی باپیرەم ڕازی نەدەبووم، بەو کۆت و بەندەی

کە دایکیشم بۆیداناوبووم، هەر رازی نەبووم. بۆیە بەبەردەوامی لەگەڵ هەردوو لایەنە ناکۆکەدا، لەململانێ و گیروگرفتدا بووم.

لەپشووی زستانەی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا، گەڕابومەوە بۆ گوڵپ، ماڵی باپیرەم ئاهەنگی بەشوودانی کچێکیان دەگێڕا، بێجگە لەئێمە، هەرچی خزم و ناسراوبوو، بۆ ئەو ئاهەنگە بانگکرابوون، دیاربوو لەوکاتەدا پەیوەندییان لەگەڵ دایکم زۆر خراپ بوو، کاتێک بینیم بێجگە لەئێمە، هەموو کەس بۆ ئاهەنگەکە بانگکراوە، ئاگرم گرت.

کە شەو داهات، ئاهەنگ دەستیپێکرد، لەکاتی ئاهەنگ گێڕاندا، بەبێ رەزامەندی هیچ کەسێک، خۆم کرد بەماڵی باپیرەمدا، کەس رووی خۆشی نەدامێ، کەس بەخێرهاتنی نەکردم، هێندەی تر پڕبووم. ئیتر دەستم بەئاژاوەگێڕی کرد، گیروگرفتم بۆ ئامادەبووانی ئاهەنگەکە درووستکرد، وام لەماڵی باپیرەم کرد ئاهەنگیان بیربچێتەوە، هەر خەریکی ڕووبەڕووبوونەوەی کارەکانی من بوون. بە تێکدانی ئاهەنگەکە تێرم نەخوارد، لە کاتی گەڕانەوەمدا، کە گەیشتمە سەربانی ماڵی باپیرەم، بەردێکی گەورەم هەڵگرت، کێشام بە لوولەی سۆپای ژووری دانیشتنی ماڵی باپیرەمداو بەرەو ماڵی خۆمان رامکرد. هەر ئەوەندەم زانی باپیرەم هاتە سەربان، بەوپەڕی تووڕەبوونەوە هاواری دەکردو میلی تفەنگە بڕنەوەکەی دەهێنایەوە، دەیوت بزانن لە کوێیە تا بیکوژم، یەک لە مامەکانم داوای لە باپیرەم دەکرد هێور ببێتەوە، تەقە نەکات. ئا لەوکاتەدا من لە نزیک ماڵی خۆمان لەسەربانی دراوسێکەمان، خۆم تەختی زەوی کردبوو، خۆشیم لەو هەرایە دەبینی کە ئەو شەوە بۆ ماڵی باپیرەمم درووستکرد.

دوای ئەوە، ماڵی باپیرەم نامەیەکیان بۆ مامە حەمەشەریف نووسی، داوایانلێکردبوو، دەبێت فایق لەماڵی خۆت دەربکەیت، ئەو نامەیە گەیشتە دەست مامم و خوێندییەوە، لەجامخانەی دۆلابی ژێر نوێنەکەدا دایناوبوو، منیش نامەکەم بینی، بەنهێنی خوێندمەوە، نووسرابوو: دەبێت فایق لە ماڵی خۆت دەربکەیت، لەبەرئەوەی لەشەوی ئاهەنگی سنۆبەری کچماندا، هەوڵیدا کادانی حەیوانەکان بسوتێنێ، پیمانزانی راومان نا، دواتر رومانەیەکی فڕێدایە

ناو سۆپای ژوری نوستنەکەمانەوە، بەڵام خوا رەحمی کرد، نەیزانیبو زنجیری رومانەکە دەربکات، رومانەکە نەتەقیەوە.

مام حەمەشەریف نامەکەی بەدەست گەیشت و خوێندییەوە، بەڵام بێجگە لـــەوەی بەرامبــــەر بـــەمن کــــەمێک رووی گــــرژ کردبـــوو، هــــیچ جــــۆرە پەرچەکردارێکی نەنواند، قسەیەکیشی نەکرد ، لەدڵی خۆمدا دەموت بەخوا ئەم مامەیەم کوڕی باشـە، وەک باپیرەم و پورم و مامەکانی ترم نییە. ئەو دوو تۆمەتـــەی کە بۆیـــان هەڵبەســـتبووم، هیچیـــان راســـت نـــەبوون، بۆئـــەوە داتاشرابوون تا مامم من دەربکات، منیش دەست لەخوێندن هەڵبگرم.

**بارەگای بارزانی:**

دوای ئـەوەی لـەپۆلی یـەکی ناوەنـدی دەرچـووم، بـۆ پشـووی هـاوین گەڕامـەوە بۆ گوڵـپ، لەگـەڵ شـەتڵ لێدانی تووتن و پاچەکۆڵـە تێکەڵبوومـەوە. شۆڕشـی ئـەیلول لەگەرمــەی ســەرکەوتندا بـوو، خانەنشـینی بـۆ شــەهیدانی شۆڕشی ئەیلول بڕایەوە، ئێمەش خانەنشینی شەهیدانەمان بۆ دەرچوو، باسی ئـەوە دەکرا، بـاوک و دایـک و خێزانـی هەنـدێک شـەهید، سـەردانی بارەگـای بارزانییان کردووە، هاوکاری مادی باش کراون.

بەو واتوو ویتە، منیشیان هەڵنا، تـا لەگـەڵ نـەنکم (دایکی بـاوکم)، سـەردانی بارەگای بارزانی بکەین و داوای هاوکاری بکـەین. سـەرەتا لەلیژنـەی ناوچـەی هەڵەبجە، داوای پشتگیریمان کرد، تـا بـەبارەگای بارزانیمـان بناسـێنن، لیژنـەی ناوچە، نامەی پشتگیرییان بۆ نووسین، خۆمـان پـارەی سـەفەرمان پەیدا کرد. شـێخ جـەلال نەقشـبەندی مێردی پورە سـوڵتان، نامەیـەکی بۆ کەسـایەتییەکی خەڵکی ناوپردان نووسی، موریدی شێخ حسامەدین بوو. ڕۆژی ١٤-٧-١٩٧٠ لەگوڵپـەوە گەشـتمان دەسـتپێکرد، تـا ئێـوارە گەیشـتینە نـاوپردان. لـەناوپردان مـاڵی ئـەو پیاوەمـان دۆزییـەوە کـە نامـەمان بـۆ بردبـوو، خـاوەن مـاڵ ڕێـزی لێگــرتین، چەنــد رۆژێــک لەماڵیــدا ماینــەوە، مەوعــدی چاوپێکەوتنیشــی بــۆ وەرگرتین.

دوای نیوەڕۆیەک من و نەنکم گەیشتینە حاجی ئومەران، بارەگای سەرکردایەتی (بارەگای بارزانی) لەخێمەدا بوو، سەرەمان هات، چووینە ژورەوە، دوو کەسی مرومۆنی کامڵ، لەخێمەکە دانیشتبوون، لەژێر لێوەوە بۆرە بەخێرهاتنێکیان کردین، ئەو نامەیەیان لێوەرگرتین، کە لەلیژنەی ناوچەی هەڵەبجەوە بۆمان بردبوون، سەیری نامەکەیان کرد، هیچ قسەیەکیان لەگەڵ نەکردین، یەکێکیان دەستی بەنووسینی نامەیەک کرد، پاش چەند چرکەیەک نامەکەی خستە ناو زەرفێکەوە، دایە دەستی من، وتی ئەو نامەیە ببەنەوە بۆ ناوچەی هەڵەبجە.

هەڵسوکەوتی ساردی ئەو دوو بەرپرسەی بارەگای بارزانی، زۆر نیگەرانی کردم، ئەوەم بیرکەوتەوە کە لەسنوری هەورامان و هەڵەبجەش، بەرپرسەکانی پدک و فەرماندەکانی شۆڕشی ئەیلول، زۆربەیان ئاغاو دەوڵەمەندبوون، گوێیان بەخەڵکی هەژارو بە بنەماڵەی شەهیدان نەدەدا.

کە لەخێمەکە هاتینە دەرەوە، نامەکەی بارەگای بارزانیم لەزەرفەکە دەرهێنا، خوێندمەوە، بەنەنکمم وت:

بۆ لیژنەی ناوچەی هەڵەبجەیان نوسیووە، ئێمە توانامان نییە هاوکارییان بکەین، ئێوە هاوکارییان بکەن، باشە لیژنەی ناوچە لەکوێیان بوو هاوکاری ئێمە بکەن؟ هەر لەتەنیشتی خێمەکەدا، نامەکەم دڕاند، بەدڕاندنی نامەکە نەنکم نیگەران بوو، بەڵام نەیتوانی ڕێگری لەمن بکات. کە گەیشتینەوە سلێمانی کرێی سوارڕۆمان پێنەمابوو، سەردانیماڵی مامە حەمە شەریفمان کرد، کرێ سوارڕۆی سلێمانی- گوڵپی بۆ دابین کردین. بەو شێوەیە لەگەڵ نەنکم گەشتێکی چەند ڕۆژەی بێ سودووماندوکەرمان کرد، لەو سەرەوە بەبێ دەستکەوت، بەڕرقێکی توندترەوە، لە پدک، لەشۆڕشی ئەیلول، گەڕامەوە.

**دەروێشەکان:**

ئەو ڕۆژەی لەگەڵ نەنکم بەرەو بارەگای بەرزانی دەڕۆیشتین، بەیانییەکەی، پێش ئەوەی بگەینە حاجی ئومەران، بۆماوەیەک لە گەلاڵە وەستاین، لەناو دوکان و بازاڕەکانی گەلاڵەدا، چەند کەسێکم بینی، دووکانی

گەڕۆکیان دانابوو کەلوپەلی ئێرانییان دەفرۆشت، سەرووسیمای ئەو کەسانە لای من ئاشنا بوو، کاتێک لێیان نزیکبومەوە، هەردوو دەروێشی بەناوبانگی ناوچەی هەورامان، قالە هەجیجی و دێوانە حەمە عەزیز بوون. ئەو دوو کەسە خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان بوون، دەروێشی شێخی حسامەدین بوون، پێشتر چەند جارێک سەردانی گوندی گوڵپیان کردبوو، لەگەڵ چەندان دەروێشی تردا، حاڵیان لەخۆیاندەهێنا، زرگ و شمشێرو خنجەریان لەخۆیان دەدا، دواتر برینەکەیان چاک دەبووەوە، وەک مرۆڤی ئاساییان لێدەهاتەوە.

ئەو کەسانەی بڕوایان بە دەروێشی و تەریقەت نەبوایە، پێیاندەوت مونکیر، شێخ لەتیف یەکێک لە مونکیرەکانی گوڵپ بوو، جارێکیان قالە هەجیجی هات بۆ گوڵپ، لەبەردەم مزگەوتی گوڵپدا پرچە درێژەکانی بەردایەوە، کەمندەکەی دەرکرد، سەیری شێخ لەتیفی کرد، زکرو هووهاو حاڵی لەخۆی هێنا، شمشێرێکی دەرهێنا، شمشێرەکەی کرد بەسکیدا، سەری شمشێرەکە لەپشتیەوە دەرچوو، ماوەیەک بەشمشێرەکەی سکییەوە گەڕا، هەر خۆی شمشێرەکەی لەسکییەوە دەرهێنایەوە، دەستی بەبرینەکانیدا هێنا، حاڵەکەی تەواوکرد، وەک مرۆڤێکی ئاسایی هەستایەوە، دەستی بەژیانی ئاسایی خۆی کردەوە.

رۆژێک دێوانە حەمە عەزیزو چەند دەروێشێکی تر، لەسەربانی حەوزی مزگەتەکەی گوڵپ، حاڵیان لەخۆیان هێنا، دوای کەمێک حاڵکردن، دێوانە حەمە عەزیز خنجەرێکی کرد بەسکی خۆیدا، بەبەرد خنجەرەکەی بەسکیدا دەکوتا، تا خنجەرەکە دیار نەما، لەوانەیە چارەکێکی نەخایاندبێت، دێوانە دەستی بەقوڕقێنە لێدان کرد، لەپڕ خنجەرەکەی لەدەمییەوە هەڵهێنایەوە.

لەوکاتەوە ئەو دوو چالاکییەی قالە هەجیجی و دێوانە حەمە عەزیزم دیبوو، زۆر سەرسامیان بووم، وام وێنا کردبوو، ئەو دوو دێوانەیە، بەردەوام لەژورێکی تاریکدا دانیشتوون، لەگەڵ شێخەکانیان، لەگەڵ خواکەیاندا خەریکی دیندارین، وامدەزانی کە مرۆڤی ئاسایی نین، کەچی ئەو رۆژە، لەو شوێنەدا بینیمن، وەک خەڵکی ئاسایی، خەریکی کاری خۆیان بوون.

سەریشم لەوە سوڕدەما کە ئەم دوو کەسە، چۆن توانیویانە لەناوچەی هەورامانی رۆژهەلاتی کوردستانەوە بگەنە گەلالە، لەوێ دوکانی فرۆشتنی کەل و پەلی ئێرانی دابنێن، لەبەرئەوەی ئەوانە خەلکی ئێرانن، ناتوانن بەرێگەی سوارڕۆ هاتووچۆ بکەن، دواتر زانیم کە قالە هەجیجی و دێوانە حەمە عەزیز، بەپشتی هێسترەکانیان، لەهەورامانی رۆژهەلاتی کوردستانەوە، بەرێگەی گوندە سنورییەکانی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگەدا، هاتوونەتە گەلالەو حاجی ئومەران، لەوێ کاسبی دەکەن.

**لە سلێمانیەوە بۆ هەڵەبجە:**

پۆلی یەکەمی ناوەندیم لەسلێمانی تەواوکرد، هەرچەند مامم لەسەر نامەکەی مالی باپیرەم قسەی نەکرد، بەلام من لای خۆمەوە بریارمدا، چیتر لەسلێمانی لەمالی مامم نەمێنمەوە. مەسرەفی خوێندن لەسلێمانی گران بوو، کەسیشم نەدەناسی لەگەلیدا خانوو بگرم، بەو شێوەیە نەمدەتوانی پۆلی دووەمی ناوەندی لەسلێمانی تەواو بکەم، خۆشم لەکلتوری کۆمەلایەتی خەلکی سلێمانی بێزار ببووم، بۆ بەردەوامبوون لە خوێندن، دەبوو روو لەشارێکی تر بکەم.

محەمەدی سەید حەسەن، یەکێک لەو قوتابیانەی گوندی گولپ بوو، لەهەلەبجە دەیخوێند، بێجگە لەوەی خزمم بوو، دراوسێ و هاورێم بوو، بەتەمەن چەند سالێک لەمن گەورەتر بوو، لەخوێندنیشدا لەپێش منەوەبوو، لەهەلەبجە لەخانوییەکدا ژورێکی بەکرێ گرتبوو، وتی وەرە لەگەل من لەهەلەبجە بخوێنە. لە قوتابخانەی ناوەندی شۆرش، خۆم نقلی قوتابخانەی ناوەندی شارەزووری هەلەبجە کرد.

ماوەی چەند رۆژێک لە هەلەبجە لەگەل محەمەد مامەوە، لە پڕ خاوەن مال کەوتە بیانوو گرتن و بەمحەمەدی وت: من ژوورم تەنها بەیەک کەس بەکرێ داوە، رێگە نادەم کەسی تر لەو ژوورەدا لەگەل تۆدا دابنیشێت.

**ماڵی پووره عوزرا:**

دوای ئەوەی خاوەن ماڵەکە ڕێگەی نەدا لەگەڵ محەمەد بمێنمەوە، پەنام بۆ ماڵی پورە عوزرا برد، داوام لێکردن لەماڵی خۆیان جێگەم بکەنەوە، تا لەخوێندن دانەبڕێم. عوزرا پووری باوکم بوو، هاوسەرەکەی ناوی حەمەی حەسەن موانی بوو، پیاوێکی ڕووخۆش و دڵفراوان بوو، نانێکی هەبوایە، حەزی دەکرد لەگەڵ خەڵکدا بەشی بکات، بەدڵێکی فراوانەوە، ئامادەییان نیشاندا لەماڵی ئەوان بمێنمەوە. ماوەی دوو ساڵ لەماڵی پووره عوزرا مامەوە، پۆلی دوو سێی ناوندیم لەوێ تەواوکرد.

ئەو ماوەیەی لەماڵی پووره عوزرا بووم، هەستم دەکرد لەماڵی خۆمدام، منداڵەکانیان زۆر خۆشیاندەویستم، زوهرەو یاسین (کچ و کوڕە هاوتەمەنەکانی خۆم)، کە دەیانبینی من قوتابییەکی زیرەکم، ئاواتیان دەخواست کە خزمەکەیان ببێت بەپزیشک، منیش ئاواتەکەی زوهرەو یاسینم هێنایەدی.

ماڵی پووره عوزرا بەتەنیا هاوکاری منیان نەدەکرد، لەماوەی دەیان ساڵدا، ماڵەکەیان وەک بەشی ناوخۆیی قوتابیانی خزمی لێهاتبوو، هەر قوتابییەکی خزممان، لەگوڵپ و گەچینەوە، بۆ خوێندن ڕووی لە هەڵەبجە بکردایە، لەماڵی ئەوان دەمایەوەو لەوێ خوێندنی تەواودەکرد.

ئەوکاتەی لەهەڵەبجە دەمخوێند، هیچ کام لەقوتابیانی هاوپۆلم، قسەیەکی هەڵەیان بەرامبەرم نەکرد، خەڵکی هەڵەبجە کە دەیانزانی من کوڕی شەهید حەمە گوڵپیم، قوتابییەکی زیرەکم، زۆر ڕێزیان لێدەگرتم و خۆشیاندەویستم.

لەهەڵەبجە چەندین هاوڕێی دڵسۆزم هەبوون. تا ئەمڕۆش هاوڕێیەتیم لەگەڵیاندا بەردەوامە، مامۆستا عەلی سادق و گوران هەڵەبجەیی دوو لەو برادەرانەی سەردەمی خوێندنی ناوەندیمن، کە تائێستاش هاوڕێیەتیمان بەردەوامە.

**ئیسلامی و شیوعی:**

ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١ لە هەڵەبجە قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندی بووم، هاوڕێیەکم هەبوو ناوی ڕەئوف بوو، برا بچوکی حاجی محەمد بامۆکی بوو،

تا بڵێی کوڕێکی بەڕێزو دیندار بوو، زۆر لێم نزیکدەبوەوە، باسی ئاین و قورئانی بۆ دەکردم، زۆر نیگەران دەبوو کە کورد بەهەڵە ئایەتەکانی قورئان دەخوێنێتەوە. لەدەرەوەی قوتابخانەش، نازانم چۆن برادەریەتیم لەگەڵ مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا عوسمان پەیدا کردبوو، مەلا ئیبراهیم بە بەردەوامی داوای لێدەکردم، بەشەو بچم بۆ مزگەوت بۆ نوێژکردن، منیش بەگومانەوە، لەو هەڵویست و بۆچوونانەی، رەئوف و مەلا برایم نزیک دەبوومەوە.

برادەرێکی ترم هەبوو ناوی ئیبراهیمی مەحمود ئەفەندی بوو، ئەم ئیبراهیمە شیوعی بوو، هەرکاتێک رەئوف و مەلا ئیبراهیم منیان دەبینی، قسەیان لەگەڵ دەکردم، ئیبراهیمی شیوعی دەهاتە لام، دەیوت:

مەلا ئیبراهیم چیت لاباس دەکات، منیش دەموت: دەڵێ بەشەو وەرە بۆ مزگەوت بۆ نوێژکردن، ئیبراهیم شیوعی دەیوت: نەچیت، ئەوە بانگت دەکات بۆئەوەی ببیت بەئەندامی حزبی ئیسلامی. ئیتر تێگەیشتم کە جۆرە پەیوەندییەک لەنێوان رەئوف و مەلا ئیبراهیمدا هەیە، تێگەیشتم کە رەئوف و مەلا ئیبراهیم دەیانەوێت من بخەنە سەر ڕێبازی ئیسلامی سیاسی، تێگەیشتم کە شیوعییەکان دژی ئیسلامییەکان کار دەکەن، زۆر نیگەرانن ئەگەر من لەئیسلامیەکان نزیک ببمەوە.

بۆ بڕیاردان لەسەر پەیوەندییەکانم لەگەڵ رەئوف و مەلا ئیبراهیم، پرسم بەمحەمەدی سەید حەسەنی خزمم کرد، قسەکانی رەئوف و مەلا ئیبراهیمم بۆ گێڕایەوەو پەرچەکردارەکانی ئیبراهیمی مەحمود ئەفەندیم بۆ باسکرد، محەمەد رەئی وابوو کە ئیسلامییەکان دەیانەوێت من لەخۆیان نزیک بکەنەوە، وتی:

لێیان دووربە، سیاسەتی ئەوان راست نییە، تۆ باوکت شەهیدی کوردستانە، چۆن دەبێت لەگەڵ حزبی ئیسلامیدا کاربکەیت، کەس نازانێت بۆ کێ کار دەکەن. دوای ئەو گفتوگۆیەی نێوان من و محەمەد، بڕوام بەقسەکانی محەمەد کرد، وردەوردە لەرەئوف و مەلا ئیبراهیم دوورکەوتمەوە.

ئەوکاتانەی لەهەڵەبجە بووم، هەستم دەکرد دەسەڵاتی مەلا عەلی عەبدولعەزیز، لەدەسەڵاتی قائیمقامی هەڵەبجە زیاترە، دواتر بۆم ڕوونبوەوە، کە هۆکارەکەی ئەوەیە، مەلا عەلی سەر بەڕێکخستنی برایانی موسڵمان بوو، لەهەڵەبجە ڕێکخستنێکی بەهێزیان هەبوو.

دوای ئـەوەی لەتەمەنـدا هـەڵکشـام، زانیـاریم لەسـەر ئیسـلامی سیاسـی پەیـداکرد، بـۆم روونبـۆوەوە کـە رێکخسـتنی برایـانی موسـڵمان (ئیخـوان) لەپەنجاکانی سەدەی بیستەوە، دوای بەغداوو موسڵ، لەهەڵەبجە بڵاوبۆتـەوە، دەرکەوت رەئوف و مـەلا ئیبراهیم، ویستبوویان من بۆ رێکخستنی برایانی موسڵمان رابکێشن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون.

**ئیستیعاب**[12]:

لـەپۆلی دووەم و سـێهەمی ناوەندیـدا، وەک قوتابییـەکی زیـرەک و خـاوەن دیسپلین، لەسەر خوێندن بـەردەوام بووم، لەگەڵ ئیسـلامی و شـیوعی و پدک کـارم نەدەکـرد، پەیوەندیشـم لەگەڵیانـدا خـراپ نـەبوو. رۆژێکیـان یەکێتـی قوتابیـانی کوردسـتان بانگیـان کـردم، بۆئەوەی بەشـداریی کۆبوونەوەکانیـان بکەم، کاتێک بەدەم داواکەیانەوە چووم، وتیـان لـەمهودوا، وەک ئەندامی یقک کـار دەکـەیت، منـیش تێنەگەیشـتم چـۆن بـووم بە ئەنـدامی یقـک، سـەرۆک شانەکەم وتی:

دوای تێکەڵبوونـەوەی جـەلالی و مـەلایی، مـن وەک ئەنـدامی یقـک سـەر بەباڵی جەلالی، بومەتە ئەندامی یقک گشتی.

سـەرۆک شـانە دواتـر باسـی ئیسـتعابی بـۆ کـردم، وتـی: دوای بـەیانی ١١ ئـازار، بـاڵی جـەلالی خـۆی هەڵوەشـاندەوە، گەڕاوەتـەوە نـاو پدک و شۆڕشـی ئەیلول، منیش لەبەرئەوەی لەپۆلی یەکی ناوندیدا، ئەندامی یقک جـەلالی بووم، ئیستیعاب گرتوومیەوە.

وەک ئەندامی یقک، تەنیا لە یەک کۆبوونەوەدا بەشـداریم کرد، لـەدەرەوەی کۆڕو کۆبوونـەوەی حزبیدا، دەربـارەی مێژووی کـورد، شۆڕشـەکانی کـورد، ئـەدەب و هـۆنراوەو فۆلکلـوری کوردی، کتێبم دەخوێندەوە، خـۆم پـەروەردە دەکرد، تێبینیم دەکرد بڕیارو هەڵسووکەتی پدک، ناکۆکە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو کتێبانەی دەیانخوێنمەوە، بە خوێندنەوە واملێهات، رەخنە لەسیاسـەتەکانی پدک بگرم.

---

١٢ ئیسـتیعاب: وشـەیەکی عەرەبیە واتە وەرگرتنەوە، مەلا مستەفا جەلالیەکانی لە ریـزی پـدک و شۆرشی ئەیلولدا وەرگرتەوە.

**من و رۆژهەڵاتی کوردستان:**

دایکم و خزمەکانم، بەبەردەوامی هەوڵیاندەدا من وەک جوتیارێکی سادەی گوندەکەمان بژیم، ئەرکی دابینکردنی بژێوی براکانم و دایکم لەئەستۆ بگرم، دەیانویست من بەکاری کشتوکاڵ و ئاودێری و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریک بکەن، منیش خەونێکی ترم هەبوو، تا دەهات لەداخوازی ئەوان دووردەکەوتمەوە، خەریکی کتێب خوێندنەوەو بیرکردنەوە بووم.

ئەو تاوانانەی سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول، بەرامبەر بەشۆڕشی ساڵی ١٩٦٧-١٩٦٨رۆژهەلاتی کوردستان ئەنجامیاندا، کە کۆتایی بەسەرهەڵدانی رۆژهەلاتی کوردستان هێنا، سەرقاڵی کردبووم، تا دەهات رقم بەرامبەر بەسەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول ئەستوورتر دەبوو، سۆزم بەرامبەر بەکوردی رۆژهەلات بەهێزتر دەبوو. وەک کوردێکی باشور، بەرامبەر بەکوردانی رۆژهەلات، هەستم بەتاوان دەکرد، ئەمە وای لەمن کرد، بیرکردنەوەی سیاسیم بەرەو رۆژهەلاتی کوردستان ئاراستە بگرێت.

لەکاتێکدا سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول، دژی رۆژهەلاتی کوردستان تاوانی ئەنجام دەدا، ژمارەیەکی زۆر، لەسەرکردەو کادرو پێشمەرگەی رۆژهەلاتی کوردستان، لەڕیزی شۆڕشی باشوری کوردستاندا بوون، لەئاست سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولدا، مامۆستا هەژار موکریانی شاعیرو ئەحمەد تەوفیقی سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەبینران، لەئاستی ناوچەی هەورامانـدا چەنـدین کەسایەتی و پێشمەرگەی قارەمانی وەک، عەلە شیعەو عەلە کووڕ، حەمە کۆڵنەدەر، حسەین بەگی وەکیل، مەنوچەر بەگ، فەرەیدون جوانڕۆیی، عەبە پاوەیی، نوری هەجیجی، رەئوف هەجیجی و هیتر، کە ژمارەیەکیان شەهیدبوون، دامودەزگاکانی شۆڕشی ئەیلولیان ئاوەدان کردبووەوە.

ئەو کەسایەتییانە، بەرژەوەندی گشتی گەلی کوردیان، لەسەرووی بەرژەوەندیی رۆژهەلاتی کوردستانەوە دانابوو، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە، قۆڵی خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتیان لێهەڵکردبوو، ئەو هەڵوێستە نەتەوەییەی

ئـەوان، بە شـێوەیەکی بـاش کاریگـەری لەسـەر بیرکردنـەوەی مـن کردبـوو، خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانم بەخەڵکی باش دەبینی، دەموت شایانی ئەوەن لەپێناویانـدا بمریـت، بۆیـە بەرنامـەی ڕزگـارکردنی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان، لەئەندێشەی سیاسیمدا جێگیربوو.

لەبەرئـەوەی مـن لەگونـدی گوڵـپ دەژیـام، گوڵـپ گونـدێکی سـەر سـنوری باشورو ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، بەتەمەنەکانی گوڵپیش بۆیان دەگێڕامەوە، کە سەردەمانێک سنوری ئێران و عێراق بەناو گوڵپدا تێپەڕیوە، بەشی ڕۆژهەڵاتی گوندەکەمان ئێران بووە، بەشی ڕۆژئاواشی عێراق بووە، کاتێکیش سـەردانی شارەدێی بیارەم دەکرد، بەچاوی خۆم دەمبینی، کە دووری نێوان بیارەو هانە گەرمڵـە تـەنها چەنـد مەترێکـەو کـە دەچوومـە تەوێڵـە، دووری نێـوان تەوێڵـەو شۆشـمێم دەبینـی، کیلۆمـەترێک زیـاتر لەیـەک دوور نـەبوون، ئیتـر سـنوری دەستکردی کوردستانەکان، لەهزری مندا نرخی نەدەما.

هاتووچۆ، بازرگانی، پەیوەندی کۆمەڵایـەتی، لـەنێوان خـەڵکی ڕۆژهـەڵات و خـەڵکی باشـوری کوردسـتاندا، بـەردەوامبوو، تێکـەڵاوی کلتـووری، لـەنێوان ڕۆژهـەڵات و باشـوردا، لەئاسـتێکی بـەرزدا بـوو، لەتێکـەڵاوی کلتـوری نێـوان کوردو عەرەب، کوردو فارس، بەرزترو قوڵتربوو.

بـاوکی بـاوکم خـەڵکی گونـدی بـارام ئـاوای هـەورامانی ڕۆژهەڵاتـە، دایکـی باوکم خەڵکی گونـدی هانـە گەرمڵـەی ناوچـەی هـەورامانی ڕۆژهەڵاتـە، بـاوکی دایکم خەڵکی گوندی هانە گەرمڵـە بـووە، تـەنها دایکـی دایکـم، خـەڵکی ناوچـەی شارەزوری باشوری کوردسـتانە، زۆرینـەی ڕەچەڵـەکمان خـەڵکی ڕۆژهـەڵاتی کوردستانە.

ئـەو هۆکارانـە وایـان لـەمن کـرد، کـە لـەڕووی سیاسـی و کۆمـەڵایەتی و کلتوورییەوە، بەرامبەر بەڕۆژهەڵاتی کوردستان خۆم بە بەرپرسیار بزانم، بیر لەئایندەی سیاسی ئەو پارچەیەی کوردستان بکەمەوە.

١. سـاڵانی ١٩٧٠-١٩٧٢ گـەلی کـورد لەباشـوری کوردسـتان مەسـتی ڕێکـەوتنی بـەیانی ١١ ئـازار بـوو، زۆرینـەی خـەڵک، بەمنیشـەوە، وای بـۆ

دەچووین کە باشوری کوردستان رزگاری بووە، کەسانی وەک منیش کە هەر لەسەرەتای ژیانمەوە، نەتەوەیی بووم، بەئەرکی خۆمم دەزانی، کار بۆ رزگارکردنی پارچەکانی تری کوردستان بکەم.

٢. لەناو ریکخستنی پدک و یقک دا، کارم نەدەکرد، رەخنەی جدیم لەسیاسەتی ئەوکاتەی پدک و سەرکردایەتی شۆرشی ئەیلول دەگرت، بیرکردنەوەی سیاسیم، ریگەی نەدەدام ببمە ئەندامی حزبی شیوعی عێراق، نەشمتوانی لەگەڵ ئیسلامییەکانی هەڵەبجە بەنهێنی کار بکەم، لەولاشەوە تا دەهات زیاتر خۆلیای سیاسەت دەبووم، دەبوو گۆرەپانێک بۆ چالاکی سیاسی خۆم بدۆزمەوە.

٣. لای خۆمەوە بریارمدا، لەپشووی هاویندا، دوای تەواوکردنی تاقیکردنەوەی بەکەلۆری پۆلی سێیەمی ناوەندی، باشوری کوردستان بەجێبێڵم، بەرەو رۆژهەڵاتی کوردستان برۆم.

٤. کە گەیشتمە رۆژهەڵاتی کوردستان، لەئێران داوای پەنابەری بکەم، ببمە هاوڵاتی ئێرانی، دوای ئەوە دەست بەخەباتی سیاسی نهێنی بکەم، حزبێکی سیاسی پێکبهێنم، ئاستی تێکۆشان بەرزبکەمەوە، رۆژهەڵاتی کوردستان رزگار بکەم.

٥. ئەگەر پرسیاری ئەوەم لێبکەن بۆچی هاتوویت بۆ ئێران، دەڵێم لەکەس و کارم زویر بووم، حەزدەکەم لەدووری ئەوان بژیم، نامەوێت بگەرێمەوە بۆ عێراق.

**بێرواس و کێمنە:**

رۆژێکی هاوینی ساڵی ١٩٧٢ بوو، پێش خۆرنشین، لەگوڵپەوە گەشتی سیاسی گەنجانەم دەستپێکرد، گوڵپ و دەرەفێلان و کانیژنانم[١٣] بەجێهێشت، لەسنووری گوندی گوڵپ دوورکەوتمەوە، کاتێک گەیشتمە سەر گۆری

١٣ دەرەفێلان و کانیژنان دوو سەرچەمەی نزیکی گوڵپن.

ئەسحابە باوان ئاوز[14]، نزیک گوندی هانەی دن، دنیا تاریک داهات، کەمێک لەپەلاماری ئاژەڵی کێوی دەترسام، لەگەڵ ئەوەشدا بەرەو شاخی شەڵواندر ملم نا، بەبێ کێشە لەکۆتایی شەڵواندر نزیک بوومەوە، تا لووتکەی شاخەکە گەیشتم، ئەمدیوی شاخی شەڵواندر عێراقە، ئەودیوی شەڵواندر ئێرانە، دیوی عێراقی شاخەکە شارەزا بووم، چونکە پێشتر لەکاتی دارهێناندا شاخەکەم دیبوو، بەڵام دیوی ئێرانی شاخەکە شارەزا نەبووم، بۆیە لەسەر لوتکەی شاخەکە، لەسەر ڕێگاکە دانیشتم، چاوەڕوانی چاوساخێکم دەکرد.

کات بەرەو نیوەشەو دەچوو، تەقەی سمی وڵاخ بەرگوێم کەوت، پاش کەمێکی تر دەنگی مرۆڤیش، تێکەڵ بەدەنگی جوڵەی سم و پرمەی وڵاخەکان بوو، بۆمدەرکەوت کەسێک بەشوێن وڵاخەوەیەو بەرەو ڕووی من دێت، چاوەڕوانم کرد تا لێم نزیکبووەوە، تارمایی کەسێکم بینی، شوێن دوو هێستر کەوتووە، لەوکاتەدا هەستامە سەرپێ، لەگەڵ هەستانی من، هێسترەکان سڵەمینەوە، وڵاخدارەکە هاواری کرد، ئەوە کێیە؟ ئەوە چییە؟ منیش یەکسەر وەڵامم دایەوە، وڵاخدارەکە ئارام بووەوە، هاتە نزیکمەوە، کاتێک بەو شەوە، لەسەر ئەو شاخە، کەسێکی لەو تەمەنەدا بینی، دووچاری سەرسوڕمان هات، پرسیاری لێکردم: لێرەدا چی دەکەیت؟ منیش وتم: لەدایک و باوکم تۆراوم، دەمەوێت بچم بۆ ئێران، داوای پەنابەری بکەم.

وڵاخدارەکە کوڕێکی گەنجی کەڵەگەت بوو، خەڵکی گوندی بێرواس بوو، دەربارەی ئێران قسەی بۆ کردم، هەوڵیدەدا لەبەرنامەکەم پەشیمان بکاتەوەو بمگەڕێنێتەوە. زۆر باسی خراپی حوکمرانی دەوڵەتی ئێرانی بۆ کردم، چەندان بەڵگەی بۆ هێنامەوە، ئەگەر بچمە ئێران تووشی کێشە دەبم و دەفەوتێم. گوێم بەقسەکانی نەدا، لەبەرنامەکەی خۆم پەشیمان نەبوومەوە، داوام لێکرد بمگەیەنێتە گوندی بێرواس، بەناچاری کوڕە بێرواسی منی لەگەڵ خۆی برد.

کە گەیشتینە ماڵی کوڕەکە لە بێرواس، باری هێسترەکانی خست، هەواڵی هاوسەرەکەی لەدایکی پرسی، دایکی وتی: هاوسەرەکەت تۆراوە. دایکی

---

١٤ باوان ئاوز نزرگەی ئەسحابەیەکی ئیسلامە نزیک گوندی سەرگەت و هانەیدنە.

پرسیاری لەکوڕەکەی کرد: ئەم کوڕەی لەگەڵتدایە کێیە؟ وتی: نانی بدەنێ، شوێنی خەوتنی بۆ دابین بکەن، سبەینێ بیبەن بۆ ماڵی مەلا ئەحمەدی کێمنە، دیاربوو مەلا ئەحمەد کەسایەتی ناوچەکە بوو، جێی متمانەی خەڵک بوو.

دوای نانخواردن و پشوودان، لەسەربانێک جێگەی نووستنیان بۆ راخستم، بەیانی بەدەم دەنگی پرسیاری ژنانی گوندی بێرواسەوە خەبەرم بووەوە، هێشتا سەرم لەژێر لێفەکەوە دەرنەهێنابوو، ژنان دەیانپرسی، ئەوە کێیە لەسەر ئەو بانە خەوتووە؟ ، کە لەژێر لێفەکەوە سەرم دەرهێناو سەیری ئەملاو ئەولای خۆمم کرد، دەرکەوت لەبەردەمی ماڵی کوڕکەدا خەوتوم، ئەو شوێنە سەر رێگەی کانی ژنانە.

هەستام چووم بۆ ماڵی هاوڕێکەی شەوم، بەڵام هاوڕێکەی شەوم نەبینیەوە، دیاربوو کە چووبوو بەشوێن هاوسەرە توراوەکەیدا، تا ئەوکاتە نەگەڕابووەوە.

تەنیا ئەو بەیانییە لەبێرواس مامەوە، بیرم نایەت چۆن گەیشتمە گوندی کێمنە، کێ بردمییە ماڵی مەلا ئەحمەد، مامۆستا پێشوازییەکی گەرمی لێکردم، ئەو چەند رۆژەی لەوێ مامەوە، وەک کوڕی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم.

مەلا ئەحمەدی کێمنەیی، پرسیاری هۆکاری سەفەرەکەمی کرد، وتم لەخزمەکانم زویر بووم، دەمەوێت لەئێران بمێنمەوە. مامۆستا کارەکەی منی بەسەرەڕۆیی دەبینی، زۆر لەگەڵم خەریکبوو تا پەشیمانم بکاتەوە، داوای کرد خۆم نەدەم بەدەست بەرپرسانی ئێرانەوە. خێزانەکەی مامۆستا (مەلاژن) لەهاتنی من بۆ ئێران زۆر نیگەران بوو، بەمامۆستای دەوت: هەرچیت کردووە مەهێڵە ئەم کوڕە لەئێران بمێنێتەوە، ئەگەر لەئێران بمێنێتەوە دەفەوتێ. مامۆستا لەزۆر لایەنەوە باسی خراپی دەسەڵاتی شای ئێرانی بۆ دەکردم، بەتایبەتی باسی باری سیاسی و ئابوری خراپی ئێرانی دەکرد، دەیوت: ئێران وڵاتێک نییە بۆئەوەی مرۆڤی تێدا بژیت، بەڵام قسەکانی ئەوانیش لەماوەی ئەو ٣-٤ رۆژەدا کە لەماڵیان بووم، کاریگەری نەبوو، لەبڕیارەکەی خۆم پەشیمان نەبوومەوە.

رۆژێکیان مامۆستا وتی، بەم زووانە نەنکت دێت بۆ ئێرە، لەگەڵ نەنکت دەتنێرمەوە، دوای ئەو قسانەی مامۆستا، رۆژێک نەنکم (دایکی باوکم) گەیشتە کێمنە، دیاربوو بەبێ ئاگادری من، مامۆستا هەواڵی بۆ خزمەکانم ناردبوو، یەکێکیان بێن قەناعەتم پێبکەن و بمبەنەوە.
نەنکم گەیشت، زیاتر لەشەوو رۆژێک لامان مایەوە، بەنەنکم و بەمامۆستا ئەحمەدو بەهاوسەری مامۆستاوە، زۆر لەگەڵم خەریک بوون، لەبڕیارەکەی خۆم پاشگەز نەبوومەوە، نەگەڕامەوە بۆ باشوری کوردستان و لەکێمنە مامەوە.

لەسەر داخوازی بەردەوامی خۆم، مەلا ئەحمەدم ناچار کرد، رادەستی بنکەی پۆلیسی سنوریی هانە گەرمڵەم بکات، بێرواس و کێمنە دەسەڵاتی فەرمی حکومەتی ئێرانیان تێدا نەبوو، لەگوندی هانە گەرمڵە، بنکەیەکی پۆلیسی سەرسنوری حکومەتی ئێرانی هەبوو. لە بنکەکە، خۆم بەدەسەڵاتدارانی ئێرانی ناساند، وتم: هاتووم داوای پەنابەری بکەم، لێکۆڵینەوەی سەرەتاییان لەگەڵدا کردم، دوای تەواوکردنی لێکۆڵینەوە، لەگەڵ بەرپرسی بنکەو چەند چریکێکدا، لەهانە گەرمڵەوە بەرەو نەوسود بەڕێکەوتین، چەند کاتژمێرێک بەسەر شاخدا سەرکەوتین تا گەیشتینە سەر جادە، من و چریکەکان بەپێ دەڕۆشتین، بەرپرسی بنکەکە کە ئەفسەرێکی ئێرانی بوو، لەگەڵ خێزانەکەیدا، سواری هێستر ببوون.
کە گەیشتینە سەر ڕێگە، جیبێکی سوپای ئێرانی چاوەڕوانی دەکردین، هەموومان سواری جیبەکە بووین، هێندەی نەخایاند گەشتینە نەوسود.

**دەسبەسەرکرام:**

بەرپرسانی هانە گەرمڵە، منیان رادەستی بەرپرسانی نەوسود کرد، تا دوای نیوەڕۆ لەوێ مامەوە، زۆرم برسی بوو، دوای ئەوەی خواردنیان بۆ هێنام، ناردمییانە ژووری سەربازەکان، بۆئەوەی پشوو بدەم. ئەوە

یەکەمجاربوو قەرەویڵەی دوو قات ببینم، فەرموویان لێکردم لەسەر یەکێک لەقەرەویڵەکان راکشێم، منیش بۆ ماوەیەک راکشام، هەر ئەو رۆژە چریکێک هات بەشوێنمدا، بردمی بۆ بنکەیەکی سەربازی لە دەرەوەی نەوسود، لەسەر رێگەی نەوسودو پاوە بوو، ئیتر ئەو بنکەیە بووە شوێنی نیشتەجێبوونی من.

نزیکەی مانگ و نیوێک لەئێران مامەوە، لەو بنکەیەی نێوان نەوسودو پاوەدا دەستبەسەر بووم، خواردن و نووستنم لەگەڵ چریکەکاندا بوو، جارجار سەربازی ئێرانی دەهاتنە بنکەکە، هەندێکجار سەربازەکان لەناو خۆیاندا شەڕیاندەکرد، بەڵام پەیوەندی نێوان چریکەکان ئاسایی بوو، لەناو یەکتردا تەباو گونجاو بوون، لەگەڵ منیشدا بێ گیروگرفت بوون.

چریکێکی نەوسودی کرابوو بە پاسەوانم، هەفتانە دەیبردم بۆ ناو شارەدێی نەسود، حەمامم دەکرد، دەچووینە چایخانە چامان دەخواردەوە، هەندێک جاریش دەچوینە ماڵی خزمی چریکەکە، ئێوارە دەیگەڕاندمەوە بۆ بنکەکە.

جارجارە لەگەڵ چریکە کوردەکاندا لەسەر سیاسەت و کوردایەتی دەستم بەگفتوگۆ دەکرد، خۆیان لەسیاسەت دەدزییەوە، باسەکەیان دەگۆڕی، دەیانوت لێرە باسی سیاسەت مەکە، باسکردنی سیاسەت مەترسی گەورەی لێدەکەوێتەوە، بەو شێوەیە هەستمکرد، ئەوەی من بیرم لێیکردبویەوە، لەبەرنامەی خۆمدا دامنابوو، زۆر زەحمەتە جێبەجێ بکرێت.

رۆژێکیان سەروسیمای هەموو چریکەکان خەم دایگرتبوو، زۆر بێتاقەت دەبینران، پرسیارم کرد بۆچی نیگەرانن؟ وتیان: حەسەن زیرەک کۆچی دوایی کردووە، ئەو رۆژە منیش لەگەڵیاندا خەم دایگرتم، هەستم کرد ئەو چریکانەش، سەرەڕای ئەوەی پیاوی حکومەتی ئێرانن، ناوێرن دەم لەسیاسەت وەربدەن، بەڵام لەناخیاندا هەستی کوردبوون هەیە، بەمردنی هونەرمەندی گەورەی کورد، حەسەن زیرەک، ئەو هەستە لەڕوخساریاندا دەرکەوت.

**گەڕانەوە:**

حکومەتی ئێران بە پەنابەر وەرینەگرتم، زیاتر لەچل و پێنج ڕۆژ لەبنکەیەکی پۆلیسی سنوور دەستبەسەر بووم، دیاربوو بۆ چاودێری و زانیاری وەرگرتن هێشتمیانەوە، بەڵام من لای هیچ کەس باسی پڕۆژەکەی خۆمم نەکردبوو، بۆیە گومان لەسەرم دروست نەبوو کە بۆ مەبەستێکی سیاسی، رووم لەئێران کردبێت.

ڕۆژێکیان وتیان: دەتگوازینەوە بۆ پاوە، چەند بەپرسێکی ئێرانی، کە لەبەشی هەواڵگری دەچوون، هاتن بەشوێنمدا، بەماشێن لەنەوسودەوە گواستمیانەوە بۆ پاوە، لەپاوە بردمیانە نووسینگەی ئاسایش، بردمیانە لای بەرپرسێک، چەند پرسیارێکی لێکردم، دواتر وتی: برۆ کە لای ئەو دەرچووم، پیاوێکی هەروامی هاتە لام، وتی: دەتبەینەوە بۆ باشوری کوردستان، وتم: بەڕێزت کێیت؟ وتی: من کوێخا حەمەخانی شۆشمێم.

هەر ئەو ڕۆژە کە لەپاوە گەڕاینەوە، لەنەوسود نەوەستاین، گەیشتینە شۆشمێ، کوێخا حەمەخان لەشۆشمێوە گەیاندمیە تەوێڵە، لەتەوێڵە چوومە ماڵی حاجی ئەولە، شەو لەوێ مامەوە، ئەو شەوە جارێکی تر لەگەڵ جافری پورزاو، هاوڕێی سەردەمی منداڵیم یەکترمان بینییەوە.

بۆ یەکەمجار، ئامانجی گەشتەکەی خۆم بۆ جافر باسکرد، بۆ یەکەمجار لای جافر ئەو نهێنیەم درکاند، کە هۆکاری راستەقینەی چوونم بۆ ئێران چیبووە، وتم: بۆ مەبەستێکی سیاسی چووم، ئامانجم ئەوە بوو پاش مانەوەم لەئێران، کار بۆ رزگارکردنی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بکەم.

جافر باسی ئەوەی بۆ کردم، لێرە چەند پەرۆشی چارەنووسی من بوون، چۆن و چەند هەوڵیانداوە، من لەچنگی ئێران رزگار بکەن، بمگێڕنەوە بۆ باشوری کوردستان، باسی هەوڵی بێوچانی فەتاح ئاغای فەرماندەی هێزی خەبات و نوری حەمەعەلی جێگری فەرماندەی هێزی بۆ کردم، کە چۆن پەیوەندییەکانی نێوان شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی ئێرانیان بۆ ئازادکردن و گێڕانەوەی من بەکارهێناوە.

کاتێک هەڵوێستی باشی ئەو دوو بەرپرسەی شۆڕشی ئەیلولم لەدەمی جافرەوە بیست، خەریکبوو دڵم بەرامبەر بەسەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول نەرم ببێت، بەڵام هەرچیم دەکرد، تاوانەکانی عەبدولوەهاب ئەتروشیم بیر نەدەچووەوە، کە لەساڵانی رابوردوودا بەرامبەر بەشۆڕشگێرانی رۆژهەڵات و بەرامبەر بەدانیشتوانی بێ دەسەڵاتی ناوچەی هەورامان ئەنجامی دابوون.

**زیندانی هەڵەبجە:**

لەتەوێڵەوە بەرەو گوڵپ بەڕێکەوتم، گەیشتمە کۆتایی شارەدێی بیارە، لەچایخانەکەی ملەگای چنار لامدا، چاییەکم خواردەوە، پۆلیسخانەکەی بیارەش لەملەگای چنار بوو، پۆلیسێکی خەڵکی گۆڵپم بینی، چاک و چۆنیمان کرد، وتی: ئەو ماوەیە لەکوێ بویت؟ منیش بێ سڵەمینەوە وتم: وەڵلا چووم بۆ ئێران و هاتمەوە.

من نەمدەزانی ئەو پۆلیسە بەمەبەستی سیخوڕی ئەو پرسیارەم لێدەکات، وامدەزانی لەڕووی خزمایەتی و ناسراوییەوە هەواڵم دەپرسێت، بۆ رۆژی دواتر، پۆلیسخانەی بیارە پەڕاوێکیان بۆ کوێخای گوندی گوڵپ نارد:

دەبێت بەزووترین کات داواکراو فایق محەمەد ئەحمەد، بنێرن بۆ بنکەی پۆلیسی بیارە.

لەگەڵ یەکێک لەخزمەکانم چووم بۆ بیارە، پۆلیسی بیارە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردم، رەوانەی پۆلیسخانەی خورماڵیان کردم، لەخورماڵ رەوانەی پۆلیسخانەی هەڵەبجەیان کردم، لەپۆلیسخانەی هەڵەبجە زیندانیکرام. بەرپرسی پۆلیسخانەی هەڵەبجە عەلی حەمە گیانە بوو، هەواڵی بۆ خزمەکانم نارد، بەڵکو کەفیلێکم بۆ پەیدا بکەن با ئەمشەو لەزیندان نەمێنێتەوە. خاڵۆ باقی و خاڵۆ عارف، چووبوونە لای ئەنوەری خەزانی هونەرمەند، ئەو شەوە ئەنوەری خەزان بوو بە کەفیلم، شەو لەزیندان دەرچووم. بۆ رۆژی دوایی پۆلیسی هەڵەبجە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردم، ئەوکات جەمال نامق قائیمقامی هەڵەبجە بوو، بەبڕیاری جەمال نامق ئازاد کرام، تاوانی بڕینی سنوری وڵاتیان لەسەر هەڵگرتم.

دوای ئازادبوونم لەزیندان، سکاڵامان لەسەر ئەو پۆلیسە تۆمارکرد، کە سیخوڕی لەسەر کردبووم، لەبنکەی پۆلیسی بیارەوە کارەکەی گواسترایە بۆ بنکەیەکی دووری ناوچەی هەورامان.

**یەکەمی ناوەندی شارەزوور:**

لەگەڵ ئەوەشدا کە لە پۆلی سێی ناوەندیدا، زۆربەی کاتی خۆمم بەبیرکردنەوەی سیاسی دەبردەسەر، بەڵام لەخوێندن دوانەکەوتم، تاقیکردنەوەکانم لەکاتی خۆیدا تەواوکرد، کاتێک لەئێران گەڕامەوە، ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی بەکەلۆری پۆلی سێی ناوەندی دەرچوبوون، لەبەرئەوەی بەیەکەمی قوتابخانەی ناوەندی شارەزور دەرچووم، پاداشت کرابووم، بەڵام کەس پاداشتەکانی بۆ وەرنەگرتبووم، پاداشتەکان لەقوتابخانە مابوونەوە، کە گەڕامەوە پاداشتەکانم وەرگرت.

یەکێک لەپاداشتەکان، قائیمقامی هەڵەبجە پێشکەشی کردبووم، بەلای منەوە گەورەترین پاداشت ئەوەبوو کە قائیمقام لەزیندانی هەڵەبجە ئازادی کردم، تاوانی بڕینی سنوری لەسەر لابردم.

پۆلی سێیەمی ناوەندیم تەواوکرد، هەندێک لەخزم و ناسیاوەکانم، دەیانوت ببە بەکارمەندی حکومەت، موچەیەک بەدەستبێنە، خۆت و دایک و براکانت بژێنە. هەندێک لەخزم و ناسراوەکانی تر دەیانوت، دوای پۆلی سێ، ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ تەواوبکە، بۆئەوەی زوو خوێندن تەواوبکەیت، ببیت بەکارمەندو گوزەرانتان باش بکەیت.

ئەوکاتانەی ئەو کەسانە ئەم جۆرە قسانەیان بەگوێمدا دەدا، هەستم نەدەکرد کێشەیەکی ئابووری جدیمان هەیە، حەزم نەدەکرد لەسەرەتای تەمەنمدا ببم بە کارمەند، حەزیشم نەدەکرد بەبێ تەواوکردنی زانکۆ، کۆتایی بەخوێندن بێنم. بۆیە گوێم لەو کەسانە نەگرت کە دەیانویست بمکەنە کارمەند، یان بمنێرن بۆ ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ.

بڕیارمدا لەقۆناغی ئامادەییدا، لەسەر خوێندن بەردەوام بم، لەسلێمانی بەشی ناوخۆیی هەبوو، خوێندکاری هەژاری دەرەوەی شارەکانی وەردەگرت، بۆئەوەی سوود لەبەشی ناوخۆیی وەربگرم، هەڵبجەم بەجێهێشت، جارێکی تر چووم بۆ سلێمانی، لەقوتابخانەی ئامادەیی سلێمانی درێژەم بەخوێندندا. داواکاریم بۆ بەشی ناوخۆیی بەرزکردەوە، لەبەشی ناوخۆیی وەرگیرام.

**فەتاح ئاغا[١٥]:**

دوای بەیانی ١١ ئازار، حکومەتی عێراق مووچەی خانەنشینی بۆ خانەوادەی شەهیدان بڕییەوە، بەگوێرەی یاسا، بڕێکی موچەی خانەنشینیەکە بەر دایک و باوکی شەهید دەکەوت، دایک و باوکی باوکم، لەژیاندا مابوون، بەشی خۆیان لەو خانەنشینیەی باوکم وەردەگرت، بەو شێوەیە بڕێکی کەمی خانەنشینییەکە بۆ ئێمە دەمایەوە. من و براکانیشم هەر هەموومان قوتابی بووین، کارمان نەبوو، خەڵک بەچاوی بەزەییەوە سەیری دەکردین، وایاندەزای لەبرساندا دەمرین.

لەو سەروبەندەدا سەردانی شارەدێی تەوێڵەم کرد، چوومە ماڵی پوورم، پوورە سۆسەنم وتی: بۆچی سەردانێکی فەتاح ئاغا ناکەیت؟ داوای هاوکاری لێبکەیت، منیش دوای سەردانەکەی ساڵی ١٩٧٠ بارەگای بارزانی، بەرامبەر بەبەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول رەشبین ببووم، وتم: پوریَ ئەوانی تر ئاغا نەبوون هێندە لەگەڵمدا خراپ بوون، هاوکارییان نەکردم، ئەم فەرماندەیە ئاغاشە، هەر بڕوام پێی نییە، ئامادە نیم سەردانی بکەم. پوورم وتی: فەتاح ئاغا پیاوێکی زۆر باشە، فەرماندەی هێزی خەباتە، نوری حەمەعەلی جێگری هێزە، دۆستی ئێمەیە، پێیدەڵێم قسە لەگەڵ فەتاح ئاغا بکات، دوای تەواوبوونی ئەو گفتوگۆیە، بەسەردانی فەتاح ئاغا رازی بووم.

بۆ رۆژی دوایی، لەگەڵ نوری حەمەعەلی سەردانی فەتاح ئاغام کرد، کە چوومە ژوورەوە، فەرماندە لەپشت مێزەکەی خۆیەوە هەستایە سەرپێ،

---

١٥ فەتاح محەمەد ئەمین ساڵی ١٩٤٠لە گوندی نۆرکی ناوچەی شارباژێر لە دایک بووە.ساڵی ١٩٨٠، لە شۆرشی گولاندا، لە شەڕێکی ناوچەی حاجی ئومەران، شەهیدبوو.

بەرەو لای من هات، بەڕوویەکی خۆشەوە تەوقەی گەرمی لەگەڵ کردم، فەرمووی دانیشتنی لێکردم، هەواڵی دایکم و براکانمی پرسی، ئەوە یەکەمینجار بوو کەسێک بەو شێوەیە پێشوازیم لێبکات، وەک خەڵک دەڵێن بەپیاوم بزانێت، لەوکاتەدا هەستم بەگرنگی خۆم دەکرد، دڵم زۆر خۆشبوو.

دوای گفتوگۆ، فەتاح ئاغا وتی: زانیومە قوتابییەکی زیرەکی، کوڕی شەهیدێکی قارەمانیت، بۆیە بڕیارمدا لەنەسریەی هێزی خەبات، مانگی چوار دینارت بۆ ببڕمەوە، بۆئەوەی خوێندنی پێ تەواو بکەیت، کە وای وت خەریک بوو لەخۆشیاندا شاگەشکە دایدەگرتم، وتم منیش ئەو چاکەیەی تۆم لەبیرناچێتەوە.

دوای کەمێکی تر، فەتاح ئاغا، عەرەب-ی بانگ کرد، عەرەب پێشمەرگەیەکی خوێندەواری خەڵکی بیارە بوو، سکرتێری فەتاح ئاغا بوو، بەعەرەبی وت: بڕیارەکە بنووسە با ئیمزای بکەم، بڕیارەکەی ئیمزا کرد، هەر لەوێدا فەتاح ئاغا کۆپییەکی بڕیارەکەی دامێ، بەگوێرەی ئەو بڕیارە، لەنەسرییەی هێزی خەبات، مانگانە چوار دینار هاوکاری دەکرێم. فەتاح ئاغا وتی: با کۆپییەکی بڕیارەکە لای خۆت بێت، ئەگەر رۆژێک من لەم هێزە نەمام، کەسێکی تر هاتە شوێنی من، با لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکە بەردەوام بێت، هاوکارییەکەت نەبڕێت.

هەر ئەو رۆژە، فەتاح ئاغا نامەیەکی تری بۆ نووسیم بۆ لقی چواری پدک لە سلێمانی، لەنامەکەدا داوای لەلقی چوار کردبوو، هاوکاریم بکەن.

دوای چەند رۆژێک چووم بۆ سلیمانی، نامەکەی فەتاح ئاغام برد بۆ لقی چوار، بەرپرسانی لقی چوار نەک هەر هاوکارییان نەکردم، ئامادە نەبوون بشمبینن، وەڵامی نامەکەیان بۆ گێڕامەوە بۆ پرسگەی لق، وتبوویان توانای ئەوەمان نییە هاوکاری بکەین.

لەڕێگەی عەزیزی حاجی ئەولەوە، بۆ ماوەی دوو ساڵ، هاوکارییەکەی هێزی خەباتم پێدەگەیشت، باری داراییم باشبوو، لەبەشی ناوخۆیی سلێمانیش وەرگیرام، لەئامادەیی سلێمانی لەسەر خوێندن بەردەوام بووم.

**خانووی شەهیدان:**

لە پۆلی پێنجی زانستی بووم، براکانی ترم لە قۆناغی خوێندنی ناوەندیدا بوون، بۆ تەواوکردنی خوێندنی ئەوان، گوڵپمان بەجێهێشت و لەهەڵەبجە نیشتەجێبووین، منیش حەزم دەکرد لەگەڵ دایکم و براکانمدا بژیم، دەستم لەبەشی ناوخۆیی سلێمانی هەڵگرت، جارێکی تر لەسلێمانیەو گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە، بۆئەوەی هەموومان پێکەوە بژین.

لەئامادەیی هەڵەبجە، درێژەم بەخوێندنی پۆلی پێنجی زانستی دا، لەخانوویەکی گەڕەکی کانی عاشقان دوو ژوورمان بەکرێ گرت، ماڵی ئێمەو خاوەن ماڵەکەو ماڵێکی تر لەیەک خانوودا بووین، شوێنەکەمان تەنگ بوو، ئازادیمان سنوورداربوو. بۆ خانوویەکی سەربەخۆ دەگەڕاین، لەگەڕەکی شەهیدان خانووی چۆڵ زۆربوو، دەمانویست خانوو بگرین، سەیرم کرد ئەو خانوانە موڵکی بەرپرس و دەوڵەمەندەکانی هەڵەبجەن. ئەو گەڕەکە، حکومەتی عێراق بۆ خێزانی شەهیدانی وەک ئێمەی دروستکردبوو، کەچی خانویەکیان نەدابوینێ.

یەکێک لەخاڵەکانی بەیانی ١١ ئازاری ١٩٧٠، دروستکردنی خانوو بوو بۆ شەهیدانی شۆڕشی ئەیلول، لەهەڵەبجە گەڕەکێک بەناوی گەڕەکی شەهیدانەوە، بۆ خێزانی شەهیدان دروستکرابوو، ئێمە کە باوکمان شەهید بوو، خانوویان نەدابوینێ، نەمانزانیبوو ئەو خانوانە بۆ شەهیدان دروستکراون.

لەخانوی شەهیداندا کرێچی بووین، کرێچی حەسەن بەگ بووین، حەسەن بەگ لەوکاتەدا سەرلقی هێزی پێشمەرگە بوو، پێشمەرگەیەکی کۆنی شۆڕشی ئەیلول بوو، لەگەڵ باوکم پێشمەرگایەتی کردبوو، وەک وەفایەک بۆ باوکم، کرێ خانوی لێوەرنەدەگرتین.

ماوەی چەند مانگێک لەو گەڕەکەدا ماینەوە، سەیرم دەکرد چەندین کەسی وەک عەبە زروف، ساڵح هەژار، مام عەبدولخالق (تا رێکەوتنی ١١ ئازار جەلالی بوو) عومەری وەستا مەردان، عوسمانی حاجی عەولکەریم (جەلالی)و

کەسانی تر، شەهیدیان نییە، بەڵام خانوی شەهیدانیان بەسەردا دابەشکراوە، کەسانی وەک ئێمەش کە باوکمان شەهید بووە، بەگوێرەی ڕێکەوتنی ١١ ئازار خانوومان بۆ کراوەتەوە، لەو خانوانە بێبەشکراوین.
هەر ئەوکاتە گەیشتمە ئەو بڕوایە کە ئەو خانوانە موڵکی کەسانی وەک ئێمەن، دەسەڵاتدارانی ئەوکاتەی پارتی، (ناوچە و قائیقائم) لەئێمەیان دزیوە، داویانە بەو کەسانە کە شەهیدیان نییە، بەڵام دۆستی خۆیان بوون.

کورد کوشتنی عەبدولوەهاب ئەتروشی و سەردانەکەی هاوینی ١٩٧٠ بارەگای بارزانیم لەبیربوو، زوڵمێکی تری دەسەڵاتدارانی شۆڕشی ئەیلولم بینی، بۆیە لەسەر دژایەتیکردنی سیاسەتی پدک بەردەوام بووم، لەوکاتەوە وەک منداڵی شەهیدێکی شۆڕشی ئەیلول، بەتەواوی لەپارتی و شۆڕشی ئەیلول یاخی بووم، بەهەڵوێست دژایەتیم دەکردن، هەر گرووپ و ڕێکخستنێک، ڕەخنەی لەپارتی بگرتایە، بەمەرجێک لەبەرەی داگیرکەرانی کوردستاندا نەبوایە، دۆستایەتی ئەو گرووپەم دەکرد .

**کاژیك:**

لەپۆلی پێنجی ئامادەیی بووم، قوتابییەک هاوڕێم بوو، ناوی کەریم عوسمان بوو، دەربارەی سیاسەت قسەی بۆ دەکردم. دەمزانی کەریم پارتی نییە، پاش ئەوەی چەندین جار لەسەر باری سیاسی کورستان راوبۆچوونمان گۆڕییەوە، وردەوردە بۆم دەرکەوت، کەریم باس لەبەرنامەی ڕێکخستنێکی نەتەوەیی دەکات، دواتر ناوی ئەو ڕێکخستنەی لای من درکاند، لایەنە جیاکانی سیاسەتی ئەو ڕێکخستنەی بۆ من روونکردەوە، وتی: داوات لێدەکەم لەناو ریزی ئەم ڕێکخستنەدا کار بکەیت، لەوێوە بەبۆچوون و هەڵویستەکانی کاژیک ئاشنا بووم، بڕیارمدا ببمە ئەندامی کاژیک (کۆمەڵی ئازادی و ژیانەوەی یەکێتی کورد).

بۆ ماوەیەک تەنیا لەگەڵ کەریم پێوندیم هەبوو، ئەو ماوەیە بێجگە لەگفتوگۆو راگۆڕینەوە دەربارەی سیاسەتی کاژیک، چەند کتێبێکی ئەدەبیاتی کاژیکیشم خوێندەوە، وەک کاژیکنامەو هەندێک نامیلکەی تر. هەر لەوکاتەدا گروپێ نووسەرو شاعیری کورد، ئاراستەیەکی ئەدەبی نوێیان بەناوی (روانگە) پێکهێنابوو، برادەرانی کاژیک هانییان دەدام، بەرهەمی ئەو ئاراستە ئەدەبییە بخوێنمەوە. زۆربەی بۆچوونەکانی ئەوکاتەی کاژیک بەلامەوە راستبوون، بەڵام یەکێک لەو بۆچونانەی ئەوکاتە کەریم بەمنی وت، نەدەچوو بە عەقڵمدا، کەریم دەیوت: دوژمنی سەرەکی گەلی کورد یەکێتی سۆڤیەتە، نازانم مەبەستی کۆمونیزم بوو، یان مەبەستی دەوڵەتی سۆڤیەتی بوو، یان مەبەستی هەردووکی بوو.

لەناو کاژیکدا گرنگی بەپەروەردەی ئەندامان دەدرا، گرنگی بەدیسپلینی حزبی دەدرا، بەوردی چاودێری ئەندامان دەکرا، بۆنموونە کەریم زۆر چاودێری منی دەکرد، بزانێت ئەو کاژیکنامەیەی بەمنی داوە دەیخوێنمەوە یان چی لێدەکەم، ئایە نایدەم بەپارتییەکان، یان نایدەم بەشیوعیەکان؟، رۆژێکیان بەبێ بۆنەو بەبێ کار، کەریم هاتە ماڵەوە، یەکسەر داوای ئەو کاژیکنامەیەی لێکردم کە چەند رۆژ لەوەوبەر پێیدابووم، منیش کتێبکەم بۆ دەرهێنا، دامە دەستی، سەیری سیمایم کرد، ئاسودەییم تێدا بینی، وام لێکدایەوە ترسی بووە کتێبەکە لای خۆم نەبێت، کە بینی کتێبەکە لای خۆمە، لەسەرو سیمایدا دڵخۆشی و رەزامەندی دەرکەوت.

دوای ماوەیەک کارکردن لەگەڵ کەریم عوسمان، محەمەدی غەفور شەریف پەیوەندی پێوەکردم، محەمەد قوتابی ئامادەیی هەڵەبجە بوو، ماوەیەکیش تەنیا لەگەڵ ئەودا پەیوەندیم هەبوو. رۆژێک محەمەد پێیوتم، کۆبوونەوەمان هەیە، کات و شوێنەکەی بۆ دانام، سەیر دەکەم شوێنەکە ماڵی جافری حاجی ئەولەی پورزاو هاورێمە، کە چوومە ژوورەوە، جافرو ئەفراسیاب (حاکم ئەفراسیاو)و محەمدی غەفور شەریف دانیشتبوون، چاوەڕوانی منیان دەکرد،

محەمەد بەرپرسی شانەکەمان بوو، یەکەم کۆبوونەوەی بەکۆمەڵی کاژیکی پێکردین.

ڕێکخستنی کاژیک لەهەڵەبجە، لەڕێگەی دوو کەسەوە گەشەی کردبوو، یەک لەوانە مامۆستا عوسمان بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو، لەئامادەیی هەڵەبجە وانەی دەوتەوە. ئەوی تریان حەمەعەلی بوو، کادری کارگێڕی هێزی خەبات بوو، خەڵکی هەڵەبجە بوو. باسی ئەو دوو کەسە دەکرا کە لەهەڵەبجە ڕۆڵیان لەدرووستکردنی ڕێکخستنی کاژیکدا گێڕاوە.

خەریکبوو شەڕی نێوان حکومەتی عێراق و شۆڕشی کورد دەست پێبکاتەوە، بەرپرسەکەم بانگی کردم، نامەیەکی دایە دەستم، وتی ئەو نامەیە ببە بۆ سلێمانی، دوو سێ ناونیشانی بۆ دیاریکردم، دەبوو لەو شوێنە نامەکە رادەستی کەسێک بکەم، ناونیشانی یەکەم، فولکەی شەقامێکی شاری سلێمانی بوو، لەکاتی خۆیدا گەیشتمە فولکەکە، کەس نەهات نامەکەم لێوەربگرێت.

کاتێک بینیم کەس ئامادە نییە نامەکەم لێوەربگرێت، ئەو شوێنەم بەجێهێشت، رووم کردە ناونیشانی دووەم، ناونیشانی دووەم بەشی ناوخۆیی قوتابیانی زانکۆی سلێمانی بوو، کە گەیشتمە بەشە ناوخۆییەکە، سەروەتی حاجی عزەت هات بەپیرمەوە، ئەوکاتە سەروەت قوتابی کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سلێمانی بوو، سەروەت خەڵکی هەڵەبجە بوو، پێشتر دەمناسی، نامەکەی لێوەرگرتم، شەو لەبەشی ناوخۆیی لای ئەو مامەوە، بۆ رۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

کاژیک لەناو خەڵکی رۆشنبیرو قوتابییاندا گەشەی کردبوو، دوای ساڵی ١٩٧٠، کاژیک لەناو ئەو کەسانەشدا گەشەی کرد، کە ساڵانی ١٩٦٦-١٩٧٠سەر بەباڵی جەلالی بوون.

زۆرێک لەکاژیکەکانی هەڵەبجە، بەتایبەت ئەوانەیان کە لەڕابوردوودا سەر بەباڵی جەلالی بوون، دوای کارەساتی ١٩٧٥، لەگەڵ پاشەکشەی کاژیک و

چالاکبوونی کۆمەڵەو دروستبوونی شۆڕشی نوێ، پەیوەندییان بەڕیزەکانی یەک وە کرد، زۆربەیان بوون بە ئەندامی کۆمەڵە، ژمارەیەکیشیان پەیوەندیان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد.

**جەمال نامق و نەوشیروان فوئاد:**

کاتێک فەتاح ئاغا مانگانە چوار دیناری نەسرییەی هێزی خەباتی بۆ بڕیمەوە، ئاماژەم بەوە کرد کە نامەیەکیشی دامێ، وتی ئەگەر لەفەرماندەیی هێز دوورکەوتمەوە، هەر کەسێکی تر هاتە شوێنم، ئەو نامەیەی پیشان بدە، بۆئەوەی بەبەردەوامی هاوکارییەکەت بداتێ.

فەتاح ئاغا بۆ سنوری هێزی پێنجوێن گوێزرایەوە، جەمال نامیق لەشوێنەکەی فەتاح ئاغا بوو بە فەرماندەی هێزی خەبات. بۆئەوەی هاوکارییەکەی خۆم لەهێز وەربگرم، سەردانی جەمال نامیقم کرد، لەوکاتەدا، قادر کۆکۆیی فەرماندەی بەتالیۆن، لای جەمال نامیق دانیشتبوو. چوومە پێشەوە، نامەکەی فەتاح ئاغام پیشانی جەمال نامیق دا، جەمال نامیق وتی پارەمان نییە، ناتوانین هاوکاریت بکەین، ئەگەر دەتەوێت دەتکەین بەپێشمەرگە. وەڵام و پێشنیارەکەی جەمال نامیقم بەدڵ نەبوو، قادر کۆکۆیی هەوڵیدا جەمال نامیق رازیبکات کە هاوکارییەکەم نەبڕێت، بەڵام جەمال نامق رازی نەبوو، منیش بەجەمال نامیقم وت پێشمەرگایەتی ناکەم، بە دڵشکاوی گەڕامەوە.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٤وە، بەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول سنوری دەسەڵاتی حکومەتی عێراقیان بەجێدەهێشت، نەوشیروان فوئاد مەستی یەکێک لەئەفسەرە گەورەکانی سوپای عێراق بوو، لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا لەسنوری هەورامان فەرماندەی هێزی پێشمەرگە بوو، لەگەڵ جەلالییەکان جیابووەوە، دوای گەڕانەوەی جەلالییەکان بۆ ناو ڕیزەکانی شۆڕشی ئەیلول، نەوشیروان فوئاد مەستی پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کردبووەوە.

خەریكبوو شەڕی پێشمەرگەو سوپای عێراق دەستیپێبكاتەوە، لەوكاتەدا نەوشیروان فوئاد مەستی هاتبووە گوڵپ، هەواڵی منداڵەكانی شەهید حەمە گوڵپی پرسیبوو، كەسێكی نزیكمان باپیرەمی بۆ لای نەوشیروان بردبوو، دوای هەواڵپرسین، ١٠ دیناری عێراقی هاوكاری بۆ ناردبووین، ئێمەش بەوەمان نەزانیبوو، خزمێكی نزیكمان هاتەلام، وتی هاوكارییەكەی نەوشیروان فوئاد مەستیتان پێگەیشت، من و دایكم لەو هاوكارییە ئاگادار نەبووین، دوای ئەوەی چەند رۆژێكی تر چاوڕوانمان كرد، باپیرەم هاوكارییەكەی بۆ نەناردین، بەبرا بچووكەكەمم وت وەرە با بچینە سەریان، هاوكارییەكەیان لێبسێنینەوە، براكەم لەگەڵم نەهات، گرنگی بەو مەسەلەیە نەدا.

بەرامبەر بە هەڵویستەكەی دوو سێ رۆژی رابوردووی جەمال نامیق، كە هاوكارییەكەی هێزی خەباتی بڕیم، بەرامبەر بەو هەڵویستە ناداپەروەریەی باپیرەم كە هاوكارییەكەی نەوشیروان فوئاد مەستی بۆ نەناردین، بەرامبەر بەهەڵویستی نامیقی برام كە نەهات لەگەڵم، بۆئەوەی بچین داوای هاوكارییەكە لەماڵی باپیرەم بكەین، تا دەهات زیاتر نیگەران دەبووم، بڕیارمدا خۆم بەتەنیا بچمە سەر ماڵی باپیرەم، داوای هاوكارییەكە بكەم.

هاوینی ساڵی ١٩٧٤ بوو، ماڵی باپیرەم لەدەشتێكی نزیک گوڵپ بەناوی داری بەرمەڕان كیاریان كردبوو، كەپریان دروستكردبوو، كاتێک گەیشتمە لایان زۆر تووڕەبووم، دەستمكرد بەسەرزەنشتیان، داوای هاوكارییەكەی نەوشیروان فوئاد مەستیم لێكردن، ئامادە نەبوون كەمێكیش لەدە دینارەكەمان بۆ بگێرنەوە، بیرم لەوە كردەوە شەڕیان لەگەڵ بكەم، بەڵام لەوكاتەد ئەوان شەش كەس بوون، سێ پیاوو سێ ژن، باپیرەم و دوو مامم، نەنكم و دوو پوورم، لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەر شەڕیان لەگەڵ بكەم دەیدۆڕێنم، ئەبێت بیر لەپلانێكی تر بكەمەوە، تا بتوانم زۆرترین زیانیان پێبگەیەنم.

کەمێک بێدەنگ بووم، پاشەکشەم کرد، لەوان وابوو من بەزیوم و بەبێ وەڵامدانەوە دەگەڕێمەوە، بەڵام من پلانێکی باشم دانا، پلانەکە ئەوەبوو چاوەڕوان بکەم تا شەو دادێت و دنیا تاریک دەکات، کە شەوداهات هەرچی تەماتەو خەیارو رووەکی تری هاوینەیان هەیە، لەبنەوە هەڵیبکەنم، بڕی دە دینار زیاتر زیانیان پێبگەیەنم. هەر وامکرد، دوای ئەوەی شەو داهات و تاریکی کرد، هەموو خەیارو تەماتەو روەکە هاوینەکانی تریانم، لەبنەوە هەڵکێشا. بۆ رۆژی دوایی، کاتیک بینیان چیم لێکردوون، کەوتنە هات و هاوار، منیان وەک شێت و سەرەڕۆ بەخەڵکی گوند ناساند.

**بڕوام بە سەرکردایەتی نەبوو:**

بەرەو دەستپێکردنەوەی شەڕی سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگە دەچووین، پۆل پۆل خەڵک پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد، زۆرینەی خەڵکی کوردستان بەسەری مەلا مستەفا سوێندی دەخوارد، منیش بەپێچەوانەی خەڵکەوە، نە حەزم دەکرد ببم بەپێشمەرگە، نە بەسەری مەلا مستەفا سوێندم دەخوارد. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو کاتێک سەیری بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلولم دەکرد، تا دەهات بڕوام بەسەرکەوتنی شۆڕش لاواز دەبوو، شکستی شۆڕش، لەئایندەیەکی نزیکدا، لەهزرمدا جێگیر ببوو، بۆیە نەمدەویست ساڵێکی خوێندنم لەئەزموونێکی شکستخواردوودا بفەوتێت، دەمەویست دوور لەدەسەڵاتی شۆڕشی ئەیلول، لەخوێندن بەردەوام بم.

کە شەڕ لەنێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای عێراقدا دەستپێکردەوە، ئامادە نەبووم ببمە پێشمەرگە، پەیوەندیم بەشۆڕشەوە نەکرد، نامەیەکم بۆ کاژێک نووسی، هەڵوێستی خۆمم روونکردەوە، نووسیم، بڕوام بەسەرکردایەتی ئەو شۆڕشە نییە، ئەو سەرکردایەتییە ناتوانێت رابەرایەتی شۆڕش بکات، سەرکەوتن بەدەست نایەنێت، داوامکرد رێگەم بدەن لەناو شاردا درێژە بەخوێندن بدەم، بەڵێنمدا بەنهێنی کاری رێکخستن بکەم. لەتەویڵە نامەکەم

دایە دەستی محەمەد غەفور شەریف، کاژێک رەزامەندی نیشاندا کە نەبمە پێشمەرگەو لەسلێمانی درێژە بەخوێندن بدەم.

**رێککەوتننامەی جەزائیر:**

ساڵێک بەسەر دەستپێکردنەوەی شەڕی هێزە چەکدارەکانی عێراق و هێزی پێشمەرگەدا تێنەپەری، رۆژی ٦-٣-١٩٧٥سەدام حسەین و شای ئێران لەپەراوێزی کۆبوونەوەی وڵاتانی ئۆپیک لەجەزائیر، بەهاوکاری سەرۆکی ئەوکاتەی جەزائیر، هەواری بۆمیدیان، یەکترییان بینی و رێکەوتنێکیان ئیمزا کرد، بەرێکەوتنی جەزائیر ناوی دەرکرد. سەدام حسەین کۆمەڵێک سازشی بۆ شای ئێران کرد، بەمەرجێک شای ئێران هاوکاری شۆڕشی ئەیلول رابگرێت، کاتێک مەلا مستەفا بینی چیتر ئێران ئامادە نییە هاوکاری بکات، خەباتی چەکداری دژی عێراق راگرت، هێزی پێشمەرگەی هەڵوەشاندەوە. هەندێک لەبەرپرسەکانی شۆڕش خۆیان تەسلیمی رژێمی بەعس کردەوە، هەندێک بەرپرس لەئێران وەک ئاوارە مانەوە. کارەساتێکی گەورە بەسەر گەلی کوردا هات.

پۆل پۆل پێشمەرگە خۆیان رادەستی سوپای رژێم دەکردەوە، سوپای عێراق چەکەکانی لێوەردەگرتن، کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی رژێم، دیمەنی خۆبەدەستەوەدانی هێزی پێشمەرگەی بڵاودەکردەوە، خەڵکی کوردستان ماتەمینی و شیوەنی دەگێڕا. پرۆسەی راوەستاندنی شەڕ، هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگاکانی شۆڕشی ئەیلول، خۆبەدەستەوەدانی سەرکردایەتی و پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بەئێران و بەعێراق، ناونرا ئاشبەتاڵ.

ئەو کەسانەی جاران بەنهێنی سەر بەحزبی بەعس بوون، سەریان دەرهێنا، خۆیان ئاشکرا کرد، ئاهەنگیان دەگێڕا، لەگەڵ دام و دەزگا حزبی و حکومییەکانی بەعسدا، بۆ پشتیوانی لەحزبی بەعس، دەستیان بەچالاکی سیاسی و خۆپیشاندانی جەماوەری کرد، چەندجارێک لەشاری سلێمانی خۆپیشاندان کرا.

ڕۆژێکیان لەبەردەم سەرای سلێمانیدا وەستابووم، خۆپیشاندانێک بۆ پشتیوانی لەحکومەتی عێراق ڕێکخرابوو، کوڕێکی هەورامی بیارەیی، ناوی ئەسعەد بوو، پێش خۆپیشاندەران کەوتبوو، هوتافی دەکێشا، دەیقیڕاند کول هەورامن (هەمو هەورامان)، ئەوانی تریش بۆیاندەسەندەوە دەیانوت بەعسییە، ئەو کوڕە هەورامییە بەعسییە، هەر بەوەوە نەدەوەستا، دەیوت دارگوێزەکانیش، ئەوانی تریش دەیانوت بەعسییە، واتە هەموو هەورامان بەدارگوێزەکانیشیەوە بەعسین، ئەو ڕۆژە ناخۆشترین ڕۆژەکانی ژیانی دوای هەرەسی من بوو.

**ببە بە جیڤارا:**

دوای ڕێکەوتنی جەزائیر، شای ئێران مەلا مستەفای بانگکرد، ئاگاداری کردەوە، چیتر هاوکاری ناکات، دەبێت کۆتایی بەخەباتی چەکداری بێنیت، بارزانی بەبێ هیچ پەرچەکردارێک، بەداواکەی شا ڕازیبوو، جاڕی کۆتاییهێنانی شۆڕشی ئەیلولی دا، داوای لەهێزی پێشمەرگە کرد، شەڕ لەدژی سوپای عێراق ڕابگرن، بگەڕێنەوە بنکەکانیان، چەکەکانیان دابنێن، لەئێران ئاوارە ببن، یان خۆیان ڕادەستی عێراق بکەنەوە.

کۆتاییهێنانی خەباتی سیاسی و سەربازی شۆڕشی گەلی کورد، لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولەوە، بەتایبەت بەبڕیاری مەلا مستەفای بارزانی، کاردانەوەی توندی گەلی کوردی لێکەوتەوە، خەڵکی کوردستان کۆتاییهێنانی شۆڕشیان بەئاشبەتاڵ وەسفکرد، ئەو دەستەواژەیە تا ئەمڕۆش بەرپرسەکانی پارتی و شۆڕشی ئەیلول نیگەران دەکات. پێش ئاشبەتاڵ، زۆرینەی خەڵکی کوردستان بەسەری بارزانی سوێندیان دەخوارد، شێرکۆ بێکەسی شاعیر هۆنراوەیەکی جوانی هەبوو، دەیوت: ئەی بارزانی بۆ هەموو شتێک دەمانەوێت، تەنها بۆ مەرگ نامانەوێت.

چاودێران پێیانوایە، ئەو هۆنراوەیەی بێکەس لەناخی دڵی زۆرینەی خەڵکی کوردستان هەڵقوڵاوە، بەڵام دوای ئاشبەتاڵ، زۆرینەی خەڵکی کوردستان رووی لەبارزانی وەرگێڕا.

لەکاتی هەرەسی شۆڕشی ئەیلولدا، لەسلێمانی لەقوتابخانەی ئامادەیی هەڵکەوت بووم، لەو باوەڕەدابووم دوای کۆتایهاتنی رۆڵی مەلا مستەفا، کاژێک بەرپرسیارێتی بەردەوامی شۆڕش لەئەستۆ دەگرێت، رێگە نادات ئاشبەتاڵ ببێت، بەڵام پاش چاوەڕوانییەکی زۆر، کە مانگ زیاتری خایاند، پاش چاودێریکردنی بارودۆخ، بۆم دەرکەوت کاژێکیش، لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولدا، ئاشبەتاڵی کردووە.

تا ماوەیەک چاوەڕوانی کاژێکەکانی هاوبیرم بووم، بێن و هەواڵی بەردەوامی شۆڕشم بۆ بێنن، منیش هاوکارییان بکەم، کە هاوبیرەکانم بینیەوە، هەواڵی کاژێکم لێپرسین، هیچ وەڵامێکیان پێنەبوو، ئیتر لەکاژێک بێ هیوا بووم، دوچاری رەشبینی بووم، لەقوتابخانە لەگەڵ قوتابیاندا، لەناو خەڵکدا، بەردەوام نیگەرانی خۆمم لەهەرەسی شۆڕش نیشاندەدا، هەندێک جاریش رەفتاری تایبەتم دەنواند، بۆئەوەی خەڵک ئەو کارەساتەی لەبەرچاو بێت کە بەسەر گەلی کوردا هاتووە.

رۆژێک لەکاتی  وتنەوەی وانەی کیمیادا، دەستم بەگریان و ئاخ هەڵکێشان کرد، مامۆستا فوئاد ئەسکەندەر عەلەکە، مامۆستای کیمیا، لێمنزیک بوەوەو وتی: ئەمجۆرە هەڵسوکەوتانە سودی نییە، واز لەم لوشکە لوشکە بێنە، بخوێنەو ببە بەجیڤارا.

ئەو قسەیەی مامۆستا فوئاد لەناخەوە هەژاندمی، هیوای تێکۆشانی لەناخمدا گەشاندەوە، یەکەمجار دەستم لەڕەفتارە تایبەتەکانم هەڵگرت، دواتر دەستم بەگەڕان کرد بەشوێن بیری شۆڕشگێری جیڤارادا، بۆم دەرکەوت جیڤارا پزیشکێکی ددانی شۆڕشگێری ئەرجەنتینی بووە، سەرکردەیەکی کاریگەری شۆڕشی کوبا بووە، چەپێکی مارکسی بووە، هەوڵی داوە لەوڵاتانی

ئەمریکای باشووردا شۆڕش بکات، لەکاتی خەباتی چەکداریدا لە فەنزوێلا بەدیل گیراوەو شەهید کراوە.

ساڵێک لەوەپێش، کەریم عوسمان کێشەیەکی لەگەڵ چەپ و کۆمۆنیزمدا بۆ دروستکردبووم، وتی: دوژمنی سەرەکی کورد، یەکێتی سۆڤیەتە، لەبەرئەوەی جیڤارا لەهزرو سیاسەتدا، سەر بە بەرەی کۆمۆنیزمی یەکێتی سۆڤیەت بوو، بۆیە تاماوەیەک، بەتەواوی خۆم نەدا بەدەست جیڤارابوونەکەی مامۆستا فوئادەوە، دوای بیرکردنەوەیەکی لۆجیکی، راستی بۆچوونەکەی مامۆستا فوئادم بۆ دەرکەوت، بۆچوونەکەی کەریم عوسمانم لەکۆڵ خۆم کردەوە.

تا ئەو رۆژەی مامۆستا وتی بخوێنەو ببە بەجیڤارا، هزرم لەسەر هەڵبژاردنی جۆری خوێندنی زانکۆ جێگیر نەببوو، جاری وا هەبوو دەموت، دەچمە کۆلێژی یاساو رامیاری، بۆئەوەی باش لەسیاسەت تێبگەم، لەوێوە بتوانم بەباشی خزمەتی گەلەکەم بکەم. هەندێک جاریش دەموت دەچمە کۆلێژی سەربازی، بۆئەوەی زانستی سەربازی فێرببم، تا ببمە پێشمەرگەیەکی سەرکەوتوو، بەباشی بەشداری شۆڕش بکەم. ناوبەناویش دەموت باشترە بچمە کۆلێژی زانستی، فیزیا یان کیمیا تەواو بکەم، لەزانستی فیزیای ناوکیدا قووڵببمەوە، بۆمبی ئەتۆمی دروووستبکەم، بە بۆمبەکە هەڕەشە لەجیهان بکەم، ئەگەر مافەکانی گەلی کورد نەدەن، بۆمبێکی ئەتۆمیتان پێدا دەقێنمەوە. جارجارەش بیرم لەکۆلێژی پزیشکی دەکردەوە، بەلام ئەو رۆژە کە مامۆستاکەم لەکەسایەتی جیڤارادا، پیشەی پزیشکی و پێشمەرگایەتی پێکەوە بۆ گرێدام، هزرم لەسەر خوێندنی کۆلێژی پزیشکی جێگیربوو.

بەلی بۆئەوەی ببم بەجیڤارا، دەستم لەکاژیک شۆرد، وازم لەپەرچەکرداری سۆزداری هێنا. دوای ئەوە دەبوو یەکەم کار کە بیکەم ببم بەپزیشک، دووەم کار کە بیکەم دەبێت ببم بەشۆڕشگێڕێکی چەپ، سێیەم کار کە بیکەم دەبێت ببم بەپێشمەرگە.

دەستم بەکۆششی جدی کرد، بۆئەوەی نمرەی باش بێنم، تا لەکۆلێژی پزیشکی وەربگیرێم. دوای ئەوە هەوڵمدەدا بەبیری شۆڕشگێڕی خۆم پەروەرە بکەم، تا لەهەزری جیڤارا نزیک ببمەوە. هەڤاڵ کوێستانی لەقوتابخانەی هەڵکەوت هاوڕێ و هاوپۆلم بوو، مەیلی چەپی هەبوو، ڕۆژانە پێکەوە باسی سیاسەتمان دەکرد، باسی ئەوەمان دەکرد کورد چۆن لەم نەهامەتییە رزگاری دەبێت، لەسەر ئەو گفتوگۆیانە، چەند کەسێک لەقوتابیانی بەعس ڕێگەیان پێگرتین، هەڕەشەیان لەمن وهەڤاڵ و عەدنان شاسوارو ئیبراهیم خدر کرد، وتیان ئەگەر لەسەر ئەو جۆرە قسانە بەردەوام بن، سزاتان دەدەین.

هەڤاڵ لەنووسینی هۆنراوەدا خاوەنی زمانێکی بەپێزو پاراو بوو، لەدوای هەرەس، چەندان هۆنراوەی شۆڕشگێڕی نووسی، یەک لەهۆنراوەکان باسی لەقوربانیدانی کچە گەریلایەکی ڤێتنامی دەکرد، ناوی مۆنیکا بوو، لەهۆنراوەکەدا دەیخواست، چۆن کچانی ڤێتنام بەشداری شۆڕشی ڤێتنامیان کردووە، کچانی کوردیش، بەشداریی شۆڕشی کوردستان بکەن، ئەو هۆنراوەیەی هەڤاڵ، کاریگەری زۆری لەسەر هەستی شۆڕشگێڕی من کرد. ئێستەش دێڕی یەکەمی هۆنراوەکەم لەبیرماوە کە دەڵێت:

**شەو لەخەوما مۆنیکام دی،**
**جانتای شانی،**
**هەگبەیەکی پڕ فیشەک و ئاو و نان بوو،**
**بۆیاخی سوری نینۆکی،**
**خوێنی خەستی ڕەنجبەران بوو.**

**پلەی سێهەم:**

لەپۆلی شەشی زانستییدا، بۆ تاقیکردنەوەی بەکەلۆری وەرگیرام، دەبوو بۆ تاقیکردنەوەی بەکەلۆری سەعی باش بکەم، بۆئەوەی نمرەی باش بێنم و لەکۆلێژی پزیشکی وەربگیرێم. لەسلێمانیەوە گەڕامەوە بۆ گوڵپ، بەرنامەی سەعیکردنی جدیم دارشت، یەکەم کار کە کردم، داوام لەبابا سەلیم کرد، بەکافرمانەکەی (موس) سەرم بتاشێت، باپیرەم سەری پاقلیر کردم، ئەوە یەکەمجار بوو بابا سەلیم هاوکاریم بکات.

دووەم کار کە کردم، لەسەرەتای رۆژەوە تا ئێوارە دەچوومە باخی کانی ژنان*، لەسێبەری درەختەکاندا سەعیم دەکرد، کانی ژنان باخ و کانییەکی جوانە، لەسەر رێگەی گوڵپ-سەرگەتە، باخەکە لەلایەن خاڵێکی باوکمەوە سەرپەرشتی دەکرا، لەدامێنی باخەکەدا ئێمەش چوار دۆنم زەوی بەراومان هەبوو، ساڵانە دەمانکرد بەکشتوکاڵ. هەستم کرد لەکاتی سەعیکردنی ناو باخەکەی کانی ژناندا، خزمەکانم وەک جاران نین، مۆڕەم لێدەکەنەوە، لەدوورەوە بەڕوویەکی گرژەوە سەیریان دەکردم، سیمایان نیشانی دەدا، کە نارازین لەباخەکەیاندا سەعی بکەم. رۆژێک گەڕامەوە ماڵەوە، باسی دوورەپەرێزی و مرووموٚنی خزمانم بۆ دایکم کرد، دایکم وتی بۆ نەتزانیوە لەیەکتری زویر بووین، ماوەیەکە پێکەوە قسە ناکەین، وتم نەخێر، ئەو هەواڵەم پێناخۆش بوو، بەڵام لەبەر هەستیاری کاتی سەعیکردن، هیچ پەرچەکردارو هەڵوێستێکم نیشان نەدا، لەسەر سەعیکردن بەردەوامبووم.

بەشداری تاقیکردنەوەی بەکەلۆری پۆلی شەشی زانستیم کرد، پێش ئەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەی پۆلی شەشی زانستی دەربچێت، شەوێک خەوم بینی، لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەرگیرابووم.

دوای ئەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوە هاتەوە، لەسەر ئاستی پارێزگای سلێمانی پلەی سێیەمم بەدەستهێنا، هەریەک لەنەبەز ئیسحاق و شیروان میرزا، لەئامادەیی سلێمانی، پلەی یەکەم و دوەمی پارێزگای سلێمانیان بەدەستهێنا، منیش یەکەمی قوتابخانەی ئامادەیی هەڵکەوت بووم، سێیەمی پارێزگای سلێمانی بووم.

**کۆلێژی پزیشکی بە تۆ تەواو ناکرێ:**

بەسەرکەوتنی تاقیکردنەوەی پۆلی شەشی زانستی دڵخۆش بووم، هەندێک لەخزم و هاوڕێکانیشم بەشداری ئەو دڵخۆشیەیان دەکردم، جافری خزم و هاوڕێم، جارێکی تر پەیدا بوەوە، بەدڵخۆشییەوە سەردانی کردم، وتی:

دایکم هاتووە بۆ سلێمانی، با پێکەوە سەردانی بکەین، بڵێین تۆ سێیەمی سلێمانی بوویت، دەتوانی بچیتە کۆلێژی پزیشکی و ببیت بەپزیشک، منیش ئەو پێشنیارەی جافرم پێخۆشبوو، پێکەوە رۆیشتین بۆ لای پوورە سۆسەن، لەماڵی باقی هەورامی بوو، هەر کە گەیشتین، جافر بەوپەری خۆشحاڵییەوە وتی:

دایکە فایق بەپلەیەکی باش قۆناغی شەشی زانستی بڕیوە، دەیەوێت بچێتە کۆلێژی پزیشکی و ببێت بە پزیشک، پوورە سۆسەن بەساردیەوە وەڵامی جافری دایەوە، رووی کردە من و وتی:

رۆڵە تۆ کوڕە هەژاری، ناتوانی کۆلێژی پزیشکی تەواو بکەیت؟ !! ئەو قسەیەی پورە سۆسەن من و جافری بێدەنگ و نیگەران کرد، لەوکاتەدا هەستم بەمەترسی هەژاری کرد، دەترسام هەژاری رێگریم لیبکات بۆئەوەی کۆلێژی پزیشکی تەواو بکەم، هەر لەوکاتەوە لەدڵی خۆمدا، بیرم لەبەرنامەیەک دەکردەوە، چۆن سەرکەوم بەسەر هەژاریدا، چۆن نەهێڵم هەژاری رێگەی پزیشک بوونم لێبگرێت.

# ٣

# له گوڵپەوە بۆ موسڵ

خەونەکـەم هاتـەدی، پـایزی ١٩٧٥لـە کـۆلێژی پزیشـکی زانکـۆی موسـڵ وەرگیـرام. لە پارێزگـای سـلێمانی، مـن، ئاورنـگ قـادر، سـتار، میـران عومـەر، عـەباس حـاجی عـەباس، لـەکۆلێژی پزیشـکی زانکـۆی موسـڵ وەرگیرابـووین. لەقوتابخانـەی کـۆلیژی بەغـدا، وەرزێـری فـەتاح شـاڵی وەرگیرابـوو، وەرزێـر خەڵکی سلێمانی بوو، بـەڵام لـەو کاتـەداماڵیـان لەبەغدا بـوو. لەقوتابخانەیـەکی شاری موسڵیش تەلار عەبدولڕەحمان وەرگیرابوو، تەلار خەڵکی سلێمانی بوو، لەو کاتەدا ماڵیان لەموسڵ بوو. بە گشتی سـاڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ حـەوت قوتـابی خەڵکی پارێزگای سلیمانی، لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەرگیراین.

لەخولـەکانی پـێش ئێمەشـدا، دەیـان قوتـابی کـوردی خـەڵکی سـلیمانی و هەولێرو دهۆک و کەرکوک، لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەرگیرابوون، لەکۆلێژ دەوامیان دەکرد. بـەهۆی ئـەوەوە کـە ژمارەیـەکی زۆر قوتـابی کـورد لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ هەبوون، هەستمان بەغەریبی نەدەکرد.

لەبەرئـەوەی تـەلار و وەرزێـر، ماوەیـەک لەکوردسـتان دوورکەوتبونـەوە، هاوڕێی بەغدایی و موسڵاویان هەبوو، کەمتر تێکەڵاوی قوتابیـە کوردەکانیـان

دەکرد، من ومیران و ستارو ئاورنگ و عەباس، لەکوردستانەوە چوبووین، لەسەرەتادا پەیوەندیمان بەهێز بوو. ئاورنگ کچ بوو، کەمێک لەمن و میران و ستار دوورکەوتەوە. بەهۆی بۆچونی کۆمەڵایەتی جیاوازەوە، ناکۆکی لە نێوان من و ستارو میراندا درووستدەبوو، میران عومەر دەیوت من لەبەگەکانی سلێمانیم، پۆزی بەگایەتی لێدەدا، ستار دەیوت من لەشێخەکانی سۆڵەم، برایەکم ئەندازیارە، پۆزی شێخایەتی و دەوڵەمەندی لێدەدا، هەردووکیشیان بەڕاستەوخۆو ناراستەوخۆ بەمنیان دەوت لاولاو، واتە لادێی. منیش هیچم نەبوو پۆزی پێوە لێبدەم، بێجگە لەشەهیدبونی باوکم، لەوکاتەش دا، دوای ئاشبەتاڵ، کەس نەیدەتوانی باسی کوردایەتی وشەهید بکات.

ستارو میران مەیلی کوردایەتیشیان نەبوو، ئیتر شتێکی هاوبەش لەنێوان من و ستارو میراندا نەما، پەیوەندی نێوان من و ستار و میران ساردی و دوورکەوتنەوەی بەدوادا هات. لەپۆلی یەکەمی کۆلێژدا، ستارو میران و ئاورنگ دەرنەچوون، من و عەباس دەرچووین، چوینە پۆلی دوەمی کۆلێژ و ئەوانمان بەجێهێشت، بەوشێوەیە پەیوەندی من و میران و ستار کۆتایی هات. پەیوەندی من و عەباس تا دەهات پێشدەکەوت، عەباس کوڕی ئاغاکانی قەڵادزێ بوو، بەڵام تا بڵێی کوڕی چاک و نەرم ونیان و سادە بوو.

لەشارەکانی تری کورستانەوە، چەند قوتابیەکی کورد، لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەرگیرابوون، تارق جاف و بورهان عومەر خەڵکی کەرکوک بوون، محەمەد یوسف محەمەد فازل و سەلاح خەڵکی ئاکرێ بوون لەهەولێر دەژیان، بەیان قادر خەڵکی هەولێر بوو، سالح عیسا خەڵکی ئامێدی بوو، لەموسڵ دەژیا، ئەمجەد حاجی سەرحان خەڵکی دهۆک بوو، فائز خەڵکی زاخۆ بوو، عەبدولا خەڵکی کۆیە بوو لەموسڵ دەژیا، پەیوەندیم لەگەڵ ئەو قوتابیانەدا باش بوو. پەیوەندیم لەگەڵ قوتابیەکانی دەورەی پێش خۆم، کەخەڵکی سلێمانی و هەولێرو کەرکوک و دهۆک بوون، باش پێشکەوت، لەپۆلی سێی کۆلێژدا قەلەندەرو شێرکۆم ناسین، لەپۆلی دووی کۆلێژدا، تاهیر هەورامی، ئازاد ئەحمەد، ئیسماعیل حەمەئەمین، حەمەنوری، مژدە ئیسماعیل رەشان و مستەفا عەبدولڕەحمان هاوڕێم بوون.

**یەکێتی خوێندکارانی کوردستان:**

کە چوینە زانکۆی موسڵ، تا لە بەشی ناوخۆیی وەرگیراین، زۆربەی خوێندکارە کوردەکان، لەئوتێل شەرقولئەوسەتی گەڕەکی بابتۆپی موسڵ بووین، لەگەڵ چەندان قوتابی کوردی کۆلێژی پزیشکی، کۆلێژی ئەندازیاری، کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابوری، پەیمانگاکان، بۆ ماوەیەک لەو ئۆتێلە بووین. شەوانە لەژوورێکدا کۆدەبووینەوە، باسی بارودۆخی کوردستانمان دەکرد، باسی پیکهێنانی حزبی سیاسیمان دەکرد. ئەو سەردەمە چەپگەرایی مۆدێل بوو، ئەو کەسەی کوردپەروەر بوایە، دەبوو چەپ بوایە، دەبوو دژی سەرکردایەت پارتی و دەوڵەتی ئێران و ئەمریکاو ئیسرائیل هەڵویستی نیشانبدایە، لەبەرئەوەی ئەو هێزانە لەپشتی ئاشبەتاڵی شۆڕشی کوردەوە بوون.

لەکۆبونەوەکاندا، هەریەکێک لەئامادەبوان باسی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی خۆی دەکرد، خۆی بەئامادەبوان دەناساند.

لەمن وابوو ئەو کۆبونەوانە خۆڕسکن، بەلام دوایی دەرکەوت، ئەو کۆبونەوانە لەلایەن یەکێتی خوێندکارانی کوردستانی (یخک) سەربە ینک وە رێکدەخران، ئامانج لێی رێکخستنی قوتابیانی کورد بوو.

من لەڕێگەی دەنگوباسەوە ئاگاداری دامەزراندنی ینک بووم، دەمزانی ینک لەدەرەوەی ولات دامەزراوە، بەلام لەبەرئەوەی لەناو شارەکاندا بەنهێنی کاری دەکرد، لەنزیکەوە رێکخستنی ینک-م نەدەناسی. دوای ماوەیەک لەکۆبونەوەکانی ئۆتێل رۆژهەلاتی ناوەراست، رۆژێکیان شێرکۆ عەبدولا سەردانی کردم، وتی: با پیاسەیەک بکەین، وتم: باشە. لەشەقاماکانی ناو شاری موسڵدا دەستمان بەپیاسە کرد، باس باسی رەوشی سیاسی ئەو کاتەی کوردستان بوو، دواتر باسی دامەزراندنی ینک کرا.

دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، خەڵکی کوردستان رەشبین بوون، حکومەتی بەعس بەسێکوچکەی بەعسیکردن و بەعەرەبکردن و راگواستن، تەنگی بەخەڵکی کوردستان هەڵچنیبوو، کەس لەو بڕوایەدا نەبوو، بەوزوانە رێکخستنێکی سیاسی دروستببێت، ئالای خەبات و بەرخودان بەرزبکاتەوە،

دژی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی بەعس بوەستێتەوە، بەڵام کاتێک بینرا، دوای دوو مانگ لەهەرەس، حزبێکی سیاسی وەک یەک یەک دامەزرا، دوای ساڵێک لەدروستبوونی، دەستی بەخەباتی چەکداری کرد، ئەو کەسانەی بڕوایان بەبەرخۆدان و ڕووبەڕووبونەوەی سیاسەتی بەعس بوو، بەتەنگ چارەسەری دۆزی ڕەوای گەلی کوردەوە بوون، لەدەوری ئەو ڕێکخراوە نوێیە کۆبوونەوە، بۆیە کاتێک شێرکۆ بەمنی وت:

لەناو ڕێخکستنی ینک کار بکە، یەکسەر ڕەزامەندیم نیشاندا، تەنیا یەک مەرجم هەبوو، وتم: دەبێت جەلالیەکان، ڕەخنە لەو سیاسەتە هەڵەیەی خۆیان بگرن کە سالانی ١٩٦٦-١٩٧٠ پاڵیاندا بەحکومەتی عێراقەوە. شێرکۆ وتی: لەبەیانی دامەزراندنی ینکدا ڕەخنەی ئەو سەردەمە کراوە، دانیان بەو هەڵەیەدا ناوە.

**بەیانی دامەزراندنی ینك:**

لەسەرەتای مانگی چواری ١٩٧٦ دا، ڕۆژێک وانەی پراکتیکی هستلۆجی (شانە زانستی)مان هەبوو، شێرکۆ عەبدوڵڵا هات بۆ لام، بەمامۆستاکەمی وت، بۆ ماوەیەک ئیزنی فایق بدە، خزمێکی هاتووە سەردانی بکات، مامۆستاکەم ڕەزامەندی نیشاندا، لەگەڵ شێرکۆ چوومە دەرەوە، دواتر چووینە ناو بەرزکەرەوەی کۆلێژی پزیشکی، سەرکەوتین بۆ قاتی سێی کۆلێژ، هەر کە دەرگای ئاسانسۆرە(بەرزکەرەوە)کە داخرا، شێرکۆ دەستیکرد بەناو گۆرەوییەکانیدا، نوسراوێکی دەرهێنا و وتی: ئەوە بەیانی دامەزراندنی ینک-ە، بیبە بیخوێنەرەوە.

بەیانەکەم لەشێرکۆ وەرگرت، خستمە ناو گۆرەوییەکەی خۆمەوە، بە بەرزکەرەوەکە گەڕاینەوە بۆ ناو گۆڕەپانی کۆلێژ، دە خولەکێکی تر لەدەرەوەی هۆڵی وانە وتنەوە مامەوە، خۆم بەچاخوارنەوە سەرقاڵ کرد، دواتر گەڕامەوە بۆ هۆڵی وانە وتنەوە.

دوای کۆتایی هاتنی وانەی ئەو ڕۆژە، بەرەو بەشی ناوخۆیی گەڕامەوە، بەیانەکە هەر لەگۆرەوییەکەمدا بوو، ئێوارە گەیشتمەوە بەشی ناوخۆیی، لەبەرئەوەی هەر ژوورێکی بەشی ناوخۆیی، چوار خوێندکاری لێبوو، نەمدەتوانی لەژوورەکەمدا بەیانەکە بخوێنمەوە، نەوەک لەکاتی خوێندنەوەی بەیانەکەدا، یەکێک لەخوێندکارەکان بێتە ژورەوە، بڵێت ئەوە چی دەخوێنیتەوە، منیش شپرزە ببم و بشڵەژێم.

بە بیرمدا هات کە باشترین شوێن، بۆ خوێندنەوەی بەیانەکە، تەواڵێتی بەشی ناوخۆییە، هەر ئەو ئێوارەیە، لەتەوالێتی بەشی ناوخۆییدا، دووجار بەیانەکەم خوێندەوە، دواتر لەشوێنێکی گونجاودا شاردمەوە.

پاش چەند ڕۆژێک شێرکۆم بینییەوە، دەربارەی بەیانەکە پرسیاری لێکردم، وتم بەیانەکەم بەلاوە باشە، ئامادەم لەناو ڕیزەکانی ینکدا خەبات بکەم، لەسەر ئەوەش کە لەبەیانەکەدا رەخنەی سالآنی ١٩٦٦-١٩٧٠جەلالی تێدا نەبوو، قسەم نەکرد.

شێرکۆ وتی: بەیانەکە بدە بەتارق جاف، تارق هاوپۆلی خۆم بوو، خەڵکی کەرکوک بوو، بەیانەکەم دا بەتارق، ئەویش بەیانەکەی خوێندەوە، ڕەزامەندی نیشاندا کە لەڕیزی ڕێکخستنی ینک دا کار بکات.

من داوام لەشێرکۆ کرد بەیانەکە بدەم بەعەباس، شێرکۆ ئەوەی پێباش نەبوو، لەبەرئەوەی من عەباسم زۆر خۆشدەویست، وامدەزانی ئارەزووی سیاسەتی هەیە، کەچی وادەرنەچوو، کاتێک داوام لێکرد لەگەڵماندا کاری سیاسی بکات، وتم: بەیانی دامەزراندنی ینکم لایە بیخوێنەورەوە، عەباس بەیانەکەی لێوەرنەگرتم، وتی: من حەزم لەسیاسەت نییە.

دواتر بەشێرکۆم وت: با بەیانەکە بدەم بەحەمە یوسف ، شێرکۆ وتی: مەیدەرێ ئەو باوکی شیوعییە، ئەو کاتە حزبی شیوعی، هاوپەیمانی حزبی بەعس بوو، بەڵام حەمە یوسف پەیوەندی سیاسی بەحزبی شیوعیەوە نەبوو، هەڵوێستێکی کوردانەی پاکی هەبوو. بەو شێوەیە من و تارق و شێرکۆ، بۆ

ماوەیەک وەک ڕێکخستنی هێشویی، لەڕیزەکانی ینک دا، دەستمان بەچالاکی سیاسی کرد.

چەند مانگێک بەسەر کارو چالاکی سیاسیماندا تێنەپەری، ژمارەیەک خوێندکار، لەزانکۆی سلێمانی دەستگیر کران، سەر بەڕێکخستنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان و ڕێکخراوی ڕەنجدەرانی کوردستان بوون، شێرکۆ دەترسا ئەویش دەستگیربکرێت، هاتە لام وتی: ئەوەی لەزانکۆی سلێمانی ڕوویداوە، ئاشبەتاڵێکی ترە، ئیتر من کاری سیاسی ناکەم. لەبەرئەوەی تارق و شێرکۆو قەلەدندەر لەیەک شوقەدا بوون، تارقیش لەمن دوورکەوتەوە. دواتربۆمدەرکەوت شێرکۆ هەر بە وازهێنانەوە نەوەستاوە، لە هەولێر سەردانی حەمەسدیقی مەحامی کردوە، کە ئەندامی ئەنجوومەنی یاسادانانی ناوچەی حوکمی زاتی سەر بە رژێمی بەعس بوو، باسی ڕەوشی سیاسی خۆی بۆ کردبوو، داوای لێکردبوو لە کاتی تەنگانەدا بیپارێزێت.

دوای ئەوەی شێرکۆ و تارق لەمن دوورکەوتنەوە، دانای عومەر سدیق، کە دەورەیەک پێش من بوو، هاتە لام، وەک بەرپرسی ڕێکخستن پێوەندی پێوەکردم، ماوەیەکی کەم لەگەڵ دانا کارم کرد، دواتر داناش لەڕێکخستن دوورکەوتەوە. دوای ئەو مژدەی ئیسماعیل ڕەشان هاتە لام، وەک بەرپرسی ڕێکخستن پەیوەندی پێوەکردم، مژدە دەورەیەک پێش من بوو، لەگەڵ مژدە بۆ ماوەیەک پێکەوە کارمان کرد.

نازانم هۆکارەکەی چی بو کە پەیوەندی من لەگەڵ مژدە کۆتایی هات، دوای مژدە عەبدولباقی مائی پەیوەندی پێوەکردم، منی بەڕێکخستنەوە گرێدایەوە، عەبدولباقی چەند دەورەیەک پێش من بوو، خەڵکی دهۆک بوو، کە عەبدولباقی کۆلێژی تەواوکرد، کەس پەیوەندی بە منەوە نەکردەوە.

ئەو ساڵەی من لە کۆلێژی پزیشکی وەرگیرام، بەختیار خالد قوتابی قۆناغی پێنجەمی کۆلێژی پزیشکی بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، دوای تەواوکردنی کۆلێژی پزیشکی بە ماوەیەک، پەیوەندی بە هێزی بەپێشمەرگەوە کرد. دواتر دەرکەوت ئەو بەرپرسی ڕێکخستنی ینکی زانکۆی

موسڵ بووه، چالاكیه سیاسیەكانی كۆلیژی پزیشكی، زۆربەی لەڕێگەی ئەوەوە دەكرا، كە كۆلیژی تەواوكردو لەموسڵ دووركەوتەوە، وە دواتر كە پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە كرد، كاری ڕێكخستنی زانكۆی موسڵ سست بوو.

**مەلا مستەفا:**

تا ئەو كاتەی گوندەكەمان ڕانەگوێزرابوو، لەپشووەكاندا دەگەڕامەوە بۆ گوڵپ، هەر كاتێك سوارڕۆیەكی سەربازی بەرەو گوند بهاتایە، دوچاری دڵەراوكێ دەبووم، بیرم لەوەدەكردەوە، لەوانەیە لای دەزگا سیخوریەكانی بەعس ئاشكرابوبێتم و ئەو سوارڕۆیە بۆ دەستگیركردنی من هاتبێت. بەبێ ئەوەی كەس بزانێت، لەماڵ دەردەچووم، لەسەر گردی قەلاتێ دەمامەوە، تا هۆكاری هاتنی سوارڕۆ سەبازییەكەم بۆ ڕووندەبوەوە، كاتێك سوارڕۆكە دەگەڕایەوە، لەقەلاتێ دەهاتمە خوارەوە.

دوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلول، ناوبەناو بەعسیەكان سەردانی گوڵپیان دەكرد، كۆبونەوەیان بەخەڵك دەكرد، ڕۆژێكیان بەرپرسی ڕێكخراوی بیارەی حزبی بەعس، لەگەڵ چەند كوردێكی بەعسی، سەردانی گوڵپیان كرد، كۆبونەوەیان بەخەڵك كرد، لەكۆبونەوەكەدا جاڕی كۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلولیان دەدا، داوایان لەخەڵك كرد ببن بە ئەندامی حزبی بەعس، خەڵكیان ئاگادار دەكردەوە، ئەگەر دەزانن لەهەر شوێنێك، لای هەر كەسێك، چەك و تەقەمەنی هەیە، بەزووترین كات ئاگاداری لایەنی پەیوەندیدار بكەن، بۆئەوەی دەستی بەسەردا بگیرێت. لەهەمان كاتدا هەڕەشەیان لەخەڵك دەكرد، كە لەناو فڕۆكەی تایبەتدا ئامێری پیشكەوتویان هەیە، لەدووری دەیان كیلۆمەترەوە، چەك و تەقەمەنی دەدۆزنەوە، دەیانوت هەر كەسێك بەچەك و تەقمەنییەوە دەستگیربكرێت لە سێدارە دەدرێت.

ئەوەی لەو كۆبونەوەیەدا زۆر نیگەرانی كردم، جنێوی یەكێ لەكوردە بەعسیەكان بوو، دوای قسەی بەرپرسی ڕێكخراوی بیارەی حزبی بەعس، سەرەی قسەی كوردە بەعسیەكە هات، قسەی كوردە بەعسیەكە پشتگیری

وتاری بەرپرسەکەی بوو، دواتر کۆمەڵێک جنێوی بازاری بەمەلا مستەفا دا. من لەرابردوودا قەت مەلا مستەفام خۆش نەویستبوو، قەت سوێندیشم بەسەری نەخواردبوو، بەڵام جنێویشم پێنەدابوو، جنێوی ئەو کەسە نانەجیبە بەعسیە بەمەلامستەفا، لەبەرچاوی بەعسیەکی شۆڤێنیدا، بۆ یەکەم جار لەژیانمدا، بۆ ماوەیەک، سۆزی بۆ مەلا مستەفادا بزواندم، بەجنێوەکەی کابرای بەعسی، نیگەران بووم، تا ئێستەش بیرم ناچێتەوە و رقم لێیەتی.

**نامەکەی تارق:**

دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، کوردستان وەک شوێنی گەشتوگوزارو حەوانەوەی عەرەبە بەعسیەکان سەیردەکرا، یەکێک لەخزمە بەعسیەکانم، لەبەغداوە گەڕابوەوە بۆ گوڵپ، دوو هاوڕێی عەرەبی بەعسی، لەگەڵ خۆی هێنابوو، دوو رۆژ لەگوڵپ مانەوە، بەهاتن و مانەوەی ئەو بەعسیانە، نیگەران بووم، نەمدەزانی چیی بکەم.

دوای گەڕانەوەی بەعسیەکان بەچەند رۆژێک، لە گوڵپ هەواڵێک بڵاوبوەوە، پێشمەرگە بە نامە هەڕەشەی لەو کەسانە کردوە، پێشوازی و میوانداری بەعسیەکانیان کردوە، هەڕەشەنامەکە کاریگەریەکی باشی بەجێهێشت، ورەی خەڵکە نەتەوەییەکانی بەرزکردەوە، ترسیشی لەدڵی بەعسیەکاندا چاند.

من وامزانیبوو ئەو کارە لەلایەن مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەوە ئەنجامدراوە، بەڵام وادەرنەچوو، مەفرەزە سەرەتاییەکان لەو کاتەدا، توانایان بەسەر کارێکی وادا نەدەشکا. دوای چەند رۆژێک، تارقی برام هاتە لام، وتی:کاکە من ئەو نامەیەم بەناوی پێشمەرگەوە نوسی و لەسەر رێگەی مامۆستا(ن) دامنا، بۆئەوەی نامە هەڕەشە ئامێزەکە ببینێت و بیخوێنێتەوەو بیگەیەنێتە خزمەکانی، لەوێشەوە بەعسیەکان ئەو هەواڵە بزانن، نەوێرن جارێکی تر بەو شێوەیە بەکەیفی خۆیان بێنەوە بۆ گوڵپ، نیشتمانمان گڵاو بکەن.

تارقی برام ئەو کاتە قوتابی قۆناغی ناوەندی بوو، هیچ نەبێت چوار ساڵ لەمن منداڵتر بوو، کوڕی سێیەمی خێزانەکەمان بوو، بەبێ ڕێنمایی هیچ کەسێک، لەو کاتەدا ئەو بیرۆکەیەی بۆ هاتبوو جێبەجێی کردبوو، ئەنجامێکی باشی لێکەوتەوە. کاتێک زانیم تارق ئەو نامەیەی نوسیوە، زۆر دڵخۆشبوم.

**بەعسییەکەی خورماڵ:**

ساڵی ١٩٧٨ گوندی گوڵپ وەک گوندەکانی تری ناوچەی هەورامان، بەر شاڵاوی ڕاگواستن کەوت، زۆربەی دانیشتوانی گوند، لەئۆردوگای خورماڵ نیشتە جێکران، ماڵی ئێمەش لە ئوردوگای خۆرماڵ نێشتەجێکراین.

لەدوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥، لەشارو شارۆچکەکانی کورستاندا، حکومەتی عێراق قوتابخانەی عەرەبی بۆ منداڵی بەرپرسە عەرەبەکان کردەوە، بۆئەوەی بەزمانی خۆیان بخوێنن، لەژێریشەوە، بەعسیەکانی هاندەدا، فشار بخەنە سەر خەڵک، مناڵەکانیان بۆ قوتابخانە عەرەبیەکان بنێرن. ڕژێمی بەعس دەیویست لەو ڕێگەیەوە، سیاسەتی بەعەرەبیکردنی خوێندن، لەکوردستاندا پەرەپێبدات، خوێندنی کوردی لەکوردستاندا شکست پێبهێنێت.

لەخورماڵ ژمارەیەک خەڵکی بەعسی سەریان دەرهێنا، بۆ بەعەرەبیکردنی خوێندن، بۆ بەبەعسیکردنی خەڵک، چالاکیان دەستپێکرد، یەکێک لەو بەعسییانە، بەناو خەڵکدا دەگەڕا، دەیوت مناڵەکانتان بنێرن بۆ قوتابخانە عەرەبیەکان، زمانی کوردی نرخی نییە، لەدوارۆژدا هەر نرخی نامێنێ. بۆئەوەی مناڵەکانتان دوارۆژێکی گەشیان هەبێت، باشترە مناڵەکانتان بنێرن بۆ قوتابخانە عەرەبیەکان. ئەو بەعسیەو بەعسیەکانی تر، بەردەوام داوایان لەخەڵک دەکرد، لە ڕیزەکانی حزبی بەعسدا کاربکەن.

ڕۆژێکیان یەکێک لەو بەعسیانە هاتە لای من، دەربارەی ناردنی منداڵی کورد بۆ قوتابخانەی عەرەبی قسەی لەگەڵ کردم، وتی: دەبێت هەموومان گرنگی بەخوێندنی عەرەبی بدەین، منداڵەکانمان بنێرین بۆ قوتابخانە عەرەبیەکان، منیش دژی بۆچونەکەی قسەم کرد، وتم: گەلی کورد زمانی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێت کورد بەزمانی خۆی بخوێنێ، نەک بەزمانی

عەرەبی، بەڵام هەر داخم لەدڵدا بوو، نەمدەتوانی وەڵامیکی توندی بەعسیەکە بدەمەوە، پێی بڵێم تۆ خیانەت لەنەتەوەکەت دەکەیت.

ئەو کاتەی ماڵمان لەخورماڵ بوو، هێزی پێشمەرگە گەشەی کردبوو، دوای چەند رۆژێک لەگفتوگۆکەی من و بەعسیەکە، هەواڵێک بڵاوبوەوە، بەشەو پێشمەرگە هاتونەتە خورماڵ، چونەتە سەر ماڵی ئەو بەعسیە، ویستویانە بیکوژن، بەڵام شەو لەماڵی خۆی نەخەوتبوو، لەبارەگای رێکخراوی بەعس خەوتبوو، ئەو شەوە لەهەڵمەتی هێزی پێشمەرگە رزگاری بوو. کابرای بەعسی زۆر ترسا، لەخۆرماڵ ماڵی گواستەوە، لەدائیرەکەی خۆی خزمەتیان گواستەوە، خورماڵی بەجێهێشت، تا هەولێر نەوەستا و خەڵکی خورماڵ لەو بەعسیە رزگاری بوو.

**کادری کۆمەڵە:**

هاوینی ساڵی ١٩٧٩ یان ١٩٨٠ بوو، لەکاتی پشووی هاوینەی زانکۆدا لەخورماڵ بووم. یەک لەکورەکانی حاجی قادر[١٦] هات بەشوێنمدا، وتی مەلا یاسین لەماڵی خۆمانە دەیەوێت بتبینێ، مەلا یاسین کوڕی پورە عوزرام بوو، پورزای باوکم بوو، ئەو یاسینە بوو کە لەمنداڵیدا ئاواتە خواز بوو من ببم بەپزیشک، ئێستە من قوتابی کۆلێژی پزیشکیم، ئەویش لەساڵی ١٩٧٨ وە پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کردوە، لەناو ینکدا سەر بەرێکخستنی کۆمەڵەیە، بەنهێنی هاتۆتە ناو شار، دەیەوێت من ببینێت، منیش بۆ لای دەچم.
لەبەرئەوەی ماڵی حاجی قادرم دەناسی، دەمزانی دو کوڕیان پێشمەرگەن، بەبێ دودڵی لەگەڵ کوڕەکەی تری حاجی قادردا رۆیشتم، کە گەیشتمە ماڵی حاجی قادر، مەلایاسین لەگەڵ پێشمەرگەیەک و چەند میوانێکدا لەژورێکدا

---

١٦ حاجی قادر هاولاتیەکی نیشتمانپەروەری دانیشتووی خورماڵ بوو، دوو کوری بە ناوی سامان و سالار پێشمەرگەبوون هەردووکیان شەهید بوون، من سامانم نەدیبوو، بەلام سالار هاورییەکی خۆشەویستی سەردەمی پێشمەرگەیاتیم بوو. کورەکانی تری لە ریکخستنی نهێنی کومەلەدا، لە ناو شارەکاندا خەباتیان دەکرد.

دانیشـتبوو، قسـەی بـۆ میوانـەکانی دەکـرد، سـڵاوم لێکـرد، ئـەملاو ئـەولای یەکترمان ماچ کرد، لەگەڵیدا دانیشتم.

مەلا یاسین دەربارەی شۆڕش دەستی بەقسە کرد، لەو کاتەدا برادەرێک خۆی کرد بەژووردا، ئەویش کوڕێکی تری حاجی قادر بوو، شۆفێری ئەمبولانسی نەخۆشخانەی خورماڵ بوو، مەلا یاسین وتی: ها چیت کرد؟ شۆفێرەکە وتی: هەمو شتەکانم گەیاند، دەرکەوت مەلا یاسین لەڕێگەی ئەو برادەرەوە، بڵاوکراوەی بۆ رێکخستنی هەڵەبجە ناردوە.

دواتر مەلا یاسین درێژەی بەقسەکانی دا، دەربارەی پەیکەری رێکخستنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان (کۆمەڵە) قسەی بۆ کردم، وتی: لەسنوری هەر قەزایەکی کوردستاندا، کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەمان هەیە، کەرتی رێکخستن لەچەند پۆلێک پێکدێت، پۆلی جەماوەرو پۆلی پێشمەرگە، پۆلی جەماوەر، ئەرکی رێکخستن و پەروەردەکردنی ئەو ئەندامانەی کۆمەڵە لەئەستۆ دەگرێت، کە لەناو شارو گوندەکاندا دەژین، پەیوەندیەکانی پۆلی جەماوەر لەگەڵ ئەندام ولایەنگراندا نهێنیە. پۆلی پێشمەرگە ئەرکی رێکخستن و پەروەردەکردنی ئەو پێشمەرگانەیە، کە لەناو هێزی پێشمەرگەدا ئەندامی کۆمەڵەن.

وتی: بەرپرسی کەرتی رێکخستنی هەڵەبجە، مامۆستا پشکۆیە، من بەرپرسی پۆلی جەماوەرم، سامان بەرپرسی پۆلی پێشمەرگەیە.

مەلا یاسین کەمێکی تر باسی کۆمەڵەی بۆ کردم، دواتر هەندێک نامیلکە و گۆڤاری لەکۆڵەپشتەکەیدا دەرهێنا، وتی ئەوانە بخوێنەرەوە، نامیلکەکانم لێوەرگرت، بردمنەوەماڵەوە، بەوردی خوێندمنەوە. ئەوە یەکەم جار بوو ئەدەبیاتی کۆمەڵە ببینم، ئەو بەیان و ئەدەبیاتەی لەکۆلێژی پزیشکی بەدەستم دەگەیشتن، هەر هەمووی بەناوی ینک نوسرابوون.

دوای ئەو کۆبوونەوەیە ، هیچ بڵاوکراوەیەکی تری کۆمەڵەم بۆ نەهات، تا ئەو کاتەی نەبووم بەپێشمەرگە، نە مەلا یاسین و نە هیچ کەسی تر، بەناوی کەرتی رێکخستنی هەڵەبجەوە، پەیوندی پێوەنەکردم.

**ناکۆکی سەرەکی و ناکۆکی لاوەکی:**

ئـەو کاتانـەی لـە زانکـۆ لە ڕێکخسـتنی  ینکدا بە نهێنـی کارمـان دەکـرد، ململانێـی سـەرەکیمان، لەگـەڵ ڕژێمـی شـۆڤێنی و دکتـاتۆری بـەعس بـوو، بەشێوازی ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ  دژایەتی سیاسـەتی بەعسمان دەکرد. ناو بەناویش، لەناو خۆماندا، لەسەر هەڵوێستە سیاسیەکانی ینک و حزبەکانی تر دەکەوتینە ناکۆکی و ململانێی لاوەکیەوە. ئەو کەسانەی سیاسـەت دەکـەن، لەسەر هەڵوێستی سیاسی و بڕیاری سیاسی حزب، بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆرن، جۆری یەکەم ئەو کەسانەن، هەڵوێست و بڕیـاری سـەرەوەی خۆیـان، گفتوگـۆ ناکـەن، یەکسـەر جێبـەجێی دەکـەن.  جـۆری دووەم، ئـەو کەسـانەن، کاتێک بڕیار و هەڵویستی سیاسیان بۆ دێتە خوارەوە، گفتوگۆی دەکەن، ڕەئی خۆیـان دەدەن، ئنجـا جێبـەجیی دەکـەن، جـۆری یەکـەمی سیاسـیەکان، بـێ گیروگفتن، جۆری دوەمی سیاسیەکان، ڕەخنەگرن، بەلام حزب لەلادان و هەڵە دەپارێزن، بەڵام ئەگەر دیموکراسیی و بنـەمای ڕێکخسـتن لەحزبدا لاواز بێت، کێشە بۆ خۆیان و بۆ سەرووی خۆیان درووستدەکەن.

یەک لەچالاکییە نهێنیەکانی ناو شار، خویندنەوە و بڵاوکردنەوەی بـەیان و وتـار بـوو،  ڕۆژێکیـان ڕێکخسـتن کاسـێتێکی دەنگـی مـام جـەلالی بـۆ هێنـام، چوومەوە بەشی ناوخۆیی کۆلێژی پزیشکی، لەڕێگەی ڕێکوردێکەوە گوێم بـۆ قسـەکانی مـام جـەلال شـلکرد، مـام جـەلال بەپەلـە قسـەی دەکـرد، وشـەو ڕستەکانی باش ریزنەدەکرد، لەوەدەچوو لەکاتی قسەکردندا تووڕە بوبێت، کە هاتـە سـەر باسـی شـەهید ئـەنوەر هەڵەبجـەیی، لەوتارەکەیـدا بەئـەنوەرە هەڵەبجەییەکە نـاوی دەهێنـا، پێشـناوی شـەهیدی بـۆ بەکارنـەدەهێنا، ڕەخنـەی لەهەڵسوکەوتی شەهید ئەنوەر دەگرت، دەیوت خـۆی وایکـردوە ئاشـکرا ببێت، دەستگیر بکرێت، لەسێدارە بدرێت[١٧].  ئەو وتارەی مام جەلال نیگەرانی کردم.

---

١٧ شـەهید ئـەنوەر هەڵەبجـەیی بەنامەیەکـەوە لەسـوریاوە ڕەوانـەی عێـراق کرابویـەوە، دەزگـا جاسوسـیەکانی ڕژێمـی بـەعس بەسـەریەوە بـوون، دەسـتگیریان کردبـوو، سـزای سـێدارەیان بەسەردا سەپاند، ساڵی ١٩٧٧ لەموسڵ، لەگەڵ مام ئەسکەندەردا لەسێدارەدران.

دوای کارەساتی هەکاری، سەرکردایەتی ینک، بەیانیکی لەسەر ئەو کارەساتە دەرکرد، لەڕێگەی ڕێکخستنەوە، بەیانەکەم بەدەست گەیشت، باسی لەتاوانی سەرکردایەتی کاتی پدک (قیادە موئەقەتە) دەکرد، کە چۆن بەپشتبەستن بەداگیرکەرانی کوردستان، بۆسەی بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان ناوەتەوە، هەر سێ سەرکردە، عەلی عەسکەری و دکتۆر خالد و حسەین بابەشێخیان شەهید کردوە، ژمارەیەک پێشمەرگەیان شەهید کردوە، ژمارەیەک بەرپرس و پێشمەرگە و کادری ینک یان دیل کردوە. بەیانەکە قیادەی موەقەتەی بەدوژمنی سەرەکی گەلی کورد دانابوو. دوای خوێندنەوەی بەیانەکە، لەڕووی فکریەوە ڕەخنەم لەبەیانەکە گرت، ڕەخنەکەی من لەسەر ئەو بنمایە بوو، لەکاتی شۆڕشی ڕزگاریخوازی نەتەوەکاندا، داگیرکەر دوژمنی سەرەکیە، ناکۆکی لەنێوان ئەو هێزو لایەنە سیاسیانەی کە دژی دوژمنی سەرەکی (داگیرکەر) تێکۆشان دەکەن، نابێت دوژمنکارانە بێت، نابێت یەکدی وەک دوژمنی سەرەکی سەیربکەن، ئەو شەڕو ململانێیەی نێوان ینک و پدک، دەبێت وەک ململانێیەکی ناوخۆیی ولاوەکی سەیر بکرێت، نەک وەک ململانێیەکی سەرەکی، نابێت ینک وپدک، وەک دوژمنی سەرەکی سەیری یەکتر بکەن، دەبێت هەمو تواناکان دژی داگیرکەر بخرێنە گەر.

**بەعسیکردن:**

ژمارەیەک قوتابی کورد، ببوونە ئەندامی حزبی بەعس، هەوڵیاندەدا زۆرترین کەس لەکوردەکان، بۆ ناو ڕیزەکانی حزبی بەعس ڕاکێشن. قوتابیە عەرەبە بەعسیەکانیش لەلای خۆیانەوە، بۆ بە بەعسیکردنی قوتابی کورد، هەوڵی بەردەوامیان هەبوو، ئەو کەسانەی ئەندامی قوتابیانی بەعس نەبووین، لەلایەن بەعسیەکانەوە لەژێر چاودێریدا بووین، هەوڵدەدرا بمانکەنە بەعسی، ئێمەش بەشێوازی جیا جیا، خۆمان لەبەعسیبوون دەپاراست.

یەکێک لەچالاکی قوتابیە کوردپەروەرەکانی کۆلێژی پزیشکی، ڕێگریکردن بوو لەبەعسیبونی قوتابی کورد، ئەو هەوڵانە هەمەجۆر بوون، یەکەم هەنگاو

ئـەوەبوو، ئـەو قوتابیـە کوردانـەی لەسـەرەتای خوێندنـەوە دێـن بـۆ زانکـۆ، بناسـرێن، پێشـوازیان لێبکرێـت، ئاگـادار بکرێنـەوە کـە پەیوەنـدی بـەقوتابیانی بەعسـەوە نەکـەن. کاتێک لەگـەڵ هەنـدێک لەهاوپۆلـەکانم لەسـەر کوردایـەتی گفتوگۆمان دەکرد، دەرکەوت دوان لەهاوپۆلەکانم بەعسین، ئەندامی قوتابیانی بەعسـن، یـەکێکیان خـەڵکی زاخـۆ بـوو، لەترسـا ببـوو بەبەعسـی، دەربـارەی سیاسـەت قسـەی نـەدەکرد. ئـەویتریان خـەڵکی کۆیـە بـوو، لەموسـڵ دەژیـا، ئەمەیان بڕوای وابوو دەبێت هـەمو کورد ببێت بەبەعسـی، ئەگـەرنا مەترسـی لەسەر ژیان و گوزەران و ئایندەی ئەو کەسانە درووست دەبێت، کە بەعسـی نین. ئەم برادەرە رۆژێک داوای لەمن کرد ببم بەبەعسـی، وتـی: ئەگـەر نـەبیت بەبەعسی، لـەکۆلێژی پزیشکی دەرت دەکـەن. بـە قسـەی ئـەم کوردە بەعسیە زۆر نیگەران بووم، جار جار بیرم لەوە دەکردەوە واز لەخوێندن بێنم، جار نا جاریش دەموت کێ دەڵێ قسەکەی راستە، با گوێی نـەدەمێ، دەموت لەوانەیـە ئەم بەعسیە بۆ ئـەوە ئـەم قسـەیە بکات، تـا مـن بکـات بـە بەعسـی، لەڕێگـەی بەعسیکردنی منەوە، خۆی گەورە بکات.

لەسـەرەتای هـەموو سـاڵێکدا یـەکێتی قوتابیـانی بەعسـییەکان (یـەکێتی نیشـتمانی قوتابییـانی عێـراق) پێشـوازییان لەخوێنـدکارە نوێکـان دەکـرد، کۆبونـەوەیان پێـدەکردن، رێنماییـان دەدانـێ، شـێوازی پێشـوازییەکە لەچوارچێوەی گروپدا بوو، هەر گروپێک نوێنەرێکی هـەبوو. سـەرەی گروپـی ئێمە هات، نوێنەرەکەی ئێمە کچێکی بەغدادی بوو، نـاوی عالیـە بـوو، دەورەی پـێش مـن بـوو، وتـەو رێنماییـەکانی هاوسـەنگ بـوون، زۆر دەترسـام داوای ئـەوەمان لێبکـات کـە ببـین بەبەعسـی، کـەچی قسـەکانی بـۆنی بەعسـێتیان لێنەدەهات.

ئـەو کۆبونەوەیـە کـەمێک ورەی بەرزکردمـەوە، لـەدڵی خۆمـدا وتـم بـۆ پرسـیاری لێنەکـەم بزانم ئـەوە راسـتە دەبێت هـەمو کـەس ببێت بەبەعسـی؟ ئـەگینا لـەزانکۆ دەریدەکـەن؟ دوای تـەواوبونی نـانخواردن و قسـە کـردن، عالیەی بەرپرسی گروپەکەمان وتی: کێ پرسیاری هەیـە؟ مـن وەڵامـم دایـەوە وتـم: مـن پرسـیارێکم هەیـە، "وتـی فـەرموو"، وتـم: "راسـتە دەبێت هـەمو کـەس

ببێت بەبەعسی؟ ئەو کەسەی نەبێت بەبەعسی لەکۆلێژ دەریدەکەن؟ عالیە یەکسەر وەڵامی دامەوە، وتی: ئەوە راست نییە، لەو کاتەدا سەیری کوردە بەعسیەم کرد کە وای بەمن وتبوو، سەری شۆر کرد، قسەی نەکرد. ئیتر تێگەیشتم کە قسەی بەعسییەکە، تەنها بۆ ترساندنی من بووە، بۆئەوەبووە وەک خۆی بمکات بەبەعسی، ئەو وەڵامەی عالیە خان بۆ من بوو بەورە، چیتر قسەی بەعسییەکانم بەهەند وەرنەدەگرت.

لەپۆلی دوی کۆلێژدا، پێشوازیم لەدوو قوتابی نوێی کورد کرد، لەپارێزگای سلێمانیەوە هاتبوون، لە بەشی ئامارو ناونوسینی کۆلێژ لەگەڵیان بووم، دوای ئەوە دەبوو برۆشتنایە بۆ نوسینگەی یەکێتی قوتابیانی بەعس، کاتێک گەیشتینە ناو نوسینگەی قوتابیانی بەعس، نوێنەری قوتابیان بەگەرمی بەخێرهاتنی کردن، دواتر پرسیاری لێکردن، وتی: پێش هاتنتان بۆ زانکۆ، لەقۆناغی ئامادەییدا چالاکیتان هەبووە؟ لەقوتابیان ئیشتان کردووە؟ یەکێک لەقوتابیە کوردەکان وەڵامی دایەوە، وتی: بەڵێ، ئێمە ئەندامی چالاکی یەکێتی قوتابیانی نیشتمانی عێراقین. نوێنەری قوتابیانی بەعس ئافەرینی لێکردن، منیش لای خۆمەوە سارد بوومەوە، کۆڵێک خەفەتم خوارد. دوایی لەگەڵ یەکێک لەو دوو قوتابییە قسەم کرد، وتم: بۆچی بوون بەئەندامی قوتابییانی بەعس؟ وتی: لەترساندا بووین بەبەعسی، نەوەک رێگەمان لێبگرن، نەهێڵن خوێندن تەواو بکەین.

ساڵێک دواتر، لەکاتی پێشوازی قوتابیە کوردەکاندا، حەمە یوسف بەهەڵەداوان هاتە لام، وتی: فریامکەوە، وتم: چی بووە؟ ، وتی: پێشوازیم لەخوێندکارە نوێکانی هەولێر کرد، قسەم بۆ کردن، پێموتن نەبن بە بەعسی، یەک لەکچەکان هەڵیدایەوە، وتی: من بەعسییم. منیش شپرزە بووم، نازانم چیی بکەم، دەترسم خەبەرم لێبدات، دووچاری کێشەم بکات. وتم: سەبرت بێت بڕوا ناکەم خەبەرت لێبدات، ئەگەر نیەتی خراپ بوایە، خۆی ئاشکرا نەدەکرد، بەنهێنی خەبەری لێدەدایت، حەمە یوسف کەمێک هێور بوەوە، بێدەنگ بوو، هەرواش دەرچوو، کچە بەعسییەکە خەبەری لێنەدا.

بــۆ رێگریکــردن لەبەعســیکردنی قوتابیــە کوردەکــان، لــەناو خۆمانــدا رێکەوتبووین، هــەر کاتێک بەعسییەکان، لەگەڵ کوردێکدا دەستیان بەپیاسە کرد، یان قسـەیان لەگەڵ کرد، ئەوە واتـای ئەوەیە، داوا لەقوتابیە کوردەکە دەکەن ببێت بە بەعسی، لەو کاتـەدا، دەبێت یـەک لەقوتابیە کوردپەروەرەکان، یەکسـەر بچێتە نـاو گفتوگۆی قوتابیە کوردەکە و بەعسیەکەوە، بڵێت دایکت یان باوکت، یان کەسێکی تری نزیکت هاتوە بۆسەردانت، چاوەڕوانت دەکات، ئـەم تـەگبیرە سـودی زۆری گەیانـدبوو، چەنـدان قوتـابی کـوردی لەتەڵـەی بەعسیەکان رزگار کردبوو.

رۆژێکیـان مـەحفوزی نوێنـەری خوێنـدکارانی بـەعس، هاتـە لام، وتـی: بـا پیاسـەیەک بکـەین، منـیش وتـم: فـەرموو، سـەرەتا هەنـدێک بەشـان و باڵمـدا هەڵیدا، دواتـر وتـی بەڕاسـتی حەیفـە بۆ کەسـێکی وەک تۆ، ئەنـدامی یـەکێتی قوتابیان نەبیت، منیش دەستم بەقسەکردن کرد، وەڵامم دایەوە، وتم من حەزم لەسیاسەت نیە، ناتوانم کاری سیاسی بکەم. لەگەرمـەی رەفزکردنی داواکەی مەحفوزدا بووم، مستەفا عەبدولرەحمان، کە لەکۆلێژ ساڵێک لەپێش منەوەبوو، هاتـە نـاو گفتوگـۆی مـن و مـەحفوزەوە، وتـی: فـایق خاڵـت هـاتوە بـۆ لات، چاوەڕێت دەکات، هەر کە مستەفا وای وت، من داوام لەمەحفوز کرد، رێگـەم بدات بچم بۆ لای خـاڵم، خواحـافیزیم لێکرد، لەگەڵ مستەفا بەزەردەخەنـەوە دورکەوتینەوە، خۆشبەختانە جارێکی تر مەحفوز نەهات بەلامدا.

سیاســەتی بــەعس بــۆ تواندنــەوەی گــەلی کــورد، تــەنیا بەعــەربکردن و بەعسیکردن و راگواسـتنی کوردی ناوچە ستراتیجیەکانی کوردستان نـەبوو، چەنــدان رێگــەو شــێوازی تــری بــەکاردەهێنرا، حزبــی بــەعس بڕیــارێکی دەرکردبــوو، هەرعــەرەبێک هاوســەرگیری لەگەڵ کچێکــی کــورد بکــات، منداڵەکانیان لەماڵەوە بەعەرەبی قسە بکەن، بڕی ١٠ دە هەزار دیناری عێراقی خەڵات دەکرێت. ئەو قوتابیە کوردانەی کە بەعسی نەبووین، بەم بڕیارەی بەعس نیگەران بووین، لەناو خۆماندا گفتوگۆمان کردبوو، ئەگەر هـەر کچێکی کورد، لەگەڵ عەرەبدا خۆشەویستی بکات، یان هاوسەرگیری بکات، ئـەو کاتـە بڕیارەکەی بـەعس جێبەجێدەکات، بۆیـە بڕیـاری بـایکۆتی ئـەو کچـە کوردانـە

دەکرا، کە دۆستی عەرەبەکان بوون، یان هاوسەرگیرییان لەگەڵ عەرەبدا دەکرد.

لەکۆلیژی پزیشکی دوو حاڵەتی وامان هەبوو، حاڵەتی یەکەم کچێکی کوردو کوڕیکی عەرەب بوون، هەردوکیان شیوعی بوون، خۆشەویستی و بڕیاری هاوسەرگیری ئەو دوانە، پێش بڕیارەکەی بەعس بوو، پەیوەندی بەو بڕیارەی حزبی بەعسەوە نەبوو، لەو کاتەشدا پەیوەندی حزبی بەعس و حزبی شیوعی بەرەو ناکۆکی و تێکچوون دەچوو، بۆیە بایکۆتی کچە کوردە شیوعیەکە نەکرا.

کچێکی کوردی تری خەڵکی سلێمانی، پەیوەندی سۆزداری لەگەڵ کوڕیکی عەرەبی بەعسیی درووستکرد، پەیوەندییەکە لەهاوسەرگیری نزیک بوەوە، لەڕێگەی چەند قوتابیەکی کوردەوە، هەوڵدرا ئەو کچە پەشیمان بکرێتەوە، هەوڵەکان بێ ئەنجام بوون، لەکۆتاییدا کچەکە شوی بەعەرەبە بەعسیەکە کرد.

کچە کوردەکە بایکۆت کرا، یەکە قوتابی کورد قسەی لەگەڵ نەدەکرد، ڕووبەڕووی سوکایەتیش بوەوە، لەبەرئەوەی ئەو کچە هیچ نرخێکی بۆ بەها نەتەوەییەکانی گەلی کورد دانەدەنا، لەبەر حەزی تایبەتی خۆی، کوردبوونی ژێرپێ خست، بڕیارەکەی حزبی بەعسی دژی کورد جێبەجێ دەکرد، ئاسانکاری بۆ بەعەرەبکردنی کورد دەکرد، قوتابیە کوردپەروەرەکان، نەک تەنیا بەبایکۆت وەلاممان دایەوە و قسەمان لەگەڵ نەدەکرد، چەندان ناوو ناتۆرەمان خستە شوێنی، کار گەیشتە ئەوەی، شێرکۆ عەبدوڵا تێکستێکی هەجووی شێخ رەزایی لەسەر نوسی و (قەلەندەر کەسنەزان)یش بەئۆکۆردیۆنەکەی، موسیقای بۆ لێدەدا و بەگۆرانی دەیوتەوە.

**کورد دەبوو بە تورکمان:**

لەکۆلێژەکانی (پزیشکی، کارگێڕی و ئابوری، ئەندازیاری) ژمارەیەک قوتابی خەڵکی کەرکوکم دەناسی، لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە کراوە بوون، پەیوەندی باشیان لەگەڵ کوردو عەرەب و تورکمان هەبوو، هەندێکیانم لەئۆتێل شەرق ئەوسەت ناسی، ژمارەیەکی تریشیانم لەڕێگەی قەلەندەرو

تارقەوە ناسی، قوتابیە کوردە کەرکوکیەکان دوو جۆر بوون، جۆری یەکەمیان دانیان بەکوردبوونی خۆیاندا دەنا، لەچالاکی سیاسی و کۆمەلایەتی کوردەکاندا، بەشداریان دەکرد. جۆری دووەمیان ئەو کوردانەی کەرکوک بوون، لەبەر هۆکاری سیاسی، بەشێوازی جیا جیا، کوردبوونی خۆیان دەشاردەوە، هەندێکیان وەک تورکمان خۆیان بەئێمە دەناساند.

لەدەورەی خۆم، برادەرێکم هەبو ناوی جەودەت بوو، شیوعی بوو، پەیوەندیمان زۆر خۆشبوو، دەیوت من باوکم تورکمانە، دایکم کوردە، دەیوت دایکم لە نەقشبەندییەکانی ناوچەی هەورامانە، منیش بەتەواوی بڕوام بەجەودەت کردبوو. دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ، جەودەت بوو بەپێشمەرگەی حزبی شیوعی، دوای ئاشتبوونەوەی هێزە سیاسیەکانی باشوری کوردستان، ئەو کاتەی من لەنەخۆشخانەی مەڵبەندی یەکی ناوچەی قەرەداغ بووم، حزبی شیوعیش لەگوندی کۆشکی ناوچەی قەرەداغ، نەخۆشخانەیان دانا، رۆژێکیان هەواڵیان بۆ هێنام، پزیشکێکی حزبی شیوعی لەنەخۆشخانەی کۆشک، هەواڵی منی پرسیووە، وتویەتی: د. فایق هاوڕێی زانکۆم بووە، حەز دەکەم بیبینم. منیش دەمزانی ئەو پزیشکەی حزبی شیوعی، جەودەتەکەی هاوڕێی کۆلێژمە، لەپێشمەرگایەتیدا ناوی خۆی گۆڕیوە بە دکتۆر دلێر.

د. دلێر سەردانی کردم، چەند جارێک یەکترمان بینی، باسی سەردەمی زانکۆمان بۆ یەکتر گێرایەوە، باسی پێشمەرگایەتی و سیاسەتمان کرد، جارێکیان دلێر دەستی بەپێکەنینێکی قوڵ و درێژ کرد، وتم: خێر، ئەو پێکەنینە چی لەپشتەوەیە، وتی: کاتی خۆی درۆیەکی گەورەم لەگەڵدا کردوون، دەمەوێت راستی بکەمەوە، منیش قەت بیرم بەلای ئەوەدا نەدەچوو جەودەت درۆی لەگەڵ کردبم، وتم: درۆکەت چییە؟ وتی: کاتی خۆی من بەئێوەم وت: دایکم کوردە، باوکم تورکمانە، بەڵام ئەوە راست نەبوو، دایک و باوکم هەردووکیان کوردن، دایکم نەقشبەندیە و باوکم زەنگەنەیە، ئەو درۆیەم بۆ ئەوەبوو، تا خۆم لەسیاسەتی شۆڤینی حکومەتی بەعس بپارێزم، بۆئەوەی لەبەر کوردبوونم دژایەتی نەکرێم.

قوتابیەکی تری خەڵکی کەرکوکمان لەگەڵدا بوو، پێیاندەوت فایقە تورکمانەکە، زۆر تێکەڵاوی خەڵکی نەدەکرد، پەیوەندی لەگەڵ کوردەکاندا، لەمەرحەبایەکی سەرپێیی تێپەری نەدەکرد. فایق دوو پۆل دوای من بوو، بەلای قوتابیە کوردەکانەوە فایق تورکمان بوو، یەکێک لەتورکمانە بەعسییەکانی کۆلێژ بوو، بەئاشکرا لەگەڵ بەعسییەکاندا کاری دەکرد.

ساڵانی ١٩٨٥-١٩٨٦ لەناوچەی قەرەداغ پێشمەرگە بووم، بووم بەهاوڕێی عومەر تاڵەبانی و براکانی تری شەهید سیروان تاڵەبانی، ڕۆژێکیان عومەر پرسیاری لێکردم، وتی: لەکام زانکۆ خوێندوتە، وتم: لەزانکۆی موسڵ، وتی: هاوڕێکانت کێ بوون؟ قوتابییە کەرکوکیە کوردەکانی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵت دەناسین، وتم: بەڵی هەمویان هاوڕێم بوون، ناوی چەند کەسێکم هێنا، وتی: کوردێکی ترتان لەگەڵ بوو ناوی فایق بوو، ئەوت دەناسی؟ وتم: ئەو فایقە تورکمان بوو، کورد نەبوو، وتی: نا، ئەو کوردە، تورکمان نییە، وتم: چۆن وا بەدڵنیاییەوە دەڵێیت کوردە، من باش ئەو کوڕەم دەناسی، ئەو خۆی ناوی خۆی نابوو فایقی تورکمان، تۆ چۆن دەڵێیت ئەو تورکمان نییە و کوردە؟ ، وتی: د. فایق ئەو دکتۆر فایقە برازای منە، برازای شەهید سیروانیشە، بۆ خۆپاراستن، خۆی کردبوو بەتورکمان، زانیاریەکانی عومەر تاڵەبانی تاساندمی.

**قەڵەندەر:**

کاتێک چومە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ، قەڵەندەر لەپۆلی سێی کۆلێژی پزیشکی بوو، قەڵەندەر خەڵکی کەرکوکە، کوڕی شێخ حسەینی برای شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانیە، بەشداری کۆبونەوەکانی ئوتێلی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستی دەکرد، سەرەتا لەگەڵ دروستکردنی حزبدا بوو، لەکۆبونەوەیەکدا خۆی بە ئامادەبوان ناساند، وتی من لەبنەماڵەیەکی بورجوازی خوێنمژم، ئینسلاخی چینایەتیم کردوە، وەک کەسێکی چەپ، ئامادەم لەخزمەتی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستاندا کار بکەم. قەڵەندەر و شێرکۆ هاوڕێ بوون، بەردەام خەریکی گاڵتەوگەپ بوون، قەڵەندەر ئەو کاتە زۆر قەڵەو بوو،

شێرکۆ زۆر لاواز بوو، بە هەردوو ئەکتەری هەزەلی ئەمریکی بۆدسپێنسەر( قەلەنــدەر) و ترانسهیل(شــێرکۆ ) دەچــوون. قەلەنــدەر خــاوەنی چــەمکی کوردایـەتی تایبـەت بـەخۆی بـوو، دەچـوو بـۆ بـازاڕ بەمنداڵـە بۆیاخچیـەکانی دەوت: تـۆ کـوردی، ئەگـەر بۆیاخچیەکـە بیوتایـە کـورد نیم، دەیـوت: ئـەی بـۆ بۆیـاخچێتی دەکـەیت؟ بـەو قسـانە دەیویسـت بڵێت: هـەرچی خـەڵکی هـەژاری موسڵ هەیـە، هـەمووی کـوردە، دەیویسـت بڵێت: رژێمی بـەعس تـەنیا زوڵمی نەتـەوەیی لـەکورد نـەکردوە، زوڵمـی چینایەتیشــی لێکـردوە، چەوســانەوەی ئابوریشی بەسەردا سەپاندووە.

لە زانکۆی موسڵ، قەلەندەر کۆمەڵێک هاوڕێی هەبوو، لە رووی نەتەوەیی و ئایدولوجیەوە جیـاوازبوون، هـاوڕێی کـورد، عەرەب، ئاسـووری تورکمـانی هەبوو، بە گاڵتەوە زۆر شتیان دەوت، رژێم نەیدەتوانی تومەتبارییان بکات.

لە سالآنی کۆتایی کۆلێژدا، قەلەنـدەر نەدەهاتـە نـاو ئـەو قوتابیـە کوردانـەی، کـە باسـی کوردایـەتییان دەکـرد، بەتوانجـەوە نـاوی سـەرکردەکانی شۆڕشـی کوردسـتانی، بەسـەر هەنـدێک لەقوتابیـە کوردەکانـدا بڕیبـوو، عەبدولمەجیـدی ناونابوو مەلامستەفا، مژدە ئیسـماعیلی ناونـابوو فـارس بـاوە، نـزار محەمـەدی ناونابوو قازی محەمەد، منی ناونابوو مام جەلال. جارێکیـان مـن و شـێرکۆی هـاوڕێی سـاردی کەوتە نێوانمـانەوە، ئەو لەسـەر شـێرکۆی کـردەوە، دەیـان قسـەی بە مام جەلال وت.

**ئەندامانی یەك:**

رۆژێکیان فـایقی تورکمـان وتـی: کـاک فـایق دەمـەوێت قسـەت لەگـەڵ بکـەم، وتـم: باشـە، چـووم بـۆ ژوورەکـەی و لەگەڵیدا دانیشـتم، وتـی: مـن تورکمـانم، لەگـەڵ بەعسـیەکاندا کـار دەکـەم، بـەڵام کـوردم خۆشـدەوێت، حـەز دەکـەم ئاگادارت بکەم، ئەگەر زۆرە تۆ دەستگیر بکرێیت، وتی: بەتەنها تۆ نیت، بڕیار هەیە چەند کەسێک دەستگیربکرێن، بڕیارە کوردێک و تورکمانێک و شیعەیەک دەسـتگیر بکـرێن، شـیعەکە نـاوی حسـەینە، تورکمانەکـە نـاوی یەشـارە، کوردەکەش تۆییت. دوو کەسەکەی تر کـە ئەگـەری دەسـتگیرکردنیان هـەبوو،

هاوپۆلی خۆم بوون، مەرحەباییم لەگەڵ حسەین هەبوو، کوڕیکی بێدەنگی لەسەرخۆبوو. هیچ جۆرە پەیوەندیەکم لەگەڵ یەشار نەبوو، یەشار کەسێکی تورکمانی شۆڤێنی بوو، ئیعترافی بەکوردستان نەدەکرد[18] دوای قسەکانی فایق دەربارەی ئەگەری دەستگیرکردنم، من خۆم تێکنەدا، وا هەڵسووکەوتم دەکرد، کە بەبەردەوامی ئاسایشی رژێم چاودێریم دەکات، وام نیشان دەدا کە من سیاسی نیم، لەهەمان کاتدا هیچ جۆرە هەڵوێست و چالاکیەکی سیاسیم نەدەنواند، کە شایانی ئەوەبێت، بمخاتە داوی دەزگای ئاسایشی بەعسەوە. لەو کاتەشدا هیچ جۆرە پەیوەندیەکی رێکخستنیم لەکۆلێژ لەگەڵ کەسدا نەمابوو. دوای ئەوەی عەبدولباقی مائی کۆلێژی تەواو کرد، کە دوایین بەرپرسی رێکخستنی من بوو، کەسی تر پەیوەندی پێوە نەکردمەوە. لای فایقی تورکمان داکۆکیم لەخۆم کرد، وتم: هیچ جۆرە پەیوەندییەکی سیاسیم، لەگەڵ هیچ حزبێکدا نییە. لەولاشەوە لەگەڵ مژدە ئیسماعیل رەشان، قسەم کرد، وتم: لەوانەیە من دەستگیر بکرێم، بەڵام ئەگەر من دەستگیرکرام، باسی تۆ و هیچ کەسی تر ناکەم (ئیعتراف ناکەم) مەترسیتان نەبێت.

مژدە لەزانکۆ ساڵێک پێش من بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، ماوەی ساڵێک زیاتر، من و مژدەو مستەفا، لەبەشی ناوخۆیی زانکۆ، لەیەک ژووردا پێکەوە بووین، پەیوەندی سیاسی و کۆمەڵایاتی، من و مژدەو مستەفا زۆر خۆشبوو، مژدە گوێی لەقسەکانی من گرت، بڕوای بەقسەکانم کرد.

من دەستگیر نەکرام، بەڵام نەمدەزانی کە ئایا فائقی تورکمان هاوکاری کردووم، یان ترساندوومی و ویستوویەتی خۆم بدەم بەدەستەوە و وەک ئەو

---

١٨ جارێکیان یەشاری تورکمان بەقوتابیەکی سودانی وتبوو، لەسلێمانی ژمارەی تورکمان لە ژمارەی کورد زیاترە. قوتابیە سودانیەکە کە دیبوی قوتابی تورکمانی خەڵکی سلێمانی لەپۆلەکەیدا نییە، کەسی تورکمانی خەڵکی سلێمانی ناناسێت، لەراستی قسەکەی یەشاری نەتەوەپەرست کەوتبوە گومانەوە، پرسیاری لەمن کرد، وتی: فایق لەسلێمانی کورد زۆرە یان تورکمان؟ منیش لەو پرسیارە سەرم سوڕما، وتم: ئەلئەمین بەخوا لەسلێمانی یەک تورکمانیش نییە، خەڵکی سلێمانی هەمووی کوردن، کێ ئەو زانیاریە هەڵەیەی بەتۆ داوە؟ ئەلئەمین وتی: یەشار وای پێوتم .

ببم به بەعسی، کە پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، لە ڕێگەی مامە عومەریەوە فایقم ناسی، ئینجا بۆمدەرکەوەت قسەکانی فایق ڕاستبوون.

من لای خۆمەوە بڕیارمدابو تا زانکۆ تەواو نەکەم، تا نەبم بەپزیشک، پێشمەرگایەتی نەکەم، یەکێک لەو بڵاوکراوانەی کە لەڕێگەی ڕێکخستنەوە بۆمان هاتبوو، باسی ئەوەی دەکرد کەی؟ چۆن؟ ئەندامانی یەکێتی دەبن بەپێشمەرگە، سەرکردایەتی یەکێتی پێیباش نەبوو ئەندامانی حزبەکەی بەبێ بەرنامە، نەبن بەپێشمەرگە، لەم کاتانەدا نەبێت:

١. ئەگەر ئەندامەکە بانگکرا بۆ سەربازی، نابێت بچێت بۆ سەربازی، دەبێت لەباتی سەربازی پێشمەرگایەتی بکات.
٢. ئەگەر ئەندامەکەی ینک لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشی ڕژێمەوە ئاشکرابوو، بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ دەرچوو، بۆئەوەی ئەندامەکە دەستگیر نەکرێت، دەبێت پیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکات.
٣. ئەگەر سەرکردایەتی ینک، لەکاتی پێویستدا، بەتایبەت داوا لەکەسێک بکات، پەیوەندی بەهیزی پێشمەرگەوە بکات.

پێش ئەوەی فایق باسی دەستگیرکردنی من بکات، لەبەشی ناوخۆیی کۆلێژی پزیشکی کچان، شانەیەکی ڕێکخستنی ینک ئاشکرابوو، دوو ئەندامی شانەکە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک دەستگیرکران، دواتر ئازادکران، دوای ئازادبوونیان دەستیان لەخوێندن هەڵگرت، پەیوەندییان بەهێزی پێشمەرگەوە کرد. نازانم باسی دەستگیرکردنی من پەیوەندی بەئاشکرابونی ئەو شانەیەوە بوو، بۆئەوەی بزانن ئایا منیش کاری ڕێکخستن دەکەم یان نا؟

ئەو شانەیە لەپێنج کەس پێکهاتبون، بەیان خەڵکی هەولێر بوو، قوتابی کۆلێژی پزیشکی بوو، دەورەیەک دوای من بوو. نازەنین عوسمان قوتابی کۆلێژی پزیشکی ڤێتەرنەری بوو، خەڵکی کۆیە بوو. نەریمان، قوتابی کۆلێژی پزیشکی ڤێتەرنەری بوو، خەڵکی کۆیە بوو، شۆرش حاجی تازە کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی موسڵی تەواو کردبوو، خەڵکی کۆیە بوو، هەژار کانیمارانی قوتابی کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی موسڵ بوو، من ئەوانم

دەناسـی، مەرحـەباییم لەگەڵیانـدا هـەبوو، بـەڵام لـەرووی ڕێکخسـتنەوە، هـیچ پەیوەندیەکم لەگەڵیاندا نەبوو.

نەمزانی چۆن شـانەکەیان ئاشـکرا بـووە، دوای ئاشکرابوونی ئـەو شـانەیە، خوێنـدنیان بەجێهێشـت و بـوون بەپێشـمەرگە. کاتێـک بـووم بەپێشـمەرگە هەرسـێ کوڕەکـە (نـەریمان و شـۆڕش و هـەژار)م بینینـەوە، بـەڵام بـەیان و نازەنین لەشاخ نەمابوون، بۆ خوێندن گەشتیی درەوەی وڵاتیان کردبوو.

**گۆرانی سیاسی:**

ئـەو کاتانـەی لـەکۆلێژی پزیشـکی دەمخوێنـد، بێجگـە لەخوێنـدنی وانـەی پزیشکی و چالاکی سیاسی، خۆلیای شیعر و گۆرانیش بووم، بەدواداچوونم بـۆ گـۆرانی سیاسـی هـەبوو. گۆرانیـە سیاسـیەکانی گـورانبێژی بـاکوری کوردسـتان، شـڤان پـەروەر، کاریـان تێکردبـووم، بەدوایانـدا دەگـەڕام، گـوێم لێدەگرتن. شڤان گۆرانیەکی هەبوو، دەیوت مارکس لینین بخێن، ڕاستی تێدا ببـین، لەتـەواوی گۆرانیەکـەدا باسـی ئـەوەی دەکـرد، دەکـرێ بەفەلسـەفەی مارکسی و ڕێبازی لینین، خەبات بۆ ڕزگاربوونی نەتەوەی کورد بکرێت. ئەو گۆرانیـە گومـانێکی منـی بەتـەواوی یـەکلاییکردەوە، لەبەرئـەوەی فەلسـەفەی مارکسی و سیاسەتی -لینینی بە پرسی ڕزگاری نەتەوەییەوە گرێدەدا، تا ئەو ڕۆژە وا تێگـەینرابووین کـە مارکسـیزم-لینینـزم تـەنیا بـۆ چارەسـەری کێشـە چینایەتیـەکان سـوودی لێوەردەگیرێـت، وا بڵاوبـوو هـەر کەسـێک مارکسـیزم بەچارەسـەری کێشـەی نەتـەوەییەوە گرێبدا، ئـەو کەسـە لەمارکسـیزم لایداوە، دژی بەرژەوەندی و مافی کرێکاران کار دەکات. گۆرانیەکەی شـڤان، گرێیـەکی سیاسی بۆ مـن کردەوە، چیتر گومـانم نـەما کە دەکرێت حزب و ڕێکخراوی مارکسی، بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی خەبات بکات.

لەدوای هەرەسی ١٩٧٥، هونەرمەند عوسـمان عـەلی، گۆرانییەکی وت، ئـەو گۆرانییە لەناو گەنجاندا زوو بڵاوبوەوە، نـاوی گۆرانیەکە (یەکـەم هـەنگاو هـی کوڕ بوە) بوو، گۆرانییەکی سۆزداری بوو، باسی لەخۆشەویستی نێوان کوڕو کچ دەکرد.

رەخنەم لەکاتی وتنی گۆرانییەکە هەبوو، دەموت دوای هەرەس، کاتی ئەو جۆرە گۆرانییە نییە، دوای هەرەس سەردەمی گۆرانی سیاسییە، سەردەمی گۆرانییەکانی شڤان پەروەرە. زۆر نیگەران بووم کە لەو کاتەدا، هونەرمەندێک، گۆرانیەکی وا تومار بکات، نیگەرانتر بووم کە گەنجەکانیش گوێی لێدەگرن و دەیڵێنەوە. نەشمدەزانی هۆنراوەی گۆرانییەکە، هی کام شاعیرەیە. بە گوێرەی بۆچوونی سیاسی ئەو کاتەی خۆم و سەلیقەی هونەریم، دەستکاری دەقی گۆرانییەکەم کرد، لەگۆرانییەکی سۆزدارییەوە، گۆڕیم بۆ گۆرانیەکی سیاسی، دواتر دەرکەوت ئەوە شیعری دڵشاد مەریوانیە، بەڵام نەمزانی کەی ئەو شیعرەی نووسیوە. ئەمە دەقی گۆرانیە سۆزداریەکەیە:

**کەسەکەم بۆ من نازانم وا باوە**
**ئەم جۆرە دڵداریە وا کراوە**
**یەکەم هەنگاو هی کوڕ بوە**
**نازی کچی هەڵگرتوە**
**تا نامایەکی داوەتێ**
**توشی سەد دەردی کردوە**
**تا نامەیەکی داوەتێ**
**پەڕوباڵی دەرکردوە**
**من خۆم ئەزانم کوێم دێشێ**
**بەو داخەوە رۆژێک دەمرم**
**برینم گەشتە سەر ئێسقان**
**رویەکی خۆشی تۆم نەدی کچی ئاسمان**
**ئیتر جورئەت لەکوێ بێنم**
**نامەی گیرفانم دەربێنم**
**بە بەرگی ئاوریشمینەوە لەبەردەم منی کەساسا**

**نازی جوانی ئەفرۆشی کێ ئەوێرێ بێ بەلاتا.**

دوای ئەوەی چەند جارێک گوێم لەگۆرانیەکە گرت، بەم شێوەیە دەقەکەم گۆڕی:

**کەسەکەم بۆ من نازانم وا باوە**
**ئەم جۆرە دابەشکردنە وا کراوە**
**یەکەم هەنگاو هی کورد بووە**
**داوای مافی خۆی کردووە**
**بەڵام تاوەکو ئێستا، هیچی دەست نەکەوتوە.**
**من خۆم دەزانم کوێم ئێشی بەو داخەوە رۆژێک دەمرم**
**برینم گەشتە سەر ئێسقان**
**رزگاریەکی تۆم نەدی ئەی کوردستان**
**ئیتر جورئەت لەکوێ بێنم**
**دوژمنی خۆم بدوێنم**
**بە فرۆکەو زرێپۆشەوە لەبەردەم کوردی کەساسا**
**بە ئاشکرا شەڕ دەفرۆشی کێ دەوێرێ بێ بەلاتا**

لەگەڵ هەندێک لەهاوڕێکانمدا، جار جار ئەو گۆرانیەم دەوتەوە، خۆم بەدەم و بەدەست موسیقام بۆلێدەدا، یەکێک لەو برادەرانەی کە زۆر حەزی بەو تێکستە دەستکاریکراوەی من دەکرد، سەباح بوو، سەباح قوتابی کۆلێژی کارگێڕی و ئابوری زانکۆی موسڵ بوو، خەڵکی کەرکوکە، جار جار سەردانی کۆلێژی پزیشکی دەکرد، یەکترمان دەبینی، سەباح یەک لەو کەسانە بوو کە لەئوتێلی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ناسیم، لەو کاتەوە ببووین بەهاوڕێ. دوای تەواوکردنی زانکۆ، سەباح بوو بەپێشمەرگە، کاتێک من بووم بەپێشمەرگە هەواڵی سەباحم پرسی، دەرکەوت پێشمەرگەی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستانە، ناوی خۆی گۆڕیوە، ناوە نوێکەی بەهمەنە، ئێستا یەکێک لەبەرپرسە باڵاکانی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستانە.

**پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە:**

خۆشەویستی( ئەوین، عیشق) ئەوەیە، بەبێ بەرامبەر، بەبێ مەرج، کەسێک یان پێکهاتەیەکت خۆشبوێت، ئامەدە بیت لەپێناویدا قوربانی بدەیت. لەپۆلی دووی ناوەندیەوە، خۆشەویستی لەناخمدا سەریهەڵدا، خۆشەویستیی من چەند جۆرێک بوو، خۆشەویستیی یەکەمم خۆشەویستی کورد و کوردستان بوو، ئەم خۆشەویستیە تا ئێستەش بەردەوامە و لەگەشەکردندایە. خۆشەویستیی دووەمم، خۆشەویستی ئەو کچە جوانانە بوو، کە دەمویست بیانکەم بەهاوسەری ژیانم، ئەم خۆشەویستیەم بەردەوام نەبووە، زیکزاکی بووە، هەڵچون و دابەزینی پێوەدیاربووە، هەوڵمداوە ئەم خۆشەویستیە بخەمە خزمەتی خۆشەویستیی یەکەمەوە. خۆشەویستی سێیەمم بۆ ئەو حزب و ڕێکخراوە سیاسی و پیشەییانە بووە، کە لە ناویاندا بۆ چارەسەری کێشەی رەوای گەلەکەم کارم کردووە، لێرەشدا دۆگمایانە کارم لەگەڵ نەکردوون، هەر کاتێک بڕوام بەو حزبانە نەمابێت، بەو باوەڕە گەیشتبم کە خزمەتی دۆزی رەوای گەلەکەم ناکەن، لەتیف هەڵمەت وتەنی :

**بە گشت زەبری پاچی قینم کۆتەڵی پیرۆزم شکاند**
**بۆ جوانەمەرگی ئەوینم تاقە فرمێسکێکم نەرژاند.**

ئەو کاتەی لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ بووم، دیوانە شیعری، پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان کویستانمە خوێندەوە، دیوانە شیعرەکەی هەڵمەت، باسی لەکێشە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابوریەکانی ئەو کاتەی خەڵکی کوردستان دەکرد. شیعری زۆرێک لەشاعیرەکانی باشوری کوردستان ئاوێنەی کێشەکانی خەڵکی کوردستانن، شیعرەکانی هەڵمەت تەنها وشەی جوان و موسیقیان لەخۆنەگرتووە، هزر و ئەندێشەی سیاسی و کۆمەلایەتیشیان لەخۆگرتووە، ڕێگای خەبات و بەرخۆدانی سیاسیشیان، بۆ گەلی کورد دەستنیشان کردوە.

چەندان جار دیوانە شیعری (پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان و کویستانمە) لەتیف هەڵمەتم خوێندەوە، بەشێکی زۆری شیعرەکانیم لەبەرکرد، بەلام بەلای منەوە جوانترین شیعری لەتیف هەڵمەت ئەم دێرە بوو:

**من نازانم تۆ لەکوێوە کشای بۆ ناو چەمی گیانم**
**تۆ چۆن زانیت منی هەژار، بێ ولات و دەسگیرانم**

لەو دێرە شیعرەدا، شاعیر بەچڕی باس لەکێشەکانی گەنجی کورد دەکات، کە بــەدەردی هــەژاریی و مــافی نەتــەوەیی زەوتکــراو و خۆشەویســتییەوە دەنــاڵێنێ، چــاوەڕوانی خۆشەوییســتێک دەکــات، خــەمی گەلەکەی و خــەمی هەژاری لەگەڵدا بەشبکات و شانی سووک بکات .

وامدەزانی لەتیف هەڵمەت ئەو دێرە شیعرەی بۆ من نووسیوە، بەئاواتـەوە بووم رۆژێک وەک ئـەو دێـرە شـیعرەی لـەتیف هەڵمـەت، کچێک خۆشـیبوێم ، هەست بە ئازاری هەژاری و بێ وڵاتی من بکات، هـەژاریم بـەلاوازی نـەزانێ، بۆ چارەسەری کێشەی گەلەکەم هاوکاریم بکات.

دوای تـەواوکردنی پۆلی شەشـی زانسـتی، پـوورە سۆسـەن پێیـوتم: تـۆ هـەژاری، هـەژار نـاتوانێ کۆلێژی پزیشـکی تـەواو بکـات. ئـەو قسـەیە کـاری تێکردبـووم، دەترسـام قسـەکەی راسـت دەرچێـت، . ئـەو کاتـەی مـن چوومـە کــۆلێژی پزیشــکی، قوتابییــەکانی کــۆلێژ، لــەخێزانە خۆشــگوزەران و سەرمایەدارەکان بوون، منی هەژارو هەژارانی تریش، پشتمان بەو چاکسازییە بەستبوو، کە حکومەتی عێراق لەبواری خوێندندا ئەنجامی دابوو. جاران تەنها ئــەوەی کەســانی دەوڵەمەنـد دەیـانتوانی کـۆلێژی پزیشـکی تـەواو بکـەن، لەبەرئـەوەی حکومـەت پشـتگیری هـەژارانی نـەدەکرد، کۆلێژەکـان بڕێکی زۆر پارەیان لەقوتابی وەردەگرت، قوتابی کتێبی دەکڕی، بەشی ناوخۆییش نەبوو.

ئـەو کاتـەی مـن لە کـۆلێژی پزیشـکی وەرگیـرام، چاکسـازی لەسیسـتەمی خوێندنی باڵادا کرابوو، چاکسـازییەکە لەبەرژەوەندی قوتـابی هـەژاردا دابـوو، کۆلێژ هـیچ پارەیـەکی لێـوەرنەدەگرتین، بـەخۆڕایی کتێبـی بەسـەردا دابـەش دەکـردین، بەشـی نـاوخۆیی خـۆڕایی بـوو، قوتـابی مانگانەیـەکی کەمیشـی وەردەگرت، لەپۆلەکانی کۆتایی خوێندندا، ئەو کەمـە پارەیـە زیـادی دەکرد، بـە ئەندازەیەک قوتابی پێویستی بەهاوکاری تر نەبێت.

ئـەو کاتـەی مـن لە زانکـۆ وەرگیـرام، بـاری ئـابوری مـاڵی خۆمـان زۆر لاوازبـوو، تـەنیا مـن نەمدەخوێنـد، دوو بـرای تریشـم لـەقۆناغی خوێنـدنی ئامـادەیی و ناوەندیـدا بـوون، بـڕی ئـەو شـەهیدانەیەی شۆڕشـی ئـەیلول، کە لەحکومــەتی عێراقـی وەرمانـدەگرت، کـەم بـوو، لەبەرئـەوەی مـن و براکـانم

گەورەببوین، واتە سێ کەسمان ١٨ هەژدە ساڵمان تێپەرکردبوو، بە پێی یاسا بڕی شەهیدانەکەمان دەبڕدرا، نیوەی مووچەی شەهیدانەکە بۆ باپیرە و داپیرەم( باوک و دایکی باوکم) دەگەڕایەوە، نیوەی بۆ دایکم و برا بچووکەکەم دەمایەوە. دوای کارەساتی ١٩٧٥ ، رژێمی بەعس دەستی بە چۆڵکردنی گوندە سنوورییەکانی باشووری کوردستان کرد، هەر گوندێکی چۆڵبکردایە، رێگەی نەدەدا خەڵک سوود لە زەویوزارەکەی وەربگرێت و کاری جووتیاری و بەخیوکردنی مەرووماڵات بکات، گوڵپ گوندێکی سنووری بوو، ئەو کەمە کشتوکاڵەی کە جاران لەگوند بەرهەممان دەهێنا، دوای راگواستن و چۆڵکردنی گوڵپ، ئەویش نەما. ئەو کاتەی من لە زانکۆ وەرگیرام، دایکم دو سێ پارچە ئاڵتونی هەبوو، ئاڵتوونەکەی فرۆشت، پارەکەی دا بەمن، بۆئەوەی هەندێک پێویستی خوێندنی پێ دابین بکەم.

تا دەمتوانی سکی خۆم و حەزی خۆمم دەگوشی، بۆئەوەی پێویستم بەپارە نەبێت، بەڵام هەندێک جار هەر پارەم پێویستم دەبوو. جاریکیان داوای ١٠ دە دینار قەرزم لەعەباسی هاوڕێم کرد، عەباس زوو پارەکەی بۆ هێنام، بەو هەڵویستەی عەباس دڵخۆشبووم، دوای ماوەیەک کە پارەم دەستکەوتەوە، قەرزەکەم بۆ عەباس گەڕاندەوە، عەباس پارەکەی لێوەرنەگرتمەوە، وتی: هەر کاتێک پارەت پێویست بوو، ئاگادارم بکە، پارەت بۆ دابین دەکەم. جارێکی تر پارەم پێنەمابوو، بەحەمەمین بارامم وت: کەگەڕایتەوە بۆ سلێمانی، بچۆ لای ئەو خزمەم، هەندێک پارەم بۆ بێنە، حەمەمین بارام لەسلێمانی گەڕایەوە پارەکەی نەهێنابوو، وتی: خزمەکەت وتی پارەم نییە، بەڵام من پارەی خۆمم بۆ هێناوی. هەرچەند هەوڵمدا پارەکەی لێوەرنەگرم، زۆری لێکردم کە ١٠ دیناری لێوەربگرم، وتم: باشە بەقەرز لێت وەردەگرم، وتی: باشە تۆ ئێستا پارەت پێنییە ئەو ١٠ دینارە وەربگرە، دواتر تەگبیری دەکەین، پارەکەم وەرگرت. دوای ماوەیەک قەرزەکەم بۆ حەمەمین بارام گێڕایەوە هەرچی هەوڵمدا پارەکەی لێوەرنەگرتمەوە. حەمەمین بارام قوتابی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ بوو، سێ دەورە پێش من بووو، خەڵکی هەڵەبجە بوو، ئێستا لەسلێمانی پسپۆری نەخۆشی منداڵانە.

بەو هەژاری و کولەمەرگییە دەژیام، هەمو ئاواتم ئەوەبوو کۆلێژی پزیشکی تەواو بکەم، دوای ئەوە ببم بەپێشمەرگە، هەندێک جاریش خەونم بەوەوە دەبینی، هاوسەرێکی جوانی پزیشکم هەبێت، خەمی هەژاری و سیاسیم لەگەڵ دابەش بکات، هەرچی ئەملاو ئەولام دەکرد، لەو کۆلێژەی خۆمان کچێکم شک نەدەبرد پێوانەکانی کۆپلە شیعرەکەی هەڵمەتی بەسەردا جێبەجێبکرێت. دیارە ئەوشاعیرە ئەو کۆپلە شیعرەی بۆ ئەوە نوسیبوو، تا هەزارانی وەک من دووچاری دڵەڕاوکێ و تەنگووچەڵەمە بکات.

هەندێک جار هەژاری و کوردایەتیم بیردەچووەوە، تەنیا لەخەونی جوانترین کچی کۆلێژی پزیشکیدا دەژیام، ئەوەش ناکۆکیەکی لەناخمدا درووستدەکرد، لەلایەکەوە هەژاری، لەولاوە سیاسەت و خولیای پێشمەرگایەتی، لەملاشەوە کچی جوان و هاوسەرگیری، دڵنیاشبووم کچە جوانەکانی کۆلێژ، ژیانێکی خۆشیان دەوێت، حەزیان بەژیانێکە لە سەرئێشەی سیاسەت دووربێت، دڵنیابووم هیچکام لەکچەکانی کۆلێژ، بەو ژیانە کولەمەرگی و سەرکێشییەی من رازی نابن، کەچی هەندێک جار، دوور لەلۆجیک و رێسای کۆمەڵایەتی و ئامانجە سیاسیەکانم، دەچوومە جیهانێکی خەیاڵاویەوە، هەوڵی بەدەستهێنانی دۆستایەتی کچێکم دەدا، ئەگەری سەرکەوتنی ئەو هەوڵە خەیاڵ بوو.

ئەو کچە جوانەی کە لە دوورەوە خۆشمویست و حەزمدەکرد دۆستایەتی لەگەڵدا درووستبکەم، ئامادەیی نیشان نەدا قسەشم لەگەڵدا بکات، زۆر نیگەرانی کردم، ئازاری رووحی ئەو فەرامۆشکردنە وایلێکردم، لای هاوڕێکانم باسی بکەم.

رۆژێکیان لەموسڵ گەڕامەوە بۆ سلێمانی، لەکۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی سلێمانی سەردانی هەڤاڵ کوێستانی هاوڕێمم کرد، باسی خۆشەویستییە ناهاوسەنگەکەی خۆمم بۆ کوێستانی گێڕایەوە، باسی جوانی و دڵرەقی کچەکەم کرد. ئەو کاتە هەڤاڵ کوێستانی شیعری دەنوسی، خەریکی نوسینی کتێبی (ئافرەت و ژانی لەدایکبونێکی نوێ) بوو. وتی بۆ من نامەیەک بۆ ئەو کچە نەنوسم، بەڵکو وایلێبکەم بەرامبەر بەتۆ دڵی نەرم ببێت و خۆشی بوێ، منیش بە پێشنیارەکەی هەڤاڵ رازی بووم.

لەبەرئەوەی کچەکە کوردی نەدەزانی، لەمەسیحیەکانی کەرکوک بوو، هەڤاڵ وتی: نامەکە بەعەرەبی دەنووسم، وتم: باشە، دوای ئەوەی ناونیشانی

من و کچەکەی وەرگرت، وتی: لەیەک کاتدا لە ڕێگەی پۆستەوە نامەکە بەدوو کۆپی، بۆ هەردووکتان دەنێرم.

من گەڕامەوە بۆ موسڵ، چاوەڕوانی نامەکەی هەڤاڵم دەکرد، هەمو ڕۆژێک چاودێری پۆستی کۆلێژم دەکرد، بزانم لەسلێمانیەوە نامەم بۆ دێت، ڕۆژێکیان پۆست گەیشت، سەیرم کرد لەو ڕۆژەدا، نامە بۆ من و بۆ کچەکەش هاتووە، من ڕۆیشتم نامەکەی خۆمم وەرگرت، سەیرم کرد نامەکەی هەڤاڵ کوێستانیە، دەستم بەخوێندنەوەی کرد، نامەکە زۆر کاریگەر بوو، چەندان جار نامەکەم خوێندەوە، هەر ئەو ڕۆژە چاودێری کچەکەشم دەکرد، بزانم نامەکە وەردەگرێت، بەڵێ کچەکە لەگەڵ هاوڕێکەیدا نامەکەیان وەرگرت، لەسەر کورسیەکی باخچەی کۆلێژ دانیشتن، دەستیان بەخوێندنەوەی نامەکە کرد، منیش بەرامبەریان دانیشتم، نامەکەم خوێندەوە، چاوەڕوانی نیشانەیەکی خۆشی بووم، تەنیا زەردەخەنەو کەمێک پێکەنین نەبێت، هیچم لەکچکەو لەهاوڕێکەی بەدی نەکرد.

چەند دێڕێکی سەرەتای نامەکەم لەبیرماوە کە دەڵێت: )كنا و مازلنا صديقان حميمان، كان يتحدس لى ما يحدس له، منذ ايام زارني و هو يتحدس لي عن شابه معجب بها . . . . . . . تا کۆتایی )

خۆشەویستی من بۆ ئەو کچە، زۆر نالۆجیکی بوو، لەبەرئەوەی کچەکە کورد نەبوو، موسڵمانیش نەبوو، تەنیا جوان بوو، ئاوەزم دەیوت: هۆکاری سیاسی و ئاینی ڕێگری لەدروستبونی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان من و ئەو کچەدا دەکەن، کەچی هەستم جڵەوی دەکردم، دەیخستمە ناو جیهانێکەوە، جیاوازی و ناکۆکی نێوان تاک و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی تێدا نەبوو، کۆمارەکەی ئەفلاتوون بوو، یان سەردەمی کۆمۆنیزمی مارکس بوو، هەمو کەسم وەک یەک سەیر دەکرد، لەو جیهانە خەیاڵاویەدا منیش بەخۆشەویستەکەم دەگەیشتم.

ماوەی چەند مانگێک هەر چاوەڕوانی وەڵامێکی ڕاستەخۆ و ناڕاستەوخۆی کچەکە بووم، بەڵام کچەکە نە وەڵامی هەڤاڵی دایەوە، نە وەڵامی منی دایەوە، دوای ئەوە کۆتاییم بەو هەستە سۆزداریە تاکلایەنە هێنا، کە دوو ساڵ زیاتری خایاند، وە لەڕوی دەرونیەوە زۆر ئازاری دام.

# ٤

# له جووتیارییه‌وه بۆ دکتوری

**به‌غدا:**

هاوینی ساڵی١٩٨١، کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵم ته‌واوکرد، له زانستی پزیشکی و نه‌شته‌رگه‌ری گشتیدا، بڕوانامه‌ی به‌که‌لوریۆس( MBcHB)م وه‌رگرت. پیشه‌ی جوتیاری گوندم به‌جێهێشت، ده‌ستم به کاری پزیشکی کرد ، له‌باتی شه‌تڵێدان و پاچه‌کۆڵه‌و و گه‌ڵاشکێن و شریت لێدان، ده‌ستم به دۆزینه‌وه و چاره‌سه‌ری نه‌خۆشی کرد، ئه‌مه گۆڕانکاریه‌کی چه‌ندایه‌تی ژیانم بوو، له ڕووی کۆمه‌ڵایه‌تی و ئابووریه‌وه، ژیانم پێشکه‌وت، ئاواتیکی خۆمم به‌ده‌ستهێنا.

ئه‌گه‌رچی له‌زانکۆ له‌گه‌ڵ کێشه‌ی هه‌ژاری و سۆزداری و سیاسیدا ده‌ژیام، به‌ڵام له‌خوێندن دوانه‌که‌وتم، له‌کاتی دیاریکراودا، به سه‌رکه‌وتوویی کۆلێژی

پزیشکیم تەواوکرد. ئەگەر پلەی نیشتمانی عەرەبی و ئامار و هەندێک وانەی تری ناپزیشکی لەنمرەکانم دەربکەیت، لەوانە پزیشکیەکاندا ریژەی لەسەدا حەفتا زیاترم بەردەکەوت، لەوانەی ئەنەتۆمی پۆلی یەک و دووی کۆلێژدا، لەبەر ئەوەی وانەیەکی هاوبەشی خۆم و ئەو کچە بوو کە تاکلایەنە خۆشمدەویست، یەکەمی پۆل بووم. لەوانەی نەشتەرگەریدا، نمرەم بەرز بوو. لەبەرئەوەی دەمویست دوای تەواوکردنی کۆلێژ، ببم بەپێشمەرگە، برینی پێشمەرگە بریندارەکان چارەسەر بکەم، بۆیە گرنگی زۆرم بەوانەی نەشتەرگەری دەدا، نمرەکانم لە هەشتاوە نزیکبوون .

لەیەکەمەکانی کۆلێژی پزیشکی بووم، بۆ منێکی هەژار، کە لەگەڵ خوێندنی کۆلێژی پزیشکی، خەریکی سیاسەت و دڵداری سەرنەکوتو بووم، ئەو نمرانە زۆر باش بوون.

دوای تەواوکردنی کۆلێژ، قۆناغی دامەزراندن هاتە پێشەوە، دامەزراندنی فەرمی لەنەخۆشخانەکانی عێراقدا، بەگوێرەی نمرە بوو، لەو نەخۆشخانەیەی دەتویست کاری لێبکەیت، ناوی خۆتت دەنوسی، دواتر بەگوێرەی نمرەکان، کێبرکێی لەسەر دەکرا، هەر کەسێک نمرەی بەرز بوایە، دەرفەتی وەرگرتنی لەو شوێنەی کە دەیەویست، لەکەسانی تر زیاتربوو، نمرەکانی من بەرزبوون، لەهەمو نەخۆشخانەکانی عێراقدا، بە نەخۆشخانەی شاری پزیشکی بەغداشەوە وەردەگیرام.

رۆژێکیان د. بەیان و د. حەمەیوسف و د. سەلاح، سێ هاوڕێ هەولێریەکەی کۆلێژی پزیشکیم سەردانیان کردم، وتیان: ئیشمان پێتە، وتم: فەرمون، وتیان: تۆ دەتەوێت لەکام شارە دامەزرێیت، وتم: شاری سلێمانی، وتیان: مادام وایە هاوکاریەکمان بکە بۆ سەلاح، وتم: هاوکارییەکە چییە؟ ، وتیان: باوک و دایکی سەلاح نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە،ماڵیان لەهەولێرە، سەلاح دەیەوەێت لەهەولێر دامەزرێت، بۆئەوەی لەنزیکەوە چاودێری دایک وباوکی بکات، بەلام لەبەرئەوەی نمرەکانی نزمن، هەولێر زانکۆی لێیە، نەخۆشخانەکانی هەولێر ئەو نمرانەی سەلاح وەرناگرن. بەلام لەبەرئەوەی

سلێمانی زانکۆی لێنیە، نمرەکانی سەلاح لەسلێمانی وەردەگیرێن، تۆ نمرەکانت بەرزە، لەهەولێر وەردەگیرێیت، داواکەمان ئەوەیە کە تۆ یەکەم هەڵبژاردەت بۆ دامەزراندن، نەخۆشخانەکانی شاری هەولێر بێت، دوای دەرچوونی ئەنجامەکان، تۆ و سەلاح شوێنەکانی خۆتان دەگۆڕنەوە، تۆ بگەرێرەوە سلێمانی، سەلاحیش بگەڕێتەوە بۆ هەولێر.

پێش ئەوەی ئەو هاوڕێیانەم ئەو قسانەم لەگەڵ بکەن، من بڕیارم دابوو داوای دامەزرندن لە موسڵ و هەولێرنەکەم، لەبەرئەوەی لەکاتی خوێندندا، شەش ساڵ لەموسڵ مابوومەوە، ئەو شەش ساڵە بە هەولێریشدا تێپەڕیبووم.

بڕیارمدابو لەسلێمانی کاری پزیشکی بکەم، وە ماڵی خۆمان لەخورماڵەوە بگوێزمەوە بۆسلێمانی، ماوەیەک لەگەڵ دایکم و براکانم لەسلێمانی پێکەوە بژین، بەڵام بۆ رازیکردنی دڵی ئەو سێ هاوڕێیەم، وە بۆ هاوکاری سەلاح، بڕیارمدا یەکەم داواکاری من نەخۆشخانەکانی هەولێر بێت. وەڵامم دانەوە وتم: باشە.

دامەزراندنی فەرمی پزیشکان، دوای تەواوکردنی زانکۆ، نزیکەی سێ مانگی دەخایاند، منیش ئیشم نەبوو، باری ئابووریشم باش نەبوو، پێویستم بە پارەبوو، بۆیە هەوڵمدا بەشێوەی کاتی خۆم دامەزرێنم.

بۆ ئەو مەبەستە سەردانی فەرمانگەی پەیوەندیداری شاری بەغدام کرد، دەستم بەرۆتیناتی دامەزراندنی کاتی کرد، نەمدەزانی کام نەخۆشخانەیەی بەغدا هەڵبژێرم، لەو کاتەدا کچێکی پزیشک لەپێشمەوە بوو، ناوی لەنەخۆشخانەی سەورە(شۆڕش)دەرچوبوو، منیش ئەوەندە حەزم لەناوی شۆڕش و شۆڕشگێری بوو، ئەو کچە جوانەش لەو نەخۆشاخانەیە دامەزرابوو، نەخۆشخانەی سەورە لەلام شیرین بوو، لەدڵی خۆمدا وتم بۆ منیش داوای دامەزراندن لەو نەخۆشخانەیە نەکەم؟ ، زانیاریم لەسەر نەخۆشخانەکانی بەغداش نەبوو، کاتێک چوومە پێشەوە، پرسیاریان لێکردم کە دەتەوێت لەکام نەخۆشخانە کار بکەیت؟ وتم دەمەوێت لەنەخۆشخانەی

سەورە كار بكەم، يەكسەر بڕياری دامەزراندنی كاتيم لەنەخۆشخانەی سەورە بۆ دەرچوو.

كە پەيوەنديیم بەنەخۆشخانەی سەورەوە كرد، دەرچوو ئەو گەڕەكەی ئەو نەخۆشخانەييەی لێيە، گەڕەكێكی جەماوەری بەغدايە، خەڵكی ئەو گەڕەكە هەژارترين خەڵكی بەغدان، ئەو گەرەكەيە لە شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨دا، خەڵكەكەی لە گوندەكانی خوارووی عێراقەوە هێنراون و لەوێ نيشتەجێكران، لەبەر ئەوەی شيعە بوون، رژێمی بەعس گرنگی بەو گەڕەكە نەدەدا، خزمەتگوزاری باشی بۆ دابين نەدەكرد، بەڵام من نزيكەی مانگ و نيوێك، لەو نەخۆشخانەيەدا وەك پزيشكی خولاو، لەبەشی نەخۆشيەكانی ژنان و منداڵبووندا بەبێ كێشە كارم كرد.

لەمانگی تەموزی ١٩٨١ دا، بۆ يەكەم جار لەنەخۆشخانەی سەورەی بەغدا، وەك فەرمانبەر(پزيشكی خولاو) دامەزرام، بيرم نايەت موچەی مانگانەم چەند بوو، بەڵام گوڕانكاريەكی چۆنايەتی لەژيانمدا دروستبوو، پێكهاتە چينايەتيەكەم لە جوتيارەوە، بۆ بورجوازی بچووك گۆڕدرا، باری ئابووريم لەئاستێكی نزمەوە، بەرەو ئاستێكی مام ناوەندی كشا. لەڕووی هزری سياسييەوە، گۆڕانكاريم بەسەردا نەهات، وەك كەسێكی نەتەوەيی شۆڕشگێڕ، لەسەر بيروباوەڕی خۆم مامەوە، پەيوەندی سياسی و كۆمەلاتيم وەك خۆی مايەوە، بەپێچەوانەی زۆرينەی خەڵكەوە، كاتێك پيشەو پلەی كۆمەلايەتيان، يان ئاستی بژێوی ژيانيان بەرەو باشی دەگۆڕێت، هزری سياسی و هەڵوێستی سياسيشيان گۆڕانی بەسەردا دێت. كەسانێك هەبوون لەكاتی قوتابخانەو زانكۆدا، شۆڕشگێر بوون، بەڵام كە خوێنديان تەواوكرد و بوون بەكارمەند، كەمێك باری ژيان و گوزەرانيان باشبوو، دەستبەرداری بيروباوەڕ بوون، كەوتنەوە خزمەتی دەسەڵات، لەپێكهاتە شۆڕشگێرەكەی كۆمەڵگا دووركەوتنەوە. من بەپێچەوانەی ئەو توێژە خۆپەرستەوە، لەگەڵ ئەوەی كە گۆڕانكاريەكی جدی بەسەر ژيان و گوزەرانی كۆمەلايەتی و ئابووريمدا هات، هەر لەسەر تێگەيشتن و هەڵوێستە نەتەوەيی و شۆڕشگێريەكەی خۆم بەردەوام بووم.

**برایەکم شەهید دەبێ:**

ئـەو کاتـەی مـن لەنەخۆشـخانەی سـەورەی بەغـدا بـووم، نـاجحی بـرام لەکۆلێژی پزیشکی ڤێتەرنەری زانکۆی بەغدا دەیخوێند. مامۆستا تارقی برام لەپێشمەرگایەتی گەڕابوەوە، وەک سزادان، بۆ شـاری بەسـرە راگوێزرابـوو، لـەوێ مامۆستا بوو. نـامقی بـرام پێشـمەرگەی پـارتی بـوو. ئێمـە چـوار بـرا بـووین، سـاڵی ١٩٦٣ باوکمـان شـەهید بـوو، بـەژیانێکی کولەمـەرگی خۆمـان پێگەیاند، من و تارق و ناجح، بیروباوەڕمان بەرامبەر بەپارتی گۆڕا، ئەندام و دۆست و لایەنگری یەک بووین. نامقی برام لەمن منداڵ تر بوو، ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بوو، بەهۆی ئەوەشەوە کە زوو دەستی لەخوێندن هەڵگرت، بوو بەهاوڕێی ئەو ئامۆزاو پورزایانەمان، کە لەگەڵ پارتی مابوونەوە، ئەویش لەگەڵ پارتی مایەوە، کە خیزانیشی پێکەوەنا، زیاتر لـەمن و براکانی ترم دوورکەوتەوە.

مـن ئاگـادار نـەبووم نـامقی بـرام کـەی دەسـتی لـەکار هـەڵگرتبوو، چـۆن سەرەتای ساڵی ١٩٨١ پەیوەندەی بە پێشمەرگەی پدک کردبوو، کە هەواڵەکەم پێگەیشت، زۆر نیگەران بووم.

ئـەو کاتـەی مـن لەبەغـدا بـووم، جارجـار نـاجحی بـرام سـەردانی دەکـردم، ئێوارەیەک لە سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٨١ دا، بەبێ ئەوەی کاتی سـەردان بێت، کتوپڕ ناجح هاتە لام، وتی: دەبێت بگەڕێینـەوە بـۆ کوردسـتان، وتـم: بـۆ؟ وتی: هەواڵیان بۆ هێناوم کە پێشـمەرگەی پـارتی و یـەکێتی شـەڕیان کردووە، لەشـەڕەکەدا نـامق برینـدار بـووە، بـاری تەندروسـتی بـاش نییـە، بە قسـەکانی ناجح بەو بڕوایە گەیشتم ، کە براکەمان شەهید بووە.

لەنەخۆشخانە مۆڵەتم وەرگرت، بۆ رۆژی دوایـی بـەیانی زوو، لەبەغداوە بەتاکسی گەیشتینەوە هەڵەبجە، بەشداری ماتەمینی شەهیدبونی نامقی برام و فازلی پوورزامم کرد، فـازل و نـامق دوو هـاوڕێی نزیکـی یـەکتر بـوون، لـەمن منداڵ تر بوون. بە وردی بـەدواداچونم بـۆ شـەهیدبوونی نـامق و فـازل کـرد،

لەرۆژی ١١-٩-١٩٨١، لەنزیک گوندی رەزڵەی ناوچەی شارباژێڕ، شەڕێکی خوێناوی لەنێوان هێزەکانی ینک و هێزێکی هاوبەشی پارتی و حسک و پاسۆکدا روویداوە، لەشەڕەکەدا نزیکەی دە کەس لەپێشمەرگەکانی پارتی و چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتیش شەهید بوون.

پرسەی نامق و فازل کۆتایی هات، پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ بەغدا، نامەیەکی لقی ٤ چواری پارتیم بۆهات، بەبۆنەی شەهیدبونی براکەمەوە، سەرەخۆشییان لێکردبووم، پەیمانیان دابوو تۆڵەی براکەم بکەنەوە، ئەوەشیان بەدەرفەت زانیبوو، داوام لێبکەن لەمەودوا ئاگامان لەیەکدی بێت و کاریان لەگەڵدا بکەم.

نامەکەم خوێندەوە، هیچ کاری تێنەکردم، نامەکەم لای دایکم بەجێهێشت، وەڵامم نەدایەوە. پاش چەند رۆژێک، نازانم لەبەغدا بوو یان لەسلێمانی، کادرێکی کۆنی پارتی، هاوڕێی سەردەمی قۆناغی ئامادەییم، شەهیدبونی براکەمی بەهەل زانی، هاتە لام، قسەی لەگەڵ کردم، بۆئەوەی لەپارتی نزیک بیمەوە، دەیوت هەر هیچ نەبێت لەبەر خاتری خوێنی شەهیدی برات، دۆستایەتی پارتی بکە، بەبێ دودڵی داواکەی هاوڕێکەمم رەد کردەوە.

**نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر:**

دوای شەهیدبوونی براکەم، گەڕامەوە بۆ بەغدا، لەنەخۆشخانەی سەورەی بەغدا دەستم بەکار کردەوە، لەمانگی ١٠-١٩٨١دا، بەفەرمی لەهەولێر دامەزرام، لەنەخۆشخانەی سەورەی بەغدا کۆتاییم بەخزمەت هێنا، پەیوەندیم بەنەخۆشخانەی کۆماری هەولێرەوە کرد، لەبەشی هەناوی، وەک پزیشکی خولاو دەستم بەکارکرد.

ئەو ماوەیەی لەهەولێر کارم دەکرد، بەردەوام چاوەڕوان بووم، د. سەلاح بێتە لام، سوپاسم بکات، بەزوترین کات بگەرێتەوە بۆ هەولێر، منیش بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، بۆئەوەی ماوەیەک لەگەڵ دایکمدا بژیم. د. سەلاح من

و دایک و باوکی بیرچووبوو، سەردانیشی نەدەکردین، منیش بێتاقەت بووم، نزیکەی ٣-٤ مانگ لەنەخۆشخانەی کۆماری هەولێر، وەک پزیشکی خولاو، لەبەشی نەخۆشییەکانی هەناوی و بوژانەوەی دڵ کارم کرد. لەگەڵ مامۆستاکانم د. دەشتی دزەیی، د. جەمیل حەبال، د. فەرهاد حەویزی، پەیوەندییەکی زانستی و کۆمەڵایەتی باشم درووستکرد.

ئەو کاتە نەخۆشی مەلاریا کەم ببوەوە، نەخۆشێکی د. جەمیل حەباڵم بینی، گومانی مەلاریام لێکرد، لەتاقیگە پشکنینی خوێنم بۆ کرد، دەرچوو مەلاریای هەیە، لەبەرئەوەی نەخۆشی مەلاریام دەستنیشانکرد، د. جەمیل داوای لەبەڕێوبەری نەخۆشخانە کرد، سوپاسنامەم بۆ دەربکەن، سوپاسنامەیان بۆ دەرکردم.

دۆستایەتیم لەگەڵ ژمارەیەک پزیشکی خولاوی نەخۆشخانەکانی هەولێر پەیداکرد، یەک لەوانە د. حسەین تالەبانی بوو، کاتێکی خۆشمان پێکەوە بەسەربرد. بەڵام من لەهەولێر زۆر دڵخۆش نەبووم، لەبەرئەوەی پەیمانم بەدایکم دابوو، بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، ماوەیەک لەگەڵیدا بژیم، لەبەرئەوەی هەستم دەکرد قەرزاری دایکمم، دایکم بەژیانێکی کولەمەرگی ئێمەی بەخێوکرد، رەشبین بوو، قەت بەبیریدا نەدەهات رۆژێک لەڕۆژان کوڕە گەورەکەی ببێت بە پزیشک و ئەو لەسایەییدا پشوویەک بدات، لەچەند مانگی رابردووشدا جەرگی سووتابوو، کوڕێکی شەهید ببوو، بۆیە زیاتر لەجاران پێویستی بەنزیکی و دڵنەوایی من دەبوو.

ئەو کاتەی من لەهەولێر بووم، لەسلێمانی خانویەکمان بەکرێ گرت، دایکم و ناجی برام لەسلێمانی نیشتەجێ بوون، جار جار تارقی براشم لەبەسرەوە دەگەڕایەوە و لەلایان دەمایەوە، چاوەڕوان بوون منیش بەزووترین کات بگەڕێمەوە سلێمانی و ماوەیەک لەگەڵیاندا بمێنمەوە.

**لیژنەی لێکۆڵینەوە:**

ڕۆژێکیان لەبەشی فریاکەوتنی نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر بووم، نەخۆشم دەپشکنی، لەپڕ نەخۆشێکی مەترسیداریان هێنایە ژوورەوە، بەپەلە نەخۆشەکەم پشکنی، بۆم دەرکەوت دوچاری جەڵتەی دڵی کتووپڕ بووە، نازانم بۆچی لەو کاتەدا فەراشەکەی بەشی فریاکەوتن لەوێ نەبوو، هەتاوەکو بەودا نەخۆشەکە ڕەوانەی بەشی بوژانەوەی دڵ بکەم. کە زانیم فەراشی لێنییە، خۆم پاڵم بەکورسی ژێر نەخۆشەکەوە نا، بەرەو بەشی بوژانەوەی دڵ بردم، لەوێ فریاکەوتنی سەرەتاییمان بۆ کرد، دوای ئەوە، بۆ شوێنی ئەرکەکەی خۆم گەڕامەوە.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، لەسەر سکاڵای کەسوکاری نەخۆشەکە، لیژنەی لێکۆڵینەوەیان لەسەرگرتم، بانگیان کردم بۆ لیژنەکە، بەتومەتی ئەوەی، لەو کاتەدا کە ئەو نەخۆشە گەیشتوەتە بەشی فریاکەوتن، دکتۆری لێنەبووە، تەنیا فەراشێکی لێبووە، کە نەخۆشەکەی گەیاندۆتە بەشی بوژانەوەی دڵ. وایانزانیبوو من فەراشیی نەخۆشخانەم، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا من پزیشکی ئێشکگر بووم، لەدژی من سکاڵا تۆمار کرابوو.

دوای ئامادەبوونم لەدانیشتنی لیژنەی لێکۆڵینەوەدا، وەڵامی لیژنەکەم دایەوە، سەلماندم کە وەک پزیشک لەو کاتەدا لەبەشی ئێشکگرتن ئامادە بووم، پشکنینم بۆ نەخۆشەکە کردوە، لەسەرووی ئەرکی خۆشمەوە، کاتێک بینیومە فەراشەکە لەوێ نەبووە، لەپێناو پاراستنی گیانی نەخۆشەکەدا، کاری فەراشەکەشم کردووە، نەخۆشەکەم گەیاندۆتە بەشی بوژانەوەی دڵ. بەو شێوەیە تومەتەکەم لەسەر لاچوو، بێتاوان دەرچووم، بەڵام سوپاسییان نەکردم.

**ڕێکخستنی کۆمەڵە:**

پیش ئەوەی کۆلێژی پزیشکی تەواو بکەم، عەبدولباقی مائی بەرپرسم بوو، چەند دەورەیەک پێش من بوو، کە کۆلێژی پزیشکی تەواکرد، ئاگاداری

نـەکردم کـاری ئاینـدەی ڕێکخســتنم لەگـەڵ کێـدا دەبێـت. بەڵام لـەدەرەوەی ڕێکخستن، لەگەڵ برادەرانی کۆلێژ هەڵویست و چالاکی سیاسیم هەبوو.

ئـەو پەیوەندییـەی لـەخورماڵ بـەنهێنی لەگـەڵ کـەرتی ڕێکخسـتنی هەڵەبجـە درووسـتمکرد، دوای ئەوە کـەس نـەهات بەلامـدا، کـەس لێـی نەپرسـیمەوە. بەبیرکردنــەوەو هەڵوێســتی سیاســی، هــەر لەگــەڵ سیاســەتی ینکـدا بــووم، لەبەرئەوەی لـەو کاتـەدا، پێشـمەرگەکانی ینـک، دژی سیاسـەتی بەعسیکردن و ڕاگواسـتن و بەعـەرەبکردنی کوردسـتان چالاکییـان دەکرد، لـەو کاتـەدا پدک، وەک سالانی کۆتایی شەستەکان، ببووە دەسکەلای دەستی کۆماری ئیسـلامی ئێــران، شانبەشــانی پاســدارو هێــزە چەکــدارەکانی ئێــران، شــەڕی هێــزە سیاسیەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانی دەکرد.

بڕوای من بەینک هێندە بەهێزبوو، پێشـمەرگەکانی ینـک لەشـەڕی نـاوخۆدا براکەمیان شەهید کرد، دژی ینـک هەڵوێستم نیشـان نـەدا، ئەو کاتانە براکەم شەهیدبوو، برادەرانـی پدک نامـەیان بۆ نوسیم، هاتنە لام بۆئەوەی دژایـەتی ینک بکـەم و دۆسـتایەتی پدک بکـەم، بـەڵام لەبەرئـەوەی بەرژەوەنـدی گشـتی گەلی کوردم لەسەرووی بەرژەوەندی بنەماڵـەوە دەبینی، لـەو بـاوەڕەدا بووم ینک بەرژەوەندی گەل دەپارێزێت، نـەمتوانی هەڵویسـتێکی دوژمنانـە بەرامبـەر بەینک نیشانبدەم، یان هەڵویستێکی دۆستانە، بەرامبەربە پدک نیشانبدەم.

لەنەخۆشـخانەی کۆمـاری هــەولێر، وەک پزیشـکی خـولاو کـارم دەکـرد، هـەولم دەدا پەیوەنـدی خۆم لەگـەڵ ڕێکخسـتنەکانی ینـک درووسـت بکەوەمـە، کەسم لەهەولێر نەدەناسی، دۆسـتێکم هـەبو بـەناوی ئـاوات تـەوفیق، لەڕێگـەی بـەرزان هەورامیـەوە ناسـیم، بـەرزان خـزمم بـوو، ئـاوات و بـەرزان قوتـابی کۆلێژی جیۆلـۆجی زانکۆی سـەلاحەدین بوون، لـەو کاتـەدا زانکۆی سلێمانی گواسترابوەوە بۆ هـەولێر، نـاوی نرابو زانکۆی سـەلاحەدین. ئـاوات دووجـار سـەردانی کردم، زۆر باسـی سیاسـەتمان دەکرد، بـاس لـەوە کرا کە پێکـەوە لەڕێکخســتن کـار بکـەین، دواتـر وتـی بـا لەگـەڵ بەرپرسـەکەم قسـە بکـەم.

ڕۆژێکیان ئاوات لەگەڵ کچێک هات بۆ لام، کچەکەی پێناساندم، وتی ئەمە کەژاڵە، بەرپرسی ڕێکخستنی ئێمەیە، حەزی کرد بتبینێت، لەو بارەیەوە قسەت لەگەڵ بکات.

دوای قسەکردن لەسەرباری سیاسی کوردستان، لەکۆتایی ساڵی ١٩٨١ دا، جارێکی تر پەیوەندیم بەڕێکخستنی ینک(کۆمەڵە) کردەوە. کەژاڵ قوتابی کۆلێژی بەڕێوەبەری و ئابوری زانکۆی هەولێربوو، خۆشکی ئەو نازەنینەی کۆلێژی پزیشکی ڤیتەرنەری بوو، کە لەگەڵ بەیانی هاوڕێیدا لەدەزگای ئاسایشی موسڵ ئاشکرابوون، دەستیان لەخوێندن هەڵگرت، بوون بەپێشمەرگە. کەژاڵ خۆشکەزای شەهید جەعفەر بوو، کە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ شەهاب و ئەنوەر لەزیندانی ئەبوغرێب لەسێدارە دران. برایەکی کەژاڵ لەنەخۆشخانەی کۆماری بوو، ناوی ئازاد بوو، یاریدەدری پزیشکی بەشی تیشک بوو، ئەویش هاوڕێم بوو، ئەوە وای لەمن کرد کە باوەڕ بەکەژاڵ و ئاوات بکەم، کاری سیاسیان لەگەڵ بکەم. دواتر بۆمدەرکەوت کە کەژاڵ و ئاوات پەیوەندیان بەکەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوەوە هەیە، بەرپرسی پۆلەکەیان لە ناو هێزی پێشمەرگەدا کادیرە، ناوی شێخ قادرە.

تا ئەو کاتەی لەهەولێر بووم، لەڕێگەی کەژاڵ و ئاواتەوە، لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی شەقلاوە بەجدی کارم دەکرد، دەرمانم بۆ پێشمەرگە دەنارد، بڵاوکراوەکانی ڕێکخستنم دەخوێندەوە، بڵاومدەکردنەوە، پڕوپاگەندەم بۆ ڕێکخستنی کۆڕەک و بۆ هێزی پێشمەرگە دەکرد.

**نەخۆشخانەکانی سلێمانی:**

دوای چوار مانگ کار کردنم لەهەولێر، د. سەلاح لە سلێمانی گەڕایەوە، هاتە شوێنی من، منیش لە هەولێرەوە گەڕامەوە بۆ سلێمانی، لەنەخۆشخانەی فێرکاری سلێمانی دەستم بە کار کرد، بەلام پەیوەندی ڕێکخستنم لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوا ، بەردەام بوو. جار جار ئاوات و کەژاڵ

سەردانیان دەکردم، بڵاوکراوەیان بۆ دەهێنام، ئەوەی لەسەر منیش بوو، ئەنجامم دەدا.

که گەڕامەوە سلێمانی، لە دایکم و براکانم نزیکبوومەوە، قۆناغێکی سەختی ژیانی دوای شەهیدبونی باوکم و براکەمم تێپەراند، باری ئابووریمان باش بوو، هەستم بەخۆشی ژیان کرد، خەریکبوو گرفتەکانی نەبوونی و دووری کەسوکارم بیردەچووەوە، موچەی مانگانەی ئەو کاتەی پزیشکی خولاو، ١٤٠ سەد و چل دینار بوو، بەباشی پێی دەژیاین، برێکیشم پاشەکەوت دەکرد.

ئەو ماوانەی لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی کارم دەکرد، رۆژبەڕۆژ هەستی کوردایەتیم بەرزتر دەبوەوە، ئامادەکاریم دەکرد تا بەزووترین کات، دوای تەواوکردنی قۆناغی پزیشکی خولاو، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بکەم.

ئەو کاتانەی من لەنەخۆشخانە کاری پزیشکیم دەکرد، رۆژانە چەندان کەس لەکارمەندەکان دەهاتنە لام، باسی سیاسەت و پێشمەرگایەتیان بۆ دەکردم، بەشێوازی راستەخۆ و ناڕاستەخۆ، بانگیان دەکردم بۆئەوەی لەگەڵیاندا کار بکەم، هەندێک جار گومانم دەکرد، لە دڵی خۆمدا دەموت لەوانەیە مەبەستیان ئەوە بێت من ئاشکرا بکەن، بیانەوێت زیانم پێبگەیەنن، بەڵام کە زوڵم و زۆری حکومەتی بەعسم دەبینی، کارە جوانەکانی ئەوانیشم دەبینی، بەو ئەنجامە دەگەیشتم کە ئەوانیش ئەندامی رێکخستن بن، بە راستی دەیانەوێت منیش لەگەڵیاندا کار بکەم. بە شێوەیەکی سیاسی تێمدەگەیاندن، کە منیش وەک ئەوان لەکەناڵی ترەوە، کار دەکەم، پێویست بەوە ناکات یەکتر بناسیین، نابێت کاری رێکخستن تێکەڵ بکەین.

ئەو ماوانەی لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی بووم، هەوڵم دەدا خشتەی ئێشکگری نەخۆشخانەکان بەزمانی کوردی دەربکرێت، لەنەخۆشخانەی منداڵان ئەو کارەم ئەنجامدا، خشتەی ئێشکگرتنم بەزمانی کوردی دەرکرد، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە، بەمنی دەوت ئەوە کارێکی باشە کە تۆ دەیکەیت،

لەپشتی منیشەوە داوای لەهاوڕێکانم دەکرد، فشارم بخەنە سەر، بۆئەوەی واز لەو کوردی نوسیینە بێنم، نەوەک سەری خۆم و ئەویش بەفەتارەتدا بدەم.

کارکردنی سیاسی، پشتگیری شۆڕش و پێشمەرگە، لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی، نیمچە ئاشکرا بوو، زۆربەی کارمەندانی نەخۆشخانە، سەر بەشۆڕش بوون، دژی حکومەتی بەعس کاریان دەکرد، من وا ناوم دەرکردبوو کە سەر بەپێشمەرگەم، هەندێک لەپزیشکە پسپۆڕەکانیش، بەئاشکرا دژی رژێم هەڵویستیان نیشاندەدا.

**بەعسییەك تەمێ دەكەم:**

ساڵی ١٩٨٢ ساڵی دوەمی شەڕی عێراق - ئێران بوو، شەڕ بەردەوام بوو، د. محەمەد باقر مالک بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی فێرکاری سلێمانی بوو، د. نهات ئەپتەر بەڕێوەبەری گشتی تەندروستی سلێمانی بوو. وتیان بەڕێوەبەری گشتی لەگەڵ پزیشکاندا کۆبونەوەی هەیە، دەبێت هەموو پزیشکانی سلێمانی ئامادەی کۆبونەوەکە بین.

کۆبونەوە دەستیپێکرد، لەسەرەتادا د. نهات ئەپتەر قسەی بۆ کردین، لەقسەکانیدا باسی شەڕی ئێران -عێراقی بۆ کردین، داوای لێکردین خۆبەخشانە بەشداری شەڕی قادسیەی سەدام بکەین، واتە بەشێوەی خۆبەخش بەشداری شەڕی ئێران-عێراق بکەین.

دوای د. نهاد، د. محەمەد باقر دەستی بەقسە کرد، قسەکانی محەمەد باقر هەموی هەڕەشە بوون، دەیوت هەرکەس بۆ قادسییەی سەدام خۆبەخشی(تەتەوع) نەکات، سزای دەدین، قسەکانی د. نهاد زۆر نیگەرانی نەکردم، بەڵام قسەکانی د. باقر زۆر ئیستفزازی بوون، خەریک بو دڵی دەتەقاندم، نەمدەزانی چیی بکەم، هەڵبسمەوە قسە بکەم، یان ددان بەخۆمدا بگرم.

لەو کاتەدا د. دلێر نوری، پسپۆری نەخۆشییەکانی ژنان و منداڵبون، هەستایە سەرپێ، دەستی بەقسەکرد، د. دلێر بەباشی بەرپەرچی د. محەمەد باقری دایەوە، کردیە کونەوە، بە د. نهادو د. باقری وت خۆبەخشی بۆ قادسییە، ئیشی دکتۆر نییە، نابێت پزیشک تەتەوع بکات بۆ شەڕی قادسیە. قسەکانی د. دلێر تورەبوونی منی کەمکردەوە، بەلاّم هەر بەرامبەر بەد. محەمەد باقر، دڵم پربوو، نەمدەزانی چی بکەم.

د. بەهادین پزیشکی خولاوی پێشکەوتوی هەناوی بوو، سەرۆکی پزیشکە خولاوەکان بوو، خەڵکی دهۆک بوو، تەنیا کەسێک لەناو پزیشکە خولاوەکاندا، بە ئاشکرا بەعسی بوو، هەر ئەوبوو، هەموومان رقمان لێیدەبوەوە، رۆژی کۆبونەوەکە ئەویش ئامادەبوو.

دوای کۆبونەوەکە د. بەهادین هاتبووە بەشی نەشتەرگەری، لەو کاتەدا من لەوێ نەبوبووم، ئیستمارەیەکی تەتەوعی بۆ من دانابوو، وتبوی دەبێت پڕیبکاتەوە، کە ئیستمارەکەیان دایە دەستم زۆر نیگەران بووم، دەموت بەعسیەکی وا، چۆن جورئەتی کردوە، ئیستمارەی تەتەوعی بۆ من داناوە، داوای کردوە پڕیبکەمەوە، بچم بۆ قادسیەی سەدام، لەدڵی خۆمدا دەموت ئەوەی بەسەرەوە ناچێت، تۆڵەی لێدەکەمەوە.

رۆژێکیان د. حەمە یوسف وتی ئیشێکم هەیە، دەمەوێت بۆ ماوەی چەند رۆژێک مۆڵەت وەربگرم، تا دەگەڕێمەوە ئیمزام بۆ بکە کە لەشوێینی من کار دەکەیت، کە سەیری خشتەی ئێشکگریم کرد، توانیم تەنیا بۆ ماوەی سێ رۆژ شوێنەکەی د. حەمە یوسف پڕبکەمەوە، بەبێ ئەوەی کێشە بۆ دەوامی خۆم دروستببێت.

سێ رۆژی مۆڵەتی د. حەمە یوسف تەواو بوو، نەگەڕایەوە، من ئێشکگری نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی بووم، د. بەهادین تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی: لە نەخۆشخانەی فێرکاری دەوامت هەیە، بۆ ئامادەنەبوویت، وتم: من لەنەخۆشخانەی فریاکەوتن دەوامم هەیە، وتی: تۆ لەباتی د. حەمە یوسف

ئیمـزات کـردوە، لـەکاتی ئامادەنـەبونی ئـەودا دەبێـت دەوام بکـەیت، وتـم: مۆڵەتەکەی د. حەمە یوسف تەواو بووە، من تا سێ رۆژ ئیمزام کردوە، لەو سێ رۆژە بەدواوە من بەرپرسیار نیم. دیاربوو د. بەهادین لەسەر مەسەلەی ئیستیمارەی تەتەوع، کە پڕم نەکردبوەوە، رقی لەمن هەستابوو، بیانوی بەمن دەگـرت، بۆئـەوەی کێشـەیەکم بـۆ درووسـتبکات. منـیش رقـم لـەو بـوو، لەبەرئەوەی ئیستمارەی تەتەوعی بۆ هێنابووم، بۆ بیانویەک دەگەڕام تۆڵەی ئیستیمارەکەی لێبکەمەوە، وتم: زۆر باشە لەسێبەری ئەم کێشەیەدا، هەقی بەعسیبونەکەی و، ناردنی ئیستمارەکەشی لێدەکەمەوە.

داوام لەهاوڕێ پزیشکەکانم کرد تا دەگەڕێمەوە، بۆ ماوەیەک لەشوێنی من بن، لەنەخۆشخانەی فریاکەوتن چوومە دەرەوە، ئەمبۆلانسێکی فریاکەوتنم لەگەڵ خۆم برد، چووم بۆ نەخۆشخانەی فێرکاری، لە ئەمبولانسەکە دابەزیم، بەشۆفێرەکەم وت، تۆ لەناو ئەمبۆلانسەکەدا بمێنەرەوە، دەبێت دەرگای سەکنی کراوە بێت، بۆئەوەی کە گەڕامەوە زوو سەربکەوم، زوو دەرچین، شۆفێرەکە نەیدەزانی چی دەگوزەرێت، بەڵام هەرچیم پێوت، بەگوێی کردم.

خـۆمکرد بە ژوری پشـکنینی نەخۆشـدا، د. بـەهادین لەپشـتی مێزێکـەوە دانیشتبوو، لە سەر مێزەکە جهازی پێوانی فشاری خوێنی زئبەقی دانرابوو، سڵاوم لێنەکرد، قسەم لەگەڵ نەکرد، جهازەکەم هەڵگرت، سێ جار لەسەر یـەک دام بەسـەرو دەمووچاویـدا، یەکسـەر هاتمـە دەرەوە، سـواری ئەمبۆلانسـەکە بوومـەوە، گەڕامـەوە بـۆ نەخۆشـخانەی فریاکـەوتن، دەسـتم بەدەوامی خۆم کردەوە.

دوای ئەوەی د. بەهادین بەدەستی من لێدانی خوارد، لەژوورەکەی هاتبووە دەرەوە، داوای لەپزیشـکانی نەخۆشـخانەی سـەربازی کردبـوو، دەسـتگیرم بکـەن، بـەڵام پزیشـکە سـەربازیەکان بـەگوێی د. بـەهادینیان نـەکردبوو، پزیشکەکانی نەخۆشخانەی سەربازی، دوو پزیشکی عەرەبی هاوپۆلی خۆم

بوون، ، خەڵکی موسڵ بوون، کاتیک زانیبویان من د. بەهادینم تەمێ کردوە، هیچ کاردانەوەیان نیشان نەدابوو.

بۆ رۆژی دوایی، لەگەڵ د. عەبدولڕەحمان رەئیس نەخۆشمان دەبینی، د. عەبدولرەحمان وتی: بۆ وات لە د. بەهادین کردوە؟ شکاتی لیکردویت، وتی: زۆر هەوڵمدا کە ئاشتتان بکەمەوە، بەلاَم سودی نەبوو، منیش باسی قسە ناشیرینەکانی د. بەهادینم بۆ د. عەبدولرەحمان کرد. هەندێک لەپزیشکەکانی هاوڕێم سەرنجیان بۆ ئەوە راکێشام کە لەوانەیە لەپزیشکی دەرمبکەن، هەندێکی تر دەیانوت لەوانەیە نەقڵت بکەن، هەندێک دەیانوت کارێکی خراپت کردوە، لەوانەیە زیندانت بکەن، منیش بەلای خۆمەوە کاریکی قارەمانیم کردبوو، لەبەرئەوەی لەژێر دەسەلاَتی حزبی بەعسدا، سەروگوێلاکی بەعسیەکم شکاندبوو، گوێشم بەفەسڵکردن و نقڵ کردن نەدەدا، لەبەرئەوەی ئامادە نەبووم تەتەوع بۆ قادسیەی سەدام بکەم، بەرنامەی پێشمەرگایەتیم هەبوو.

د. بەهادین لەدادگا شکاتی لێکردبووم، بۆ رۆژی دوایی پۆلیسی سلێمانی داوایانکردم، منیش سەردانی بنکەی پۆلیسی سەرای سلێمانیم کرد، زابتەکان پێشوازی قارەمانێکیان لێکردم، بەڕووی خۆشەوە دەیانوت چۆن ئەو ئازایەتیەت لەخۆتا شکبردوە، بەو شێوەیە سەروگوێلاکی بەعسیەکت شکاندوە؟ چایان بۆ بانگ کردم، چەند دەقیقەیەک لەبنکەکە مامەوە، بەڕێزەوە بەڕێیانکردم، پەراوی لێکۆڵینەوەیان بۆ نەکردمەوە، سکالاَکەی د. بەهادینیان فەرامۆش کرد.

د. بەهادین لەئیدارەی نەخۆشانەش شکاتی لێکردبووم، چەند رۆژێک بەسەر روداوەکەدا تێپەری، وتیان د. محەمەد باقر لەلای بەڕێوەبەری گشتی پێداگری کردوە، کە دەبێت راژەی من بگوازرێتەوە بۆ دهۆک، بۆ لای خزمەکانی د. بەهادین. د. باقر لەمن توورە بوو، لەبەرئەوەی ئیستمارەی تەتەوعم پڕنەکردبوەوە، لەدکتۆر بەهادینیشم دابوو، دەیویست منی

لەکۆڵبێتــەوە، داوای دەکــر راژەم بگوازنــەوە بــۆ دهــۆک، بۆئــەوەی لــەوێش لەلایــەن خزمــەکانی د. بەهادینــەوە چیانبوێــت پێمبکــەن. دوای چەنــد رۆژێــک بڕیاری بەڕێوەبەری گشتی دەرچوو، راژەی من گواسترایەوە بۆ دهۆک.

رێکخستنم لەسەر ئەو کێشەیە ئاگادارکردەوە، رێکخستن بەباشیان نەزانی مــن بــڕۆم بــۆ دهــۆک، نــەوەک بە چــوونم بــۆ دهــۆک کێشــەکە گرانتــر ببێــت، مەترسی لەسەر ژیانی مــن درووست ببێت، منیش حــەزم دەکرد بــەزووترین کات بچمە شاخ، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکەم.

لەکۆڵبێتــەوە، داوای دەکـر راژەم بگوازنــەوە بـۆ دهـۆک، بۆئـەوەی لــەوێش لەلایـەن خزمـەکانی د. بەهادینـەوە چیانبوێـت پێمبکـەن. دوای چەنـد رۆژێـک بڕیاری بەڕێوەبەری گشتی دەرچوو، راژەی من گواسترایەوە بۆ دهۆک.

ڕێکخستنم لەسەر ئەو کێشەیە ئاگادارکردەوە، ڕێکخستن بەباشیان نەزانی مـن بـڕۆم بـۆ دهـۆک، نـەوەک بە چـوونم بـۆ دهـۆک کێشـەکە گرانتـر ببێـت، مەترسی لەسەر ژیانی من درووست ببێت، منیش حـەزم دەکرد بـەزووترین کات بچمە شاخ، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکەم.

# ٥

# پزیشکێك دەبێت بە پێشمەرگە

## بڕیاری قورس و دژوار

حەوت ساڵ بەسەر قسە کاریگەرەکەی مامۆستا فوئاد ئەسکەندەردا تێپەری، (بخوێنە و ببە بەجیڤارا)، وا کۆلێژی پزیشکیم تەواوکرد، دە مانگ وەک پزیشکی خولاو لەنەخۆشخانەکانی بەغداو هەولێر و سلێمانی کارم کرد، بووم بەئەندامێکی چالاکی یەکێک لەحزبە شۆڕشگێرەکان، ئەو دوو خاڵە گرنگبوون بۆئەوەی لەجیڤارابوونەکە نزیک ببمەوە، وا ئامادەکاری بۆ قوناغی سێیەمی بەجیڤاربوون (پێشمەرگایەتی) دەکەم، بۆئەوەی وەک جیڤاراکەی مامۆستا فوئاد، لەڕیزی گەریلاکاندا، وەک پزیشک، وەک سیاسی، رۆڵی خۆم ببینم، ئامانجەکەم بێنمەدی.

لەدوای کارەساتی ١٩٧٥ وە، بڕیارم دابوو پێشمەرگایەتی بکەم، دەمویست دوای تەواوکردنی کۆلێژی پزیشکی، ئەو بڕیارە جێبەجێبکەم، وا کۆلێژی

پزیشکیم تەواو کرد، ئەندامی چالاکی ڕێکخستنی حزبێکی شۆڕشگێڕم، بەلاّم لەو ساڵانەی دواییدا، کێشەیەکی بنەماڵەییم بۆ هاتبوە پێشەوە. برایەکم پێشمەرگەی پدک بوو، لەئەیلولی ۱۹۸۱دا، لەشەڕی براکوژیدا، بەدەستی هێزی پێشمەرگەی ینک شەهیدکرا، بۆئەوەی جیڤارابوونی خۆشم بسەلمێنم، دەبێت پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەی ینک وە بکەم، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا، هێزی پێشمەرگەی پارتی، دژ بەجیڤارابوون کاریان دەکرد. بەو شێوەیە ئاستەنگێک لەبەردەممدا خۆی قوتکردبۆوە، ناکۆکیەکی لەناخمدا درووست کرد بوو، خەریکبوو تا مۆخی ئێسقانم بخوات. ناکۆکیەک لەنێوان پێوانە خێڵەکیەکان و پێوانە نەتەوەیی و سیاسیەکانی هزرمدا لوولی دەدام. بەکام پێوانەیە، هەڵسوکەوتی سیاسی بکەم، ئەگەر مل بۆ پێوانە خێڵەکیەکان بدەم، بنەماڵەکەم لەخۆم نارەنجێنم، بەلاّم خیانەت لەبیروباوەڕە نەتەوەیی و ئایدۆلۆجیەکەم دەکەم، ئەگەر مل بۆ بیروباوەڕ بدەم، بەمرۆڤێکی نەتەوەیی و ئایدۆلۆجی دەناسرێم، بەلاّم بنەماڵەکەم لەخۆم دەرەنجێنم.

وا خەریکە کوڕە گەورەکەی دایکم، دەبێتە پێشمەرگەی ئەو حزبەی، کە پێش کەمتر لەساڵێک کوڕەکەی تری شەهید کردوە، ئەوە تەنیا کێشەی دایکم نەبوو، کێشەی زۆرێک لەخزمەکانیشم بوو، بەگوێرەی ڕێسای خێڵەکی کۆمەڵگای کوردستان، دەبوو من لەڕیزەکانی پدکدا چەکم هەڵگرتایە، لەوێ کوردایەتم بکردایە، تۆڵەی نامقی براشمم، لەپێشمەرگەکانی ینک، بکردایەتەوە. بەلاّم بەگوێرەی ڕێسای کۆمەڵگای نەتەوەیی پێشکەوتووخواز، من وا ناکەم، نابمە پێشمەرگەی پدک، من کەسێکی خێڵەکی نیم، کەسێکی سیاسیم، لە بڕیاردا پەنا بۆ لۆجیکی جیاوازی بیروڕای ناو خێزان و کۆمەڵگا دەبەم.

دایکم سیاسی نەبوو، بۆ شەهیدبونی نامقی کوڕی، کزەی جەرگی دەهات، بەقەدەر دنیایەک ڕقی لەبکوژانی کوڕەکەی دەبوەوە، منیش دەچمە لای ئەوانەی ئەو ڕقی لێیان دەبێتەوە، ئامادەکاری دەکەم بۆئەوەی ببمە پزیشکی ئەوانەی کوڕەکەی دایکمیان شەهیدکردووە. دڵی خۆمم بەوە دەدایەوە، بکوژانی کوڕەکەی دایکم، لەهەمو هێزەکانی تر، باشتر داکۆکی لەگەلەکەیان دەکەن، ئەو هێزە سیاسیەی کە براکەم خۆی بۆداوە بەکوشت، لەڕابردوودا

کەمتەرخەمی زۆری بەرامبەرمان کرد، دژایەتی زۆری شۆڕشی پارچەکانی تری کوردستانی کرد، ئێستاش لەسەر ئەو سیاسەتە بەردەوامە.

ئەو کاتە بڕوام وابوو ئەگەر هەر کەسێک پشتگیری لەخەباتی ینک نەکات، کارەکانی ناکەونە خزمەتی گەلی کوردەوە، خزمەتی گەلی کوردیشم لەسەرووی بەرژەوەندی تایبەت و بنەماڵەوە دەبینی، بۆیە توانیم پێ بەسەر جەرگی خۆمدا بنێم، قەناعەت بەدایکم بکەم، کە ئەو ڕێگەیەی من گرتومەتە بەر، ڕێگەیەکی ڕاستە، لەبەرژەوەندی تەواوی گەلی کوردایە، بەرەو سەرکەوتنمان دەبات.

لەڕوویەکی ترەوە، بیرم لەوە دەکردەوە کە دایکم چەند دەردیسەری بۆ ئێمە کێشا، چەندە دەردی هەژاری بینی، شایانی ئەوەبوو ئەو ژیانەی ماویەتی بەخۆشی بژی، شایانی ئەوەبوو وەک دایکی پزیشکێک بژی، بەڵام کاتێک خۆم ئامادە دەکرد ببم بەپێشمەرگە، دەموت ئیتر ناتوانم خزمەتی دایکم بکەم.

لەو لاشەوە دەترسام ڕۆژێک دایکم بێت بەشوێنمدا، بڵێ دەست لەپێشمەرگایەتی هەڵگرە، وەک ئەوەی لەگەڵ تارقی برامدا کردی، تارق تا ساڵی ١٩٨٠ پێشمەرگەی ینک بوو، بەبێ ئاگاداری من، دایکم چوو بەدوایدا هێنایەوە، کاتێک تارقی برام دەستی لەپێشمەرگایەتی هەڵگرت و گەڕایەوە، زۆر نیگەران بووم، زۆر لەدایکم زویر بووم. بۆیە پێش ئەوەی ببم بەپێشمەرگە، دایکمم ئاگادار کردەوە، پێموت، ئەگەر من بووم بەپێشمەرگە، تۆ بێیت بەشوێنمدا، بڵێیت واز لەپێشمەرگایەتی بێنە، چیتر بەدایکی خۆمت نازانم.

لەلایەکی ترەوە بیرم لەقسەی خەڵک دەکردەوە، بەتایبەتی بیرم لەقسەی کەسانی دەروبەری پدک دەکردەوە، لەوانەیە نەزانن من هەر لەمناڵیەوە پدک بەهێزێکی نەتەوەیی و نیشتمانی نازانم، ئاگادار نین، لەکەیەوە لەڕیزەکانی ینکدا کار دەکەم، تەنیا بەدیدێکی خێڵەکی سەیری بابەتەکە دەکەن. پدک وەک حزب، زۆر نیگەران بوو، منێک کە خاوەنی سێ شەهیدی پدکم، (باوکم ١٩٦٣، مام ١٩٧٧، برام ١٩٨١) براکەشم بەدەستی پێشمەرگەی ینک شەهیدکراوە، دەبم بەپێشمەرگەی ینک، ئەبێ چیم پێ بڵێن، چۆن باسم بکەن.

لەباشوری کوردستان یەک لەسەرچاوەکانی ئەندام و کادری حزب، کەس و کاری شەهیدەکانی حزبە، وای بۆدەچن ئەگەر کادرەکانیان سیاسەتی حزبەکەش بەڕاست نەزانن، لەبەر خاتری شەهیدەکەیان، داکۆکی لەسیاسەتی حزب دەکەن، کاتێک پدک دەبینی من لەو تۆڕە کلاسیکیەی حزب خۆم رزگار کردوە، هەست بەشکستێکی گەورە دەکات، دیارە پەرچەکرداری توندی دەبێت.

زۆربەی برادەرانی یەکێتیش، لەدیدی خێڵەکی خۆیانەوە، سەیری پێشمەرگایەتی منیان دەکرد، لەناخیاندا چەندان پرسیار راست دەبوویەوە، کەسێک پێش ساڵێک براکەیمان کوشتبێت، ئێستا وەک پێشمەرگە دێتە لامان، دەیەوێت هاوکاریمان بکات؟ ، تۆ بڵێی راست بکات؟ ، ئەمە کابرایەکی نەزان و گەمژەیە، یان کەسێکە بڕوای بەبیروڕای جیاواز هەیە، بیروباوەڕی یەکێتی بەڕاست دەزانێت؟ ، بەرژەوەندی حزب و نەتەوە، لەسەروی بەرژەوەندی خێزان و بنەماڵەوە دادەنێت؟ یان بۆ مەبەستێکی تایبەت هاتووە؟

کاتێک چوومە نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار، فەرماندەیەکی پێشمەرگەی برینداری لێبوو، ئەو فەرماندەیە زۆر بەوریاییەوە، لەچارەسەریەکانم نزیک دەبوەوە، دوایی بۆمدەرکەوت، ئەم فەرماندەیە ئەو کەسەیە، کە لەشەڕی رەزڵەدا، دیلەکانی پدک کوشتوە، دیارە ئاگادار بووە کە براکەی منیش لەو شەڕەدا شەهید بووە، ئەگەر خۆی شەهیدی نەکردبێت.

بە ئیرادەی بەهێزی خۆم، ڕێگیرییە خێڵەکیەکانم تێپەڕاند، بڕیاری بەپێشمەرگەبوونم جێبەجێکرد، لەپێشمەرگایەتیشدا چەندان ئاستەنگی ترم تێپەڕاند، لەیەک کاتدا بووم بەپزیشک و پێشمەرگەو کادیر، سەرکەوتنم بەدەستهێنا، بەڵام دەرکەوت کەم کەس وەک من، لەسیاسەتدا ڕێسای خێڵەکی تێپەراندوە، قوربانی داوە و پێشەنگ بووە.

**لە هەڵەبجەوە بۆ هاوار:**

دوای ئەوەی بڕیارمدا پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکەم، بیرم دەکردەوە لەکام ناوچەوە بڕۆمە دەرەوە، بەرپرسانی کەرتی ڕێکخستنی

شــەقڵاوە، پێیــان باشــبوو، لەدەڤــەری هــەولێرەوە پەیوەنــدی بە هێــزی پێشـمەرگەوە بـکەم، خـۆم پێمبـاش بـوو لەناوچـەی هەورامانـەوە پەیوەنـدی بـەهێزی پێشـمەرگەوە بکـەم، لەبەرئـەوەی شـارەزای ناوچەکـە بـووم، کـاتی خۆیشی لەڕێگەی مەلا یاسینەوە، پەیوەندیم لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجە هەبوو.

ڕۆژی ٤-٤-١٩٨٢م دیـاریکرد بۆئـەوەی پەیوەنـدی بـەهێزی پێشـمەرگەوە بکـەم، سـەرلەبەیانی ئـەو ڕۆژە، لە هەڵەبجـە، سـەردانی مـاڵی پـورە سۆسـەنم کـرد، پێمـوتن: بـەنیازم پەیوەنـدی بـەهێزی پێشـمەرگەوە بکـەم، مـاڵی پـوورە سۆسـەن سـەر بـەینک بـوون، ماوەیـەک لەوەوبـەر جـافری کـوڕی و هـاوڕێی منـداڵیم، لەزینـدان ئـازادکرابوو، پەیوەنـدی بـەهێزی پێشـمەرگەوە کردبـوو. پوورە سۆسەن وتی: بڕۆ بۆ لای جافرو نیازی و ئـەوان، بارەگایـان لەگونـدی هاوارە، منیش پێم خۆشبوو، لەبەرئەوەی جافرو نیازی دوو هـاوڕێی منداڵیم بوون. هەر ئەو ڕۆژە پوورە سۆسەن بانگی فاتح سۆسـەکانی کچـەزای کـرد: منی پێناسـاند، وتـی دکتـۆر بگەیەنـە لای جـافر و ئـەوان، فـاتحیش هێسـتریکی هێنا، سواری هێیسترەکەی کردم، خۆی پێشمکەوت، لەهەڵەبجەوە گەیشتینە عەبابەیلێ، عەبابەیلێمان تێپەڕکرد، بەسەر شاخی شنرۆیدا سەرکەوتین، ئێوارە خەریک بو دنیا تاریک بکات، من و فاتح گەیشتینە گوندی هاوار.

پێش ڕاگواسـتنی گونـدە سنورییەکانی کوردسـتان، هـاوار یـەکێک لەگونـدە خۆشــەکانی ناوچەکــەبوو، خەڵکەکــەی کاکــەیین، لەبەرئــەوەی بــەر هێرشــی ڕاگواســتن و وێرانکردنــی ســاڵی ١٩٧٨ کــەوتبوو، داری بەســەر بەردیــەوە نەمابوو. بارەگای دوو کەرتی پێشمەرگەی لێبوو، کەرتێکیان مامۆستا شـاهۆ فەرمانـدەی بـوو، کەرتەکـەی تـر مـەحمودی حـاجی فـەرەج فەرماندەی بـوو، لەهەوارە کۆن کەرتێکی تر هەبوو، حەمەی حەمە سەعید فەرماندەی بوو. من چوومە بارەگای ئەو کەرتەی لەڕێگەکەمەوە نزیک بوو، بارەگای ئەو کەرتـەی مامۆسـتا شـاهۆ فەرمانـدەی بـوو، نیـازی هـاوڕێم جێگـری بـوو. ئـەو شـەوە جافرم نەدی، بۆ سبەینێ جافر هـات بۆلام، لـەو کاتـەدا جـافر ڕابـەر سیاسـی کەرتەکەی مەحمودی حاجی فەرەج بوو.

**پێشوازی:**

ئێوارەی ٤-٤-١٩٨٢ گەیشتمە بارەگای کەرتی دوی تیپی ١١ هەورامان، بارەگا لەکەوێلێکدا بوو*، تەختی ژوری دانیشتنی پێشمەرگەکان چاڵ و چۆڵ بوو، رەق و تەق بوو، دۆشەک و کورسی تێدا نەبوو، پێشمەرگەکان بەدەوری چرایەکی کزدا دانیشتبون، روناکییەکەی هێندە نەبوو، بەباشی خەڵک ببینی و بیناسی.

وامدەزانی بەبۆنەی ئەوەوە پزیشکێک پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووە، فەرماندەی کەرت یان رابەر سیاسی کەرت، وتارێک پێشکەش دەکات، بەخێرهاتنم دەکات، سیاسەتی ینکم بۆ روونەدەکاتەوە. لەباتی ئەوە، یەک لەپێشمەرگەکان سەری بەرزکردەوە و وتی: تۆ من دەناسییت؟ ، کەمێک سەیرم کرد، وتم: ببوورە نەبەخوا ناتناسم، لەوە ناچێت پێشتر یەکترمان دیبێت، وتی: چۆن تۆ من ناناسییت؟ من لەگەڵ باوکت پێشمەرگە بووم، لەگەڵ خۆشتا تەلەبە بووم. زۆر سەرم لەو قسەیە سورما، بیرم کردەوە کاتێک باوکم شەهید بوو، من زۆر منداڵ بووم، هێندە منداڵ بووم بۆشەهیدبوونی باوکم نەدەگریام، ئەم کابرایە چۆن توانیوییەتی بەو منداڵییە، پێشمەرگایەتی بکات؟ . دواتر پرسیارێکی تری لێکردم، وتی: مەجە چل درۆی گوڵپی دەناسی؟ وتم: بەڵێ، وتی: کاتی خۆی لەشۆرشی ئەیلولدا من بەرپرسیاری ئیغتیالاتی (تیرۆری) گوندی گوڵپ بووم، جەمال نامق ناردمی بۆئەوەی معەلیمە (مامۆستا)عەرەبەکەی گوڵپ بکوژم، ئەو چل درۆیە وتی: تۆ واز بێنە، من خۆم دەیکوژم، کەچی نەشیکوشت.

لێرەشدا دیسان کەوتمە بیرکردنەوەو گومانەوە، باشە ئەگەر شۆرشی ئەیلول بیەوێت موعەلیمێکی عەرەبی بەستەزمان بکوژێت؟ بۆ ئەم کابرایە دەکاتە بەرپرسی ئیغتیالاتی گوڵپ، خۆعەبدولوەهاب ئەتروشی بەبێ هۆکار، بەبەرچاوی خەڵکەوە، کەسانی بێتاوانی دەکوشت، جەمال نامق بۆچی بیەوێت بەنهێنی موعەلمێکی عەرەب بکوژێت؟ خەریک بوو دووچاری رەشبینی و گومان دەبووم، خەریک بوو بڵێم بۆچی هاتم بۆ لای ئەم درۆزنانە؟ .

لەو کاتەدا بیرم بۆ رۆژانی سەرەتای کۆلێژی پزیشکی گەڕایەوە، پێش ئەوەی لە زانکۆ وەربگیرێم، وامدەزانی قوتابی زانکۆ، وەک ئامێر لەسەر پێوانەو کەتەلۆک دەجولێتەوە، بەلام کەڕەفتاری ئەو قوتابیە کوردەم بینی، کاتێک بۆ نانخواردن لەکۆلێژ دەچووینەدەرەوە، وەستا و، وەک سەگ دەست و لاقەکانی لە دەرگای کۆلێژ گیرکرد و میزی بەدەرگایی کۆلێژی پزیشکیدا کرد، ڕاچلەکیم. رەفتارەکەی ئەلماسی کۆلێژی ئەندازیاریم بیرکەوتەوە کە بەخاوەن چێشتخانەکەی وت: باقی پارەکەم بدەرەوە، خاوەن چێشتخانە وتی: چەند پارەت دامێ؟ قوتابیەکە وتی: دە دینار، دە فلسیشی نەدابویێ، بەچاوی خۆم بینیم ئەو قوتابیە نۆ دینار و حەوتسەدو پەنجا فلسی لەگەڵ پارەی خواردنەکەی بەدرۆیەک لەکابرای خاوەن چێشتخانە وەرگرت، ئیتر بڕوام بەزانکۆ و قوتابی زانکۆ لاواز بوو، بەرامبەر بە قوتابی بەزانکۆ رەشبینی دایگرتم. دەترسام پێشمەرگەکانیش وەک ئەو قوتابیانەی زانکۆ وابن، هەر خەریکی درۆو فشە بن، دەترسام بەدرۆی ئەم کابرایە بڕوام بەپێشمەرگەو پێشمەرگایەتی نەمێنێ و زوو بروخێم و تەسلیم ببمەوە.

درۆکانی حەمە کەریم پەستییان کردم، خەریک بوو دوچاری رەشبینی دەبووم، نازانم شاهۆ بوو، یان نیازی بوو، چاوێکیان لێداگرتم، بەو چاوداگرتنە تێگەیشتم، ئەو برادەرە قسە هەڵدەبەستێت، فشە دەکات، پێشمەرگەکانیش بۆ کات بەسەر بردن، بۆی دەکەنەوە.

بۆ رۆژی دوایی حەمەکەریم دەرگای درۆکانی بۆ کردمەوە، من زۆر بەدرۆکانی پێنەدەکەنیم، بە بەرپرسەکانم وت: ناوی منیش لە ئێشگریدا دابنێن، ئەو پیاوە فشەکەرە وتی: با ناوی تۆی تێدا نەبێت، وتم: بۆچی؟ وتی: ئەگەر سوپا هێرش بکات تۆ نازانی چۆن رابکەیت، وتم: بەخوا ئەگەر سوپا هێرش بکات، ببینم تۆ رابکەیت، تەقەت لێدەکەم، بەو قسەیە بێدەنگم کرد.

پرسیارم لەبەرپرسەکان کرد، ئەم کابرا درۆزنە چۆن لە پێشمەرگایەتیدا وەرگیراوە؟ چیرۆکی پێشمەرگایەتی حەمە کەریمیان بۆ گێرامەوە:

حەمەکەریم جەیشی شەعبی بووە، شەوێکی ساڵی ١٩٨١، پێشمەرگە پلان دادەنێن بنکەی جەیشی شەعبی ئۆردوگای زەمەقی نزیک هەڵەبجە بگرن، لە

کـاتی هێرشـی پێشـمەرگەدا ئـەو حـەرەس دەبێـت، حەرەسـێکی کەمتەرخـەم دەبێت، لەکاتێکدا پێشمەرگە هێرشی سـەر بنکـەی جەیش شـەعبیەکە دەکەن، ئەو لە تەوالێت دەبێت، پێشمەرگە بەئاسـانی دەست بەسـەر بنکەکـەدا دەگرن، ئەم پیاوەش لەتـەوالێتی بنکەکـەدا دەستگیر دەکـەن، خـەریک بووە پێشمەرگە بیکوژن، لەو کاتەدا حامدی حاجی غالی فەرماندەی هێزەکە دەڵێت: ئاگاداری کەریم بن، پێشمەرگەکان دەڵێن ناوت چییە، دەڵێت ناوم کەریمـە، وا دەزانن مەبەسـتی حامـد ئـەو کەریمەیـە، پێشـمەرگەکان یارمـەتی دەدەن، وادەزانـن خـەدمایلی پێشـمەرگەیە. بـەڵام لەڕاسـتیدا، بەرپرسـی هێزەکـە مەبەسـتی کەریمێکی تر بووە، پێشمەرگەیەک بووە کە لـەو شـەڕەدا بریندار بووە. کە ڕاستیەکە دەردەکەوێت، بۆماوەیەک حەمەکەریم زیندانی دەکەن، دواتر ئازادی دەکەن و دەیکەن بە پێشمەرگە.

لەولاشەوە هەرچی حکومەتی عێراقە، وایبۆدەچێت کە حەمەکەریم بنکەی جەیشـی شـەعبیەکەی بەدەسـتەوە داوە، خیانـەتی لەحکومـەت کـردوە، خـۆی دەسـتی حکومــەت ناکـەوێت، دایـک و بـاوک و منداڵـەکانی دەسـتگیردەکەن، لـەخواروی عێـراق زینـدانیان دەکـەن. لەبەرامبـەر ئـەو کێشـە چـاوەروان نەکراوانەی لە ماوەیەکی کەمدا ڕووبەڕوی ببوونەوە، حەمەکەریم بەو شێوەیە لەگەڵ دەوروبەریدا، هەڵسوکەوتی دەکرد.

**مام هادی:**

کـە گەیشـتمە هـاوار، لەسـەر شـێوەی ڕێکخسـتن و چـالاکی پێشـمەرگە پرسـیارم کـرد، وتیـان لـەڕووی سـەربازیەوە، ئێـرە سنوری چالاکی تیپی ١١ هەورامانـە، فەرمانـدەی تیـپ، حامـدی حـاجی غالیـە، ئێسـتا لەسـەرکردایەتیە. هـەموو تیپێـک رابـەر سیاسـی هەیـە، رابـەر سیاسـی ئـەو کاتـەی تیپـی ١١هەورامان مامۆستا سەرکەوت بوو، ئەویش لەسەرکردایەتی بوو. ئـەو سـێ کەرتەی کە لەگوندی هاوارو هاوەرەکۆن بوون، لەگـەڵ فەرمانـدەی کەرتـەکان کە باسم کردن، سەر بەتیپی ١١ هەورامان بوون.

لەڕووی سیاسیەوە کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵە هەیە، مامۆستا پشکۆو مەلا یاسین و سامان لێی بەرپرسیارن، ئەوانیش لێرە نین، چوون بۆ سەرکردایەتی. ڕێکخستنی خەتی گشتی هەیە، مام هادی بەرپرسیاریەتی، مام هادی لەو کاتەدا لەوێ بوو، بەڕۆژ دەردەکەوت و دەمانبینی، قسەی بۆ دەکردین، بەشەو کەس نەیدەزانی لەکوێیە. مام هادی پێشمەرگەی ساڵی ١٩٧٦ ینک بوو، بڕوای بەکەس نەبوو، گومانی هەبوو پیلانی دژ بکەن و بیکوژن، بۆیە شوێنی نوستنی لەشوێنیکی نهێنیدا بوو، خۆی دروستیکردبوو، کەم کەس دەیدۆزیەوە، کە شەو دادەهات لە شوێنە نهێنیەکەی خۆی دەشاردەوە ودەخەوت، تا ڕۆژی دوایی، جارێکی تر دەردەکەوت و دەهاتەوە ناو پێشمەرگە. مام هادی خەڵکی تەوێڵەبوو، وەستایەکی باشی چەقۆ دروستکردن بوو، پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگە، بەهۆی ئەوەوە هاوڕێی جافر بوو، هاوڕێی منیش بوو.

**یەکەم نەشتەرگەری:**

کە پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد، هەندێک ئامێری نەشتەرگەری بچوک و دەرمانی بەنجی مەوزوعی و تەقەڵی دوورینەوەی برینم لەگەڵ خۆم بردبوو، لەبارەگای پێشمەرگەکانیش، هەندێک دەرمانی سەرەتایی هەبوو، دوای چەند ڕۆژێک دەستمکرد بەپشکنینی نەخۆش و بریندار.

پێشمەرگەیەک هاتە لام ناوی ئازاد بوو، خەڵکی گوندی سۆسەکان بوو، لەکەرتەکەی حەمەی حەمسەعید بوو، دوو ساڵ لەوەوبەر، لەشەڕی براکوژیدا، گولەیەک بەر ئێسقانەکانی پشتی کەوتبوو، بۆ چارەسەرکردنی برینەکەی، سەردانی ئێرانی کردبوو، پزیشکە ئێرانیەکان پێیانوتبوو: ئەگەر دەستکاری گولەکە بکەین، دوچاری ئیفلیجی دەبێت.

کە ئەو بریندارەم بینی و پشکنینم بۆ کرد، گولەکە لەژێر پێستیدا بوو، بڕیاری نەشتەرگەریم بۆ دا، بەدەرمانی زایلۆکاین دەوری گولەکەم سڕ کرد، لەماوەی چەند چرکەیەکدا گولەکەم دەرهێنا و برینکەم دووریەوە.

بەو نەشتەرگەرییە بچوکە، دڵی پێشمەرگەکەم خۆشکرد، ئەو ترسەی لەدڵدا نەما کە بەهۆی گولەکەوە دووچاری ئیفلیجی ببێت، خۆشم دڵم خۆشبوو، لەبەر ئەوەی یەکەم کاری نەشتەرگەریم بۆ پێشمەرگە ئەنجامدا. بەڵام لەهەموی گرنگتر، ئەو پڕوپاگەندەیە بوو، بۆ نەشتەرگەرییەکە و بۆ پزیشکەکە کرا، لەناو هێزی پێشمەرگەدا بڵاوبوەوە، پزیشکێکمان بۆ هاتووە، ئەو نەشتەرگەریانە دەکات کە پزیشکەکانی ئێران ناتوانن بیکەن، ئەم پڕوپاگەندەیە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی پێشمەرگە زۆر باشبوو، بەتایبەت لەو ناوچەیەدا کە سێ کەرتی پێشمەرگەی لێبوو.

**پەیوەندیە نهێنیەکان:**

لەکاتی شەڕی ناوخۆی نێوان پدک و ینک دا، ئێران پەیوەندی لەگەڵ پدکدا بەهێز بوو، زۆربەی بارەگاکانی پدک لەناو خاکی ئێراندا بوون، ینک بە ئاشکراهیچ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ئێراندا نەبوو. ئەو پێشمەرگەیەی ینک کە گولەکەم لەپشتیدا دەرهێنا، لەشەڕی ناوخۆدا لەگەڵ پێشمەرگەکانی پدک بریندار ببوو، برینەکەی لەئێران چارەسەر کرابوو. نیازی عزەتی جێگری فەرماندەی کەرتیش، کە لەشەڕی ناوخۆدا بریندار ببوو، ئەو کاتەی من بووم بەپێشمەرگە تازە لەئێران گەڕابووەوە، لەئێران نەشتەرگەری بۆ کرابوو.

لەو پەیوەندیەی نێوان ینک و ئێران سەرم سوڕدەما، پدک پەیوەندی لەگەڵ ئێران زۆر بەهێزە، ئەی ئێران چۆن هاوکاری ینک دەکات، چۆن بریندارەکانی شەڕی ناوخۆ بۆ ینک چارەسەر دەکات، کە دوژمنی دۆستەکەیەتی ؟ لەوانەیە ئێران لەیەک کاتدا، دۆستایەتی پدک و ینک ی کردبێت، پدک بەئاشکرا پەیوەندی لەگەڵ ئێران هەبوو، ینک بەنهێنی پەیوەندی لەگەڵ ئێران هەبووبێت. لەوانەیە ینک لەڕێگەی کوردەکانی ئێرانەوە، کەناڵی پەیوەندی تایبەتی خۆی هەبووبێت، ئەگەری سێیەم ئەوەیە کە بریندارەکانی ینک بەنهێنی لەعێراق چارەسەر کرابن، پێیانوترابێت بڵێن، لەئێران چارەسەرمان وەرگرتووە.

**لەگەڵ شەڕدا:**

کاتێک پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەی ینک وە کرد، هێزی پێشمەرگە شەڕی هێزەکانی سوپای عێراقی دەکرد، بەڵام هەموو هێزی خۆی، بۆئەو شەڕە تەرخان نەکردبوو، لەبەرئەوەی ئەو کاتەی من بووم بەپێشمەرگە، شەڕی براکوژی لەلوتکەدا بوو، بەشێکی گەورەی توانای پێشمەرگەی هەموو لایەنە سیاسییەکان، بۆ شەڕی براکوژی تەرخان کرابوو. نەک هەر ئەوە، دوای ماوەیەک بۆم دەرکەوت، کە ململانێیەکی قووڵ، لەنێوان رێکخراو و دەستە سیاسیەکانی ناو ینکدا هەیە.

هۆکاری ململانێ ناوخۆییەکان، سیاسی و ئایدولۆجی و خێڵەکی بوو، لەو کاتەدا کە من بووم بەپێشمەرگە، دوو لەو کەرتانەی تیپی ١١ هەورامان، لەبەر سیاسەتی سەرکردایەتی و بەرپرسانی سەرووی خۆیان، مانیان گرتبوو، چالاکی خۆیان سڕکردبوو.

نزیکەی مانگێک لەگوندی هاوار مامەوە، ئەو ماوەیە لەگەڵ پێشمەرگەکاندا راهاتبووم، لەحەرەسیات و کەمین گرتندا هاوکاریم دەکردن، شەوێکیان حەرەس بووم، رەبایەیەکی سەر لووتکە شاخەکانی نزیک هاوار، تۆپ بارانی کردین، دو سێ گولە لەنزیک بارەگاکەی ئێمەوە کەوتە خوارەوە، ئەگەرخۆم تەختی زەوی نەکردایە، لەوانەیە پارچەیەکم بەربکەوتایە. نەمدەزانی چی بکەم، نەمدەزانی ئەم تۆپبارانە واتای چییە؟ ، نیازی عزەتم لەخەو خەبەر کردەوە، وتم ئەمە چییە؟ چی بکەم؟ نیازی خۆی تێکنەدا، لەژێر بەتانیەکەیەوە وتی: هیچ نییە، لەسەر زەوی راکشێ، ئەو رەبایانە جار جار بەو شێوەیە تۆپبارانمان دەکەن، منیش گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم، دوای ماوەیەک تۆپ بارانەکە وەستا.

رۆژێکیان لەگەڵ حەمەکەریم، لەسەر لوتکەی شاخێکی نزیک بارەگا، کەمین بووین، کەمین بۆ ئەوەبوو ئاگاداری جوڵەو بەرنامەکانی دوژمن بییت، بە دووربیین چاومان لێبوو، سەربازەکانی ناو رەبایەی شاخی شنروێ، لەرەبایەکانییان دەردەچن و بەرەو لای ئێمە دێن، کاتێک حەمەکەریم ئەو دیمەنەی بینی، خەریک بو زراوی بتەقێ، هاواری کرد، من نەموت تۆ بۆ

کەمین باش نییت، ئێستە چیی بکەین؟ ، منیش وتم من لێرە دەمێنمەوە تۆ بڕۆ برادەران ئاگادار بکە.

حەمەکەریم ئەو بۆچوونەی منی پێباشبوو، چووە خوارەوە، کەمێکی پێچو، سەیرمکرد هەمو هێزەکەی، بەفەرماندەی کەرتەکانیشەوە هێنایە سەر شاخ، ئەو رۆژە سەربازەکان لەوە زیاتر نەهاتنە پێشەوە، هێرشیان نەکرد.

رۆژێکی تر لەبارەگا راکشابووم، وتیان سوپای عێراق هێرشی کرد، دەرکەوت هێرشەکە بۆئەو سەربازە هەڵهاتوانەی گوندی هاوار بوو، کە لەناو باخەکاندا دەسوورانەوە، سەربازەکانی سوپای عێراق تەقەیان کرد، یەک لەسەربازە هەڵهاتوەکان قۆڵی بریندار ببوو، برینەکەی سوک بوو، تەداوی برینەکەیم کرد. لەو کاتەدا چوار پێشمەرگەی بەجەرگ ، فەیسەل کاکل، رزگار تەوێڵەیی، عەلی مام سەعید و غەفور بەشاخەکەی بەرامبەردا سەرکەوتن، پشتی سەربازەکانیان گرت، لێیاندان و هێرشی سەربازەکانیان شکاند.

**ئاوەکەی زەڵم:**

بە گوێرەی بەرنامەی رێکخستنی کۆمەڵە، دەبوو من بچمە بارەگای سەرکردایەتی یێک، لەنەخۆشخانەی سەرکردایەتی کار بکەم. عەتا هەورامی بەرپرسی دەستەی پاراستنی مەلا بەختیار بوو، بۆ کاری تایبەتی خۆی، سەردانی ناوچەی هەورامانی کردبوو، ئەو کاتەی من بوومە پێشمەرگە، ئەو لەگوندی هاواربوو، دەیویست بگەڕێتەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی. مەفرەزەی لەتیفی حەمەی مەلاسابیریش، ئامادەکاری دەکرد بۆئەوەی بەرەو سەرکردایەتی بڕوات، بڕیار درا منیش لەگەڵ عەتا ولەتیفدا، بەرەو سەرکردایەتی بچم.

لەڕۆژێکی مانگی نیسانی ١٩٨٢، لەهاوارەوە بەرەو عەبابەیلێ بەڕێکەوتین، بەشەو بەناو گوندەکانی شارەزووردا تێپەڕین. هەر ئەو شەوە لەئاوی زەڵم نزیکبووینەوە. بەهار بوو، ئاوەکەی چەمی زەڵم زۆر بوو، لەکاتی بڕینی ئاوەکەدا، دوو دوو سێ سێ، دەستی یەکترمان دەگرت، بۆئەوەی ئاوەکە

نەمانبات. من لەمناڵیەوە لەگۆمی کانیژنانی گوڵپ، فێری مەلە ببووم، لەکاتی پەڕینەوەدا بیرم دەکردەوە، ئەگەر ئاوەکە بمانبات، چۆن بەو شەوە لەو ئاوە ساردە زۆرەدا، دەست بەمەلە بکەم، خۆم و هاوڕێکانم رزگار بکەم.

بە سەلامەتی لەئاوەکەی چەمی زەڵم پەڕینەوە، بۆ رۆژی دوایی لەگوندی سۆیلەمیشی نزیک سەیدسادق ماینەوە، بۆشەوی دوایی لەجادەی نێوان سەیدسادق و موان پەڕینەوە، بەرە و شارباژێر بەڕێکەوتین.

**قەویلە:**

هاوارمان بە جێهیشت، شارەزوورمان بڕیی، گەیشتینە گوندی قەویلەی ناوچەی شارباژێڕ، خەریکبو دنیا روونـاک دەبـوەوە، لەگـەڵ چەنـد پێشمەرگەیەک چوینە ماڵێک، یەکێک لەپێشمەرگەکان وتی: لەم خانوەدا، حسکەکان کاک نەشیروانیان دەستگیر کرد.

کاتێک سکرتێری کۆمەڵە لەلایەن پێشمەرگەکانی حسکەوە دەستگیرکرا، مـن لـەزانکۆ بـووم، ئـەو رەفتـارە نادیموکراتیـەی حسـک، لەلایـەن خـەڵکی کوردستـانەوە ریسـوا کـرا. کاتێـک بـووم بەپێشـمەرگە، سـەیر دەکـەم پێشـمەرگەکان ئـەو رووداوە بـۆ مەبەسـتێکی تـر دەگێرنـەوە، دەسـتیانکرد بەهێرش بۆ سەر کەسێتی سکرتێری کۆمەڵە، هەندێک لەپێشمەرگەکان باسی بێوەفایی نەوشیروان مستەفایان بۆدەکردم، دەیانوت: سامان، کادرێکی کۆنی کۆمەڵـەی ناوچـەی هەورامانـە، ئـامۆزای ئـازاد هەورامیـە، لـەکاتی دەستگیرکردنەکەیدا، لەگەڵ نەوشیروان مستەفا بووە، زۆر هاوکاری کردوە، ئامادە بوە گیانی خۆی بۆ رزگارکردنی نەوشیروان مستەفا ببەخشێت، بەڵام دواتر کە هەردووکییان لەزیندانی حسک ئازاد بوون، لەبەرئەوەی سامان لەسەر هەندێک بابەتی سیاسی و رێکخستن، لەگەڵ نەوشیروان مستەفا بۆچونی جیاوازبووە، نەوشیروان مستەفا وەفای بۆ دڵسۆزی و قوربانی سامان نەبووە، فەرامۆشی کردووە و قسەی پێ وتووە.

پێشمەرگەکانی تر دەیانوت: پێشمەرگەو فەرماندەکانی تیپی هەورامان، بەبەردەوامی هەوڵیانداوە تۆڵەی دەستگیرکردنی نەوشیروان مستەفا، لەحسک

بکەنەوە، دەیانوت: لەشەڕیکی نێوان حسک و ینکدا، ئەو فەرماندەیەی حسک کە نەوشیروان مستەفای دەستگیرکرد، کەوتە دەست هێزی پیشمەرگە، لەتۆڵەی دەستگیرکردنی نەوشیرواندا، یەکسەر فەرماندە دیلەکەی حسک دەکوژن، کەچی نەوشیروان مستەفا هەر بەچاوی دۆستانە، بەخۆشەویستیەوە سەیری پێشمەرگەکانی ناوچەی هەورامان و هەڵەبجە ناکات، چوونکە کادیرو پێشمەرگەکانی ئەو ناوە، دۆستایەتیان لەگەڵ مەلا بەختیاردا بەهێزە. بەو قسانەدا بۆمدەرکەوت، کە ناکۆکی و ململانێ، لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا هەیە، دیاربوو ئەو پێشمەرگانە دەیانویست، منیش وەک خۆیان لێبکەن، دڵم لەسکرتێری کۆمەڵە کرمۆڵ بکەن.

لەو کاتەدا ئەو هەواڵانەی کۆلێژی پزیشکیم بەبیرهاتەوە، کە لەسەر شۆڕش و خەباتی پێشمەرگایەتی پێماندەگەیشت، یەک لەهەواڵەکان پڕوپاگەندە بوو بۆ نەوشیروان مستەفا، کە سەرکردەیەکی زۆر زاناو دانایە، دەبوو ئەو پڕوپاگەندەیە لەناوخەڵکدا بڵاوبکەینەوە. یەکێک لەهەواڵەکانی تر ئەوەبوو کە نەوشیروان مستەفا بەمەبەستی گفتوگۆ لەگەڵ حسک، سەردانی ناوچەی شاربازێڕی کردوە، بۆئەوەی کێشەکانی نێوان حسک و ینک بەئاشتی چارەسەر بکەن، کەچی حسکەکان، لەباتی ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، دەستگیریان کردبوو.

ئەو ڕۆژە ئەو خانوەم بینی کە سکرتێری کۆمەڵەی تێدا دەستگیرکرابوو، بەوردی لەخانوەکە وردبوومەوە، لەچەند ژورێکی بچووک پێکهاتبوو، ئەو ژوورەی ئێمە لێی دانیشتبووین، بەڕێرەوێکدا دەچووە سەر ژووری دانیشتنی خاوەن ماڵ، گەوڕی ئاژەڵەکانیان، لەنێوان ژوری میوان و ژوری دانیشتندا بوو، ئەو ماوەیەی لەو ژوورەدا دانیشتین، گوێمان لەپرخە و کاوێژی ئاژەڵەکان بوو، هەستمان بەبۆنی گەوڕی ئاژەڵ دەکرد، بۆ منی تازە پێشمەرگە، ئەم دیمەنە کەمێک گران بوو، دەترسام هەموو گوندەکانی کوردستان وابن، بەڵام بابەتی ناخۆشی سەرەکی ئەو ڕۆژەی من، ئەو قسەو قسەڵۆکانە بوون، بەرامبەر بە سکرتێری کۆمەڵە دەکران.

**دوو تەزکیە:**

بۆ رۆژی دوایی، لەگەڵ پێشمەرگەکاندا چوین بۆ ناو دارستانێکی نزیک گوندی پارەزان، لەناو دارستانەکەدا ژمارەیەک پێشمەرگە و بەرپرسم بینیی، هەر ئەو رۆژە بۆ یەکەمجار، شەوکەتی حاجی موشیر و حامد حاجی غالی و مامۆستا پشکۆم بینین، جارێکی تر مەلا یاسینم بینیەوە. بە گەرمی بەخێرهاتنییان کردم، هەمو خۆشحاڵی خۆیان نیشاندا بە بۆنەوی ئەوەوە کە پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کردوە.

لەبەرئەوەی کاتی خۆی لەخورماڵ بەنهێنینی مەلا یاسینم دیبوو، لەگەڵ مامۆستا پشکۆو مەلا یاسین دانیشتم، دەربارەی کۆمەڵە قسەیان لەگەڵ کردم، کەرتی رێکخستنی هەڵەبجە بڕیاریاندا، تەزکیەم بۆ بکەن بۆ ناوەندی کۆمەڵە (د. فایق پێش ئەوەی بێتە دەرەوە پەیوەندی بەرێکخستنی کۆمەڵەوە بووە)، منیش تەزکیەکەم وەرگرت، بەڵام نە تەزکیەکەی کەرتی رێکخستنی شەقڵاوەم خوێندبوەوە، نە تەزکیەکەی کەرتی رێکخستنی هەڵەبجەم خوێندەوە، نەمدەزانی چییان تێدانووسراوە. کە گەیشتمە بارەگای سەرکردایەتی، هەردو تەزکیەکەم دا بە دەست مەلا بەختیارەوە، لەو کاتەدا مەلا بەختیار بەرپرسی ناوەندی رێکخستنی کۆمەڵەبوو.

**فەرماندەکەیان کوشت:**

ئەو ماوە کورتەی لەگەڵ بەرپرسەکانی ینک، لەناو دارستانەکەی شاربازێڕدا مامەوە، دڵەڕاوکێ و شپرزەیی بەسەرو سیمایانەوە دیاربوو، تێگەیشتم کە کێشەی بەرپرس و پێشمەرگەکانی ینک، لەگوندی هاوارەوە تا دەگاتە شاربازێڕ، لەسەر چۆنیەتی شەهید کردنی حەمە تەوفیقە.

ساڵی ١٩٧٧، پێشمەرگەکانی سەرکردایەتی کاتی پدک، لەئەشکەوتی پاڤێ ناوچەی بادینان، ئیبراهیم عەزۆی فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی ینکی ناوچەی بادینان و ١٤ پێشمەرگەیان، شەهید کرد. ساڵی ١٩٧٨ سەرکردایەتی کاتی پدک، بەهاوکاری سەرۆک خێڵە کوردەکانی ناوچەی هەکاری و هێزە چەکدارەکانی سوپای تورکیا، لەشەڕی خوێناوی هەکاریدا، زیانێکی گەورەی

سیاسـی و سـەربازییان بـەهێزی پێشـمەرگەی ینـک گەیانـد، هەر سـێ سەرکردەی ینک (عەلی عەسکەری، د. خالد، حسەین بابەشێخ)یان شەهید کرد.

پێشمەرگەکانی ینک، لەسنوری هەورامان، هەوڵدەدەن، تۆڵەی ئەشکەوتی پاڤێ وکارەساتی هەکاری، لەپێشمەرگەی پدک بکەنەوە، چاودێری هێزێکی پدکی ناوچەی هەڵەبجە دەکەن، بۆ ئەوەی پیلانگێرییەک دژی ئەو هێزەی پدک ئەنجام بدەن، بیانخەنە داوەوە، تۆڵەی هاوڕێکانیان بکەنەوە. سەرەتا داوای چاوپێکەوتن لەهێزەکەی پدک دەکەن، دوای چاوپێکەوتن، باس لەنزیکبونەوەو ڕێکەوتنی مەیدانیان لەگەڵدا دەکەن.

پێشمەرگەکانی پدک، بەو داوایەی پێشمەرگەی ینک ڕازی دەبن، دەکەونە نـاو داوەکـەوە، وایلێـدێت پێکـەوە جەولەدەکـەن. شـەوێکی هـاوینی ١٩٧٨ لەگونـدی کانیزنـانی ناوچـەی شـەمێران، هەردوو هێـزەکە پێکـەوە دەخـەون، یەکێتیـەکان دەیانـەوێت ئـەو فێڵـەی، سـاڵیک لەوەوبـەر پێشـمەرگەکانی پـدک، بەرامبەر بـەئیبراهیم عـەزۆو هاوەڵـەکانی، لەئەشـکەوتی پاڤێ ئەنجامیاندا، لـەو گوندەی ناوچەی شـەمێران، دژی پارتی کۆپی بکەنـەوە، پێشمەرگەکانی پدک بکوژن و تۆڵەی کارەساتی هەکاری و کارەساتی ئەشکەوتی پاڤێ بکەنەوە.

ئـەو شـەوە پێشـمەرگەی پـدک و ینـک، پێکـەوە دەخـەون، یەکێتیـەکان کاتژمێری سفری لێدانی پێشمەرگە پارتیەکانیان داناوە، شـەڕ درووسـتدەبێت، ژمارەیـەک لەپێشـمەرگەکانی پـدک، لـەو شـەڕەدا شـەهید دەبـن، بـەهۆی ئـەو شەڕەوە، هێزەکەی پدک لەو ناوچەیە هەڵدەوەشێتەوە، عـەزیزی حەمـەساڵح، فەرماندەی هێزەکەی پدک، دەستگیر دەکرێت، لەزیندان هەڵدێت، بە گوێرەی قسەی بەرپرسەکانی ینک، عەزیز پەیوەندی بەهـەواڵگری حکومـەتی عێراقـەوە دەکات.

لـەو کاتـەدا عـەزیزی حەمەسـاڵح لەهەڵەبجـە دەبێـت، مەفرەزەیـەکی پێشـمەرگەی ینـک، دەچێتـە نـاو شـاری هەڵەبجـە، بـەبێ ئـەوەی مەفرەزەکـە لەگـەڵ هێزەکـانی ڕژێمـدا بەشـەڕبێت، کـادرێکی مەفرەزەکـە، بـەناوی حەمـە تـەوفیق شـەهید دەبێـت، بـەگوێرەی زانیاریـەکانی بەرپرسـانی ینـک لەسنوورەکەدا، حەمەتەوفیق بەدەستی عەزیزی حەمە ساڵح شەهید دەکرێت.

پاش ماوەیەک، عەزیز پەیوەندی بە بەرپرسێکی ینک وە دەکات، بڕیاردەدات ببێت بەپێشمەرگەی ینک، بەمەرجێک بیکەن بەفەرماندەی کەرت، بەڵام زۆربەی پێشمەرگەکانی سنوری هەورامان و هەڵەبجە، وە بەتایبەتی ئەوانەی کە سەر بەرێکخستنی کۆمەڵەبوون، نەک هەر ناڕازی بوون کە عەزیزی حەمەساڵح وەک پێشمەرگە وەربگیرێت، بەڵکو داواشیان دەکرد کە دەبێت بکوژەکەی شەهید حەمە تەوفیق بکوژرێت.

دیاربوو لەسەر ئەو بابەتە، ناکۆکی لەنێوان بەرپرسەکانی ینکدا دروستببوو، هەندێک لەبەرپرسەکانی ینک، ئەو داوایەی پێشمەرگەکانیان بەڕاست نەدەزانی، ئەمەش هۆکاری ئەو ناکۆکییە بوو کە وای لەبەرپرسەکانی ئەو سنوورەی ینک کردبوو، لەسیمایاندا نیگەرانی و شپرزەیی دەربکەوێت. بە هۆی کێشەی عەزیزی حەمەساڵح ەوە، دوو کەرتی تیپی ١١هەورامان بۆ ماوەیەک لەگوندی هاوار دانیشتبوون، لەسەر چارەنوسی عەزیزی حەمەساڵح چاوەڕوانی دوا هەڵوێستی سەرکردایەتیان دەکرد.

بۆ رۆژی دوایی ناوچەی شارباژێرم بەجێهێشت، کە گەیشتمە بارەگای سەرکردایەتی، هەواڵ هات، لەژێر فشاری پێشمەرگەو کادری سنوری هەڵەبجەدا، لەباتی ئەوەی عەزیزی حەمەساڵح بکەن بەفەرماندەی کەرت، سەرکردایەتی ینک بڕیاری کوشتنی عەزیزی داوە، بڕیارەکەشیان جێبەجێکرد.

**جافر بریندار دەبێ:**

دەیان رەبایەی سوپای عێراق، لەدەوروبەری گوندی هاوار بوون، جار جار تۆپبارانییان دەکردین، ناوبەناو هێرشی سنورداریان بۆ دەکردین، بەڵام کاتێک من هاوارم بەجێهێشت، لەنەخۆشخانەی سەرکردایەتی مامەوە، سەربازەکانی رژێم هێرشێکی فراوانیان بۆ سەر بارەگاکانی گوندی هاوار کرد، لەو شەڕەدا تەنها یەک پێشمەرگە برینداربوو، ئەویش جافری خزم و هاوڕێی منداڵیم بوو. زۆر نیگەران بووم، لەبەرئەوەی لەسنووری ناوچەی هەورامان نەمابووم، نەمتوانی هاوکاری جافر بکەم، جافر یەک لەو کەسانە بوو، لەقۆناغە جیاکانی ژیانمدا بەشێوازی هەمەجۆر، مادی و مەعنەوی،

هاوکاری کردبووم، حەزم دەکرد ڕۆژێک ئەو پێویستی بەمن بوایە، هاوکاریم بکردایە، کەچی کە بریندار بوو، من لەگەڵیدا نەبووم. گولەیەک بەر سنگی کەوتبوو، شوێنی مەترسیداری نەگرتبوو، خۆشبەختانە پاش ماوەیەک برینەکەی سارێژ بوو.

**لەشکری ئیسلامی:**

لەماوەی کەمتر لە دە ڕۆژدا، لەهاوارەوە، گەیشتینە سنوری شاری سەردەشتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەو دیمەنانەی سنوری سەردەشت، تا بڵێی جوان و دڵگیربوون، ناوچەکە ڕەز و باخێکی زۆری هەبوو، کاتی واهەبوو ماوەی کاتژمێرێک ڕێمان دەکرد، لەبەر سێبەری باخەکان، ئاسمانمان بەرچاو نەدەکەوت.

لەو گەشتەدا ڕۆژێک لەسەر کانیەکی ناوچەی شارباژێڕ دانیشتبووین، پشوومان دەدا، سێ پێشمەرگەمە هاتنە لامان سڵاویان لێکردین، کەمێک لەسەر کانیەکە مانەوە، دواتر خواحافیزیان کردو ڕۆیشتن، هەر سێ پێشمەرگەکە چەکی کلاشینکۆفی نوێی مۆدێلی (بێکۆناخ)یان پێبوو، کە لێمان دوورکەوتنەوە، لەتیف وتی: دوای ماوەیەک ئەو چەکانە دەبنە هی خۆمان. پرسیارم لێکرد: ئەوانە کێن؟ چۆن چەکەکانیان دەبنە هی خۆمان؟ وتی: ئەوانە پێشمەرگەی لەشکری ئیسلامیین، دوای ماوەیەکی تر چەکییان دەکەین، دەست بەسەر چەک و بارەگاکانیاندا دەگرین.

لەسەرەتای مانگی حەوتی ١٩٨٢ دا، لەکاتژمێری سفردا، هێزی پێشمەرگەی یەک، پەلاماری هەمو بنکەو بارەگاکانی لەشکری ئیسلامی دا، شەڕ دروستبوو، پێشمەرگەکانی لەشکری ئیسلامی بەرگرییەکی لاوازیان کرد، لەبەرگەڵو کە بارەگای سەرەکی لەشکری ئیسلامی لێبوو، لەشەڕەکەدا فەرماندەی تیپی ٤٧ پیرەمەگرون سەلاح موهەندیس شەهید بوو. لەگوندی حاجی مامەندی ناوچەی شارباژێڕ، حامیدی حاجی غالی، فەرماندەی تیپی ١١ هەورامان، بەسووکی بریندار بوو.

لەشـكری ئیسـلامی زیـانی گیـانی زۆری پێگەیشـت، بەرپرسـی یەكـەمیان بەبرینداری دەستگیركرا، ماوەیەک لەزیندان مایەوە. بەو شێوەیە ئەو لەشكری ئیسلامیە، كە ینک خۆی دەستی لەهێشتنەوەو گەورەكردنیدا هـەبوو، لـەماوەی بیست و چوار كاتژمێردا، هەڵیوەشاندەوە.

لە تەممـوزی ١٩٨٢دا، كە لە نەخۆشـخانەی شـەهید دكتـور بەختیـار كـارم دەكرد، رۆژێكیان لەزیندانەوە برینداریێكیان هێنـا، برینـدارەكە نـاوی شـێخ زرار بوو، وتیان دكتۆر ئەمـە برینـداری شـەڕی لەشـكری ئیسـلامییە، ئـەو برینـدارە یەكێک لەبەرپرسە باڵاكانی لەشكری ئیسلامی كوردستان بوو.

ئـەو رۆژەی شـێخ زرار بەبرینـداری هاتـە نەخۆشـخانە، قسـەی فەرمانـدەی مـەفرەزەكەی تیپـی ١١ هـەورامانم بیركەوتـەوە، كـە پـێش دوو مانـگ كاتێـک بەرەو بارەگاكانی سەركردایەتی بەڕێوەبووین، وتی: سـەیری ئـەو كڵاشـینكۆفە جوانانـە بكـە، ماوەیـەكی تـر هـەر هـەمویان چـەک دەكـەین، خۆمـان ئـەو كڵاشینكۆفانە لەشان دەكەین. قسەی فەرماندەی مەفرەزەكە راست دەرچوو.

لەشكری ئیسلامی كوردستان حزبیكی سیاسی ئیسلامی بـوو، سـاڵی ١٩٨١ لەئێران، كۆماری ئیسلامی ئێران دایمەزراند، كۆمـەڵێک كەسایەتی سیاسـی و ئاینی كورد رابەرایەتیان دەكرد، ژمارەیـەک كـادرو بەرپرسـی ینـک، بـەبڕیاری سـەركردایەتی وەک خـەدمایل نێردرابـوون بـۆ نـاو لەشـكری ئیسـلامی. شـێخ زرار و عــەباس شــەبەک، دوو لــەو كەســایەتیانە بــوون كــە لەدامەزرانـدنی لەشكری ئیسلامیدا بەشداریان كردبوو.

ینک دەرفەتی بە دروستبوون و گەشـەكردنی لەشـكری ئیسـلامی دا، دواتـر هەڵیوەشاندنەوە، ئەو پرۆسەیە تەنها كردەیەكی سەربازی رۆژانە نەبوو، تەنیا بـۆ دەستبەسـەراگرتنی، چـەک و تەقەمــەنی و خـۆراكی ئـەو حزبـە نـەبوو، گۆڕانكاریـەكی سیاسـی بـوو، جێبـەجێكردنی یـەكێک لەتەكتیكـەكانی جـەلال تاڵــەبانی ســكرتێری ینــک بــوو. مامجــەلال دەیویســت بەدۆســتایەتی و نزیكبونەوەی لە لەشكری ئیسلامی: ماركسیبون و ماوتسیی بوونەكـەی خـۆی لای كۆمـاری ئیسـلامی ئێران كاڵ بكاتـەوە، لـەكۆماری ئیسـلامی ئێران نزیـک

ببێتـەوە، هاوکـاری لـەئێران وەربگرێـت، چیتـر ئێـران وەک حزبێکـی بـێ دیـن سەیری ینک نەکات.

لەلایەکی ترەوە، بەدروستبوونی لەشکری ئیسلامی کوردستان، مـام جـەلال دەیویست پەیام بۆ حکومەتی عێراق بنێرێت: ئەگەر گفتوگۆمان لەگەڵ نەکەیت، لەگەڵمان رێک نەکەوییت، بەحزبی ئیسلامی سەر بەئێران دەترووخێنین. مـام جەلا چاودێری ئێران و عێراقی دەکرد، بزانێت لەدروسـتکردن و هێشتنەوەی لەشـکری ئیسـلامی کوردسـتاندا، سـوود لە ئێـران وەردەگرێـت ؟ ، یـان لـە هەڵوەشاندنەوەی ئەو حزبەدا، سوود لە عێراق وەردەگرێت؟ . کاتێک بینی بە هەڵوەشانەوەی لەشکری ئیسلامی سوود لە عێراق وەردەگرێت، بۆ گفتوگۆی نێـوان ینـک و حکـوومەتی عێـراق بەکاریـدەهێنێت، لـەعێراق نزیکبـوەوە، بـۆ نیشاندانی هێزی ینک بەعێراق، بۆ سەرکوتکردنی ئەو هێزەی ئێران پشـتیوانی دەکـرد، لـەماوەی بیسـتوچوار کـاتژمێردا، کۆتـایی بەلەشـکری ئیسـلامی هێنـا، زەمینـەی زیـاتری بـۆ نزیکبونـەوە لەحدکا و ئەگـەری گفتوگۆ لەگـەڵ عێراقدا، خۆش کرد.

# ٦

# لە سەرکردایەتی

**لەگەڵ داشعێراقیەکاندا:**

لە گەشتەکەی نێوان هەورامان و بارەگاکانی سەرکردایەتیدا، تێبینیم کرد، ناکۆکییەکی هزری و سیاسی، لەنێوان هاوڕێیانی کۆمەڵەدا هەیە، ئەندام و کادرانی کۆمەڵەی سنوری تیپی ١١هەورامان، لایەنگری لە هەڵوێستی مەلا بەختیارو سالار عەزیزن دەکەن، لە هەڵوێست وەرگرتندا، بەرژەوەندی چینایەتیان لەبەرژەوەندی نەتەوەیی پێ گرنگترە، رەخنە لە ئاراستە نەتەوەییەکەی کۆمەڵە دەگرن، رەخنە لەسیاسەتی مامجەلال و نەوشیروان مستەفا و فەریدون عەبدولقادر دەگرن، گاڵتەیان بەزمانی کوردی و نەتەوەبوونی کورد دێت، یەکێتی چینی کرێکارو یەکێتی خاکی عێراقیان، لەزمان و کلتوورو یەکێتی گەلی کورد، بەگرنگتر دەزانی.

بۆچوونی منیش پێچەوانەی ئەوان بوو، من لەگەڵ ئاراستە نەتەوەییەکەی کۆمەڵەدا بووم، بەڵام بەشداری گفتوگۆکانم نەدەکرد، رەئی خۆمم نەدەدا، لەبەرئەوەی کاتێک لەشارباژێر مەلا یاسینم بینی، پێیوتم: دکتۆر

ئاموژگارییەکت دەکەم، تا ماوەی شەش مانگ هەر گوێگربە، ڕەئی خۆت لەسەر بابەتە سیاسیەکان مەدە، تا باش خۆت لێیان تێدەگەیت، ئەو کات ڕەئی بدە، ئەوڕێنماییەی مەلا یاسینم بەلاوە باشبوو، تا ماوەیەک بەو ڕێنماییە کارم کرد. بەڵام ئەو بێدەنگییەی من بەرامبەر بەقسەی هاوڕێکانم، وای لەهاوڕێکانم گەیاندبوو، کە من بەو بۆچوونەی ئەوان ڕازیم، وەک ئەوان لایەنگری لەبۆچونەکانی مەلابەختیار و سالار عەزیز دەکەم.

کە گەیشتمە سەرکردایەتی، ماوەی چەند ڕۆژێک لەبارەگای مەلا بەختیار مامەوە، کەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجە تەزکییەی بۆ کردبووم، کە زۆربەی کادرەکانی سەر بەباڵی داشعێراق بوون، ئیتر بەبێ ئیرادەی خۆم، لە ڕیزی داش عێراقییەکانی کۆمەڵەدا بووم. بەلای باڵی کوردستانی کۆمەڵەشەوە من سەر بە بەرەی داشعێراقم، چوونکە خەڵکی سنووری هەڵەبجەم، لە ڕێگەی کەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجەوە پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کردوە. لەدڵی خۆمدا دەموت، چیم لەخۆم کرد، هەڵەم کرد لەڕێگەی ناوچەی هەورامانەوە پەیوەندییم بە هێزی پێشمەرگەوە کرد.

**دکتوری ڕاستەقینە؟:**

مەلا بەختیار ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە بوو، بەرپرسی ناوەندی ڕێکخستنی کۆمەڵەش بوو، منیش تەزکییەی کەرتەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەم پێبوو، دەبوو یەکەم جار بچمە لای مەلا بەختیار، تەزکیەکانی بدەمێ. مەلا بەختیارم بینی، تەزکیەکانی ڕێکخستنم دایە دەستی، ئەویش تەزکیەکانی خوێندەوە، بەخێرهاتنی کردم.

دوای ئەوە مەلا بەختیار لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ناوەندی کۆمەڵە، ناوەندی کۆمەڵە ئەو کاتە وەک قیبلەی ئێمە وابوو، بارەگایەکی تایبەتی هەبوو، سێ کەس کاروباری ناوەندەکەیان بەڕێوەدەبرد، نەوشیروان مستەفا سکرتێری کۆمەڵە بوو، مەلا بەختیار بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو، فەرەیدون عەبدولقادر بەرپرسی ڕاگەیاندنی کۆمەڵە بوو.

سـەرەتا مـەلا بـەختیار بەفەرەیـدون عەبـدولقادری ناسـاندم، فەرەیـدون بەزەردەخەنەوە دەستی راکێشا و تەوقەی لەگەڵ کردم، بەخێرهاتنی کردم، بەڵام هەر هەستم کرد بەخێرهاتنەکەی گەرم نییە. دوای ماوەیەک سکرتێری کۆمەڵەهات، ئەوە یەکەمجار بوو ببینم، پیاوێکی باڵابەرزی رەشتاڵەی لاواز، کە دەرۆیشت بەرێوە، دەتوت جومگە لەنێوان ئێسقانەکانی لەشیدا نییە، دەتوت هـەمو گیـانی یـەک ئێسـقانی گەورەیـەو پێکـەوە دەجووڵێت، مـەلا بـەختیار بەسـکرتێری کـۆمەڵەی ناسـاندم، ئەگـەر یـادەوەریم یارمـەتیم بـدات، وابـزانم تەوقەشـی لەگـەڵ نـەکردم، نـازانم بـەخێرهاتنی کـردم یـان نـا، لـەباتی ئـەوەی پێشوازی گەرمم لێبکات، لەسـەر دۆخـی ناوشـار پرسـیارم لێبکات، سیاسـەتی کۆمەڵەم بۆ روونبکاتەوە، وتی: دکتۆری راستەقینەیە؟ یان وەک ئەوانی تر، فێری دەرزییلێدان بوە و خۆی لێکردووین بەدکتۆر؟ ، ئەمـەیانم پێخۆشبوو، لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا سکرتێرێکی وریامان هەیە، شارەزایی وردی لەبواری پزیشکیدا هەیە. مەلا بەختیار وتی: دکتۆری راستەقینەیە، نەوشیروان مستەفا وەڵامی دایەوە و وتی: باشە گوندی گوڵپ چۆن دکتۆری لێهەڵکەوتووە. وەک ئـاوێکی سـارد بەسـەر هـەمو گیانمـدا بکـەن ساردبوومەوە، سـەیری ئـەملاو ئەولای خۆمم دەکرد بۆئـەوەی کونێک بدۆزمـەوە خـۆمی پیابکـەم، نەمدەزانی چیـی بـکەم، بێـدەنگیم هـەڵبژارد، مـەلا بـەختیاریش لـەوە زیـاتر لەسـەری نەرۆیشت، گفتوگۆکە کۆتایی هات.

### نەخۆشخانەی شەهید دکتور بەختیار

دوای ئەوقسە زبرانەی سکرتێری کۆمەڵە، ناوەندی کۆمەڵە، نوسـراوێکیان بـۆ نەخۆشـخانەی شـەهید دکتـۆر بـەختیار کـرد، بۆئـەوەی وەک پزیشـک لەنەخۆشخانەکە کار بکەم. نەخۆشخانەکە لەکوێرە گوندێکی نێوان گوندەکانی شێنێ و ناوزەنگ دا بوو، ناوی قوڵەهەرمێ بوو. لە بارەگاکەی مەلا بەختیار، جـل و جانتاکـەی خـۆمم هـەڵگرت، رۆژی ١٢-٥-١٩٨٢ پـەیوەنـدیم بەنەخۆشخانەوە کرد.

نەخۆشــخانەی شــەهید دکتــۆر بــەختیار بــەناوی د. بــەختیار خالــدەوە نــاونرابوو، کە لەســەردەمی کــاری ڕێکخســتنی سیاســی کــۆلیژی پزیشــکیدا، بەرپرسـی زانکـۆی موسـڵ بـوو، دوای تـەواوکردنی کۆلێژی پزیشـکی، دکتـۆر بەختیار پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد، لەناوچەی قەرەداغ پێشمەرگە بـوو، لــەو ناوچەیــە پزیشــک و رابــەر سیاســی بــوو، بـۆ بەســزاگەیاندنی تاوانبارێک، ڕووی کردەوە ناوشار، لەکاتی ئەنجامدانی چالاکییدا، شەهید بوو.

**زانکۆی موسڵ:**

یــەک لەســیما جوانــەکانی پێشــمەرگایەتی لە شۆڕشــی نوێــدا، بەشــداری ژمارەیەک پزیشکی شۆڕشگێر و قوتابی زانکۆ بوو، زۆربەی ئەو پزیشکانە، دەرچـوی کـۆلیژی پزیشـکی زانکـۆی موسـڵ بـوون. دکتـۆر بـەختیار یەکـەم پزیشکی دەرچوی زانکۆی موسـڵ بوو، کە پەیوەندی بەهێزی پێشـمەرگەوە کرد. بەیان و نازەنین دوو کچە خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسـڵ بوون، سەر بەرێکخستنی ینک بوون، لە ناو شاردا بەنهێنی کاریان دەکرد، کە گومان لەسەریان درووستبوو، بۆئەوەی بەر هەڵمەتی دەزگا سیخوڕییەکانی رژێم نەکەون، دەستیان لەخوێندن هەڵگرت، پەیوەندییان بەهێزی پێشمەرگەوە کرد. نەریمان قوتابی کۆلێژی ڤێتەرنەری زانکۆی موسڵ بوو، لەگەڵ بـەیان و نـازەنین لەرێکخسـتندا بـوو، کـە شـانەکەیان ئاشـکرا بـوو، ئـەویش پەیوەنـدی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد. دکتۆر زریـان (عەبدولرەحمان یـونس) لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ بوو، سێ خول لە پێش منەوە بوو، خـەڵکی کـەرکوک بـوو، ئـەویش پەیوەنـدی بـەهێزی پێشـمەرگەوە کـرد. دکتـۆر عەبدولمەجیـد عەولا، لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ بوو، یـەک سـاڵ لـەپێش منـەوە بـوو، خــەڵکی هــەولێر بــوو، دوای تــەواوکردنی خوێنــدن، پەیوەنــدی بــەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد، لەشـەڕی براکوژیدا گولەیـەک بـەر سـەری د. عەبدولمەجیــد کــەوت، بەبرینــداری برایــە دەرەوەی وڵات، لەســوید مــافی پەنابــەری وەرگــرت، بــەهۆی کاریگــەری برینەکەیــەوە، دوای چەنــد ســاڵێک لەهەندەران شەهید بوو. من و دکتـۆر شـوان و دکتـۆر ڕێبـاز، کە لـەکۆلێژی

پزیشکی زانکۆی موسڵ هاوپۆل بوین، ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیمان بەهێزی پێشمەرگەوە کرد. ئازاد ئەحمەد، کە دوو ساڵ دوای من هاتە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ، کاتێک کۆلێژی تەواوکرد، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و ساڵی ١٩٨٩ شەهید بوو. جەودەت و یەشار، دوو قوتابی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ بوون، خەڵکی کەرکوک بوون، دوای ئەوەی خوێندنیان تەواوکرد، پەیوەندییان بەهێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعیەوە کرد، دکتۆر حەسەن هەڵەبجەیی قوتابی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی مووسڵ بوو، دوای تەواوکردنی خوێندن، ساڵی ١٩٨٤پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد. دکتۆر شاخەوان دەرچووی پەیمانگای تەندرووستی زانکۆی مووسڵ بوو. ، پێش من پەیوەندی بە هیزی پێشمەرگەوە کردبوو.

دەیان کەسی تری وەک جەبار یاوەر، شۆڕش حاجی، ڕێکەوت عوسمان، یوسف، هەژار کانی مارانی، پیشرەو (نامق حەمەشوکر) ، رەئووف کامل کە دەرچوی کۆلێژەکانی زانکۆی موسڵ بوون، لە ناو شاردا بە نهێنی کاری ڕێکخستنیان دەکرد، دوای تەواوکردنی زانکۆ پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد.

**نەریمانی ڤیتەرنەری:**

کە گەیشتمە نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار، نەریمانی کۆلێژی پزیشکی ڤیتەرنەریم بینی، ئەویش لەنەخۆشخانە کاری دەکرد، کە نەریمانم بینییەوە، زۆر دڵخۆش بووم، لەبەرئەوەی هاوڕێیەکی سەردەمی زانکۆم بوو، سروشتی مرۆڤ وایە، ئەگەر بڕواتە شوێنێکی نوێ، کەسێکی ناسراو لەو شوێنە نوێیە ببینێت، بەهاوڕێ و پشتیوانی خۆی سەیری دەکات، دڵی پێیدەکرێتەوە. دواتر پرسیاری ئەندامانی شانە نهێنیەکەیانم لێکرد، وتی: هەموویان سەلامەتن، بەیان و نازەنین گەشتیی سوریایان کردوە، هەوڵیان بۆ دراوە تا لەوێ خوێندن تەواوبکەن، شۆڕش و هەژار لەناو هێزی پێشمەرگەدا لەسنوری قەزای کۆیە کادرن، منیش لەو کاتەوە هاتومەتە دەرەوە، لەنەخۆشخانە هاوکاری دکتۆرەکان دەکەم.

زۆر دڵخۆش بووم بە هاوڕێیەتی نەریمان، لەبەرئەوەی لەناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵەدا، وەک من بیری دەکردەوە، لەگەڵ ئاڕاستە نەتەوەییەکەی کۆمەڵەدا بوو، دواتر بۆمدەرکەوت کە لەو نەخۆشخانەیەدا، تەنیا نەریمان وەک من بیردەکاتەوە.

**غەفوور کەرکوکی:**

لەنەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار، شاخەوانم بینی، شاخەوان لێم نزیک بوەوە، وتی: د. فایق دەمناسی؟ وتم: شێوەت دەکەم، بەڵام بەباشی بیرم نایەتەوە لەکوێ چاوم بەتۆ کەوتووە، شاخەوان خۆی پێناساندم: ناوی راستەقینەی غەفور بوو، خەڵکی کەرکوک بوو، پەیمانگای تەندروستی موسڵی تەواوکردبوو، یەکێک لەو کەسانە بوو کە ساڵی ١٩٧٥ لەگفتوگۆکانی ئوتێل رۆژهەلاتی ناوەراستی موسڵدا، بۆ دروستکردنی حزبی سیاسی رۆلی باشی هەبوو. لەسەر ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵە، شاخەوان دژی ئاڕاستە نەتەوەییەکەی کۆمەڵەبوو، جار جارەش گومانی دەکرد کە کورد نەتەوە بێت.

**حەمەئاوات:**

حەمە ئاوات ئەو پێشمەرگە بریندارە بوو کە ساڵی ١٩٧٨ دا ، لەشەڕەکەی نێوان پدک و ینکدا، لە گوندی کانیزنان لەنزیک هەڵەبجە بەخەستی بریندا بوو، بە هۆی برینەکەیەوە لاقێکی کورتبوەوە، یاریدەدەری پزیشکیی بەشی تیشک بوو، لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار تیشکی بۆ نەخۆش و بریندار دەگرت. لەسەر ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵە، دژی ئاڕاستە نەتەوەییەکە بوو.

ژمارەیەکی تر کارمەندی تەندروستی و بەڕێوەبردن، لەنەخۆشخانە کاریان دەکرد، بەیان و ئومێد دو برابوون خەڵکی سلێمانی بوون، لەبەشی کارگێری نەخۆشخانە کاریان دەکرد.

**پیلانەکەی فوئاد تاڵەبانی:**

کە گەیشتمە نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار، نەخۆشخانەکە تەنیا یەک پزیشکی لێبوو، ناوی فوئاد تاڵەبانی بوو، بەتەمەن بوو، لەئەڵمانیا خوێندنی تەواوکردبوو، دەیانوت پسپۆری نەخۆشییەکانی خوێنە. د. فوئاد حەزی نەدەکرد هاورێیەتی من بکات، گفتوگۆی زانستیشی لەگەڵدا نەدەکردم، ئەوەش پێچەوانەی کلتووری پزیشکانە، چەند جاریکیش بەهەڵە دەرمانی بۆ نەخۆشەکانی بەکارهێنابوو، بەئاوو سابون برینی تەداوی دەکرد، زۆربەی کاتی خۆی بەگاڵتەوگەپەوە بەسەردەبرد، ئەو هەڵسووکەتانەی گومانیان لا دروستکردم کە فوئاد تاڵەبانی پزیشک بێت.

دوای ماوەیەک نەریمان و حەمەئاوات چیرۆکی د. فوئادیان بۆ گێرامەوە، دەیانوت حکومەتی عێراق د. فوئاد تاڵەبانی ناردبوو بۆئەوەی مامجەلال ژەهرخواردبکات، کەس بەو پیلانەی نەزانیبوو، خۆی لەپیلانەکەی پەشیمان ببووەوە. بە بەرپرسەکانی ینکی وتبوو، حکومەتی عێراق بۆئەوە ناردوومی بۆ ناو پێشمەرگە، تا مامجەلال ژەهرانخوارد بکەم.

دەیانوت دوای ئەوەی د. فوئاد پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە دەکات، هەوڵ دەدات پەیوەندی خۆی لەگەڵ مامجەلال بەهێز بکات، رۆژێک داوای چاوپێکەوتن لەگەڵ مامجەلال دەکات، لەچاوپێکەوتنەکەدا بەمام جەلال دەڵێت، من لەلایەن حکومەتی عێراقەوە نێردراوم، تا بەبەکارهێنانی ژەهر، کە لەناو دەرماندایە، تۆ بکوژم. پیلانەکە وابووە، هەر کاتێک مامجەلال نەخۆش بکەوێت، د. فوئاد سەردانی بکات، پشکنینی بۆ بکات، بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی کەپسولی کیفلیکسی بداتێ، کەپسوولەکەن ژەهریان تێدایە، لە باتی ئەوەی مام جەلال چاک بکاتەوە زیاتر نەخۆشی دەخات و شەهید دەبێت.

دوای ئەو قسانەی د. فوئاد، سەرکردایەتی ینک دووچاری شۆک دەبن، لەناو خۆیاندا کۆبونەوە دەکەن، بڕیاری دەستگیرکردنی د. فوئاد دەردەکەن، دەرمانەکە دەنێرن بۆ تاقیگە، بۆئەوەی بزانن د. فوئاد راست دەکات، ئەنجامی تاقیگەکە دەیسەلمێنێت، دەرمانەکە ژەهری تێدایە. بۆچوونی جیاواز لەسەر

ئەوەی چی لەدکتۆر فوئاد بکەن، لەنێوان بەرپرسانی ینکدا درووست دەبێت، لەکۆتاییدا دەگەنە ئەو ئەنجامە، مادام خۆی ئەو نهێنیەی ئاشکرا کردووە، با ئازاد بکرێت.

جارێکی تر د. فوئاد دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار، لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوام دەبێت. کاتێک ئەو زانیارییانەم لەسەر د. فوئاد بۆ دەرکەوت، منیش ئەوم فەرامۆش کرد، بیرم لەوە نەدەکردەوە بۆچی لەگەڵ مندا پەیوەندی گەرم نییە، بڕوام وابوو کە ئەو فوئاد تاڵەبانیە هەر پزیشک نەبووە.

**کامێرا ڤیدیۆکەی هێرۆ خان:**

دوای ئەوەی گەیشتمە بارەگاکانی سەرکردایەتی، هێرۆ خانم بینی، کامێرەیەکی ڤیدیۆی هەبوو، بەردەوام چاوپێکەوتنی لەگەڵ کادر و فەرماندە چالاکەکانی پێشمەرگەدا دەکرد، بە کامێرا ڤیدیۆکەی ریکورد دەکرد، ڤیدیۆکانی بۆ ریکخستنە نهێنیەکانی ناو شارەکان دەنارد، بۆ ئەوەی ئەندامانی رێکخستنە نهێنیەکان ئاگاداری باروودۆخی ناو شۆڕش بن و ورەیان بەرزببێتەوە. من تازە گەیشتبومە نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار، هێرۆ خان سەردانی نەخۆشخانەی کرد، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئەنجامدام، لەکاتی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراقدا، کە گەڕامەوە سلێمانی، هەندێک لەهاوڕێیانی رێکخستن، بۆیانگێرامەوە ئەو چاوپێکەوتنەکەیان بۆ رۆشتبوو بۆ ناو شار.

رۆژێکیان هێرۆ خان لەگەڵ مەفرەزەیەک پێشمەرگە، هات بۆ نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار، د. فوئاد تاڵەبانی لەگەڵ خۆی برد، دواتر زانییمان کە هێرۆ خان بەگەشت بەرەو سنوری رانیە و قەڵادزێ رۆیشتوە، کە هێرۆخان گەڕایەوە، د. فوئادی لەگەڵ خۆی نەهێنایەوە، هەواڵ بڵاوبویەوە کەد. فوئاد گەڕاوەتەوە بۆ لای حکومەتی عێراق، دو ساڵ دوای ئەوە، لەکاتی گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و ینک دا، هەندێک لەپێشمەرگە بریندارەکان، سەردانی بەغدایان کرد، د. فوئادیان دیبوو هاوکاری کردبوون.

**نەشتەرگەری کورتاج:**

لەناوچەی مەنگوڕایەتی سنوری قەزای قەڵادزێ و سەردەشت، لەبناری شاخی مامەندەدا، لەنزیک چەند گوندێکی ئەو دەڤەرەدا، ینک بنکە و بارەگای دانابوو، ڕاگەیاندن و ئێزگەی دەنگی شۆڕشی عێراق لەگوندی تووژەڵە بوو، بارەگای مەکتەبی عەسکەری و مەکتەبی کارگێڕی، لەگوندی زەڵێ بوو، بارەگای مام جەلال و نەوشیروان مستەفاو مەلا بەختیارو سەرکردەکانی تری ینک، لەگوندی ناوزەنگ بوو، بارەگای هێزی پاراستنی سەرکردایەتی، لەگوندی شێنێ بوو. لەخوارووی گوندی ناوزەنگەوە، زیندانێکی گەورە دروستکرابوو، عەلی شامار بەرپرسی زیندان بوو. گوندی قوڵەهەرمێ کوێرە گوندێک بوو، دانیشتوانی گوندەکە فڕۆکەیان دیبوو، سوارڕۆیان نەدیبوو، لالۆ عەبدولرەحمان پێنجوێنی لەنزیک ئەو گوندەوە، نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیاری دروستکردبوو.

لەنەخۆشخانەکەدا، ژووری تایبەتی پشکنینی نەخۆش هەبوو، ژوری تاقیگەی تایبەتی هەبوو، ژورێکی تاریکی تایبەتی بەتیشک گرتن هەبوو، چەند ژورێکیش بۆ حەوانەوە و خەوتنی نەخۆش درووستکرابوو، لەدەرەوەی بینای نەخۆشخانەکە، چێشتخانەیەک دروستکرابوو، ژووری پشوودان و خەوتنی بۆ پزیشکان و بۆ کارمەندان تێدا دروستکرابوو. بەڵام هیچ ژورێکی تایبەتی نەشتەرگەریی، لەنەخۆشخانەکەدا درووستنەکرابوو.

ڕۆژێکیان خیزانی پێشمەرگەیەک نەخۆش کەوت، هاتە نەخۆشخانە، پشکنینم بۆکرد، دەرکەوت دوچاری نەخۆشی منداڵ لەبارچوون بووە، خوێنبەربوونەکەی نەدەوەستایەوە، پێویستی بەنەشتەرگەری کورتاج بوو، لەبەرئەوەی شوێنی تایبەتی نەشتەرگەری نەبوو، بەشێوەیەکی کاتی ژووری تیشکم کرد بەشوێنی نەشتەرگەری، نەشتەرگەریەکەم بەسەرکەوتویی بۆ ئەنجامدا، نەخۆشەکەم لەناردن بۆ عێراق و ئێران رزگار کرد، ئەوە یەکەم جار بوو لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار، لەسەرکردایەتی، نەشتەرگەری وا بۆ نەخۆشی ژنانە بکرێت، ئەگەرچی زۆرینەی پێشمەرگە و بەرپرسەکان بەو نەشتەرگەریە خۆشحاڵبوون، بەڵام لەبەرئەوەی

نەشتەرگەریەکە بۆ نەخۆشی ژنانە بوو، وەک نەشتەرگەری دەرهێنانی گولەی پشتی پێشمەرگەکەی دەڤەری هەورامان، لەناو پێشمەرگەدا دەنگی نەدایەوە.

**سێ محەممەدی لەکۆڵ دەبێتەوە:**

د. سەردار تاڵەبانی لەنەخۆشخانەی رانیە پزیشکی ددان بوو، بەشداری خۆپیشاندانەکانی بەهاری ١٩٨٢ کوردستانی کردبوو، دوای پاشەکشێی خۆپیشاندانەکان، لەگەڵ برادەرێکی کارمەندی تەندروستیدا، لە نەخۆشخانەی شەهید دکتور بەختیار پەیوەندیان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد. ئەوە یەکەم جار بوو پزیشکی ددان ببێت بەپێشمەرگە، هاتنی د. سەردار خزمەتێکی گەورەی بە نەخۆشی ددانی پێشمەرگەو هاوڵاتیانی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان کرد.

دکتۆرێکی عەرەب هاتەلامان، خەڵکی بەسرە بوو، چەند پزیشکێکی تر هاتنە لامان، بەڵام لای ئێمە نەمانەوە بەرەو ئێران رۆیشتن، لەوێوە گەشتی دەرەوەی ولاتیان کرد، هەندێکیشیان کە دەیانبینی ژیانی پێشمەرگایەتی گرانە، زوو کۆلێیان داو دەگەڕانەوە. لەپایزی هەمان ساڵدا، هەردوو خوێندکاری هاوڕێی کۆلێژم، د. شوان و د. رێباز، لە نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار. پەیوەندییان بەهێزی پێشمەرگەوە کرد

د. شوان لەزانکۆ ناوی حەمەیوسف بوو، خەڵکی ئاکرێ بوو، لەهەولێر دەژیا، لە کۆلێژی پزیشکی هاوپۆل بووین، پێکەوە چالاکی سیاسیمان دەکرد، دەربارەی کێشە سیاسیەکان هەڵوێستمان لەیەکەوە نزیک بوو.

ناوی سیانی د. شوان لەزانکۆ، محەمەد یوسف محەمەد عەزیز محەمەد فازل بوو، لەکۆلێژ بەحەمە یوسف بانگ دەکرا، زۆر رقی لەناوەکەی خۆی دەبوەوە، لەزانکۆ هەوڵیدا ناوەکەی بگۆڕیت، دەیویست هەرچی محەمەد هەیە لە ناوی خۆی و باوکی و باپیری بکاتەوە، بەڵام چەند هەوڵی دا لە دادگا و لە تومارگە، تەنها توانی یەک محەمەد لە ناوەکەی خۆی بکاتەوە، محەمەد یوسفی گۆڕی بۆ یوسف.

که بوو بەپێشمەرگە، ناوی خۆی کرد بەد. شوان، بەدکتۆر شوان ناسرا، ئەو هەموو محەمەدەی لەکۆڵ بوەوە. ساڵی ١٩٨٦ لەگوندی کانی توی ناوچەی مەرگە، لەماڵی مستەفا چاوڕەش، لەگەڵ د. مەحمود عوسمان و مستەفا چاوڕەش و بێستونی مەلا عومەر، ژەهرخوارد کرا، بێستون و دایکی مستەفا چاوڕەش شەهیدبوون، ئەوانی تر چاکبوونەوە، دوای راپەڕین، د. شوان بۆ ماوەی چوار ساڵ، بوو بەوەزیری مافی مرۆڤی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

**نامەیەك بۆ دوو کەس:**

لەکاتی خوێندنی زانکۆدا، هەژار و نەدار بووم، دەستگیرانم نەبوو، دوای تەواوکردنی خوێندن، بووم بەپزیشک، سەردەمی هەژاریم تێپەڕاند، بووم بەهاوڕێی کچە کوردێکی جوان، خۆشەویستی لەنێوانماندا دروستبوو، ئامادەبوو وەک خۆم پێشمەرگایەتیی بکات، کاتێک بووم بەپێشمەرگە، لەسەر ئەوە رێک کەوتین، هەر کاتێک زانکۆی تەواوکرد، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکات، هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکات.

نامە گواستنەوە لەنێوانماندا هەبوو، شەوێک لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار، لەگەڵ دکتۆر شوان دانیشتبووین، باسی دەستگیران و خۆشەویستیمان دەکرد، حەماس گرتمی، نامەیەکم لەجانتاکەمدا دەرهێنا، دوو رۆژێک لەوەوبەر خۆشەویستەکەم بۆی ناردبووم، دەستم بەخوێندنەوەی کرد. کاتێک د. شوان گوێی لەنامەکە گرت، گومانی لادرووست بوو، پرسیاری لێکردم کە ئەو خۆشەویستەی تۆ فلان کچ نییە، منیش راست وەلامم دایەوە، وتم چۆنت زانی ئەو کەسەیە، وتی برارۆ، ئەوە خۆشەویستی فلان برادەری تریشمە، لەم رۆژانەدا نامەیەکی هاوشێوەی ئەو نامەیەی تۆی بۆ ئەویش ناردووە، ئەویش بۆی خوێندمەوە، لەبەرئەوەی زۆرێک لەوشەو دەستەواژەکانی هەردوو نامەکە، وەک یەک بوون، بۆیە کەوتمە گومانەوە و پرسیارم کرد.

د. شوان، ناوی هاوڕێکەی پێوتم، هەر لە سەردەمی زانکۆوە، لە ڕێگەی دکتور شوانەوە، دۆستایەتیم لەگەڵ جەلال جەوهەری هاوڕێی د. شواندا هەبوو، لەو کاتەدا جەلال کادری یەکێ لەتیپەکانی هێزی پێشمەرگە بوو، بۆ کارێک سەردانی بارەگای سەرکردایەتی کردبوو. لەسەر داوای من یەکترمان بینی و لەسەر ئەو بابەتە قسەمان کرد، هەردوولا بەو ئەنجامە گەیشتین، کە ئەو کچە لەیەک کاتدا، پەیمانی خۆشەویستی بەهەردووکمان داوە، لەگەڵ هەردووکمان ڕێک کەوتووە کە دوای ئەوەی خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە دەکات، هاوسەرگیریمان لەگەڵدا دەکات. ئیتر نەمانزانی کامەیانی بە ڕاست بووە، من و جەلال جەوهەر بڕیارماندا لێی دووربکەوینەوە، هەر واشمانکرد دوورکەتینەوە.

**هەڤاڵ کوێستانی:**

زۆرجار دوای تەواوکردنی ئەرکی نەخۆشخانە، سەردانی بارەگاکانی سەرکردایەتیم دەکرد، چاوم بەبرادەرانی سەردەمی شارم دەکەوت، یەک لەو برادەرانە هەڤاڵ کوێستانی بوو، هەڤاڵ هاوڕێی قۆناغی ئامادەییم بوو، هەر کە کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی سلێمانی تەواوکرد، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد. کە لەناوزەنگ هەڤاڵم بینی، زۆر دڵخۆش بووم، بەلام تا من لە پێشمەرگایەتیدا بەهەڤاڵ گەیشتمەوە، ناکۆکی و ململانێ ناڕەواکان، هەڤاڵی نیگەران و ڕەشبین کردبوو، هەڤاڵی سەردەمی ئامادەیی و زانکۆ نەبوو، هەڤاڵی سەردەمی هۆنراوە ئاگرینەکانی خەباتی ناو شارنەبوو، وتی: بمزانیبایە دێیتە دەرەوە هەواڵم بۆ دەناردی نەیەییت. بەو قسەیەی هەڤاڵ نیگەران بووم، بەلام بێدەنگیم هەڵبژارد، لەدڵی خۆمدا وتم: بەخوا هەزاری وەک تۆش قسەیان بکردایە و هەواڵیان بناردایە پەیوەندی بە هێزی پیشمەرگە نەکەم، من هەر دەهاتم و چەکی پێشمەرگایەتیم هەڵدەگرت.

بەلام هەر بیرم دەکردەوە بۆچی ئەو هەڤاڵە بەحەماسەی خاوەنی شعری مۆنیکا، نوسەری کتێبی ئافرەت و ژانی لەدایکبونێکی نوێ، ئەو هەڤاڵەی کە کۆلێژی تەواوکرد یەکسەر تا پێشمەرگایەتی نەوەستا، وایلێهاتوە بەمن بڵێت،

ئەگەر بمزانیبایە دێتە دەرەوە، پەیامم بۆ دەناردی کە نەیەیت. کە وردبوومەووە، بینیم ململانێی نارەوای ناو کۆمەڵە، پشتی هەڤاڵی شل کردوە، وا خەریکە لەنوسین دادەبرێت. لەململانێکانی ناو کۆمەڵەدا هەڤاڵ هاوسۆزی باڵی سالار عەزیزو مەلا بەختیار بوو، پێیوابو جۆری هەڵسوکەوت لەگەڵ باڵی داشعێراقی ناو کۆمەڵەدا دیموکراتی نییە، بەڵام وەک بڕوای سیاسی، لەگەڵ داش عێراقدا نەبوو، چەندان جار لەسەر ئەو مەسەلەیە گفتوگۆمان کرد. ئەو کاتە هەڤاڵ لەڕاگەیاندنی کۆمەڵەو لە ڕاگەیاندنی گشتی یەکێتی کاری دەکرد، لەسەر پارتی پێشڕەوی کرێکارانی کوردستان نامیلکەیەکی نووسیبوو، نامیلکەکەم خوێندەوە، بەلامەوە نوسینێکی گرنگ بوو، نامیلکەکە باسی لەپارتی پێشڕەوی کرێکارانی هەر چوار پارچەی کوردستان دەکرد.

ڕۆژێک لەسەر گرنگی ئەو نامیلکەیە، لەگەڵ فەرەیدون عەبدولقادر قسەم کرد، وتم نوسینێکی بەهێزە، بۆچی نوسینی هاوشێوەی ئەو نامیلکەیە لەسەر کوردستانیبوونی کۆمەڵە بڵاوناکەنەوە، بۆچی هانی هەڤاڵ نادەن بابەتی تر بنووسێت؟ فەرەیدون بەو قسەیەی من نیگەران بوو، وتی ئەو نامیلکەیەی هەڤاڵ سیاسی نییە، نووسینێکی ئەدەبییە.

**یەکەم دیدار:**

هەڤاڵ کوێستانی پێشنیاری بۆ کردم سەردانی مام جەلال بکەین، منیش پێمباش بوو، چەند ڕۆژێک چاوەڕوان بووین، مام جەلال بە ڕەزامەندی وەڵامی داینەوە. پێش ئەوەی بگەینە بارەگای مام جەلال، من و هەڤاڵ بە لای دووکانەکەی ئەحمەد ساروخدا تێپەڕین، کە بینیم لەدوکانەکەدا هەندێک دەرمان دانراوە، وەک پزیشک، لەسەر دەرمانەکان هەندێک ڕێنماییم بەئەحمەد ساروخ[١٩] دا، لەو کاتەدا پێشمەرگەیەکی قەڵەوی لەخۆڕازی دەمانچە بەقەد، لەمن و هەڤاڵ نزیک بوەوە، لەگەڵ هەڤاڵ دەستی بەقسەکرد، سەیرێکی منیشی کرد، کەبینی ڕێنمایی پزیشکی بەدوکاندارەکە دەدەم، وتی: سەیری

---

١٩ ئەحمەد ساروخ قاچاخچی و دوکاندارێکی گوندنشینی ئەو دڤەرە بوو، قاچاخی بە گولەی ساروخەوە کردبوو، بۆیە ناویاننابوو ئەحمەد ساروخ.

ئەمە ناکەیت ئەڵێی دکتۆرە. هەڤاڵ دەستی بەپێکەنین کرد، وتی نایناسی؟ ئەوە دکتۆر فایقە، هاوڕێی منە، تازە پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کردوە.

لەوێدا بۆ یەکەم جار عەلی شامارم ناسی، هەڤاڵ بەعەلی شاماری وت: دەمانەوێت بچین بۆ لای مام جەلال، تۆش لەگەڵمان وەرە، عەلی شاماریش بەسەردانەکەی لای مام جەلال رازی بوو، سەردانی مام جەلالمان کرد، مام جەلال بەگەرمی پێشوازی لەمن کرد، بەلام هەستم کرد لەو چاوپێکەوتنەی مام جەلالدا، عەلی شامار زۆر قازانجی کرد، لەوە دەچوو پێش ئەوە، مام جەلال لەعەلی شامار زوییر بووبێت، لەو چاوپێکەوتنەدا ئاشتی کردەوە.

**هەڵویستی دیار:**

ئەو کاتەی من لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار بووم، ئەندامانی کۆمەڵەی نەخۆشخانە، لەیەک شانەدا کۆبوونەوەمان دەکرد، بەرپرسی شانەکە مامۆستا ئەنوەر بوو، مامۆستا ئەنوەر یەکێک لەکادرە کۆنەکانی کۆمەڵەبوو، لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی نوێوە، پەیوەندی بەشۆڕشەوە کردبوو، لەلوبنان لای فەلەستینیەکان، پەروەردەی سەربازی دیبوو، بارەگای مامۆستا ئەنوەر لەگوندی شێنێ بوو.

مامۆستا ئەنوەر، کۆبونەوەیەکی بەمن و حەمە ئاوات و شاخەوان و نەریمان کرد، لەکۆبونەوەکەدا باسی هزری عێراقچێتی ناو کۆمەڵەی کرد، رەخنەی لە هزری عێراقچیەکانی ناو کۆمەڵە گرت، منیش لەدڵی خۆمدا وتم: کاتی ئەوە هاتوە منیش هەڵوێستی خۆم بەرامبەر بەعێراقی و کوردستانی ناو کۆمەڵە دیاری بکەم، خۆ ناکرێ من هەروا بمێنمەوە، لەبەرئەوەی برادەرانی عێراقی هاوڕێمن، گوێ لەقسەکانیان دەگرم و هیچ ناڵێم، وا دەزانن لەگەڵ ئەواندام، بەبۆچونەکانیان رازیم، هەرچی خەتە کوردستانیەکەشە، وا دەزانن من عێراقچیم، وەک رکابەری خۆییان سەیرم دەکەن، رقیان لێم دەبێتەوە.

کۆبوونەوەکەی ئەو رۆژەم بەدەرفەت زانی، هەڵوێستی خۆم لەسەر ململانێکانی ناو کۆمەڵە ئاشکرا کرد، پشتیوانی خۆم بۆ باڵی کوردستانی کۆمەڵە نیشاندا. دوای ئەو کۆبونەوەیە، چەندان جار لەنەخۆشخانە لەسەر

کوردستانیبون و عێراقیبوونی کۆمەڵە، لەگەڵ حەمە ئاوات و شاخەوان گفتووگۆمان کرد، راوبۆچونی جیاوازمان بەرامبەر بەرووداوەکان نیشاندا. ئەو هەڵویستەی من دژی باڵی داشعێراق، ئەوانی نیگەران کرد.

لەو کاتەدا ینک شەڕی سوپای عێراق و شەڕی براکوژی هێزە کوردیەکانی دەکرد، لەناوخۆشیدا کەوتبووە ناو ئەو ململانێ سیاسیەوە، بۆیە ژمارەیەک لەکادرو پێشمەرگەی کۆمەڵە، بەرگەی ئەو هەمو شەڕ و ململانێیەیان نەدەگرت، بەشێوازی جیاواز، دەستبەرداری خەباتی پێشمەرگایەتی دەبوون، دەگەرانەوە بۆ عێراق، یان گەشتی وڵاتانی ئەوروپایان دەکرد.

دوای ئەوەی هەڵویستی من لەسەر کوردستانی بوونی کۆمەڵە ئاشکرابوو، لەباڵی داش عێراق دوورکەوتمەوە، لەباڵی کوردستانی نزیک بوومەوە. یەکەم جار لەگەڵ هەڤاڵ کوێستانی سەردانی مام جەلالم کرد، پێشوازی مام جەلال گەرم بوو، بەلام هەر هەستم دەکرد پێشوازیەکە وەک پێویست نییە، هەستم کرد مام جەلالیش لەو باوەڕەدا بووە، کە من سەر بەباڵی داشعێراق بووبم، بۆیە زۆر بەقوڵی پرسیاری لێنەکردم، وەک میوانێکی ئاسایی بەڕێی کردم.

دوای ئاشکرابوونی هەڵویستی من لەسەر ململانێکانی ناو کۆمەڵە، پەیوەندیم لەگەڵ مام جەلادا زۆر بەهێزبوو، کە سەردانی نەخۆشخانەی دەکرد، گرنگی پێدەدام، جار جار بۆ بارەگای خۆی بانگی دەکردم، ڕێنمایی و هاوکاری دەکردم.

پەیوەندیم لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، ئاسایی بووەوە، بووم بەیەکێک لەو کەسانەی، سەردانی بارەگاکەییم دەکرد. لەگەڵ میوانەکانیدا دادەنیشتم، گوێم لەگفتوگۆکانیان دەگرت، جارێکاین سەردانی نەوشیروان مستەفام کرد، محەمەدی موهتەدی میوانی بوو، بەمحەمەدی مهتەدی برای عەبدوللای موهتەدی ناساندم، وتی ئەمە دکتۆر فایقە، ئەندامی کۆمەڵەیە، کوڕی شەهید حەمەگوڵپیە، پزیشکێکی زۆر زیرەکە.

**ملازم خوله:**

ئەو کاتەی گەیشتمە بارەگاکانی سەرکردایەتی، مقۆ مقۆی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراق دەستی پێکردبوو، رۆژ لەدوای رۆژ ئەو مقۆمقۆیە زیاتر دەبوو، منیش بەو هەواڵانە نیگەران دەبووم، دەترسام گفتوگۆ و رێکەوتن سەربگرێت، دوو ساڵ پێشمەرگایەتی نەکەم.

شانبەشانی گەرمبوونی دەنگوباسی گفتوگۆ، پەیوەندییەکانی نێوان ینک و حدکا گەشەی دەکرد، کار بەوە گەیشت، پێشمەرگەی ینک، شانبەشانی پێشمەرگەی حدکا، لەیەک سەنگەردا، دژی سوپای پاسدارانی ئێران شەڕبکەن.

ملازم خولە، فەرمانەدەیەکی هێزی پێشمەرگەی ینک بوو، دەرچووی کۆلێژی سەربازی سوپای عێراق بوو، فەرماندەی تیپی ٨٣ هەورێی ناوچەی خۆشناوەتی بوو، خەڵکی هەولێر بوو، لەشەڕێکدا دژی سوپای پاسداران، بەخەستی بریندار ببوو.

مام جەلال هەواڵی بۆ ناردم، سەردانی ملازم خولە بکەم، باری تەندروستی هەڵسەنگێنم و ئاگاداری بکەمەوە، منیش لەگەڵ پێشمەرگەیەک، بەرەو نەخۆشخانەکەی حدکا رۆیشتم، نەخۆشخانەکە نزیک گوندی کانی زەردی ناوچەی سەردەشت بوو، ملازم خولەم بینی، پشتی بریندار ببوو، دوچاری ئیفلیجی هاتبوو، نەیدەتوانی لاقەکانی بجوڵێنی، ئەو پزیشکانەی لەنەخۆشخانەکەی حدکا چارەسەری برینەکەی ملازم خولەیان دەکرد، کورد نەبوون، فەرەنسی بوون، سەر بەڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوری فەڕەنسا بوون.

دوای بینینی ملازم خولە، بە بەرپرسانی نەخۆشخانەکەی حدکا م وت: ئەگەر کارتان بەمن هەیە لێرە دەمێنمەوە، ئامادەم هاوکاری پزیشکە فەرەنسیەکان بکەم، بەرپرسانی نەخۆشخانەکە سوپاسیان کردم. کە گەڕامەوە، باری تەندروستی و شێوازەکانی چارەسەرکردنی ملازم خولەم بۆ مامجەلال باسکرد. بۆ تەواوکردنی چارەسەری برینەکەی، دوای ماوەیەک ملازم خولە گەینرایە ئەوروپا، لەئەوروپا تا چەند ساڵێک مایەوە، بە رووداوێ هاتووچۆ کۆچی دوایی کرد.

**هێزی پشتیوان:**

لەپایزی ساڵی ١٩٨٢ دا، پەیوەندی نێوان ینک و حدکا زیاتر پێشکەوت، هاوپەیمانی سەربازی لەنێوان پێشمەرگەی باشورو پێشمەرگەی رۆژهەڵاتی کوردستاندا دروستبوو، پێشمەرگەکانی ینک لەبەرەکانی شەڕی سوپای عێراق کشانەوە، بەرەو سنوری رۆژهەڵاتی کوردستان هاتن، ناویای نرا هێزی پشتیوان، واتە پشتیوانی پێشمەرگەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان دەکەن، دژی هێرشەکانی سوپای پاسدارانی ئێران، شانبەشانی پێشمەرگەکانی حدکا و کۆمەڵە، شەڕیان دەستپێکرد.

هەر لەو کاتەدا راگەیاندینی ینک، تەوەرێکی سیاسی کردەوە، وتاریان لەسەر دەنوسی و قسەیان لەسەر دەکرد، تەوەرەکە بەم پرسیارە دەستی پێدەکرد، ئایا مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە یان چەند مەسەلەیەک؟ وەڵامەکەی لە راگەیاندندا دەدرایەوە کە یەک مەسەلەیە. مەبەستی ڕاگەیاندنی ئەو کاتەی ینک ئەوە بوو: کێشەی کورد لەتەواوی ناوچەکەدا یەک ناوەڕۆکی هەیە، رزگاریی گەلی کوردە لەدەسەڵاتی داگیرکەرانی کوردستان، پێشمەرگەی کوردستان بەرپرسیارە بەرامبەر پاراستنی هەر پارچەیەکی کوردستان، ئەو شەڕەی ئەمڕۆ هێزی پشتیوان دەیکات، ئەرکێکی نەتەوەییە، شەڕیکی ڕەوایە. دارشتن و باسکردنی ئەو چەمکە نەتەوییانە، بۆ ئەوە بوو، ڕەوایی بە شەڕی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دژی سوپای پاسدارانی ئێران بدات، وە لەناو کادرو پێشمەرگەدا زەمینەی گۆڕانکاری بۆ ئەو ستراتیجە نوێیە خۆشبکات، بۆئەوەی کادرو پێشمەرگەی ینک، ئەو گۆڕانکارییە سەربازی و سیاسییە وەربگرن و هەرسی بکەن، بەرامبەر بەو سیاسەتە نوێیەی ینک، ناڕەزایی نیشان نەدەن.

لەسەر تەوەرەی مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە یان چەند مەسەلەیەک، مامجەلال، نەوشیروان مستەفا، فەرەیدون عەبدولقادرو رێکەوت عوسمان وتاریان دەنوسی. هەرچی باڵی عێراقی و داشعێراقی ناو کۆمەڵەبوو، دژی ئەم سیاسەتە نوێیەی یەکێتی دەوەستایەوە، بەسیاسەتێکی راستییان نەدەزانی، دەیانوت ئەو سیاسەتە نوێیەی ینک، تەکتیکە، بۆئەوەیە، پەیوەندی لەگەڵ دکتۆر قاسملۆ خۆشبکات، بۆئەوەی قاسملۆ نێوەندگیری نێوان ینک و حکومەتی عێراق بکات، تا گفتوگۆ دەستپێدەکات.

**له تیپی ۱۱ هەورامان:**

هێزی پێشمەرگەی ینک، لەهەموو ناوچەکانەوە، بۆ هاوکاری پێشمەرگەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بانگ کرا. تیپی۱۱ هەورامان، بەشێکی ئەو هێزەبوون، بە گەیشتنی تیپی ۱۱ هەورامان بۆ سنوورەکە، لە نەخۆشخانەی شەهید دکتور بەختیار سەردانیان کردم، دوای ئەوە بەرەو بەرەکانی شەڕ بەڕێکەوتن، بۆ ڕۆژی دوایی هەواڵێکی ناخۆشم بیست، لەشەڕی نێوان پێشمەرگەکانی تیپی یانزەی هەورامان و سوپای پاسداراندا، پێنج لەو پێشمەرگانە شەهید بوون، کە ڕۆژێک پێشتر میوانی من بوون. ناوی شەهیدەکان۱. فەیسەڵی مەلا عەلی ناسراو بەکاکە شێخ، فەرماندەی کەرت بوو. ۲. عومەر حەمە عەلی، ناسراو بەعومەر چاوجوان، فەرماندەی مەفرەزە بوو. ۳. سەعدی ئەبوبەکر، ناسراو بەسەعدی هەورامی، فەرماندەی مەفرەزە بوو. ٤-فاتح مستەفا، فەرماندەی مەفرەزە بوو. ٥-عزەدین محیەدین، پێشمەرگە بوو. تەرمەکانیان هێنرانەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی، بەشێوەیەکی کاتی لەگۆڕستانی گوندی شێنی نێژران، دواتر تەرمەکانیان بردنەوە بۆ زێدی خۆیان.

**میوانی مامە ریشە:**

دوای چەند ڕۆژێک لەبەردەوامبونی شەڕی نێوان ئێران و هێزی پێشمەرگەی ینک وهێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەبو شەهاب[۲۰] هات بۆ نەخۆشخانە، وتی: د. فایق من کراوم بەبەرپرسی کاروباری لۆجستی بەرەی شەڕ، دەمانەوێت مەفرەزەی پزیشکیشمان لەگەڵدا بێت، منیش زۆر حەزم دەکرد لەبەرەی شەڕ نزیک ببمەوە، دۆستایەتیشم لەگەڵ ئەبوشەهابدا باشبوو، وتم: خۆم لەگەڵتا دێم. ئەو کاتە د. شوان پێشمەرگە بوو، ئەو لەنەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار مایەوە، من لەگەڵ ئەبوشەهاب چووم بۆ بەرەی شەڕ.

---

۲۰ ئەبووشیهاب، پێشمەرگەی سەرەتایی شۆرشی نوێیە، کادری پێشکەتووی کۆمەلە بوو، خەڵکی کەرکوکە، ناوی ئیحسانە، ناوی پێشمەرگایەتی ئەبووشەهابە، یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانمە.

کاروبـاری کـارگێڕی بــەرەی شــەڕەکە، لەگونـدێکی ســنوری ڕۆژهــەڵاتی کوردستان بوو، چەند ڕۆژێک لەگوندەکە ماینەوە، ڕۆژێکیان ئەبوشەهاب وتی: دکتۆر ئەم نیوەڕۆیە میوانی مامە ڕیشەین، کە بنکەی کەرتەکەی مامە ریشەم بینـی، وەک مـاڵی ئاغـای لادێ وابـوو، تـا ئـەو کاتـە وامزانیبـوو مامـە ریشـە کەسێکی سادەیە، تەنیا دەزانێ تەقە بکات، بەڵام مامە ریشە پێشوازییەکی وای لێکـردین، خـواردنێکی وا خـۆش و بـەتامی بـۆ ئامـادە کـردین، لـەبیرکردنی زەحمەتە، لـەو میواندارییـەدا، مامـە ریشـە نیشـانیدا، نـەک تـەنها فەرماندەیـەکی سەربازی بەتوانایە، بەڵکو کەسێکی سیاسی و دبلۆماسیشە، لەو میواندارییەی مامە ریشەدا، بۆ یەکەم جار چەند جۆرێک کەمپووتم[٢١] خوارد.

**لە سەنگەری پێشەوە:**

بـۆ ڕۆژی دواتـر، ئەبوشــەهاب وتــی: بـا ئەمشــەو بچـین بـۆ سەرشــاخ، ســەردانی پێشــمەرگەکان بکـەین، لای نیـوەڕۆوە مـن و ئەبوشــەهاب و هیـوا قازانقایی، بەشاخدا سەرکەوتین، قەدپاڵی شاخەکە، پڕ لەکانی و چەم و ڕەز و باخ بوو، جوانیی سروشت کاریکردە سەر هەستی ئەبوشەهاب، ئـەبو شـەهاب ڕاوەستا، دەستی بۆ یەکێک لەباخەکانی قەدپاڵی چیاکە ڕاکێشا، وتـی: خۆزگـە تــەنیا بەهێنــدەی ڕووبــەری ئــەو باخچەیــەی قــەدپاڵی ئــەم شــاخە، خــاکی ئازادکراومان هەبوایە، لەو شوێنەدا کارگەم دادەنا، لـەولاترەوە ئۆتێل و بـارم دروست دەکرد، لەولایترەوە چێشتخانەو تیاترۆخانەم درووست دەکرد.

کــە چــەرخی زەمانــە بەســودی کــورد وەرگــەڕا، ڕاپــەڕین ســەرکەوت، ئەبوشـەهاب بۆ ماوەیـەک، لـە دەربەنـدیخان پارێزگـاری کەرکوک بـوو، بـەڵام نەیتوانی هیچ کام لەو خەونانەی جێ بەجێ بکات.

ئێوارە گەیشـتینە سـەنگەری پێشـمەرگە، شـەو لە سـەنگەرەکانی تیپـی ٣١ سلێمانی مـاینەوە، دانـای ئەحمـەد مەجید فەرماندەی تیپی ٣١ سلێمانی بـوو. پێشـمەرگەکان سـەنگەریان دروسـتکردبوو، سـەری سـەنگەرەکانیان گرتبـوو،

---

٢١ کەمپوت میوەی هەڵگیرای ناو قوتووە.

پێخەفیان پێبوو، شەو لەگەڵ پێشمەرگەکان خەوتین، ئەوە یەکەمجار بوو، لەگەڵ پێشمەرگەدا لەسەنگەری پێشەوە، بەرامبەر دوژمن بمێنمەوە و بخەوم. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاوو هەوا ساردی کردبوو، ئەو شەوە هەستم بەسەرما نەکرد.

**مایەسیری:**

لەسەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگەدا رۆژمان لێبوەوە، نانی بەیانیمان خوارد، ئەبوشەهاب وتی: با بڕۆین سەردانی بارەگای مام جەلال بکەین، لەسەر شاخەوە بەڕێگەیەکی تردا خۆمان بەرەو دەشتاییەک خلکردەوە، پێش خۆرنشین گەیشتینە ئەو گوندەی مام جەلالی لێبوو، ئەو شوێنە وەک بارەگای سەرکردایەتی فیلمی شەڕ وابوو، مام جەلال لەخانویەکدا بوو، لەڕەبایەی کۆنی سوپا دەچوو، بەدەوریدا چەندان خەیمە هەڵدرابوون. فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەی ینک لەوێ بوون، یەک لەوانە شەوکەتی حاجی مشیر بوو. شەوکەت کە منی بینی، بردمیە دەرەوەی خێمەکەی، بەچپە وتی: ئیشم پێتە، تا قسەکەی کرد، هەزار شتی خراپ بەبیرمدا هات، دەترسام بڵێت با تەسلیم بینەوە، کەمێکی تر دووریخستمەوە، وتی: دکتۆر وابزانم دوچاری مایەسیری بووم، کە وایوت ئۆخەیم کرد کە بابەتە نهێنیەکەی مایەسیری بوو، دواتر وتم با پشکنینت بۆ بکەم، پشکنیم بۆ کرد، وا دەرچوو، دووچاری نەخۆشی مایەسیری ببوو، درمانم بۆ نوسی و چاک بوەوە.

**پاسدار و بەرزانی:**

کە گەیشتینە بارەگا کاتیەکەی مامجەلال، خەریک بوو شەو دادەهات، بارەگا زۆر قەرەباڵغ بوو، منیش شوێنی خەوتنم نەبوو، بەسکرتێرەکەی مام جەلالم وت: بەڵکو بۆ ئەمشەو شوێنیکی نووستنم بۆ دابین بکەیت، چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد سکرتێر بانگم بکات و بلێت فەرموو لەو شوێنەدا بخەوە. تا درەنگانی شەو هیچ دیار نەبوو، وەڵامی نەدامەوە، کەوتمە گەڕان بەشوێن سکرتێردا، هێندە تاریک بوو، چاو چاوی نەدەبینی، گەیشتمە قەرەباڵغیەک،

گویم لەقسەی سکرتێرەکەی مامجەلال گرت، جنێوی بە من دەدا، دەیوت: نازانم چی لەو دکتۆرە بێقیمەتە واو وایە بکەم، ئەویش داوای شوێنی نوستنم لێدەکات، هەر کە قسەکەی تەواو کرد، چوومە سەر سەری، وتم: تۆ عەیب ناکەیت وا بەمن دەڵێیت، هەر ئێستە دەچم لای مامجەلال سکاڵا دەکەم، کابرای سکرتێر دەستی بەپاڕانەوە کرد و وتی: دەبێت بمبووری زۆر ماندووم، داوات لێدەکەم نەچیت بۆ لای مامجەلال، هەر ئێستە جێگەی نوستنت بۆ پەیدا دەکەم، ئەو شەوە لەگەڵ سکرتێرە جنێوفرۆشەکە ڕێکەوتین، جنێوەکانی بۆ مامجەلال نەگێڕمەوە، بەرامبەر بەو بێدەنگیەی من، جێگەیەکی گەرمی نوستنی بۆ پەیداکردم. ئەگەر بڕۆشتمایە بۆ لای مام جەلال، جنێوەکانی سکرتێرەکەیم بۆ بگێڕایەتەوە، بەدڵنیاییەوە گۆچانێکی تێدا دەشکاند. ئەو کاتانە دادگاو سزاو پەروەردەی ینک، بەرامبەر بەو کەسانەی لەناو هێزی پێشمەرگەدا سەرپێچیان دەکرد، تەنها گۆچانەکەی مامجەلال و قسە سوێرەکانی نەوشیروان مستەفا بوون.

بۆ ڕۆژی دوایی سەردانی مامجەلالم کرد، بەڵام ڕووداوەکەی شەوم بۆ نەگێڕایەوە، ماوەیەک لەگەڵ دەیان کادرو بەرپرسی تری ینکدا لە ژوورەکەی مامجەلالدا مامەوە، قسەیەکی دووبارە دەکردەوە کە بەلایەوە گرنگبوو، دەیوت لەم شەڕەدا کە سوپای پاسداران هێرشی کردۆتە سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، پێشمەرگەی پارتی شانبەشانی سوپای پاسداران، بەشداری شەڕیان کردوە، دەیوت دوان لەپێشمەرگەکانی پارتی، کە لەشەڕەکەدا دەستگیرکراون، بارزانین.

**پێڵاوەکانی قاسملۆ:**

هەر ئەو ڕۆژە عەبدولرحمان قاسملۆ سەردانی مامجەلالی کرد، ئەویش بۆ ماوەیەک لەگەڵ مام جەلال لەو ژوورەدا مایەوە، ڕاوبۆچوونییان گۆڕیەوە، دواتر هەردووکیان لەژوورەکە چوونە دەرەوە، نازانم بۆ کەناڵی ڕاگەیاندن

بوو؟ یاخود تەنها بۆ تۆمارکردن بوو، پێکەوە لەسەر خەباتی نەتەوەیی، گرنگی یەکێتی نەتەوەیی گەلی کورد، پەیوەندی یەک و حدکا، قسەیان کرد[٢٢].

ئەو شوێنەی مام جەلالی لێبوو، نزیک گوندی ساوان بوو، ئەو خانوەی مام جەلال کردبووی بەژووری جووڵە سەربازیەکانی بەرەی شەڕ، لەسەردەمی شای ئێراندا، بنکەی سەربازی سوپا بوو. ئەو رۆژەی قاسملۆ سەردانی مام جەلالی کرد، کە هاتە دەرەوە بۆئەوەی لێدوانی ڕاگەیاندنی هاوبەش بدەن، پێلاوەکانی قاسملۆ دیار نەمابوون، بە دیارنەمانی پێڵاوەکانی قاسملۆ، مام جەلال شپرزە بوو، بەڵام قاسملۆ زۆر گرنگی پێنەدا، دواتر جوتێک پێڵاویان بۆ قاسملۆ پەیداکرد.

دیارنەمانی پێلاو لەکاتی کۆبوونەوەی فراوانی بارەگا و مزگەوتدا، ببووە دیاردە، لەبەرئەوەی لەکۆبونەوە فراوانەکاندا، ژمارەیەکی زۆر پێلاو دادەکەنران، جاری واهەبو پێشمەرگە دەچووە دەرەوە، پێڵاوەکەی خۆی نەدەناسییەوە، پێڵاوی کەسێکی تری لەپێ دەکرد، جاری واش هەبوو پێشمەرگەی قوشمە، حەزی لەپێلاوی نوێ و باشی بەرپرسەکان دەکرد، بەمەبەست پێلاوی بەرپرسێکی لەپێدەکرد و بۆی دەردەچوو.

---

٢٢ لەو ساڵانەدا چەند جارێک لەتۆری کۆمەڵایەتی فەیسبوک، ڤیدیۆی ئەو قسانەی مام جەلال و قاسملۆم بینیەوە.

# ٧
# مەڵبەندەکان

لەگەڵ ئەبوشەهاب یەکدوو  رۆژ لەبارەگاکەی مامجەلال ماینەوە، دواتر بەرەو بنکەی لۆجستی بەرەی شەڕ گەڕاینەوە، هێندە لەبەرەی شەڕ نەماینەوە، لەوانەیە ١٠-١٢ رۆژ بوبێت. ئەبوشەهاب وتی:

دەگەڕێینەوە بۆ بارەگای سەرکردایەتی، بەم زووانە گۆڕانکارییەک دەبێت، ئاگادار دەکرێینەوە، وتم: گۆڕانکاریەکە چییە، وتی: مەڵبەند درووست دەکەین.

ئەو کاتەی من بووم بەپێشمەرگە، رێکخستنی هێزی پێشمەرگە لە چوارچێوەی تیپدا بوو، هەر ناوچەیەک یان قەزایەک تیپێکی پێشمەرگەی هەبوو، تیپ لە٣-٥ کەرت پێکهاتبوو، هەر کەرتەو ٢٠-٣٠ پێشمەرگە بوو. تیپ فەرماندەی سەربازی هەبوو، پێیان دەوت سەرتیپ، جێگری سەرتیپی هەبوو، رابەری سیاسی تیپ هەبوو، کۆمەڵەو بزوتنەوە و خەتی گشتی، لەسنوری تیپدا کاری رێکخستنیان دەکرد.

لەسنووری تیپدا، سەرتیپ بەرزترین دەسەڵات بوو، فەرماندەی تیپەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ، پەیوەندییان بەمەکتەبی عەسکەریەوە بوو. ملازم

عومەر بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری هێزی پێشمەرگەی ینک بوو، هەمو تیپێک رابەری سیاسی هەبوو، رابەری سیاسی پەیوەندی بەمەکتەبی سیاسی ینک بوو.

پێش تیپ رێکخستنی هێزی پێشمەرگە لەچوارچێوەی هەرێمدا بوو، هەر ناوچەیەک هەرێمێکی سەربازی هەبوو، ئەو هەرێمەش لەچەند کەرتێک پێکهاتبوو. ینک زووزوو گۆرانکاری لەشێوەی رێکخستنی هێزەکەیدا دەکرد. لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٢ دا، مەڵبەندی درووستکرد. لە سنووری چوار پارێزگاکەی کوردستان، چوار مەڵبەند دروستکرا، هەر پارێزگایەک مەڵبەندێکی هەبوو، مەڵبەندی ١ لەسنوری پارێزگای سلێمانیدا بوو، سەرەتا بارەگای لەشارباژێڕ بوو، دوای ئەوەی شەڕی ئێران - عێراق ناوچەی شارباژێڕی گرتەوە، بارەگای مەڵبەند گوێزارایەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ، تا ئەنفالی دوو، بارەگای مەڵبەندی یەک، لەناوچەی قەرەداغ بوو.

مەڵبەندی دوو لەسنوری پارێزگای کەرکوکدا بوو، بارەگای لەسەرگەڵو بوو، تا ئەنفالی یەک بارەگاکەی هەر لەوێ مایەوە.

مەڵبەندی سێ لەسنوری پاریزگای هەولێردا بوو، بارەگای لەگوندەکانی ناوچەی خۆشناوەتی بوو، تا ئەنفالی پێنج، بارەگای لە گوندەکانی خەتێ و بالیسان و سماقوڵی مایەوە.

مەڵبەندی چوار سەر بەپارێزگای دهۆک بوو، بەهۆی شەڕ و ململانێی نێوان پدک و ینک وە، بەهۆی دووری ئەو مەڵبەندەوە لەسەرکردایەتی ینک، مەڵبەندەکە وەک مەڵبەندەکانی تر، جێگەی خۆی نەگرت.

خاڵێکی تری ئەرێنی مەڵبەندەکان، دابەشکردنی دەسەڵاتی ناوەند بوو بەسەر ناوچەکاندا، بەرپرسانی مەڵبەند ئەندامی سەرکردایەتی ینک بوون، کۆمەڵێک دەسەڵاتیان پێدرابوو، لەوەو پێش ئەو دەسەڵاتانە تەنیا مافی سکرتێر و مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری ینک بوو.

خاڵێکی تری ئەرێنی مەڵبەندەکان، دەسەڵاتەکان لەنێوان ئەندامانی مەڵبەندا دابەشکرابوون، وەک تیپ و هەرێم نەبوو، هەمو دەسەڵاتەکان بەدەست فەرماندەیەکی سەربازیەوە بێت، دەسەڵاتی یەکەمی مەڵبەندەکان لای

ئەندامانی سەرکردایەتی بوو، ئەندامانی سەرکردایەتی کادری سیاسی بوون، سەربازی نەبوون.

هەر مەڵبەندێک لەچەند بەشێک پێکهاتبوو، بەرپرسی بەشەکان ئەنجومەنی مەڵبەندییان پێکدەهێنا، بەشی سیاسی، بەشی سەربازی، بەشی کۆمەڵایەتی، بەشی دارایی، بەشی ڕاگەیاندن. بەرپرسی سەربازی مەڵبەند، وەک هەر ئەندامێکی تری ئەنجومەنی مەڵبەند دەسەڵاتی هەبوو.

هەر یەک لەو مەڵبەندانە نەخۆشخانەی هەبوو، پزیشکێک یان دو پزیشک لەگەڵ ژمارەیەک کارمەندی تەندروستی کاریان تێدا دەکرد، بەشی تەندروستی مەڵبەند، لەلایەن بەشی کاروباری کۆمەڵایەتی مەڵبەندەوە، سەرپەرشتی دەکرا.

هەر مەڵبەندێک دادگا و حاکمی خۆی هەبوو، دادگاش سەر بەبەشی کاروباری کۆمەڵایەتی مەڵبەند بوو.

زۆربەی بەشەکانی مەڵبەندەکان کەوتنە سەر پێ، کاری خۆیانیان بەڕێوەدەبرد، تەنها بەشی ڕاگەیاندنی مەڵبەندەکان نەبێت، لەبەر نەبوونی پێویستییەکانی ڕاگەیاندن، یان لەبەر هۆکاری تر بوبێت، بەشی ڕاگەیاندنی مەڵبەندەکان بەساوایی لەشوێنی خۆیدا مایەوە، ڕاگەیاندنی ناوەندیی ینک، ئەرکی ڕاگەیاندنی هەموو مەڵبەندەکانی ئەنجام دەدا.

**ملازم عومەر و سەرتیپەکان:**

ملازم عومەر بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری ینک بوو، کەسێکی سەربازی بوو، دەرچووی کۆلێژی سەربازی سوپای عێراق بوو، لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگایەتی کردبوو، تیئروانین و هەڵویستی، دەربارەی پەیوەندی نێوان حزبە سیاسیەکانی کوردستان، دەربارەی ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵەو ینک، سەربازی نەبوو، سیاسی بوو، حزبی نەبوو، نەتەوەیی بوو. بەردەوام دژی شەڕی ناوخۆ دەوەستایەوە، زۆربەی کات بەشداری شەڕی ناوخۆیی نەدەکرد. بەرامبەر بەناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵە، هەوڵی چارەسەری

دیموکراتیانـــەی کێشـــەکانی دەدا، خـــۆی نـــەدەکردە لایـــەنگری هیچکـــام لەدەستەکان. لەکاتی شەڕی ناوخۆییدا خیشی[23] دەکرد، لەو کاتەدا کە مـلازم عـومەر خیشی دەکرد، نەوشـیروان مسـتەفا یـان مامجـەلال، یـان بەرپرسـێکی تری ینک، جڵەوی هێزی پێشمەرگەیان بەدەستەوە دەگرت. بەڵام مـام جـەلال و نەوشـیروان مسـتەفا، ئـەو هەڵوێسـتانەی مـلازم عومـەریان پێهەرسـدەکرا، تێگەیشتنیان بۆ هەڵوێستەکانی هەبوو، لەگەڵیدا هەڵیاندەکرد.

لەبەر ئەوەی پیشـەکەی مـن راسـتەوخۆ پەیوەنـدی بە برینـی پێشـمەرگەوە بـوو، خەریکـی چارەسـەری نەخۆشـی و برینـی پێشـمەرگەبووم، جارجـارەش لەگەڵ پیێشـمەرگەدا بەشـداری ئێشـگری و کەمـین گـرتن دەبـووم، هەنـدێک جـاریش راسـتەوخۆ لەگەڵ هێـزی پێشـمەرگەدا بەشـداری شـەڕم دەکـرد، پەیوەندیم لەگەڵ ملازم عـومەر و بەرپرسـی بەشـی سـەربازی مەڵبەندەکان و سـەرتیپەکاندا باشـبوو. مـاوەیەک وەهـابی سـەرتیپی تیپـی ٣١سـلێمانی بـوو، رێگەی نەدەدا هیچ کادرێک کۆبـوونەوە بە پێشـمەرگەی تیپەکەی بکـات، تەنهـا کادر کە بۆ ماوەیەک بەرپرسی رێکخستنی تیپی ٣١ سلێمانی بوو، مـن بـووم، ئەو ماوەیە کۆبوونەوەم بە پێشمەرگەکان دەکرد، پەیوەندیشم لە گەڵ وەهابدا زۆر باشبوو، رۆژێکیان لەبارەگـای تیـپ لەگەڵ وەهابـدا دانیشـتبووین، وەهـاب رۆژنامەی ریبازی نوێی بە دەستەوە بوو، دەیخوێندەوە، کە کـاتی نـانخواردن هـات، وتـی دکتـور دەتـوانین ئەم رۆژنـامەیە بکەیـن بە سـفرە، وتـم بـۆ نـا، بـا بیکەیین بە سـفرەی خـواردن، زۆر دڵـی بەو هەڵوێسـتەی مـن خۆشـبوو، وتـی بەخوا پیاوی .

**نەخۆشخانەی شەهید دکتور رێباز:**

دوای ئـەوەی لەبـەرەی شـەڕ گەڕاینـەوە، فەرەیـدون عەبدولقادری ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی ینـک، سـەردانی نەخۆشـخانەی شـەهید د. بـەختیاری کـرد،

---

[23] خیش: وشەیەکی کوردی ناوچەی شارباژێرە، بە واتاین مانگرتن و توورەبوون دێت.

بەمنی وت: دکتۆر ئاگاداری مەڵبەندمان درووستکردووە، وتم: بەڵێ، وتی: بێجگە لەمەڵبەندی دوو، هەموو مەڵبەندەکان دکتۆریان هەیە، یەکێک لەدکتۆرەکانی ئێرە (نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار) بنێرە بۆ نەخۆشخانەی مەڵبەندی دوو، منیش یەکسەر وتم: من خۆم دەچم، فەریدون وتی: ئاخر ئێمە لێرە ئیشمان بەتۆهەیە، دکتۆرێکی تر بنێرە، من هەر لەسەر بڕیارەکەی خۆم سوور بووم، وتم: کاک فەرەیدۆن بەرپرسی مەڵبەندی دوو کەسێکی کرێکارە، بۆیە من حەز دەکەم بچم بۆ ئەو مەڵبەندە، بۆئەوەی پشتیوانی لەسەرخستنی سەرکردەیەکی کرێکاری بکەم.

ئەو کاتە من کۆمەڵە بووم، بڕوام وابوو شۆڕشگێڕترین چینی کۆمەڵگا، چینی کرێکارە، لەناو چەپەکاندا کرێکار رێز و خۆشەویستی تایبەتی هەبوو، لەبەرئەوەی خۆشم لەبنەماڵەیەکی هەژار بووم، کرێکاریشم کردبوو، هێندەی تر هەژار و کرێکارم خۆشدەویست، بۆیە بەقەناعەتەوە حەزم دەکرد بچمە مەڵبنەدی دوو، لەبەرئەوەی عەلی بچکۆلی کرێکار و ئەندامی سەرکردایەتی ینک، بەرپرسی ئەو مەڵبەندە بوو.

لەو کاتەدا د. شوان لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار بوو، د. تارقی (د. رێباز) هاوپۆل و هاوڕێم، کە لەزانکۆ پێکەوە کاری رێکخستنمان دەکرد، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کردبوو، ئەویش لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار بوو، هەرسێکمان پێکەوە کارمان دەکرد. دەمتوانی یەکێک لەوان بنێرم بۆ مەڵبەندی دوو، خۆ ئەگەر د. تارقم بناردایە باشتر دەبوو، لەبەرئەوەی د. تارق خەڵکی کەرکوک بوو، مەڵبەندی دووش لەسنوری پارێزگای کەرکودا بوو، بەڵام ئەو تێگەیشتنەی ئەو کاتە من بۆ سیاسەت و کرێکارو زەحمەتکێش هەمبوو، کە کرێکار جێگەی متمانەی خەڵکە، دەبێت رۆشنبیر پشتگیری بکات، وایلێکردم کە داواکەی سەرکردایەتی ینک رەتبکەمەوە، خۆم ببمە پزیشکی مەڵبەندی دوو.

دوای چەند ڕۆژێک، هەردو هاوڕێکەی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵم بەجێیهێشت، لەگەڵ ئەنجوومەنی مەڵبەندی دوو، بەرەو سەرگەڵو بەڕێکەوتین، کە گەیشتمە سەرگەڵو، نەخۆشخانەیەکم کردەوە، ناوم نا نەخۆشخانەی شەهید دکتور ڕێباز[٢٤].

**مەڵبەندی دوو:**

ئێوارەی ڕۆژی ٣-١٢-١٩٨٢ه لەگەڵ ئەنجومەنی سەرکردایەتی مەڵبەندی دوو، لەگوندی شێنێ وە، بەرەو سنوری قەلادزێ بەڕێکەوتین، بەرپرسی مەڵبەندی دوو عەلی بچکۆل بوو، ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەبوو، پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگە زیندانی سیاسی بوو، خەڵکی کەرکوک بوو.

ڕابەر سیاسی مەڵبەند، ئاوات عەبدولغەفور بوو، کادری پێشکەوتوی کۆمەڵەبوو، لەبنەرەتا خەڵکی خانەقینە، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر لەسلێمانی ژیابوو، بەخەڵکی سلێمانی ناسرابوو، ئەویش پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگە، زیندانی سیاسی بوو.

بەرپرسی سەربازی مەڵبەندی دوو، مستەفا چاو ڕەش بوو، کادری پێشکەوتوی کۆمەڵەبوو، پێشمەرگەی کۆن بوو، پێشتر لەقەرەداغ فەرماندەی هەرێم بوو، خەڵکی سلێمانی بوو.

بەرپرسی بەشی دارایی مەڵبەند، شێخ دارا حەفید بوو، سەر بە خەتی گشتی* بوو. بەرپرسی بەشی کاروباری کۆمەلایەتی مەڵبەند، شێخ محەمەد سەرگەڵویی بوو، سەر بە خەتی گشتی بوو. بەرپرسی ڕاگەیاندنی مەڵبەند، شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە بوو، سەر بە خەتی گشتی بوو.

ئەو شەوە سنوری قەلادزێمان تێپەڕاند، لەگوندی نورەدین کەمێک پشوومانداً، زۆر خەومان دەهات، پێخەفمان پێنەبوو، گوندەکەش چۆڵ بوو، چوینە خانویەکی چۆڵەوە، چەند فەردە گەنمێکی لێبوو، لەسەر فەردە

---

٢٤ دکتور ڕێباز، یاریدەدەری پزیشکی بوو، برای شەماڵ فەرمانده‌ی تیپی ٩٣ کۆیە بوو، دوای ئەوەی بوو بەپێشمەرگە، لەشەڕێکدا شەهید بوو.

گەنمەکان کەوتین بۆئەوەی خەومان لێبکەوێت، بەڵام بڕوا ناکەم ئەو شەوە کەسمان خەوی لێکەوتبێت. بۆئەوەی بۆ دوژمن ئاشکرا نەبین، پێش رووناکی رۆژ، گوندەکەمان بەجێهێشت، بەرەو مەرگە بەڕێکەوتین.

کاتێک بەرەو مەرگە دەڕۆیشتین، لەبەرزاییەک دەچوینە خوارەوە، ئاوات عەبدولغەفور لەسەر باری تەندروستی خۆی پرسیارێکی لێکردم، وتی: دکتۆر نازانم بۆ جار جار ئەم مەچەکەم ئازارم دەدات؟ دوای ئەوەی بەدەم رۆیشتنەوە سەیری مەچەکیم کرد، منیش پرسیارم لێکرد: ئایا لەڕابوردوودا هیچ فشارێک بەر مەچەکت کەوتوە؟ ، وتی: بەڵێ، کاتێک لەزیندانندا بووین، چەندین جار کەلەپچە کراوم، چەند جارێکیش بەدەست هەڵیانواسیوم، وتم: ئەو کەلەپچەکردن و هەڵواسینە، هۆکاری ئەم ئازارەی ئێستای دەستتە، زۆری پێخۆشبوو کە من واموت، دواتر کۆڵەپشتی دەرمانەکەمم کردەوە، دەرمانێک پێدا، وتم ئەوە بخۆ چاک دەبێتەوە. ئازاری مەچەکی ئاوات، بەو دەرمانە چاک بوەوە، لەو کاتەوە ئاوات عەبدولغەفور، بڕوای بەتوانای پزیشکی من پەیداکرد، بەپزیشکێکی سەرکەوتوی دەزانیم، هەر کێشەیەکی تەندروستی هەبوایە، سەردانی دەکردم.

**خانوەکان دەسووتێنن:**

ماوەی چەند رۆژێک لەمەرگەو گوندەکانی دەوروبەرداماینەوە، لەو ماوەیەدا، پێشمەرگەی تیپەکان دەهاتن بۆ لامان و دەمانەوە، فەرماندەکانیان لەگەڵ بەرپرسانی مەڵبەند کۆبونەوەیان دەکرد.

بە هێزێکی زۆرەوە بەرەو بەرگەڵو و سەرگەڵو بەڕێکەوتین، شەو گەیشتینە سەرگەڵو، ماڵی باوکی شێخ محەمەد لەسەرگەڵو بوو، ئەنجومەنی مەڵبەند، بووە میوانی ماڵی باوکی شێخ محەمەد، بەڵام میوانێکی درێژ خایەن، مانگێک زیاتر لەلای پورە فاتم و شێخ مەحمود (دایک و باوکی شێخ محەمەد) ماینەوە.

ئەو شەوەی گەیشتینە سەرگەڵو، خانووی ئیسلامیەکانیان سووتاند، خانوی ئیسلامییەکان ئەو خانوانە بوون کە لەشکری ئیسلامی ساڵی ١٩٨١ لە

بەرگەڵـو، بـۆ بارەگـا درووسـتی کـردن، دوای ئـەوەی لەشـکری ئیسـلامی هەڵوەشـایەوە، خانوەکـان بـەچۆڵی مابوونـەوە، دەکـرا مەڵبەنـد سـوود لـەو خانوانە وەربگرێت، بۆ بارەگای خۆی بەکاریان بێنێت، بەڵام ئەو شەوەی ئێمە گەیشتینە سەرگەڵو، خانوەکانی بەرگەڵو ئاگریان تێبەردرا.

گومان هەبوو ئەو هێزەی پارتی و حسک و پاسۆک، ئەو کارەیان کردبێت کە لەو ناوەدا دەسووڕانەوە، بۆئەوەی ینک نەتوانێت ئەو خانوانە بۆ بنکەو بارەگای مەڵبەند بەکاربهێنێت.

**لە لێواری براکوژیەکی تردا:**

هـەر کـە گەیشـتینە نزیـک سـەرگەڵو، هێزێکـی زۆری پـدک و حسـک و پاسـۆکمان بینـی، بـە گونـدەکانی ناوچەکـەدا دەگەڕان، مـاوەی چەنـد رۆژێـک هێزەکـەی ئێمـە و هێزەکـەی ئـەوان، لـەنێوان گوندەکانی سـەرگەڵو، هەڵـەدن، مالومە و یاخسەمەردا هاتووچۆمان دەکرد و بەرامبەر یەکتری دەوەستاینەوە و هێزمـان نمـایش دەکـرد. رۆژێکیـان هـەردوو هێزەکـە لـەنێوان هەڵـەدن و مالومەدا، بەرامبەر یەکتری وەستان، خەریک بوو شەڕ درووستببێت.

لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر شەڕ درووستببێت، لەوانەیە یەکێک لەوانەی بەگولەی پێشمەرگەکانی پدک شـەهید بکرێت من بم، لەدڵی خۆمدا دەموت، ساڵێک لەمەوبەر نامقی برام لەناوچەی شارباژێر لەشەڕی نەگریسی براکوژیدا، بەدەستی پێشمەرگەکانی ینک شـەهیدکرا، تۆ بڵێی ئەم جارە لەم شـەڕەدا مـن بەگولـەی پێشـمەرگەکانی پـدک شـەهید نەکـرێم، ئیتـر شـەڕی براکوژی نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردسـتان، تـەنیا بەمـەجازی نەمێنێتـەوە، لەناوەڕۆکیشـدا، بـەکردەوە لـەناو بنەماڵـەی ئێمـەدا، ببێت بەشـەڕی براکـوژی راستەقینە.

سـوارە جاسـەنەیی[٢٥] فەرمانـدەی هێزەکـەی پـدک بـوو، خـەڵکی گونـدی جاسـەنەی نزیـک قـەزای دوکـان بـوو، لەڕێگـەی خـەڵکی ناوچەکـەوە، دەرگـای

---

٢٥ دواتر سوارە جاسەنەیی کوڵی داو خۆی رادەستی حکومەتی عێراق کردەوە.

گفتوگۆی لەگەڵ هێزەکەی ینک کردەوە، پەیامێکی نارد، داوای گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەی کردبوو. لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، هەردوو هێزەکە دان بەخۆیاندا بگرن، دواتر هێزەکەی پارتی و حسک و پاسۆک ناوچەکە بەجێ بێلن، پاش چەند رۆژێک هێزەکە ناوچەکەی چۆل کرد، ئاوێک بەئاگرەکەدا کرا، شەڕ درووست نەبوو.

**قاله دێگەڵ:**

پاش ئەو گرژی و خۆ سوورکردنەوە کاتییە، هێزەکەی پارتی و حسک و پاسۆک، بەرەو ناوچەی شارباژێڕ کشانەوە، ناوچەی جافایەتی بۆ هێزەکەی ینک مایەوە. مەڵبەند دەستی بەکارەکانی خۆی کرد، هەر بەرپرسێک لەسەرگەڵو خانویەکی گرت، لەو خانوەدا کاروباری بەشەکەی خۆی بەڕێوەدەبرد. دوای ئەوە بەرپرس و ئەندامانی مەڵبەند، بەرنامەی بەسەرکردنەوەی دۆست و لایەنگرانی ینکیان دەستپێکرد.

یەکەم جار، سەردانی ماڵی حاجی قادر (قاله دێگەڵ)مان کرد، حاجی قادر هاولاتیەکی گوندی مالومە بوو، دۆستی نزیکی ینک بوو، بەقسەی خۆش و هەجوی کۆمەلایەتی ناسرابوو، بەرپرسی مەڵبەند بەمنی وت: سەردانی حاجی قادر دەکەین، لەبەرئەوەی حاجی نەخۆشە، تۆش لەگەڵمان وەرە.

ئەو زستانە لەباتی قەمسەڵە، کۆڵەباڵێکی ناوچەی هەورامانم لەبەرکردبوو، کۆڵەپشتێک دەرمانیشم بەکۆڵەوە گرت، لەگەڵ بەرپرسەکانی مەڵبەند، سەردانی ماڵی حاجی قادرم کرد، دوای بەخێرهێنان و چاک و چۆنی، لەحاجی قادر نزیکبوومەوە، حاجی تەنگە نەفەس بوو، ڕەنگی شین هەڵگەڕا بوو، لاقەکانی ئاوسا بوون، بۆمدەرکەوت دووچاری نەخۆشی سستی دڵ بووە. لەناو کۆڵەپشتەکەمدا دەزگای فشارپێوی خوێنم دەرهێنا، فشاری خوێنیم پێوا، بەسەماعەی پزیشکی، گوێم لەترپەی دڵ و دەنگی هەناسەدانی گرت، ئەنجامی پشکنینەکەش بەتەواوی ساخیکردەوە، حاجی دووچاری نەخۆشی سستی دڵ بووە.

تێبینــیم کــرد حــاجی گرنگــی بەپشــکنینەکەی مــن نــادات، گرنگــی بەنەخۆشییەکەی خۆشی نادات، سەبارەت بەو ساردوسڕییەی حاجی قادر، بەرامبەر پشکنین و ڕێنماییەکانم، لە دڵەوە نیگەران بووم، لەلایەکی تریشەوە بەزەییم بەحاجی قادردا دەهاتەوە، کە دووچاری ئەو نەخۆشیە بووە و وەک پێویست چارەسەری نەخۆشیەکەی وەرناگرێت.

پشـکنینی پزیشـکی خـۆمم تـەواوکرد، وامـدەزانی دوای ئەوە بەرپرسـانی مەڵبەند، سیاسەتی نوێی ینک و پێکهێنانی مەڵبەندەکان، بۆ حاجی قادر باس دەکەن، کەچی پەنایان بۆ گاڵتەپێکردنی حاجی برد. حاجی قادر پیاوێکی سـەیر بـوو، هـەر کـەس پێـی بوتایـە قالەدێگـەل، دەیـوت داکـت دەگـێم، پێشمەرگەکان دەیانگێڕایەوە، ڕۆژێک لەمزگەوتەکەی مالومە بانگیداوە، لەکاتی بانگدانـدا، پێشـمەرگە لێـی نزیکبوونەتـەوە، پێیـانوتوە قالەدێگـەڵ، ئـەویش بانگەکـەی نـەبڕیوە، بـەڵام لـەناو بانگەکـەدا، لەسـەر کێشی بانگەکە، دێڕێک جنێـــوی بـــۆ بانگەکـــە زیـــادکردوە، وتویـــەتی داکتـــان دەگێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێم.

خولە کۆمەڵە و ئاوات عەبدولغەفور، زەمینەیەکیان رەخساند کە من بڵێم دێگەڵ، بەرامبەر بەو دێگەڵەی من، حاجی قادر دەستی بەجنێودان کرد. دواتر وتـی: ئـەم کابرایـە بـۆ ئـەم کوڵەباڵـەی لەبـەرکردوە؟ ئـەڵێی هەورامییـە؟ ، بـرادەران وتیان بەڵی هەورامییە، حاجی وتی: لەبەیانیەوە ئێوە دەڵێن ئەمـە دکتۆرە، ئێستەش دەڵێن هەورامییە، ئەی ئەگەر هـەورامی بێت چۆن دکتۆرە؟ دواتـر دەسـتیکرد بـەجنێودان بەهـەورامی، دوای ئـەوە حـاجی بڕێکـی زۆر جنێویدا، ماندوبوو، منیش وتم: حاجی دێگەڵ، هەر کە وام وت: ریزێکی تر جنێوی پێدام، دواتر وتـم: ڕاست نییە بەو شێوەیە قسە بەهەورامی دەڵێیت، هــەورامی پێکهاتەیــەکی زیــرەک و ســەرکەوتووی کۆمــەڵگای کوردســتانە، لەبەرئـەوەی لـەناو خـەڵکی ناوچەکـەی خۆتاندا پزیشـک هەڵنەکـەوتووە، ئێمـە لەهەورامانـەوە هـاتووین خزمـەتی ئێـوە بکـەین، نابێـت بـەجنێو پێشـوازیمان لێبکەن، دواتر وتم: بۆ زانیاریت، ئەم شوێنەی ئێمەی تێدایە، سنوری قەزای

دوکانـه، ئـەم قەزایـە دوو دەسـەڵاتی تێدایـە، دەسـەڵاتی حکومـەتی عێـراق و دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە، لەناوهەردوو دەسەڵاتەکەشدا، دوو دکتـۆر هەیـە، ئـەو دوو دکتـۆرە کـە چارەسـەری نەخۆشـەکانی ئێـوە دەکـەن، هـەردووکییان هەورامین[٢٦].

**شەڕی هاوڕێکان:**

ینـک لەسـنوری ناوچـەی جافایـەتی، بەتایبـەتی لەگونـدی سـەرگەڵو خۆشەویست نەبوو، لەبەرئەوەی لەماوەیەکی کورتدا، لەودەڤەرە دوو شـەڕی براکـوژی خوێنـاوی کردبـوو، لەهـەردوو شـەڕەکەدا، ینـک پـەلاماردەر بـوو. شـەڕی یەکـەم پیلانگێـری دژی شـێرکۆی شـێخ عـەلی، فەرمانـدەی هێـزی پێشمەرگەی حسک بوو، لەو شەڕەدا شێرکۆ و براکانی شەهید کران، شـەڕی دووەم دژی لەشکری ئیسلامی کوردستان بوو.

شێرکۆ خەڵکی گوندی سەرگەڵو بوو، خزمی شەهید عەلی عەسکەری بوو، دوای جیابونەوەی بزوتنەوەی سۆسیالیست لەینک، شێرکۆ فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی حسک بوو.

ئـەو زانیارییانـەی لەپێشـمەرگە و کـادرانی ینـک، دەربـارەی شـەهیدکردنی شێرکۆی شێخ عەلی و براکانی وەرمگرتبوو، بـەو شـێوەیە بـوو، سـاڵی ١٩٨١ یـەکێتی بڕیاریـدابو بـەپیلانێک شـێرکۆ لەناوبـەرێت، لـەو کاتـەدا جـەمالی عـەلی بـاپیر فەرمانـدەی هـەرێمی چـواری ینـک دەبێـت، سـەرکردایەتی ینـک داوا لەجـەمال دەکـات دەعـوەتی شـێرکۆ بکـات، لـەکاتی دەعوەتـدا بیکوژێت. وەک دەگێرنـەوە جـەمالی عـەلی بـاپیر، بـەو پلانـە رازی نـەبووە، بـەڵام بـەزۆر سەپاندویانە بەسەریدا، کاتێک دەعوەتنامەکە لە جەمالەوە بۆ شـێرکۆ دەچێت، شـێرزادی برابچـووکی شـێرکۆ، بەبراگەورەکـەی دەڵێت، کاکـە بـا نـەڕۆین، نەوەک فێڵمان لێبکەن و بمناکوژن.

---

٢٦ لەو کاتەدا د. فازل کوری مامۆستا حەمەمین هەورامی پزیشکی قەزای دوکان بوو.

پەیوەندی نێوان جەمال و شێرکۆ هێندە دۆستانە بووە، شێرکۆ گوێ بەوریاکردنەوەی براکەی نادات، بۆ دەعوەتەکەی جەمال دەڕوات، کاتێک دەگەنە شوێنی دەعوەتەکە، شێرزادی برای شێرکۆ لەدوورەوە دەوەستێ، ناچێتە ناو دەعوەتەکە، کە ڕووداوەکە دروستدەبێت، تەقە لەشێرکۆ و براکانی تری دەکرێت و دەکوژرێن، لەهەمان کاتدا شێرزادی برای شێرکۆ، تەقە لەجەمال و پێشمەرگەکانی ینک دەکات، ژمارەیەکیان لێدەکوژێت و دەردەچێت.

کاتێک من لەشار بووم، هەواڵی ئەو ڕووداوە جەرگبڕەم بیست، هەموومان وەک کۆستمان کەوتبێت وابوو، سەرتاپای خەڵکی کوردستان بەدۆست و لایەنگیری ینکیشەوە، ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی شەرمەزار دەکرد، زۆربەی کادر و پێشمەرگەی ینک، ئەو پیلانگێرییەی ینک یان بەڕاست نەدەزانی.

شەڕی دووەمی خوێناوی ینک لەو ناوچەیەدا، پەلاماری بارەگاکانی لەشکری ئیسلامی بوو، لەتەموزی ١٩٨٢دا، هێزی پێشمەرگەی ینک، پەلاماری بارەگاکانی لەشکری ئیسلامی دا، ژمارەیەک پێشمەرگەی هەردوو لا شەهید بوون، شێخ زراری بەرپرسی لەشکری ئیسلامی، لەشێخەکانی ئەو دەڤەرە بوو، بەبریندراری بەدیل گیرا.

بۆیە یەکێک لەکارە گرنگەکانی مەڵبەندی دوو، ئاشت کردنەوەی خەڵکی دەڤەرەکە بوو، عەلی بچکۆلی بەرپرسی مەڵبەند، خۆی خەڵکی ئەو دەڤەرە بوو، لەسەردانەکانیدا منیشی لەگەڵ خۆی دەبرد. کە لەسەرگەڵو جێگیر بووین، دوای سەردانەکەی حاجی قادر، ڕۆژێکیان لەگەڵ بەرپرسی مەڵبەند و ئەندام مەڵبەندێک، سەردانی ماڵی شەهید شێرکۆی شێخ عەلی مان کرد، ئەو سەردانە بۆ ئاشتبونەوەی نێوان ینک و بنەماڵەی شەهید شێرکۆ بوو، دایکی شەهید شێرکۆ و تاقە کوڕە زیندوەکەی بەخێرهاتنیان کردین، لەگەڵمان دانیشتن، بێدەنگیەکی خەمناک باڵی بەسەر دانیشتنەکەدا کێشا، بۆ ماوەیەک هیچ کەس قسەی نەدەکرد، لەو کاتەدا بیرم لەو ڕووداوە ناخۆشەی ئەم بنەماڵەیە دەکردەوە، بەراوردی کێشەی ئەم بنەماڵەیەم لەگەڵ بنەماڵەی خۆماندا دەکرد، کە پێش ساڵێک لەشەڕی براکوژیدا، براکەی منیش بەدەستی پێشمەرگەی ینک شەهیدکرا، بیرم لەچەندان شەهیدی تری شەڕی براکوژی

دەکردەوە، بەڕووداوێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێنم دەزانین، دڵم پڕبوو، خۆم پێنەگیرا، دەستم بەگریان کرد.

بەرپرسی مەڵبەند، کە بەو شێوەیە منی بینی، بەسەرسوڕمانەوە، سەیرێکی کردم، دایک و برای شەهید شێرکۆش، هەر بەهەمان شێوە بەسەرسوڕمانەوە سەیرییان دەکردم، هەموویان بێدەنگیان هەڵبژارد، نەیاندەزانی بۆچی دەستم بەگریان کرد، کەسیش پرسیاری لێنەکردم بۆ داتە پڕمەی گریان. دوای چەند چرکەیەک، گریانەکەم کۆتایی پێهێنا، بەڵام دڵنیام ئەو گریانەی من، یەکێک لەو هۆکارانە بوو، کە پەیوەندی نێوان من و عەلی بچکۆلی تێکدا.

**شەڕەبەق:**

حکومەتی عێراق، قوتابخانەی گوندی سەرگەڵوی داخستبوو، بینای قوتابخانەکە چۆڵ بوو، لە بینای قوتابخانەکەی سەرگەڵودا، نەخۆشخانە و دادگای مەڵبەندمان کردەوە، لەبەرئەوەی دکتۆرو حاکمەکانی مەڵبەند هەموو کۆمەڵەبوین، جێگەی پۆلی ڕێکخستنی کومەڵەشمان کردەوە.

لەشەوێکی بارانـاوی زستانی ١٩٨٣دا، لەقوتابخانەکەی سەرگەڵو، لەگەڵ حاکم سەمەدو حاکم عەزیزو دکتۆر محەمەدو دکتۆر هادی و ئیبراهیمی کادردا، خەوتبووین، دەنگێکی نامۆ لەخەو خەبەری کردمەوە، لەسەرەتادا وامزانی ئەوە دەنگی جوڵەی مشکە و نان دەخوات، کەمێک گوێم هەڵخست، هەستم کرد دەنگەکە گەورەتر دەبێت، هەستام بەرەو رووی دەنگەکە ڕۆیشم، سەیرم کرد دڵۆپەی سەربان نانە تیریەکەی تەڕکردووین. برادەرەکانم خەبەر کردەوە، وتم هەستن سەربانی قوتابخانەکە دڵۆپە دەکات، باران هاتۆتە ژێرمان، هەمو لەخەو هەستاین، سەیری ژوورەکانی ترمان کرد، بینیمان ژوورەکانی تریش دڵۆپەیان کردوە، دەرمانی نەخۆشخانە هەمووی تەڕ بووە، دەستمان کرد بەدەرهێنانی دەرمانەکە، حەب و گولاجەکان بەتەواوی تەڕ ببوون، کەڵکیان نەمابوو.

خەوم زڕاوە، دەرمانم تەڕبووە، هیچ نەماوە نەخۆشی پێچارەسەر بکەم، لەدەمەو بەیاندا، پیاوێکی سەرگەڵویی لەگەڵ منداڵەکەیدا خۆیکرد بەژووردا،

وتی: دکتۆر فریام کەوە، ئەمشەو تا بەیانی منالّەکەم وەک کەو خوێندویەتی، مەبەستی ئەو پیاوە ئەوەبوو، کە منالّەکەی دووچاری کۆکەیەکی گران بووە، منیش هاتمە زمان، بەگالّتەوە وتم: منالّەکەت ببە بۆ شەرەبەق، واتە بیبە بۆ راوە کەو، من بۆ گالّتە ئەو قسەیەم لەگەلّ ئەو پیاوەدا کرد، بۆئەوەی خەمی تەڕبوونی دەرمانەکەم بەبادا بدەم، بەلاّم ئەو نەیدەزانی بۆچی من وام پێوتووە، وای دەزانی سوکایەتیم پێکردوە، لێم تووڕەبوو، هێندەی نەمابوو بەو تاریک و لێڵییە دەست لەیەخەی یەکتری بدەین. دواتر بۆم روونکردەوە کە سەربانەکەمان دلۆپەی کردووە، ئاو هاتۆتە ژێرمان، دەرمانەکانمان تەڕ بوون، بەو شێوەیە هاولاتیەکەم هێور کردەوە.

**حەبی لازیکس:**

پێش ئەوەی ببم بەپێشمەرگە، زۆر بەکەمی گالّتەو گەپم دەکرد، ئەو ماوەیەی بووم بەپێشمەرگە، سەیرم کرد، هەر شوێنێک دەڕۆیت، هەر کەس دەبینی، خەریکی گالّتەو گەپ و نوکتەیە، منیش نوکتە و قسەی خۆشم نەدەزانی، لەدلّی خۆمدا وتم چی دەبێت ئەگەر، لەدەرەوەی پێوانە تەندروستیەکان، لە باتی نۆکتەو گالّتەوگەپ، دەرمان بەکاربێنم.

ئەو کاتەی لەسەرگەلّو بووین، کادرێکی کۆمەلّە کۆبونەوەی بەدکتۆرو حاکمەکانی مەلّبەند کرد، رۆژێکیان کە قسەکانی تەواوکرد، وتی: هاوڕێیان تێگەیشتن، خۆی گومانی هەبوو کە وەک پێویست پەیامەکەی گەیاندبێت، من وتم: باش تێنەگەیشتین، حاکم سەمەد لەو لاوە هەلّیدایەوە، بەکادرەکەی وت: بۆئەوەی باش تێبگەین، دەبێت بەپەلە قسە نەکەیت، تۆ بەپەلە قسە دەکەیت، کادری فەقیر بێدەنگ بوو.

رۆژێک دواتر کادر هاتە لام، وتی: دکتۆر سبەینێ کۆبونەوە بەشانەی رێکخستنی کچان دەکەم، ئەگەر بەئەرکی نازانیت حەبێکی ڤالیۆمم بدەرێ، با پێش کۆبونەوەکە بیخۆم، بۆئەوەی لەکۆبونەوەکەی ئەواندا، لەسەر خۆ قسە بکەم و لێمتێبگەن.

ئەو کات هەندێک هاوڕێی کچ، لەڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شاری سلێمانی کۆمەڵـە، ئاشـکرابوون، بـۆ خۆپاراسـتن لەزینـدانیکردنی رژێـم، ببـوون بەپێشمەرگە، سێ کەسیان لەسەرگەڵو بوون، لەشانەیەکی تایبەتی ڕێکخستندا بوون، ئەو کادرەی کە بەرپرسی ئێمە بوو، بەرپرسیاری ئەوانیش بوو.

کەمێک بیرم کردەوە، دواتر وتم: باشـە، بـەڵام لای خۆمـەوە بڕیارمدا، با منیش گاڵتەیەک بەو کادیرە بکەم، با لـەباتی حـەبی ڤالیۆم، حـەبی لازیکسـی بدەمێ، حەبی لازیکس بۆئەوەیە ئەو کەسـەی بەکاریدەهێنێت، لـەباتی ئـەوەی ئارام ببێتەوە و لەسەرخۆ قسە بکات، زوو زوو میز دەکات وبێ ئۆقرە دەبێت.

دەبوو برای کادر بۆ کاتژمێر ٤ ئێوارە کۆبونـەوە بکات، منیش وتـم: پێش کۆبونەوەکـە بـەنیو کـاتژمێر، ئـەو حەبانـە بخـۆ، دوای ئـەوە بـڕۆ بـەئارەزوی خۆت لەسەرخۆ قسە بکە، حەبەکە لازیکسـی ٤٠ ملیگرامـی بـوو، وابـزانم دوو حەبیشم پێدابوو.

پـێش دەسـتپێکردنی کۆبونەوەکـە بـەکاتژمێرێک، پیاوێـک بەسـواری هێستریکەوە لەهەڵەدنەوە هات بۆ لام، نامەیەکی دایە دەستم، وتی ئەوە نامەی کـاک جـەبارە، کـە نامەکـەم خوێندەوە، سـەیرم کـرد نامـەی جـەبار فەرمانـە، لەگونـدی هەڵەدنـەوە بـۆی ناردبووم، ئـەو کاتـە جـەبار فـەرمان بەرپرسـی ڕێکخراوی کۆمەڵەبوو، بارەگای ڕێکخراو لەگوندی هەڵەدن بوو.

لەنامەکەدا نوسیبوی: لەهەڵەدن ژنێک منداڵی دەبێت، ئازارێکی زۆری هەیە، بـاری تەندروسـتی زۆر خراپـە، بـەڵکو بێیـت هاوکـاری بکـەیت. دوای خوێندنەوەی نامەکە هەندێک دەرزی تایبەتم بەو نەخۆشیە ئامادەکرد، سواری هێسـتر بـووم، دەرمانـەکانم لەبـەردەمی خۆمـدا دانـا. کـابرای هەڵـەدنیش، بەشوێن هێسترەکەوە بەدوامدا ڕێی دەکرد، لـەڕێگا پێکـەوە قسـەمان دەکرد، لەکاتی قسەکردندا وتی: دکتۆر تۆ هەورامیت، وتم:

بەڵێ هەورامیم، تۆ چۆن زانیت من هەورامیم؟ وتی: لەکاتی قسەکردندا، تۆ لـەباتی ئـەوەی بڵێی ئـاخر وایە یان ئـاخر وا نابێت، دەڵێیت ئـاخور وایە یان ئاخور وا نابێت، واتە واوێک دەخەیتە سەر وشەی ئاخر، لەهەموو کوردا تەنیا هەورامی بەئاخر دەڵێن ئاخور، وتم ڕاستدەکەیت وایە. ئیتر من پرسـیارم لـەو

کرد: تۆش هەورامیت؟ وتی: بەڵێ ماوەی چەندان ساڵ پێش ئێستا، باوکم لەهەورامانەوە هاتوە بۆ هەڵەدن، لێرە هاوسەرگیری کردوە، نیشتەجێبوە و نەگەڕاوەتەوە.

لەڕێگەدا زانیم کە نەخۆشەکە خیزانی ئەوبرادەرەیە، کە گەیشتینە هەڵەدن، لەماڵی کاک هەژاری هاوسەری نەخۆشەکە نزیک بووینەوە، نەخۆشەکەیان ئاگادارکردەوە، پزیشک هاتوە بتبینێت، ئەو ژنە دووگیانە، کە دیاربوو لەباری منداڵبونێکی سەختدا بوو، وتبووی: بەهیچ شێوەیەک ڕێگە نادەم دکتۆری پیاو بمبینێت، ئەگەر دکتۆری پیاو بمبینێت، خۆم دەسووتێنم.

کورد واتەنی دەستێکم کەوتە ئەملاو دەستەکەی ترم کەوتە ئەولا، ماڵی نەخۆشەکەم بەجێهێشت، چووم بۆ ماڵی جەبار فەرمان، نانی ئێوارەم خوارد، پێش خەوتن، هەواڵمان پێگەیشت ژنە دوگیانەکە بەبێ هاوکاری پزیشک، منداڵەکەی بووە، تەندروستیشی باشە، بەو هەواڵە زۆر دڵخۆشبووم، شەو لەماڵی جەبار فەرمان نووستم، بۆ رۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو.

کە گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو، سەیردەکەم باس هەر باسی کۆبونەوەی کادرەکەی کۆمەڵەیە، هەر یەکە و لای خۆیەوە شتێک دەڵێت. دەرکەوت دوای ئەوەی من بەرەو هەڵەدن رۆیشتبووم، کادرەکە حەبەکانی خواردبوو، سەردانی ماڵی کچەکانی کردبوو، ویستبوی دەست بەکۆبونەوە بکات، هەستی کردبوو تەنگاوە، داوای لێبوردنی لەکچەکان کردبوو، وتبوی: کارێکی بچوکم بۆ هاتۆتە پیشەوە، دەبێت برۆم کارەکە بکەم، بەزووترین کات دەگەڕێمەوە. باشبوو شوێنی کۆبونەوەکە لەمزگەوتی گوندەوە نزیک بوو، دوای دە دەقیقەیەک کادرەکە دەگەڕێتەوە شوێنی کۆبوونەوەکە، هەست دەکات دیسان تەنگاوە، ئەم جارەش داوای لێبوردن دەکات، دەڵێت: کارێکی تری پەلەم بۆ هاتۆتە پێشەوە، داوای مۆڵەتی چونەدەرەوە دەکات، بەرەو مزگەوت ملدەنێ، جاری سێیەم دەیەوێت بگەڕێتەوە، کە دەگاتە دەرگای ماڵەکە، تەنگاوی زۆری بۆ دەهێنێت، هاوار دەکات: دینت بسووتێنم فایق، بەیارمەتیتان من دەڕۆم.

بەو شێوەیە ئەو رۆژە کۆبونەوە ناکرێت، کادر دەست بەهەڕەشە دەکات، دەڵێت مەرج بێت هەر کاتێک ئەو فایقە گەڕایەوە وا و وای لێبکەم، هەر دەبێت

بیکوژم.  که له هەڵەدن گەرامەوە، لەژوورێکی نەخۆشخانەدا دانیشتم، حاکم سەمەدو کادرەکە هاتن بۆ لام، حاکم سەمەد بەزەردەخەنە تەنزئامێزەکەی خۆیەوە وتی: بۆ وات لەو برادەرە کرد؟ ، هەر کە حاکم سەمەد وای وت، کاکی کادر لێم نزیک بووەوە، فیشەکی بردە پێشەوە، وتی: هەر ئێستە دەتکوژم، منیش خۆم سەخڵەت نەکرد، کادر لوولەی تفەنگەکەی خستە سەر کەلەی سەرم، وتی: هەر دەتکوژم، بە پێکەنینەوە وتم: منەتت نازانم ئەگەر نەمکوژیت، لەگەڵ وام وت: دەستی بەپەلەپیتکەی کڵشینکۆفدا نا، دەنگێکی نزم هاتە گوێم، تێگەیشتم بەفیشەکی موختار کوژ، واتە بەفیشەکێک کە گولەی تێدا نییە، تەقەی لێکردووم.

دیاربوو کادرەکە، لەگەڵ حاکم سەمەدو حاکم عەزیزدا، تەگبیریان کردبوو من بترسێنن و توڵەم لێبکاتەوە، کە بینیان من تێکنەچووم، هەر حسابم بۆ تەقەکە نەکرد، حاکم سەمەدی وتی: هاوڕێ سەرکەوتوو نەبوویت.

**وێنەی شەهیدان و ئایدۆلۆجیا:**

بە گوێرەی پەیڕەوی ناوخۆی مەڵبەندەکانی یەنک، نەخۆشخانە و دادگای مەڵبەند، سەر بەبەشی کاروباری کۆمەڵایەتی بوون، شێخ محەمەد سەرگەڵویی، بەرپرسی بەشی کاروباری کۆمەڵایەتی بوو.

قوتابخانەکەی سەرگەڵومان چۆڵکرد، نەخۆشخانەمان گواستەوە بۆ بینای بنکەی تەندروستی سەرگەڵو، بیناکە دوو بەش بوو، بەشێکی بۆ خزمەتگوزاری تەندروستی بوو، بەشەکەی تر شوێنی حەوانەوەی پزیشک و کارمەندانی تەندروستی بوو، نەخۆشخانەکەی من لەبەشێکیدا بوو، بارەگای کاروباری کۆمەڵایەتی لەبەشەکەی تریدا بوو.

دیواری ژووری بنکەی تەندرووستی، بەپۆستەرە وێنەی شەهیدانی کۆمەڵە رازێنرابویەوە. دوای چەند رۆژێک سەردانی بارەگای کاروباری کۆمەڵایەتیم کرد، سەیرمکرد وێنەی شەهیدەکانی کۆمەڵە نەماون، دیوارەکە بەوێنەی کەوو کۆترو پشیلە رازێنراوەتەوە، لەپێشمەرگەکانم پرسی، کوا وێنەی شەهیدەکان؟  وتیان کاک شێخ محەمەد وتوویەتی: ئەو وێنانە داگرن،

لەپشـتی وێنـەکان وێنـەی ئـاژەڵ و پەلـەوەر درووسـتبکەن و بەدیوارەکانـدا هەڵیواسن.

بـەو وەڵامـە زۆر نیگـەران بـووم، چـۆن حزبێکـی شـۆڕشـگێری وەک یـنـک، خاوەنداری لەشەهیدەکانی ناکات، وێنەکانیان لەچاوی جەماوەر دەشارێتەوە؟ . بیـرم لـەهۆکاری ئـەو روداوە دەکـردەوە، لەسـەرەتادا وایبۆدەچـووم ئـەو رەفتارەی شـێخ محەمـەد بۆ دژایەتیکردنی کۆمەڵە بێت، وتم: ئـەم رەفتـارەی شێخ محەمەد، پەرچەکرداری کۆمەڵەی بەشوێندا دێ، لەنێوان کۆمەڵە و خەتی گشتیدا ناکۆکی درووست دەبێت، بۆچی ئەندام مەڵبەندێکی ینک رەفتاری وا دەنـوێنێ؟ بەباشـم زانـی بـۆ ئـەو مەبەسـتە سـەردانی عـەلی بچکـۆل بکـەم، لەسـەردانەکەمدا باسـی ئـەو رەفتـارەی شـێخ محەمـەدم بـۆ کـرد وتـم: ئـەو رەفتارەی شێخ محەمەد، وا لەئەندامانی کۆمەڵەدەکات، بەهـەمان شێوە لەگـەڵ وێنـەی شـەهید عـەلی عەسـکەریدا هەڵسـوکەوت بکـەن، ئـەوەش کێشـەی لێدەکەوێتەوە. لەو مەسەلەیەدا ئەو عەلی بچکۆلەی کە من لەبـەر کۆمـەڵـەبونی و کرێکـاربوونی شـوێنی کـەوتبووم، پشـتگیری شـەهیدانی حزبەکـەی نـەکرد، پشتگیری شێخ محەمدی کرد.

ساڵی ١٩٨٦ کاتێک شەوکەتی حاجی مشیر بەرپرسی مەڵبەندی یـەک بـوو، بڕیـاری دا پۆسـتەرە وێنـەکانی شـەهید ئـارام لـەدیواری قوتابخانەکـەی سێوسـێنان بکرێنـەوە، کاتێـک چـووم بـۆ لای عومـەر فـەتاحی بەرپرسـی ڕێکخراوی کۆمەڵە، سکاڵای ئـەو رەفتـارەی بەرپرسـی مەڵبەنـدم کـرد، عومـەر فـەتاحیش داکـۆکی لـەو رەفتـارەی شـەوکەتی حـاجی مشـیر کـرد. ئیتـر بـۆم ئاشکرا بوو، سەرکردایەتی ینک، بەکۆمەڵە و شۆڕشگێرانەوە، هـەر هـەمووی دژی ئایـدۆلۆجیای مارکسـیزم -لینینیـزم کـار دەکـەن، دەیانـەوێت ناسـنامەی مارکسی و چەپ لەحزبەکەیان دووربخەنەوە.

**برنجی رەنگاورەنگ:**

کـە گەیشـتینە سـەرگەلو، ماوەیـەکی زۆر لـەماڵی بـاوکی شـێخ محەمـەد ماینـەوە، ئـەو ماوەیـە خـواردنی خۆشـمان دەخـوارد، بـەڵام لـەوە خۆشـتر،

ڕۆژێکیان سەبیحەخانی خێزانی شەهید عەلی عەسکەری، لەسلێمانیەوە هات بۆ سەرگەڵو، دەعوەتێکی بۆ مەڵبەند کرد، خواردنەکانی تا بڵێی بەتام و چێژو هەمەڕەنگ بوون، ئەوە یەکەمجار بوو برنجی ڕەنگاوڕەنگ (سپی و ڕەش و زەرد) لەسەر یەک سفرە ببینم، ئەوە یەکەم جار بوو، گۆشتی هەمەجۆر، گۆشتی کوڵاوو برژاوو سووروەکراو، گۆشتی حەیوان و مریشک و قەل و ماسی، پێکەوە لەسەر یەک سفرە ببینم. ئەو ڕۆژە هەر بەرپرسە و باسی جۆرە خواردنێکی پەسەندی خۆی دەکرد، هەر یەکەو دەیوت من حەزم لەفلان بەشی گوشتی مریشک و گوشتی قەلە.

لەڕابوردوودا، لەماڵی خۆمان، لەماڵی خزم و هاوڕێکانم، لەچێشتخانەکان، لەیانەی زانکۆ و لەیانەی پزیشکان، لەنەخۆشخانە، قەت هێندە خواردنی هەمەڕەنگ و زۆرم نەدیبوو، لەو کاتەوە منیش، باڵی قەل و مریشک و پشتە مەخزەی بەرخ، بەخۆشترین خواردن دەزانم.

**ڤیتامین قزەڵقورت:**

ئەو پزیشکانەی کە پێشمەرگە بووین، جیا لەکێشە گشتیەکان، ڕووبەڕوی چەند کێشەیەکی تایبەت دەبووینەوە، یەک لەو کێشە تایبەتانە، پرسیاری گرانی کادر و بەرپرسەکان بوو، نەماندەوێرا بچینە کۆڕو کۆبونەوە کۆمەڵایەتیەکانی پێشمەرگە، بەپرسیار دەربارەی خواردن و پاک و خاوێنی و نەخۆشی، دایاندەگرتینەوە، یان لەکاتی ئاساییدا، دەچووینە لای دۆستێک، پێشمەرگەیەک دەهات و سکاڵای لەسەر تەندروستی خۆی دەکرد، داوای چارەسەری لێدەکردین.

ئەو کاتەی لەسەرگەڵو بووم، لەنەخۆشخانەی شەهید د. بەختیارەوە، نامەیەکی دکتۆر تارق جاف(د. ڕێباز)م بەدەست گەیشت، نوسیبوی، واز لەپێشمەرگایەتی دەهێنم، لەبەر دوو هۆکار، هۆکاری یەکەم ئەوەیە، ناتوانم بچمە ناو هیچ کۆڕو کۆمەڵێک، بەپرسیار وەڕسم دەکەن، هەر کەدەزانن دکتۆرم، سەدان پرسیارم لێدەکەن، دوای ئەو نامەیە تارق دەستی لەپێشمەرگایەتی هەڵگرت، گەشتی ئەوروپای کرد، لەوکاتەوە لەدانیمارک

نیشـــتەجێیە، لـــەهیچ کـــۆڕو کۆبونەوەیـــەکی سیاســـی و کۆمـــەڵایەتیـــدا نـــاویم نەبیستەوە.

ســـاڵی ١٩٨٧، لەنەخۆشـــخانەی مەڵبەنـــدی یـــەک بـــووم، بـــەهادین نـــوری دکتۆرەکـــانی مەڵبەنـــد و بەرپرســـێکی ینکـــی دەعـــوەت کـــرد، مـــن و د. ناســـح قەرەداغی و د. جەلال عوسمان و ئەندام مەڵبەندێک بووین، هەر کە دەستمان بـەخواردن کـرد، کـابرای بـەرپرس، سـەلیەیەک پرسـیاری لەسـەر خـواردن لێکـردین، ئێمـەش بـەو پرسـیارانە بێـزار بـووین، لـەکاتی میـوە خواردنیشـدا، بەرپرسـەکە دەسـتی بە پرسـیار کردەوە، وتـی: هـەنار چ ڤیتـامینێکی تێدایـە، د. جەلال هەڵیدایەوە، بەدەنگێکی بـەرز وتـی: هـەنار ڤیتـامین(ق[٢٧]) تێدایـە، کـابرای بەرپرس تێگەیشت و بیدەنگ بوو.

**دەرزی لێدان:**

کارو چالاکی مەڵبەندو ڕێکخستن و نەخۆشخانەی شەهید د. ڕێبـاز، کەوتـە سـەر ڕێچکـەی ئاسـایی خـۆی. ئامادەکـاری بـۆ هـەڵبژاردنی نـاوخۆیی کـەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵـە دەکرا، کـادرێکی کۆمەڵـە لەنەخۆشـخانە سـەردانی کـردم، وتـی: دەترسـم لـەم هەڵبژاردنـەدا هەڵنەبژێـرمەوە، پۆسـتەکەم وەرنەگرمـەوە، داوات لێدەکەم فێری دەرزی لێدانم بکـەیت، بۆئـەوەی ئەگـەر هەڵنەبژێرامـەوە، کاری تەداوی و دەرزی لێدان بکەم. بە داواکاری کادرەکە ڕازی بووم، منیش بەباشـم زانـی سـەرەتا فێـری دەرزی لێـدانی بکـەم، لەبەرئـەوەی کادرەکـە لەگوندی هەڵەدن بـوو، جارجـارە لەهەڵەدنـەوە نـەخۆش سـەردانی سـەرگەڵوی دەکرد، دەرزیم بۆ دەنووسین، کەس نـەبوو دەرزیەکـەیان بۆ بکـات، وتـم زۆر باشە فێری دەرزی لێدانت دەکەم، لەهەڵـەدن بمێنـەرەوە، هـەر کـەس پێویسـتی بەدەرزی لێدان بوو، دەرزی بۆ بکە.

کادرەکـە چەنـد ڕۆژێـک لەنەخۆشـخانە مایـەوە، فێـری دەرزی لێـدانم کـرد، دوای ئـەوە گەڕایـەوە بـۆ هەڵـەدن. ڕۆژێکیـان ژنێکـی نـەخۆش لەهەڵەدنـەوە

٢٧ ڤیتامین ق واتای ڤیتامین قزەڵقورتە.

سەردانی نەخۆشخانەی کرد، بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی، دەرزیم بۆ نووسی، خۆم دەرزییەکم بۆ کرد، دەرزیەکانی ترم دایە دەستی ژنە نەخۆشەکە، وتم بیبە با فلان کەس لەهەڵەدن دەرزیەکانی ترت بۆ بکات، بەژنەکەدا نامەم بۆ کادرە دەرزی لێدەرەکە نووسی. ژنە سەردانی کادری کردبوو، نامەکەی منی دابوە دەستی، وتبووی ئەو دەرزیەم بۆ بکە، کادرەکە زۆر شەرمن بوو، قەڵەوێکی سوورو سپی بوو، کە ژنەکەی دیبوو، تەریق ببوەوە، ئارەقی کردبوو، وتبووی من نازانم دەرزی بۆ ژن بکەم. بۆ رۆژی دوایی، ژنە نەخۆشەکە لەهەڵەدنەوە گەڕایەوە، نامەیەکی دایە دەستم، نامەکەم خوێندەوە، کادێرەکە نووسیبوی: تۆ منت فێری دەرزی لێدانی پیاو کرد، کەچی نەخۆشی ژنت ناردوە دەرزی لێبدەم، من نازانم دەرزی بۆ ژن بکەم. منیش بەنامەیەک وەڵامم دایەوە: دەرزی لێدانی ژن و پیاو، جیاوازی نییە، وەک یەکە، شەرم مەکە دەرزی بۆ ئەم ژنە بکە. دوای ماوەیەک هەڵبژاردنی کەرتی رێکخستن کرا، کادرەکە لەهەڵبژاردندا سەرکەوتەوە، پۆستەکەی خۆی وەرگرتەوە و وازی لەدەرزی لێدان هێنا.

**نامەکە:**

نەورۆزی ساڵی ١٩٨٣ بوو، لە سەرگەڵو بووم، لەکاتی ئاگرکردنەوە و تەقەی نەورۆزدا، لە شارەدێی مەرگە، پێشمەرگەیەک برینداربوو، لەڕێگەی جهازەوە هەواڵیان بۆ هێنام کە پێشمەرگەیەک لەمەرگە بەسەختی برینداربووە، باری تەندروستی مەترسیدارە، داوایان لیکرد بڕۆم بۆ مەرگە برینەکەی چارەسەر بکەم. هەر کە هەواڵەکەم بۆ هات، کۆڵەپشتەکەم پڕکرد لەدەرمانی پێویست، لەگەڵ عوسماندا(ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵمدابو) لەسەرگەڵووەوە بەرەو مەرگە بەڕێکەوتین، ماوەی ٣-٤ کاتژمێر بەڕێوە بووین، بەبەردەوامی باران لێیدەداین، جلەکانمان تەڕببوو، بەڵام لەبەرئەوەی بۆ رزگارکردنی گیانی پێشمەرگەیەک دەچووم، گوێم بەباران و تەڕبوونی جلەکانم نەدەدا. تا من گەیشتمە مەرگە، بەختیار شەهید ببوو، تەرمەکەیان ناشتبوو، بەشداری پرسەکەیم کرد، بنەماڵەی شەهید بەختیار، خەڵکی

سەنگەسەر بوون، کە بینیان من بەو لێزمەی بارانە لەسەرگەڵو بۆ مەرگە هاتووم، بۆئەوەی چارەسەری برینەکەی شەهید بەختیار بەکەم، خەمەکانیان سووک بوون، لەو کاتەوە لەگەڵ ماڵی شەهید بەختیار و خزمەکانیدا، دۆستایەتیم بەردەوامە.

بۆ رۆژی دوایی پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سەرگەڵوو، زیرۆ عەبدوڵای ئەندامی مەکتەبی عەسکەری ینکم بینی، وتی: دکتۆر نامەیەکی سەرکردایەتیم پێیە، کە گەڕایتەوە بیبە بۆ مەڵبەند، وتم: بەسەر چاو.

نامەکە گەورەبوو، بەتێپی ئاوی پێچرابوو، دیاربوو نامەیەکی دوورو درێژ بوو، نامەکەم وەرگرت. کە گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو، نامەکەم برد بۆ عەلی بچکۆل، لەو کاتەدا زۆربەی برادەرانی ئەندام مەڵبەند لەگەڵ عەلی بچکۆلبوون، وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئەو نامەیە بکەن وابوو، نامەکەم دایە دەستی بەرپرسی مەڵبەند، خوێندیەوە، دوای خۆی دایە دەستی مستەفا چاوڕەش و ئاوات عەبدولغەفور، ئەوانیش خوێندیانەوە، هەموویان سەری رەزامەندیان بۆ لەقاند. دیاربوو لەو نامەیەدا هەڵویستێکی نوێی ینک دەربارەی باری سیاسی و سەربازی کوردستان دیاریکرابوو، بەڵام هیچیان بەمن نەوت.

لەدڵی خۆمدا دەموت، ئاخۆ ناوەڕۆکی ئەو نامەیە چیی بێت؟ بۆچی وا بەوردی خوێندیانەوە، بەبێ ئەوەی لەبەر چاوی من قسەی لەسەر بکەن، بەهێمای سەرلەقاندن رەزامەندیان لەسەرنیشاندا؟ ، دیسان دەموت، خۆزگە لەڕێگە نامەکەم دەخوێندەوە، تا بزانم ناوەڕۆکی نامەکە چییەو چی تێدایە؟ ، جارێکی تر دەموت نا باشتر نەمکردەوە، لەبەرئەوەی ئەوە لادان و پێشێلکردنی بنەمای رێکخستنی حزبییە.

دوای نامەکە هەندێک رووداوی ناخۆش هاتنەپێشەوە، لای خۆمەوە وتم، بەخوا نامەکە پەیوەندی بە گەشتێکی تری شەڕی براکوژییەوە هەیە. فەرماندەیەکی پێشمەرگەی حسک بە ناوی کاکەسوری قوریتانی، لەزیندانی سەرگەڵو بوو، لەزیندان دەریانهێنا و شەهیدیانکرد، وتم: لەوانەیە ناوەڕۆکی نامەکە بڕیاری کوشتنی ئەو پێشمەرگەیەی تێدابوبێت. هەر لەو ماوەیەدا، نازانم پێش کوشتنی کاکەسوری قوریتانی بوو، یان دوای ئەوە، سالاری مامە

عەبە هات بۆ لام، سالار گەنجێکی سەرگەڵویی بوو، ئەندامی چالاکی حسک بوو، وتی: دکتۆر تۆ پزیشکی، بەیەک چاو سەیری نەخۆشی هەموو لایەنە سیاسیەکان دەکەیت، خەڵکی سەرگەڵو تۆیان خۆشدەوێت، ئەگەر مەڵبەندی ینکمان گرت، تۆ رانەکەیت، ئیمە ژیانی تۆ دەپارێزین. من گاڵتەم بەقسەکانی سالار دەهات، تێر پێی پێکەنیم، کەمێک گاڵتە و گەپ لەنیوان من و سالاردا هەبوو.

**شێخ شەماڵی باخ:**

دوای گەیشتنی نامەکە و کوشتنی کاکەسور، هێزێکی پێشمەرگەی ینک، هێرشیان بۆ سەر ئەو پێشمەرگانەی حسک دەستپێکرد، کە لەسنوری گوندەکانی مەرگە و چیای ئاسۆسدا بوون، ئەو پێشمەرگانە خزمەکانی رەسوڵ مامەند بوون، خەڵکی ناوچەکە بوون، زۆربەیان بەردەشانی بوون، ماوەی چەند رۆژیک شەڕ لەنێوان هەردوولادا بەردەوام بوو، بەهۆی فشاری زۆری پێشمەرگەکانی ینکەوە، پێشمەرگەکانی حسک لەناوچەی مەرگە کشانەوە، پەڕینەوە بۆ بناری چیای کۆسرەت. بەگەیشتنیان بەبناری کۆسرەت، لەدەشتی کۆیە لەگەڵ هێزەکانی ئەو ناوچەیەی حسک و هێزێکی حزبی شیوعی عێراق (حشع)دا تێکەڵبوون. ئەو هێزە هاوبەشەی حسک و حشع، کەمینایان بۆ تیپی ٩٣کۆیەی ینک دانا، شێخ شەماڵی باخ، فەرماندەی تیپی ٩٣ کۆیە و جێگرەکەی و چەندان پێشمەرگەی تریان شەهید کرد.

دیاربوو تیپی ٩٣ کۆیە ئاگاداری ئەو سیاسەتە نوێیەی ینک نەبوو کە لەنامەکەدا دیارییکرابوو و کوشتنی کاکەسووری قوریتانی و شەڕی ئاسۆسی لێکەوتەوە، یان وەک پێویست پێشبینی رووداوەکانیان نەکردبوو، بۆیە لەو باوەڕەدا نەبوون کە پێشمەرگەی حسک و شیوعی کەمینای بۆ دابنێن. بە شەهیدکردنی شێخ شەماڵ، کە لەناو هێزی پێشمەرگە و جەماوەردا، خۆشەویسترین فەرمانەدەی ینک بوو، دۆستێکی نزیکی حشعیش بوو، پێشمەرگەی یەکێتی بەرامبەر بەحشع و حسک ئاگریان گرت، بەدوای تۆڵەدا دەگەڕان.

شـێخ شـەماڵ خەڵكـی گونـدی بـاخی نزیـک شـاری سـلێمانی بـوو، فەرماندەیەكی سەربازی و كادرێكی سیاسی لەسەرخۆبوو، برایەكی بە ناوی دكتور ڕێباز یاریدەدەری پزیشک بوو، ئەویش چەكی پێشمەرگایەتی هەڵگرت و شـەهید بـوو، برایەكی تـری قوتـابی كـۆلێژی پزیشـكی زانكـۆی سـەلاحەدین بوو، لە ڕێكخستنە نهێنیەكانی ناوشاردا خەباتی دەكرد، دەزگا سیخوڕیەكانی ڕژێـم دەسـتگیریان كـرد و شـەهدیان كـرد، تـا ئەمـڕۆش تەرمەكەی نەدۆزراوەتەوە.

شەماڵ یەک لەو كادرانەی یـنک بـوو كە لای فەلەستینیەكان پەروەردەی سەربازی دیبوو. من لە نەخۆشـانەی شـەهید دكتـور بەختیـار شـەماڵم ناسـی، ئەگەر بە كارێـک سـەردانی بارەگـای سـەركردایەتی بكـردایە، سـەردانی نەخۆشـخانە و تیپی مۆسـیقای شـەهید كـارزانی دەكـرد. لە ململانێكـانی نـاو كۆمەڵەدا سەربە باڵی كوردستـانی بـوو، دوای شـەهیدبوونی، شـێركۆ بێكەس هۆنراوەیەكی لەسـەر نووسـی بە نـاوی شـەماڵ، هاوڕێكانی شـەماڵ دەیانوت، شـەماڵ یەک لەو كەسـانە بـووە كە حەزی بە دۆسـتایەتی حزبـی شـیوعی كردوە، كاتێک حزبی شیوعی دژی ڕژێمی بەعس بڕیاری خەباتی چەكداری داوە و مەفرەزەكانیـان خۆیـان گەیاندۆتە شـاخەكانی كوردسـتان شـەماڵ زۆر هاوكاری كردوون.

**نەوشیروان مستەفا لە سەرگەڵو:**

دوای شەهیدبوونی شێخ شـەماڵ و هاوڕێكانی، هێزێكی هاوبەشـی پدک و حسـک و حشـع و پاسـۆک(بەرەی جـود)، هێرشیانكردە سـەر مەڵبەنـدی سـێی هەولێرو داگیریان كرد. دكتۆر كەمال خۆشناو بەرپرسی مەڵبەند بوو، مـلازم سـەید كـەریم بەرپرسـی سـەربازی مەڵبەنـد بـوو. لـەو شـەڕەدا پێشـڕەو چەمچەماڵی(نامق حەمە شوكر) شەهید كرا، پێشـتر یـەک لـەهاوڕێكانی زانكـۆم بوو، دەرچووی كۆلێژی بەڕێوەبەری و ئابوری زانكۆی موسڵ بوو.

دوای داگیركردنـی بارەگـای مەڵبەنـد، پێشـمەرگەكانی بـەرەی جـود، وە بەتایبـەتی پێشـمەرگەكانی حشـع، سـووكایەتی زۆریـان بەبەرپرسـەكانی یـنک

کردبوو، بەخەستی هەوڵی لەکەدارکردنی کەسێتی هەندێک لەبەرپرسەکانیان دا، ئەوەش هێندەی تر رقی پێشمەرگەی ینکی، بەرامبەر بەپێشمەرگەی حشع ئەستوور کرد.

لەگەرمەی ئەو شەرو ململانێیەدا، نەوشیروان مستەفای سکرتێری کۆمەڵە، سەردانی سەرگەڵوی کرد، هەر لەو کاتەدا، هێزەکانی ینک لەگەرمیانەوە، بەرەو سەرگەڵو دەهاتن و کۆدەبوونەوە. ئەو کاتەی نەوشیروان مستەفا لەسەرگەڵو بوو، شیوعیەکانی سنوری کۆیە و هەولێر، شانبەشانی پێشمەرگەکانی حسک و پارتی و پاسۆک، شەڕی پێشمەرگەی ینک یان دەکرد، شیوعیەکانی سنوری پارێزگای سلێمانی، دژی شەڕی براکوژی بوون، لەگەڵ مەڵبەندی یەکی ینک، لەگفتوگۆدا بوون، بەهادین نوری ئەو کاتە بەرپرسی پاریزگای سلێمانی حشع بوو، مەلا بەختیار بەرپرسی مەڵبەندی یەکی ینک بوو، هەردووکیان دژی شەڕی براکوژی وەستانەوە، لەیەکتر نزیک بوونەوە، بڕیاریاندا خۆیان لەشەڕی براکوژی ئەم جارە بەدووربگرن.

لەوکاتەدا کە نەوشیروان مستەفا لەسەرگەڵو بوو، سەردانم کردوو پرسیارم لێکرد، ئایا ئەو هەڵوێستەی حشع لەپاریزگای سلێمانی، جدییە؟ چۆن دەبێت حشع لەپارێزگای هەولێر شەڕی ینک بکات، لەسلێمانی دۆستایەتی ینک بکات، سکرتێری کۆمەڵە وتی: حزبی شیوعی دوو هەڵوێستی جیاوازی هەیە، شیوعیەکانی سنوری پارێزگای سلیمانی حەز بەدۆستایەتی ینک دەکەن، شیوعیەکانی پارێزگای هەولێر حەز بەدۆستایەتی پدک دەکەن.

بەرپرسانی ئەوکاتەی مەڵبەندی یەکی ینک، بەتەنیا هەوڵیان لەگەڵ حزبی شیوعی نەدەدا بۆئەوەی شەڕی ناوخۆ درووست نەبێت، لەگەڵ بەرپرسانی پدک لەناوچەی شاربژێر قسەیان کردبوو، بۆئەوەی جارێکی تر دووچاری شەڕی براکوژی نەبن. ئەو هەڵویستەی مەلابەختیاری بەرپرسی ئەو کاتەی مەڵبەندی یەک، بەرامبەر حشع و پدک، لەلایەن زۆرینەی ینکەوە رەخنەی لێدەگیرا، زۆرینەی ینک دەیانوت: چۆن پێشمەرگەی پدک و حشع و حسک، شەماڵ و پێشرەو شەهید دەکەن، مەڵبەندی سێی هەولێر داگیردەکەن، لەولاوە مەلا بەختیار لەگەڵیاندا نەرمی دەنوێنێت و شەڕیان ناکات؟

**وێنەکەی مامە ریشە:**

لــەو رۆژانــەدا کــە نەوشــیروان مســتەفا لەســەرگەڵو بــوو، هــەرهێزی پێشمەرگەی ینک بوو، بەرەو سەرگەڵو دەهات، تیپی ٥٧ سەگرمە یەک لەو تیپانــە بــوو، ئــازاد حەمەغــەریب (ئــازادی ســەگرمە)فەرماندەی تیــپ بــوو، مامەڕیشــە فەرمانــدەی کــەرتی چــواری جــەباری تیپــی ٥٧ ســەگرمە بــوو. لەپایزی ١٩٨٢، لەشەڕی رۆژهەڵاتی کوردستاندا، مامە ریشەم ناسی، بۆیە کە گەیشتە سەرگەڵو، سەردانی کردم، دوای بەخێرهێنانی، مامە ریشەم برد بۆ ناو چایخانە و دوکانەکانی سەرگەڵو، دەچووینە هەر دوکان و چاییخانەیەک، مامــە ریشــە بــەخاوەن دوکــان و چایخانــە و خەڵــکەکەی تــری دەوت: مــن دەناسی؟ ئەگەر هاوڵاتییەکە بیوتایە تۆ ناناسم، دەیوت: من مامە ریشەم، دواتر دەیوت: ئەی تۆ وێنەی منت لە لایە، ئەگەر هاوڵاتییەکە بیوتایە وێنەی تۆم لا نیە، (لەو کاتەدا هیچ کەس لەسەرگەڵو وێنەی مامە ریشەی لانەبوو)، وێنەیەکی خۆی لەگیرفانی دەردەهێناو دەیدایە دەستی، بەو شێوەیە مامە ریشــە ژمارەیــەک وێنــەی خــۆی، بەســەر دانیشــتوانی گونــدی ســەرگەڵودا دابەشکرد.

مامە ریشە شەو لەنەخۆشخانە لای من مایەوە، بۆ رۆژی دوایی، پێش ئەوەی خواحافیزیم لێبکات و لەگەڵ هێزەکەدا بەرێبکەوێت، وتی: تۆ وێنەی منت لایە، وتم: نەخێر، من وێنەی تۆم بۆ چییە؟ دەستی کرد بەگیرفانیدا، وێنەیەکی خۆی دەرهێنا، بەبێ رەزامەندای خۆم، وێنەکەی لەسەر مێزەکەم دانا، وتی: با ئەو وێنەیەت لابێت، منیش بێدەنگ بووم، وێنەکەم لەسەر مێزەکە بەجێهێشت.

دوو کــاتژمێر بەســەر دەرچــونی مامــە ریشــەدا تێنەپــەری، لەسلیمانیەوە میوانم هات، یەکێکیان بەرزان هەورامی پورزام بوو، ئەوی تریش ئاوات تــەوفیق بــوو کــە لەرێکخســتنی نهێنــی نــاو شــاردا پێکــەوە خــەباتمان دەکــرد. بەرزان وئاوات لەگەڵ خۆیاندا هەندێک پێویستیان بۆ هێنابووم، دوای چۆنی و چــاکی و چــاو روونبوونــەوە، وتیــان: داواکاریــەکمان هەیــە، وتــم؛ فــەرموون، داواکاریەکە بڵێن وتیان: وێنەیەکی مامە ریشەمان دەوێت، یەکسەر دەستم

کرد بەپێکەنین، وتیان بۆ پێدەکەنی، وتم: ئەمشەو مامەڕیشە لای من میوان بوو، کەمێک لەمەوبەر ئێرەی بەجێهێشت، بەبێ ڕەزامەندی خۆم، وێنەیەکی خۆی لێرە دانا، فەرمون ئەوە وێنەکە، وێنەکەم لەسەر مێزەکە هەڵگرت و دامە دەستیان، بەرزان و ئاوات بەو وێنەیە زۆر دڵیان خۆش بوو، دەیانوت خۆزگە دوێنێ سەردانمان بکردیتایە، بۆئەوەی لەنزیکەوە مامە ریشەمان بدیبایە.

**تۆڵە بە سەبرە ئەمما بە زەبرە:**

هێزی پێشمەرگەی ینک، بەسەرکردایەتی نەوشیروان مستەفا، سەرگەڵوی بەجێهێشت، چەند ڕۆژێک دوای ئەوە، هەواڵی شەڕی قرناقە و پشتئاشان بڵاوبوەوە، هەواڵی دەستبەسەراگرتنی بارەگاکانی پدک و حشع و حسک و باسۆک، دڵی هێزی پێشمەرگەی خۆشکرد، لەبەرئەوەی بەتۆڵەی داگیرکردنی بارەگاکانی مەڵبەندی سێ مان دەزانی، بە تۆڵەی شەهید شەماڵ و شەهید پێشڕەو و شەهیدەکانی ترمان دەزانیی، دەمانوت نەوشیروان مستەفا راستی وتوە: تۆڵە بەسەبرە ئەمما بەزەبرە. لەولاشەوە هەواڵی کوشتنی دیل و ژن و منداڵی حشع، نیگەرانی دەکردین .

**ئەنجوومەنی سەرگەڵو:**

لەگوندی سەرگەڵو ئەنجومەنی خەڵکی ئاوایی درووستکرا، کاروباری خەڵکی گوندەکەی بەڕێوەدەبرد، پەیوەندی نێوان خەڵک و هێزی پێشمەرگەی ڕێکدەخست، هەوڵ هەبوو لەگوندەکانی تری ناوچە رزگارکراوەکاندا، ئەنجومەنی هاوشێوە دروستبکرێت.

بەرپرسانی مەڵبەندی دوو، حەزیان لە ئەنجومەنی ئاوایی نەدەکرد، وای بۆ دەچوون ئەنجومەن لەپایەو دەسەلاتی ئەوان کەم دەکاتەوە، بۆیە پەیوەندی نێوان ئەنجومەنی سەرگەڵو و مەڵبەند، پڕ لەناکۆکی و ململانێ بوو، من پەیوەندیەکی باشم لەگەڵ، ئەندامانی ئەنجومەندا هەبوو.

بیرۆکەی ئەنجوومەنی گوندەکان، هی شێخ عوسمان سەرگەڵویی بوو، شێخ عوسمان خەڵکی سەرگەڵو بوو لەسلێمانی دەژیا، لەناو شاردا سەر

بەڕێکخستنی کۆمەڵەبوو، دوای ئەوەی پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، لەدامەزراندنی ئەنجومەنی سەرگەڵودا ڕۆڵی سەرەکی بینی، ئەندامانی تری ئەنجومەنی سەرگەڵو، دانیشتوی گوندی سەرگەڵو بوون.

**دادگای مەڵبەند:**

عەزیز و سەمەد، حاکمی دادگای مەڵبەندی دوو بوون، دەرچووی کۆلێژی یاسای زانکۆکانی عێراق بوون. حاکم عەزیز خەڵکی خانەقین بوو، بەڵام لەسلێمانی ژیابوو، ئەندامی کۆمەڵەبوو، پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگە، زیندانی سیاسی بوو، لەزینداندا قارەمان و خۆڕاگربوو، لەژووری تاکەکسیدا زیندان کرابوو، ئەشکەنجە کرابوو، نهێنی ڕێکخستنی نەدرکاندبوو. لەتەمەندا، لەحاکم سەمەد گەورەتر بوو.

حاکم عەزیز بەردەوام پێدەکەنی و گاڵتەو گەپی دەکرد، کاتێک حاکمی مەڵبەند بوو، چەندان جار بەگاڵتەوە، لەگەڵ پێشمەرگە مەفرەزەی دەکرد، دەچوو بۆ ناو شاری سلێمانی، بەشداری چالاکی پێشمەرگەی دەکرد، جارێکیان لەگەڵ مەفرەزەیەک چووبووەوە ناو شار، بەگاڵتەوە بە هەڕەمەکی تەقەی کردبوو، کەسێکی برینداری کردبوو، دەرچوو ئەو کەسە ئەندامی ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەیە.

حاکم سەمەد، سەر بەڕێکخستنی کۆمەڵەبوو، خەڵکی شاری هەولێر بوو، بەڵام هیچی لەهەولێری نەدەچوو، خوو ڕەوشتی خەڵکی سلێمانی گرتبوو، سلێماناوی ببوو، بەردەوام خەریکی نوکەتەو کڵاو لەسەر نان بوو، تۆڵەی خەڵکی هەولێری لەخەڵکی سلێمانی دەکردەوە. ئەو دوو حاکمە لەپێشمەرگایەتیدا مانەوە تا دوای ئەنفال و کیمیاباران، ئاوارەی ئەوروپا بوون، حاکم عەزیز لەبەریتانیا و حاکم سەمەد لەسوید نیشتەجێ بوون، مافی پەنابەریان وەرگرت، جارجار سەردانی کوردستان دەکەنەوە. دوای ڕاپەڕین بۆ ماوەیەک، حاکم سەمەد پۆستی پاریزگاری هەولێری وەرگرت.

**جەبار یاوەر:**

جـەبار یـاوەر خـەڵکی جەلەولایـە، کـۆلێژی کشـتوکاڵی زنکـۆی موسـڵ تـەواوکرد، دوای تـەواوکردنی کـۆلێژ، بـوو بەپێشـمەرگە، ئـەو کاتـەی مـن لەســەرگەڵو بــووم، جــەبار یــاوەر ئەنــدامی کــەرتی رێکخســتنی دوکــانی کۆمەڵە بوو، بەرپرسی رێخستنەکانی مەڵبەندی دووی کۆمەڵە بوو ، بەهۆی پەیوەنـدی رێکخسـتنەوە، بـووین بـەهاوڕێ، شـوێنی پشـودانی جـەبار یـاوەر، لەنەخۆشخانە لەگەڵ من بوو.

جــەبار یــاوەر زۆر حــەزی لەکۆبونــەوە نــەدەکرد و گرنگــی بە بــواری تەندرووستی دەدا، منیش حەزم لە کۆبوونەوە دەکرد، بەبێ ئەوەی بـەزارەکی و بەرەسمی لەناو خۆماندا رێکبکەوین، من کۆبونەوەم بۆ ئەو دەکرد، ئـەویش لەرێگـەی رێکخسـتنەوە دەرمـانی بـۆ مـن پەیـدا دەکـرد، ئـەو ماوانـەی پێکـەوە بـووین، لـەڕووی کۆمەڵایـەتی و سیاسـیەوە، کـاتێکی خـۆش و هاوسـەنگمان بەسەر برد، تا ئێستها دۆستایەتیمان بەردەوامە.

**دلاوەری ئەحمەد مەجید:**

پێشــمەرگەیەکی کــۆنی ینکــە، خــەڵکی سـلێمانیە، ســەر بەرێکخســتنی کۆمەڵــەبوو، لــەپۆلی یــەکی ناوەندیـدا، مــن و ئــە و چەنــد برادەرێکــی تــر لەرێکخسـتنی قوتابیانـدا پێکـەوە کارمـان دەکـرد. دلاوەر پـەیمانگای هونـەرە جوانـەکانی بەغـدای تـەواوکرد، لەگـەڵ تـەواوکردنی پـەیمانگادا، یەکسـەر بـوو بەپێشمەرگە، لەمەڵبەندی دوو لەسەرگەڵو، جێگری تیپی تایبەتی مەڵبەند بوو.

**ئەحمەد عەسکەری:**

ئەحمەد لەشێخەکانی عەسکەر بوو، رابـەری سیاسـی تیپی مەڵبەنـد بـوو، دەرچــوی کــۆلێژی ئەنــدیازاری زانکۆکــانی عێــراق بــوو، یــەکێک لــەهاوڕێ نزیکـەکانم بـوو، کاتێـک لەسـەرگەڵو پێشـمەرگە بـوو، خێزانـی پێکـەوە نـابوو، شەوبۆخانی خێزانیشی کۆلێژی ئەندازیاری تەواوکردبوو، هەر کاتێک بیزانیایە لەماڵەوە خواردنی خۆشیان هەیە، دەیوت وەرە با بڕۆینەوە بـۆ ماڵـەوە نانێک بخۆین.

**شالاوی عەلی عەسکەری:**

شالاو کوڕی گەورەی شەهید عەلی عەسکەریە، ئەو ماوەیەی من لەسەرگەڵو بووم، شالاو لەسەرگەڵو دەمایەوە، لەناو مەڵبەندا پۆستی نەبوو، لەڕوی کۆمەلایتیەوە پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ بەرپرسان و کادرەکانی مەڵبەند هەبوو، شالاو بەردەوام خەریکی قسەی خۆشبوو، ناو بەناو سەردانی دەکردم.

**فاتح شوانی:**

لەو کاتەدا فاتح شوانی فەرماندەی تیپی تایبەتی مەڵبەند بوو، تا بڵێی پیاوێکی خاکی و رووخۆش بوو، جار جار لەنەخۆشخانە سەردانی دەکردم، رۆژێکیان هات بۆ لام وتی: دکتۆر نەخۆشم، پشکنینم بۆ کرد، دەرمانی نەخۆشیەکەیم دایە دەستی، لای من دەرچوو. دوای ئەو مستەفا سەرگەڵویی هات بۆ لام، مستەفا خەڵکی سەرگەڵو بوو، فەرماندەی کەرتی تیپەکەی فاتح بوو، سەیرمکرد هەندێک دەرمانی بەدەستەوەیە، وتم: ئەوە چییە؟ وتی: کەمێک نەخۆش بووم، هاتم بۆ لای تۆ لەڕێگا فاتح شوانیم بینی، وتی: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ وتم: نەخۆشم بۆ لای دکتۆر دەچم، فاتح پێیوتم: ها ئەو دەرمانانەی من بخۆ، ئیتر بۆچی دەچیت بۆ لای دکتۆر.

**شێخ عەبدولکەریم و شێخ مەحمود:**

شێخ عەبدولکەریم لەشێخانی شەدەڵە بوو، پێشتر سەربە پدک بوو، ساڵی ١٩٨٢ هاتە دەرەوە، بوو بەپێشمەرگەی ینک، مام جەلال زۆر رێزی لێگرت. لەسەر خەتی گشتی، بوو بەئەندامی مەڵبەندی دوو، بەرپرسی ڕاگەیاندنی مەڵبەند بوو، بەلام مەڵبەند ڕاگەیاندنی نەبوو.

لەکاتی گفتوگۆو راگۆڕینەوەدا، کە باسی پدک و بنەماڵەی بارزانی دەکرا، بۆ رێزلێنان، پێشگری کاکی بۆ مەسعود بارزانی یان بۆ ئیدریس بارزانی بەکاردەهێنا، دەیوت کاک مەسعود یان کاک ئیدریس وایوت. کادرو

پێشمەرگەکانی ینک، وە بەتایبەت کۆمەڵەکان، ئەو (کاک) بەکارهێنانەی شێخ عەبدولکەریمیان بەکوفر دەزانی، زۆر نیگەران دەبوون.

لەو کاتەدا شێخ مەحمودی برا گەورەی شێخ عەبدولکەریم، لەسەرگەڵو پێشمەرگە بوو، پەیوەندیەکی باشی کۆمەلایەتیم لەگەڵ شێخ مەحمود دروستکردبوو، یەک لەهاوڕێ نزیکەکانم بوو، هەر کاتێک شێخ مەحمود بیزانیبایە خواردنی خۆشیان هەیە، دەیوت دکتۆر با بڕۆینەوە بۆماڵەوە نانێک بخۆین.

ئەو کاتەی لە سەرگەڵو لە نەخۆشخانەی شەهید دکتور ڕێباز بووم ، خۆم و عوسمان خواردنمان بۆ خۆمان درووستدەکرد، برادەرەکانم دەیانزانی خواردنی باش ناخۆین، بۆیە هەرکاتێک لە ماڵەوە خواردنی باشیان لێنایە، منیشیان بانگ دەکرد.

**مەدحەت کاکەیی و ڕەمزی قوتبەدین:**

مەدحەت و ڕەمزی دوو هونەرمەندی شێوەکار بوون، مەدحەت خەڵکی گوندێکی نزیک کەرکوکە، ڕەمزی خەڵک خانەقینە، هەردوکیان کاکەیی بوون. لەناو ڕیزەکانی یەکێتیدا وەک پێشمەرگەی هونەرمەند، لەگەڵ هونەرمەندەکانی تردا ڕۆڵێکی جوانیان هەبوو، کاتێک لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار بووم، سەردانیان دەکردم، داوای تیشکی ئێسکەکانی لەشی مرۆڤیان لێدەکردم، وە لەسەر ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ پرسیاریان لیدەکردم، بۆئەوەی لەوێنەکێشاندا سودی لێوەربگرن، بەو هۆیەوە بوون بەهاوڕێم.

ڕۆژێک لەسەرگەڵو سەردانیان دەکردم، یەکێک لەخزمەکانم لەشارەوە هات بۆ لام، بەهەورامی دەستمان بەقسە کرد، لەو کاتەدا مەدحەت و ڕەمزی هونەرمەند، لێمان نزیک بوونەوە، هەموو گیانی خۆیانیان کرد بەگوێ، هەردوو پێکەوە بەخۆشیەوە وتیان: ئەوە بەماچۆ قسە دەکەن؟ وتم: بەڵی بۆ؟

، هەردوو پێکەوە بەپێکەنینەوە ئەملاو ئەولایان ماچ کردم، وتیان: ئێمەش ماچۆین[28].

لەو کاتەوە هاوڕێیەتی من و مەدحەت و ڕەمزی زیاتر پێشکەوت. هەردوو هونەرمەند دوای ئەنفال و کیمیاباران، گەشتی ئەوروپایان کرد، ئێستا لەدەرەوەی وڵات دەژین، جار جار سەردانی کورستان دەکەنەوە.

**فیلەتەن:**

هێزی بەرەی جود، لەشەڕی قڕناقە و پشتئاشاندا شکا، یەک دەستی بەسەر ناوچە رزگارکراوەکانی پارێزگای هەولێریشدا گرت، لەبەرئەوەی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەک لەسەر سنور بوون، مەترسی پەلاماری ئێران و هێزەکانی بەرەی جودیان لەسەر بوو، سەرکردایەت یەکیش، لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا مەیلی بۆ گفتووگۆ هەبوو، بارەگای مام جەلال لە گوندی ناوزەنگی بناری شاخی مامەندەوە، بۆ گوندی بالیسانی ناوچەی خۆشناوەتی گوێزرایەوە.

هەندێک لە پێداویستیەکانی بارەگای مامجەلال، گوازرانەوە بۆ بەرگەڵو، مام جەلال خۆی، بەبێ پێداویستییەکانی، لە ناوچەی خۆشناوەتی بوو، بارەگای نەوشیروان مستەفاش لەخۆشناوەتی بوو. لەو کاتەدا یەک دووچاری ڕاراییەک هات، ئایا بارەگا و پیویستیەکانی سەرکردایەتی لەبەرگەڵو بگوازنەوە بۆ ناوچەی خۆشناوەتی، یان سەرکردایەتی یەک بگەڕێتەوە بۆ بەرگەڵو. لەرووی سیاسیەوە بۆ یەک باشتر بوو، بارەگای سەرکردایەتی لەناوچەی خۆشناوەتی بێت، بەڵام لەڕووی سەربازی و تەکنیکیەوە، گەیاندنی پێداویستیەکانی ڕاگەیاندن و بارەگای مام جەلال بۆ ناوچەی خۆشناوەتی، کارێکی زەحمەت بوو، لەبەرئەوەی دەبوو ئەو پێداویستیانە، لە دۆڵی جافایەتیەوە بەسەر دەریاچەی دووکاندا تێپەڕێنرێن، بگەیەنرێنە ناوچەی خۆشناوەتی، قەبارەی پێداویستیەکان گەورەبوو، بەزەحمەت لەبەرچاوی بازگەکانی سوپای عێراق و جاشەکان دەشاردرایەوە.

---

[28] شێوەزاری هەورامی و کاکەیی و زەنگەنە و شەبەک، زور لەیەکەوە نزیکن، هەمووی پێکەوە بەگوران یان بەماچۆ دەناسرێن.

نــە مەڵبەنــدی دوو، نــە مەکتــەبی عەســکەری، نــە ســەرکردایەتی ینــک، بەرپرسیاریتی گواستنەوەی پێداویستییەکانیان لەئەستۆ نەدەگرت، لەو کاتـەدا جـەبار فەرمـان کـادرێکی پێشـکەوتووی کۆمەڵـەبوو، بەرپرسـی رێکخـراوی سلێمانی کۆمەڵەبوو، بارەگای لەگوندی هەڵـەدن بوو، هاتـە مەیدانـەوە و وتـی: مـن ئامـادەم پێداویسـتییەکانی سـەرکردایەتی، بگەینمـە ناوچـەی خۆشـناوەتی، هیچ لایەنێکی بەرپرس، لەڕووی پێشـنیارەکەی جـەبار فەرماندا نەوەستایەوە، دەرفـەتیان پێـدا ئەرکەکـەی ئـەنجام بـدا. لـەماوەی ٤٨ کـاتژمێردا، هـەرچی پێداویسـتی سـەرکردایەتی هـەبوو، لـەدۆڵی جافایەتیـەوە، بەسـەر دەریاچـەی دوکاندا پەڕاندیەوە و گەیاندییە ناوچەی خۆشناوەتی، بەرامبـەر بـەو ئازایـەتی و دسپلینە سەربازییەی جەبار فەرمان، وەک خەڵاتێکی مەعنەوی، مـام جـەلال لەقەبی فیلەتەنی بۆ جەبار فرمان دانا[٢٩].

**کۆبوونەوەی سەرکردایەتی:**

هاوینی ١٩٨٣، ئەندامانی سەرکردایەتی ینک خۆیـان بۆ کۆبـوونەوە ئامـادە دەکرد، کۆبوونەوەی سەرکردایەتی لە گوندی بالیسـانی نـاوچەی خۆشـناوەتی بـوو، ، منـیش حـەزم دەکـرد لەگـەڵ بەرپرسـی مەڵبەنـدی دوودا، گەشـتێکی ناوچـەی خۆشـناوەتی بکـەم، چـاوم بـەدکتۆر زریـان بکـەوێت، لەبەرئـەوەی د. زریان لەزانکۆ هاورێم بوو، حەزم دەکرد ببینم.

لـەو گەشـتەدا جـەمال تـاهیرم لەنزیکـەوە بینیـی، شـەو کـە گەیشـتنیە سـەر ئاوەکـەی دوکـان، کـەمێک وەسـتاین، چـاوەروانی بەلەمـە بچوکـەکانمان دەکرد بێن و لەئاوەکـە بمانپەڕێننـەوە، مامۆسـتا جـەمال بـەو شـەوە، حـەزی لەمەلـە دەکـرد، دەیویسـت لـەناو گۆماوەکـەی دوکانـدا مەلـەبکات، وایلێهـات مـن و مامۆستا جەمال و چەند پێشمەرگەیەکی تر، بە شەو لەدەریاچەکەدا مەلـەمان کرد. دوای دوو رۆژ گەیشتینە ناوچەی خۆشناوەتی، لەگوندەکانی بالیسان و خەتێ و توتمێ ماینەوە.

---

٢٩ فیلەتەن بەواتای کاری گەورەی فیلانە دێت.

رۆژێکیان خۆم بە تەنیا لەنەخۆشاخانەکەی مەڵبەندی سێ بووم، د. زریان لەوێ نەبوو، سوارڕۆیەک خۆی لەنەخۆشخانە نزیک کردەوە، پێشمەرگە لەسوارڕۆکە دابەزین و بەهەڵەداوان هانایان بۆ هێنام، وتیان: دکتۆر، مامۆستا جەمال باری تەندروستی زۆر خراپە، فریای کەوە، کە مامۆستا جەمالم تاهیرم بینی، گیانی دەدا، سەری بەسەختی بریندار ببوو، دوچاری خوێنبەربونێکی زۆر هاتبوو، ئاگای لەخۆی نەمابوو، ناودەمیم پاک کردەوە، کانیولام بۆدانا.

عەلی بچکۆلی بەرپرسی مەڵبەندی دووش بە سووکی برینداربوو، دەرکەوت هەردووکیان بەهۆی وەرگەرانی سوارڕۆوە، برینداربوون. دوای چەند دەقیقەیەک، مامۆستا جەمال لەبەر دەستمدا گیانی لە دەستدا، بەگوێرەی زانیاری پزیشکی، مێشکی مامۆستا جەمال بەسەختی بریندار ببوو، بەهۆی برینداربوونی مێشکیەوە گیانی لەدەستدا.

مامۆستا جەمال تاهیر خەڵکی شاری سلێمانی بوو، پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگە، بەرپرسی ڕێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەبوو، ئەمنی سلێمانی گومانی لێکردبوو بەرپرسیارێتی هەیە، دەستگیری کردبوو، زۆر ئەشکەنجەیان دابوو، هیچ زانیاریەکی نەدرکاندبوو. کە لەزیندان ئازاد کرا، هاتە شاخ و بوو بەپێشمەرگە. لەکۆنفرانسی دووی کۆمەڵەدا، کە لەتەموزی ١٩٨٢ لەناوزەنگ بەسترا، بەئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێردرا، دواتر کرا بەئەندامی ناوەندی کۆمەڵە، بوو بەبەرپرسی دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە.

بە هۆی شەهیدبونی مامۆستا جەمالەوە، کۆبونەوەکەی سەرکردایەتی ینک چەند رۆژێک دواخرا، تەرمەکەی ئەسپەردە کرا، لەبالیسان بەخاک سپێردرا، ماتەمینی بۆ گێڕدرا. شەهیدبونی مامۆستا جەمال لەو کاتەدا، زیانێکی گەورەبوو، کۆمەڵە دووچاری ململانێییەکی سیاسی توند هاتبوو، داشعێراقیەکان، لەپۆستەکانیان دوورخرابوونەوە، بۆشاییەک لەسەرکردایەتی کۆمەڵەدا دروست ببوو، مامۆستا جەمال لەباڵی کوردستانی کۆمەڵەبوو، لەناو

شار قارەمانێکی زیندان بوو، لەکاری ڕێکخراوەیی نهێنیدا، شارەزاو چالاک بوو، ئەو ماوەیەی پێشمەرگە بوو، تواناکانی زیاتر پێشکەوتبوون، بۆشاییەکی پڕکردبوەوە، هیوای گەورەی لەسەر هەڵچنرابوو.

**لەلای من بمێنەرەوە:**

بالیسان یەکێک لەگوندە جوانەکانی ناوچەی خۆشناوەتیە، هەوایەکی سازگاری هەیە، باخێکی چڕو ئاوێکی زۆری هەیە. بارەگای مامجەلال لەبالیسان بوو، مامجەلال ناردی بەشوێنمدا، کە گەیشتم، لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا کۆبونەوەی دەکرد، منیش دانیشتم و گوێم لەقسەکانی مامجەلال گرت.

تێبینیم کرد ئەو خەڵکەی لەگەڵ مامجەلال دانیشتبوون، بنەماڵەیەکن، لەگەڵ بنەماڵەیەکی تردا کێشەیەکی کۆمەلایەتیان هەیە، مامجەلال دەیویست ناکۆکی و ململانێی نێوان ئەو دو بنەماڵەیە چارەسەر بکات، لەقسەکانیدا باسی گرنگی کاتی بۆ ئامادەبوان دەکرد، دەیوت: تێپەربونی کات لەچارەسەرکردنی کێشەدا گرنگە، مریشک کە لەسەر هێلکە کڕ دەکەوێت، ئەگەر ٢٨ بیست و هەشت ڕۆژی تەواو لەسەر ئەو هێلکانەی بۆی دانراون نەمێنێتەوە، هێلکەکانی نابن بەجووجەڵە، دەبێت ئێوەش پەلەنەکەن، تا کاتی گونجاو بۆ چارەسەری کێشەکەتان دێتە پێشەوە. دواتر نمونەی دەرمان و پزیشکی بۆ ئامادەبوان دەهێنایەوە، کە چۆن نەخۆشی پێ چارەسەر دەکرێت، وتی: لەو بارەیەوە دکتۆر فایق باشتر دەزانێ، ئێستا لەگەڵمان دانیشتووە، بەدەست ئاماژەیەکی بۆ لای من کرد، دیاربوو مام جەلال دەیویست من بەو بنەماڵەیە بناسێنێت.

دوای کۆبوونەوەکە، مام جەلال داوای لێکردم لەگەڵ خۆی بمێنمەوە. دیاربوو مامجەلال و سەرکردایەتی، دەیانویست من لەنزیک خۆیانەوە بمێنمەوە، بۆئەوەی وەک خۆیان دەیانویست پەروەردەم بکەن و لەکێشەی ڕۆژانە و پێکدادانی کادرە ناوەنجیەکانی ینک دوورمبخەنەوە، یەکەمجار فەرەیدون عەبدولقادر پێیوتم دەمانەوێت تۆ لەنزیکی خۆمانەوە بیت، ئێشمان

پێتە، من داواکەی ئەوم قبووڵ نەکرد و چووم بۆ مەڵبەندی دوو، دوای کەمتر لەساڵێک وا جارێکیتر مامجەلال راستهوخۆ پێمدەڵێت، مەڕۆرەوە بۆ مەڵبەندی دوو، لەگەڵ خۆم بمێنەرەوە، بەڵام بەداواکەی مام جەلالیش رازی نەبووم.

**مافی چارەی خۆنووسین:**

ماتەمینی شەهدیبوونی مامۆستا جەمال کۆتایی هات، کوبونەوەی سەرکردایەتی ینک لەبالیسان دەستی پێکردەوە، گرنگترین بریاری ئەو کۆبونەوەیە، گۆڕینی ستراتیجی ینک بوو، تا ئەو کاتە، دروشمی سیاسی ینک، (دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) بوو، لەکۆبونەوەی بالیساندا، ئەو درووشمە گۆڕا بۆ(مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کوردستان). لەڕووی سیاسیەوە ئەو کۆبونەوەیە گۆڕانکاری جدی دروستکرد، تا ئەو کاتە دروشمی سەرەکی هەمو شۆڕشەکانی کورد، (دیمۆکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) بوو، ئەوە یەکەمجار بوو رێکخراوێکی سیاسی، کە سەرکردایەتی شۆڕشی باشوری کوردستانی دەکا، پرۆژەی سیاسی خۆی لەئۆتۆنۆمیەوە، بۆ مافی چارەی خۆنوسین بگۆڕێ و قۆناغی ئۆتۆنۆمی تێپەڕێنێ.

**نەوشیروان مستەفا لە خۆشناوەتی:**

ئەو کاتەی لەسەرگەڵو بووم، باری دارایی ینک زۆر خراپ بوو، جلەکانم دڕابوون، پارەم نەبوو جل بکڕم، مەڵبەندی دوو پارەیان نەبوو، منیش کاتێک هاتبوم بۆ پێشمەرگایەتی، پارەم لەگەڵ خۆم نەهێنابوو، هەندێک پارەم هەبوو لەماڵەوە لای دایکم دامنا، وتم: ئەو پارەیە بۆ خوێندنی ناجحی برام خەرج بکە، ئەو کاتە من بووم بەپێشمەرگە، ناجحی برام خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی ڤێتەرنەری بوو.

پێش ئەوەی بڕۆم بۆ مەڵبەندی دوو، کاتێک لەسەرکردایەتی بووم، مام جەلال دوو سێ جار هاوکاری کردم، دەیوت ئەو پارەیە بنێرەوە بۆ ماڵەوە، منیش پارەکەم دەناردەوە، هیچم بۆ خۆم هەڵنەگرتبوو. شێخ دارای حەفید،

ئەندامی مەڵبەندی دووی ینک و بەرپرسی دارایی مەڵبەند بوو، پەیمانی پێدام کە لەسەر حسابی خۆی جلم بۆ بکرێت، هەر بەتەمای ئەو جلانەی شێخ بووم، بەڵام رێکنەکەوت جلەکانم بۆ بکرێت.

بە جلە دڕاوەکانمەوە گەشتی ناوچەی خۆشناوەتیم کرد، ئەو ماوەیە کە لەناوچەی خۆشناوەتی بووم، چەند رۆژێک لەبارەگای نەوشیروان مستەفا مامەوە، کاتێک نەوشیروان مستەفا بینی جلەکانم دڕاون، وتی: من قاتێک جلم هەیە، شۆردوومە کورت بوەتەوە، بۆ من ناشێت، تۆ لەبەریان بکە، یەکسەر پێشنیارەکەیم قبووڵ کرد، جلەکانم لەبەر کرد، جلەکانی خۆمم فڕێدا. جلەکانی ئەو رانکوچۆغەی دەڤەری باڵەکایەتی بوو، وەک جلوبەرگی دەڤەری سلێمانی نەدوورابوو، تا ئەو کاتەی لەناوچەی خۆشناوەتی بووم، لەبەرکردنی ئەو جلانە لەناو خەڵکدا ئاسایی بوو، بەڵام کە کۆبونەوەی سەرکردایەتی تەواوبوو و گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو، خەڵک بەدەرقاچە تەسکەکانی جلەکانم پێدەکەنین، دەیانوت ئەو جلانە چییە؟ بۆ وایە؟ ، لەبەر پرسیارو توانجی خەڵک، چیتر ئەو جلانەم لەبەر نەکرد.

لەو گەشتەی ناوچەی خۆشناوەتیدا، هەندێک هەڵسوکەوتی تایبەتی نەوشیروان مستەفام بۆ دەرکەوت، کاتی خۆی کە لەسەرکردایەتی بووم، باسی بابەتێکی سیاسی بۆ کردین، لەکۆتایی سمینارەکەدا پرسیارم لێکرد، وتم: کام کتێبانە بخوێنینەوە بۆئەوەی رۆشنبیری سیاسیمان گەشەپێبدەین. وەڵامی نەدامەوە، وەڵام نەدانەوەکەی بەلامەوە جێی سەرنج بوو، چۆن بەرپرسێکی سیاسی، کۆڕگێڕێک، پرسیاری وای لێبکرێت، هیچ وەڵام نەداتەوە، دواتر بۆمدەرکەوت کە بەرپرسەکانی ینک، نایانەوێت ئەندام و کادر و پێشمەرگەکانیان، خۆیان پەروەردە بکەن، رێگە نادەن کادرەکانیان فێری سیاسەت ببن. بۆیە کادرەکانی ینکم ناونا روەکی سروشتی[٣٠]. کادرو

---

٣٠ روەکی سروشتی ئەو روەکەیە کە لەرواندن و گەشەکردنیدا، کاریگەری مرۆڤی لەسەر نیە، خۆی گەورە دەبێت و گەشە دەکات، کادرەکانی ینک کاریگەری سیاسەتی ینکیان لەسەر نەبوو، بە ئارەزووی خۆیان، خۆیان پەروەردە دەکرد.

پێشمەرگەکانی یەکیش، کاریگەری سیاسەتی یەکیان لەسەر نەبوو، هان نەدەدران بۆئەوەی خۆیان پەروەردە بکەن، ئەو ماوەیەی من پێشمەرگەبووم، خولی پەروەردەکردنی کادیرانیش هەڵگیرابوو، ئەو کەسەی بیویستایە لەسیاسەت تێبگات، خۆی رۆشنبیر بکات، دەبوو پشت بەخۆی ببەستێت، ئەو کات هەر یەکێک بەشێوەیەکی تایبەت خۆی پەروەردە دەکرد، ئەمەش یەک لەو هۆکارانە بوو کە یەکێتی بیروڕای، لەناو ریزەکانی کۆمەڵەو یەکدا لاواز کرد.

ئەو کاتەی لەناوچەی خۆشناوەتی، لەنزیکی نەوشیروان مستەفاوە بووم، هەستم بەهەندێک تایبەتمەندی تری کرد، ئێوارەیەکیان لەبالیسان هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی لەسەر سفرە نانیان دەخوارد، منیش بانگکرابوم بۆ ئەو نانخواردنە، لەگەرمەی نانخواردندا، نەوشیروان مستەفا رەخنەی توندی لەئەرسەلان بایزی بەرپرسی راگەیاندی یەک گرت، وتی: گوێم لەدەنگوباسی رادیۆکەتان بوو، بێژەرەکە دەیوت، لەکاتی خوێندنەوەی ئەم هەواڵەدا، گوێمان لەدەنگی تەقینەوەی تۆپەکانی دوژمنە، ئەوە ئاشکراکردنی شوێنی رادیۆکەمان بوو، چۆن دەبێت بێژەر لەو کاتەدا قسەی وا بکات؟

ئەو رەخنەیەی نەوشیروان مستەفا بەتەواوی راست بوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو رەخنەیە لە کۆبونەوەدا نەبوو، لەکاتی نانخواردندا بوو، ئەرسەلان بایز رەخنەکەی پێهەرسنەکرا، نیگەران بوو، نەوشیروان مستەفاش لەو نیگەرانتر بوو، لەو کاتەوە نەمبیستووە پەیوەندی نێوان نەوشیروان مستەفا و ئەرسەلان بایز خۆش بووبێت.

کاتیک مامۆستا جەمال تاهیر شەهید بوو، نەوشیروان مستەفا زۆر خەمبار بوو، بەچاوی خۆم بینیم، لەسەر تەرمە ئەسپەردەکراوەکەی شەهید جەمال، لەکانیەکەی بالیساندا دەستی بەگریان کردبوو، بەدەستەسرێک فرمێسکەکانی خۆی دەسری، دوای تەواوبونی ماتەمینی شەهید جەمال، شۆفێرکەی خۆی دەرکرد، چوونکە ئەو سوارڕۆیەی کە وەرگەڕاو بەهۆیەوە

مامۆستا جەمال شید بوو، ئەو لێیخوڕیبوو، وتبوی: من ناتوانم تۆ ببینیم، کە تۆ دەبینم، مەرگی مامۆستا جەمالم بیردێتەوە.

لەبەهاری ساڵی ١٩٨٣ دا، شەڕی نێوان ینک و حسک هەمو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، ینک کاکەسوری قوریتانی لەزیندان دەرکرد و شەهیدی کرد، هێزی بەردەشانیەکانی، خزمانی رەسوڵ مامەندی لەسنوری مەڵبەندی دوو شکاند. لەشەڕی قرناقەو پشتئاشاندا، لەگەڵ هێزەکانی تری بەرەی جودا حسک شکا، لەو جەولەیەی شەڕی براکوژیدا، لەزۆربەی ناوچەکان، حسک بەرامبەر بە ینک شکا.

حسک تەنها لەشارەزور باڵادەست بوون، پێشمەرگەکانی حسک، جەمیل هەورامی و شەوکەت حەمەساڵح و مام جافریان دەستگیرکرد، رۆژانە پڕوپاگەندەی کوشتنی ئەو کادرانە بڵاودەکرایەوە.

جافر و شەوکەت لەباڵی کوردستانی کۆمەڵەبوون، جەمیل هەورامی کادری یشک بوو، مەڵبەندی یەک بەدەستی داشعێراقیەکانەوە بوو، لەبەرململانێی نێوان باڵەکانی کۆمەڵەو یشک، بەرپرسانی مەڵبەندی یەک گرنگی بەو کادرە دەستگیرکراوانە نەدەدا، هەوڵی ئازادکردنیانی نەدەدا. کەسوکارو دۆستانی ئەو کادرانە، لەنێوان سەرکردایەتی حسک و سەرکردایەتی ینکدا هاتوچۆیان دەکرد، بۆئەوەی رێگری لەکوشتنیان بکەن و هەوڵی ئازادکردنیان بدەن.

بارەگای کاتی نەوشیروان مستەفا، لەنێوان گوندی خەتێ و گوندی توتمێی ناوچەی خۆشناوەتیدا بوو، لەیەکێک لەو رۆژانەدا، کە من لەبارەگای نەوشیروان مستەفا بووم، پێشمەرگەیەک هات بۆ لام، وتی دکتۆر پیاوێک هاتوە بۆ لات، دەڵێ: ناوم جەماڵە، دەمەوێت دکتور فایق ببینم، منیش چووم بەدەمیەوە، ناسیمەوە، جەمالی حەمەعەلی برای نوری حەمەعەلی بوو، لەبەرئەوەی لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا من هاتوچۆی ماڵی حاجی ئەولەی باوکی مام جافرم دەکرد، جەمالیش بەبۆنەی نوری حەمەعەلی برایەوە لەتەوێڵە هاتوچۆی ماڵی حاجی ئەولەی دەکرد، یەکترمان دەناسی، دوای

بەخێرهاتن و هەواڵپرسین، ئامانجی سەردانەکەی بۆ بارەگای نەوشیروان مستەفا رونکردەوە و وتی: حسک دەیەوێت مام جافرو هاورێکانی بکوژێت، لای حسکەوە زۆر هەوڵمان داوە ئەو کارە نەکەن، بەڵام بۆئەوەی لەم کارەدا سەرکەوتوو بین، دەبێت سەرکردایەتی ینک هاوکاریمان بکات. من هاتووم کاک نەوشیروان ببینم، بۆئەوەی لەڕەئی حسک و لەڕەئی بنەماڵەی گیراوەکان ئاگاداری بکەمەوە، بەڵکو ئەویش بۆ ئازادکردنی مام جافر و هاورێکانی هاوکاریمان بکات.

دوای ئەوەی گوێم لەقسەکانی جەمالی حەمە عەلی گرت، چووم بۆ لای نەوشیروان مستەفا، باسی دەستگیرکردنی مام جافرو هاورێکانیم بۆ کرد، باسی گرنگی مام جافرم بۆ خۆم کرد، دواتر وتم: جەمالی حەمەعەلی بۆ ئەو مەبەستە هاتوە تۆ ببینێت، یەکسەر وەڵامی دامەوە، وتی: من جەمالی حەمەعەلی بەپیاو نازانم. نامەوێت بیبینم.

ئەو هەڵوێستە چاوەڕوان نەکراوەی نەوشیروان مستەفا، وەک چەقۆیەک دڵمی بریندارکرد، بەڵام لەو کاتەدا هێندە نەوشیروان مستەفام بەگەورەو گرنگ دەزانی، جارێکی تر بەرامبەر بەو هەڵسوکەوتەشی بێدەندگیم هەڵبژارد، تەنیا بەخەم خواردن وەڵامی هەڵوێستە چاوەڕوان نەکراوەکەیم دایەوە. ناخۆشتر لەو وەڵامەی نەوشیروان مستەفا ئەوەبوو، چی بەجەمالی حەمەعەلی بڵێم، بیرم نایەت چۆن وەڵامی جەمالم دایەوە، جەمال بەبێ وەڵام، بەبێ ئەوەی بتوانێت نەوشیروان مستەفا ببینێت، لەخۆشناوەتیەوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی.

دواتر بیرم لەوە دەکردەوە، هاوڵاتییەکی دۆستی پدک ی وەک جەمالی حەمەعەلی، بەهۆی پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوە، عەوداڵی ئازادکردنی مام جافری کادری کۆمەڵەو زیندانی سیاسی و پێشمەرگەی ینک بووە، کەچی سکرتێری کۆمەڵە، هیچ گرنگییەک بەئازادکردنی کادری حزبەکەی نادات. من نازانم ئەگەر نەوشیروان مستەفا کاتی خۆی، لەسەردەمی ژیانی مەدەنیدا، ناکۆکی لەگەڵ جەمالی حەمەعەلیدا هەبوبێت یان نا، بەڵام واتێگەیشتم ئەو هەڵوێستەی

نەوشیروان مستەفا، هەڵویستێکی سیاسی دڵڕەقانەیە، لەبەرئەوەیە کە جەمال برای شەهید نوری حەمەعەلیە، نوری حەمە عەلی لەلایەن مەفرەزەی ئیغتیالاتی یەکێتیەوە تیرۆرکراوە. بە لای منەوە ئەوە باشترین کات بوو، بنەماڵەیەکی رکەبەر، یان دوژمن، لەخۆت نزیک بکەیتەوە، هەوڵی رێکەوتنی لەگەڵدا بدەیت، نەک بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەیت.

ئینجا تێگەیشتم کە نەوشیروان مستەفا، وەک بەرپرسانی مەڵبەندی یەک، هیچ گرنگی بەمان و نەمانی کادرەکانی نادات، ئامادە نیە لەگەڵ حسک، لەرێگەی خەڵکەوە، بۆ ئازاد کردنی کادرەکانی، هەنگاوێک بنێت.

یەکێک لە هۆکاری ناکۆکیە سیاسیەکانی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان، درێژبونەوەی ئەو ناکۆکیانەی شەڕی براکوژی و تیرۆری سیاسی ئەو کاتەیە، حزبە سیاسیەکان نەک هەر بەرنامەیەکیان بۆ چارەسەری ئەو کێشانە دانەناوە و پڕۆژەی ئاشتیی نیشتمانیان نییە، بەڵکو ئەگەر تاک و تەرا دەرفەتی ئەو ئاشتبونەوەیە، لەسەر ئاستی تاک رەخسابێت، وەک ئەوەی جەمالی حەمەعەلی هاتبوو بۆ لای نەوشیروان مستەفا، سەرکردەکان ئەو دەرفەتەشیان لەباربردوە.

ئەو کاتەی لەخۆشناوەتی لەبارەگای نەوشیروان مستەفا مامەوە، رۆژێکیان عەلی بچکۆل هات بۆ ئەویَ، وتیان: عەلی بچکۆل میوانی هەیە، میوانەکە دەیەوێت تۆش ببینێت، چووم بۆ ئەو بن دارەی کە چەند مەترێک لەدووری بارەگاکەوە بوو، دوو ژن لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و عەلی بچکۆلدا دانیشتبوون، یەکێک لەژنەکانم ناسیەوە، لەنەخۆشخانە نێرس بوو، لەو کەسانە بوو، کە لەنەخۆشخانە بەکچێکی شۆڕشگێر دەناسرا، چۆنی و چاکی گەرممان لەگەڵ یەکتردا کرد، ژنەکەی تریشیان هەر لەنەخۆشخانە نێرس بوو، من نەمدەناسی، خزمی عەلی بچکۆل بوو. دەستمان بەقسە کرد، نەوشیروان مستەفا لەکاتی قسەکانیدا باسی ئەوەی دەکرد کە ینک بەچاوی رێزەوە سەیری دکتۆر دەکات، وە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەندیک ئاماژەی بەوەدا،

که هەوڵی کوشتنی دکتۆر ئومێد مەدحەت و کوشتنی کەیکاوس لەباتی دکتۆر ئومێد، بەبڕیاری سەرکردایەتی ینک نەبووە، دیاربوو ئەو قسانەی بۆیە دەکرد، بۆئەوەی ئەو دوو کارمەندە کە گەڕانەوە، لەنەخۆشخانەکان ئەو هەواڵە بڵاوبکەنەوە، بۆئەوەی دکتۆرەکانی سلێمانی و کوردستان متمانە بەینک بکەن، وا تێنەگەن یەکێتی دەیەوێت سزای ئەو پزیشکانە بدات، کە هاوکاری پێشمەرگە ناکەن.

لەگەرمەی قسەکاندا، فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەر هاتە ئاسمانی ناوچەکە، لێمان نزیک بووەوە، نەوشیروان مستەفا یەکسەر هەستا، ئاربیجیەکی بەدەستەوە گرت، لەبن بەردێکدا سەنگەری لەفڕۆکەکە گرت، من و عەلی بچکۆلیش لەجێی خۆمان هەستاین، هەر یەک لەشوێنێکدا سەنگەرمان گرت، بەڵام باش بوو، فڕۆکەکە دوورکەوتەوە، بۆردومانی نەکرد.

**کەرتەکەی هاوڕێ جەبار :**

ئەو کاتانەی لەسەرگەڵو بووم، لەسنوری چالاکی تیپی ٤٧ پیرەمەگرون نزیک بووم، بریندارەکانی تیپی ٤٧ زوو دەگەیشتنە لام، بەباشی چارەسەرم دەکردن، کەرتی هەرە چالاکی تیپ، کەرتی شەهید سەلاحی موهەندیس بوو، ئەو کەرتە بوو کە هاوڕێ جەبار فەرماندەیی دەکرد، برینداری زۆریان هەبوو، بریندارەکانیان دەهێنایە سەرگەڵوو، منیش دەمبینین و چارەسەرم دەکردن، بەو هۆیەوە هاوڕێیەتیم لەگەڵ پێشمەرگەکان و فەرماندەی کەرتەکەیان باش پێشکەوتبوو.

لەدرێژەی چالاکیەکانی کەرتەکەی هاوڕێ جەباردا، کاتێک مەفرەزەیەکی کەرتەکەی هاوڕێ جەبار، پەلاماری مۆڵگەیەکی سەربازیی ڕژێمی دەدا، کەوتنە کەمینەوە، هاوڕێ جەبارو دڵشاد و پێشمەرگەیەکی تر شەهید بوون. تا ئەمڕۆش جوانی و لەسەر خۆیی و ژیری و ئازایەتی، هاوڕێ جەبارو کەرتەکەیم لەبیرناچێتەوە.

هـاورێ جـەبارو سـەلاحی موهەنـدیس و دکتـۆر کامـل و شـێخ محەمـەد و حەمەتوفیـق ڕەحـیم، خـاڵۆزاو پـورزای یـەکتر بـوون، بـێجگە لە حەمەتوفیـق، لەکات و شوێنی جیاوازدا هەموویان شـەهیدبوون، لەبنەماڵـە خۆشـگوزەران و شۆڕشـگێڕەکانی شـاری سـلێمانی بـوون، بەسـەرو مـاڵ، خزمـەتێکی زۆریـان بەینک و بەشۆڕشی نوێ کرد.

**ددان کێشان:**

یـــەکێک لەکێشـــەکانی پزیشـــکانی پێشـــمەرگە، ددان کێشـــان بـــوو، لەپێشمەرگایەتیدا، بەتایبـەتی لەسنوری تیپ و کەرتەکانـدا، هـەر کـەس ددانـی ئـازاری پێبگەشـتایە، دەبـوو ددانـی بکێشـێت، لەبەرئـەوەی پزیشـککی ددان و ئامێری پڕکردنەوەی کلۆری ددانمان نەبوو. تا لەسەرکردایەتی بووین دکتۆر سەردار چارەسەری نەخۆشی ددانـی دەکرد، کە هاتمـە سـەرگەڵو تـەنیا خـۆم بووم، دەبو بەرامبەر بەنەخۆشی و ئازاری ددانی نەخۆشەکان، کارێک بکەم.

ئەو کاتەی لەسەرکردایەتی بووم، هەندێک زانیاریم لەسـەر بـەنجکردنی ددا ن و ددان کێشـان لـە د. سـەردارەوە وەرگـرت، بـەڵام هێشـتا خـۆم تـاقی نـەکردبوەوە، بـزانم دەتـوانم ددان بکێشـم یـان نـا. ڕۆژێکیـان دڵشـادی پێشمەرگەی کەرتەکەی هاوڕێ جەبار هاتە لام، وتی دکتۆر ددانم زۆر ئـازارم دەدات، ئۆقرەی لێبڕیوم، تکایـە ددانـم بۆ بکێشـە. بە ناچـاری دەسـتم بـەکاری ددان کێشـان کـرد، دڵشـاد پێشـمەرگەیەکی کەڵەگـەتی باڵابـەرز بـوو، باشـبوو کـــەمێک دەمـــی گـــەورەبوو، ددانەکـــەیم بـــەنجکرد، بەســـەرکەوتویی ددانە کلۆرەکەیم بۆ کێشا. ئەو ددان کێشانە بۆ من ئـەزمونیکی پزیشـکی نـوێ بـوو، لەپێشمەرگایەتیدا فێری بووم.

**دومەڵ:**

کاوە عەرەب پێشـمەرگەیەکی عـەرەبی تیپـی ٢١ کـەرکوک بـوو، ڕۆژێکیـان لەسـەرگەڵو هاتـە لام، وتـی: لەگونـدی قەمچوغـەی نزیـک دوکـان، نەخۆشـێک هەیـە، بـەڵکو سـەردانی بکـەیت، وتـم: نەخۆشـیەکەی چییـە؟ کـە باسـی

نەخۆشییەکەی بۆ کردم، بەباسەکەی کاوە عەرەبدا تێگەیشتم ئەو نەخۆشە دووچاری دومەڵ بووە. بۆ رۆژی دوایی، ئامێری پێویستی نەشتەرگەری بچوک و دەرمانم خستە ناو کۆڵەپشتەکەم، لەگەڵ کاوە و پێشمەرگەیەکی تردا، بەرەو قەمچۆغە بەڕێکەوتین. کە گەیشتینە قەمچۆغە، چووین بۆ ماڵی مام عومەر، مام عومەر دوچاری نەخۆشی دومەڵ ببوو، نەشتەرگەریم بۆکرد، دەرمانم بۆ نوسی، رێنماییم کرد چۆن تەداوی برینەکە بکەن.

مام عومەر، سەرۆک خێزانی یەک لەو خانەوادانەی شاری کەرکوک بوو، کە رژێمی بەعس لەزینداندا کوڕێکی شەهیدکردبوو، کوڕەکانی تری ببوون بەپێشمەرگە، خۆشی لەکەرکوک کاری رێکخستنی نهێنی کۆمەڵەی کردبوو، بۆ خۆپاراستن لەگرتن و کوشتنی رژێمی بەعس، کەرکوکی بەجێهێشت بوو، لەگوندی قەمچوغەی نزیک دوکان لەگەڵ منداڵەکانیدا نیشتەجێ ببوو.

**دوو قەل:**

رۆژێکیان گەنجێکی خەڵکی گوندی سەرمۆردی ناوچەی جافایەتی هاتە لام، وتی: دکتۆر ئەو گرێیانەم بۆ عەمەلیات دەکەییت؟ کە پشکنینم بۆ کرد، دووچاری گرێی چەوری ناوچەوان ببوو، وتم: بەسەرچاو، بەبەنجی مەوزوعی، نەشتەرگەری گرێ چەوریەکانم بۆ کرد. ئەو گەنجە بەو نەشتەرگەریە زۆر دڵخۆش بوو، دوایی بۆیان باسکردم، کە چەند جارێک خوازبێنی ژنی کردوە، بەهۆی ئەو گرێیانەوە ژنیان نەداوەتێ، ماڵی باوکی کچەکە ترساون ئەو گرێیانە نەخۆشی خراپ(شێرپەنجە)بێت. دوای نەشتەرگەریەکە، گەنجەکە خوازبێنیەکەی دووبارە کردبویەوە، ئەوجارە سەریگرتبوو، خۆشەویستەکەی لێمارەکرابوو، بەو بۆنەیەوە دوو قەلی بۆ هێنام، قەلەکانم لێوەرنەگرت، هەر بەخۆیدا هەردوو قەلەکەم ناردەوە. ئەو کاتە من یەکلایەنە سەیری دیارییەکەم کرد، تەنها بە بەرتییلم دەزانی، دواتر کە ئەو بابەتەم لای هاوڕێکانم باس کرد، وتیان: دەبوو هەر هیچ نەبێت یەکێک لەقەلەکانت لێوەربگرتایە، نەوەک نەخۆشەکە هەست بەکەمی بکات، وابزانێت حسابت بۆ نەکردووە .

**فیڵەکەی شێخ محەمەد:**

مەفرەزەیەکی تیپی ٤٧ پیرەمەگروون، لە ناو شاری سلێمانی، کوێخای سەرچناری دەستگیرکردبوو، هێنابووی بۆ مەڵبەند، لەمەڵبەند زیندان کرا، کوێخا لەزیندان رایکرد، لەکاتی راکردندا کوێخا کەوتوو رانی شکا، شێخ محەمەدی بەرپرسی کاروباری کۆمەڵایەتی، هاتە لام، وتی: دکتۆر ئەو برینداره ببینە، بزانە چی لێبکەین، کە پشکنینم بۆ کرد، ئێسکی رانی شکابوو، وتم: رانی شکاوە، من ناتوانم لێرە چارەسەری بکەم، دەبێت بینێرین بۆ شوێنێکی تر بۆئەوەی نەشتەرگەری بۆ بکەن.

بۆ رۆژی دوایی هەواڵێک بڵاوبوەوە: دکتۆر فایق کوێخای سەرچناری ئازادکردوە، دیاربوو بەرپرسانی مەڵبەند خۆیان دەیانویست کوێخا ئازاد بکەن، بەڵام لەبەر نارەزایی پێشمەرگە و رێکخستن، نەیاندەوێرا بەئاشکرا ئەو کارە بکەن، لەوە دەچوو هەرخۆیان رێگەیان دابێت لەزیندان رابکات، بەڵام لەدەرەوەی زیندان کەوتبوو لاقی شکابوو، هۆکارێکی تایبەتیش بۆ دەستگیرکردنی کوێخا نەبوو، سەرکردایەتی و مەڵبەند بڕیاری دەستگیرکردنیان بۆ کوێخا دەرنەکردبوو.

کاتێک ئەندام و کادرو پێشمەرگەکانی کۆمەڵە، ئەو هەواڵەیان بیست، کەوتنە رەخنەو گلەیی لە من، منیش نەمزانی مەڵبەند فیڵم لێدەکەن، ئەو قسەیەم دەکەن بەبیانوو، کە وتم رانی شکاوە و ناتوانم چارەسەری بکەم، بەو هۆیەوە کوێخاکە ئازاد دەکەن و دەڵێن دکتۆر ئازادی کردووە.

**گوێ بڕاو:**

هاوینی ساڵی ١٩٨٣، لەسەر بانی نەخۆشخانەکەی سەرگەڵو نوستبووم، بەیانی زوو کەسێک هاتە سەربانی نەخۆشخانەکە، بەئەسپایی وتی: دکتۆر ئەو گوێیەم بۆ بخەرەوە شوێن خۆی، سەیرم کرد، پیاوێک لەسەر سەرم وەستاوە، پارچەگۆشتێکی بەدەستەوەیە، کە باش لە پارچەگۆشتەکە

وردبوومەوە، دڵنیابوم کە گوێچکەیە، کە سەیری سەروسیمای کەسەکم کرد، گوێچکەیەکی لەسەری کرابووەوە، لەشوێنی گوێچکە لێکراوەکەدا، کەمێک خوێنی مەییوم بینی. دیمەنێکی زۆر بێزارکەر بوو، لەڕووی پزیشکیەوە هیچی بۆ ناکرێت، لەڕوی کۆمەڵایەتیشەوە، گوێ بڕین گەورەترین کەتنە، کەسێک بەرامبەر بەدوژمنی دەیکات.

بەشداری خەمی بریندارەکەم کرد، تێمگەیاند کە ناتوانم هیچی بۆ بکەم، وتم: ئەگەر بشڕۆیت بۆ ناو شار، هیچ سودیی نابێت، دواتر وتم: بەس نیە دوژمنەکەت نەیکوشتوویت، بەوە کەمێک هێور بوەوە، هەستا بەجێیهێشتم. ئەو بریندارە جوتیارێکی گوندەکانی دۆڵی جافایەتی بوو، شەو لەکاتی خەوتندا، دوژمنەکانی چوبونە سەری و گوێیان بڕیبوو.

**یاخیبوونی حەمەسەعید حەسەن:**

حەمەسەعید حەسەن پێشمەرگە بوو، کادری بەشی ڕاگەیاندنی ینک بوو، ساڵی ١٩٨٣بارەگای ڕاگەیاندنی ینک لە بەرگەڵو بوو، بەو هۆیەوە، بڵاوکراوەکانی ڕاگەیاندنی ینکمان زوو بەدەست دەگەیشت. یەکێک لەو نامیلکانەی ئەو ماوەیە خوێندمەوە، نوسینێکی شاعیری پێشمەرگە، حەمەسەعید حەسەن بوو، دەربارەی یەکێتی نوسەرانی کورد نوسیبووی، ناوەڕۆکی نامیلکەکە، ڕەخنەگرتنێکی توندی ئەو نوسەرو ئەدیبانەی کوردستان بوو، کە بەلایانەوە ئاسایی بوو، یەکێتی نووسەرانی کورد هەڵوەشێتەوە، ببێت بەلقی یەکێتی نوسەرانی عێراق.

یەکێتی نووسەرانی کورد، دوای ڕێککەوتنی بەیانی ١١ئازاری ١٩٧٠ دامەزرا بوو، حکومەتی بەعس، ساڵی ١٩٨٣ بەبڕیارێک، ئەو یەکێتیەی هەڵوەشاندەوە، کردی بە لقی یەکێتی نوسەرانی عێراق. حەمەسەعید ڕەخنەی توندی لەژمارەیەک نووسەری کورد گرتبوو، کە پشتیوانیان لەبڕیارەکەی حکومەتی بەعس کردبوو.

کاتێک حەمەسەعید حەسەن ئەو نامیلکەیەی نووسی، ینک و حکومەتی عێراق، ئامادەکارییان بۆ گفتوگۆ و ڕێککەوتن دەکرد، هەندێک لەو نووسەرانە،

کە لەگەڵ ئەوەبوون یەکێتی نوسەرانی کورد هەڵوەشێتەوە و ببێتە لقی یەکێتی نوسەرانی عێراق، کەسانی نزیکی بەرپرسانی ینک بوون، لەگەڵ حەمەسەعید حەسەنیشدا ناکۆکییان هەبوو. سەرکردایەتی ینک، وە بەتایبەتی نەوشیروان مستەفا، لەباتی ئەوەی داکۆکی لەبۆچوون و هەڵویستی حەمەسەعید حەسەن بکا، دەستیان بەدژایەتی کردنی حەمەسەعید کرد.

ئەوە وای لەحەمەسەعید حەسەن کرد، بەرامبەر بەسەرکردایەتی ینک و شاعیرە دۆستەکانی ینک، پەرچەکرداری توند بنوێنێ، هۆنراوە هەجوە بەناوبانگەکەی بنوسێت و لەناو هێزی پێشمەرگەدا بڵاویی بکاتەوە، ئەو هۆنراوەیە بە(بۆینباخ) ناوی دەرکرد، لەهۆنراوەکەدا سەرکردەکانی ینک و شێرکۆ بێکەسی هەجوو کردبوو. دوای ئەو هۆنراوەیە، حەمەسەعید حەسەن وازی لەینک هێنا، گەشتی ئەورووپای کرد، دەستی بە نووسینی هۆنراوەی رەخنە ئامێزو هەجووی سیاسی کرد.

**وریا:**

پێش ئەوەی پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بکەم، رۆژێک لەنەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی ئێشکگربووم، برینداریکیان هێنا، فریا نەکەوتین هیچی بۆ بکەین، یەکسەرگیانی لەدەستدا، وتم: ئەم برینداره کێ بوو، وتیان: ئەوە سدیق ئەفەندی بوو، لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، بەرپرسیاریێتی گەورەی هەبووە، لەکۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستدا، دەستی لەدەستگیرکردن و شەهیدکردنی بەرپرسەکانی رۆژهەلاتی کوردستاندا هەبووە، لەبەر ئەوە تیرۆر کراوە.

پێش تیرۆری سدیق ئەفەندی و دوای ئەویش، چەند کادرێکی تری پدک، لەسلێمانی تیرۆر کران، وەک شەفیق ئاغا، عەبدولی سۆران، نوری حەمەعەلی. هەندێ بەرپرسی تری شۆڕشی ئەیلول، سلێمانیان بەجێهێشت، نەوەک ئەوانیش تیرۆر بکرێن. لەو کاتەدا هەواڵ بڵاوبوەوە کە فایقە رەش، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی پدک کردوە، بۆئەوەی خۆی لەتیرۆری ینک بپارێزێت.

دوای کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، کاتێک ماڵم لەسەقز بوو، سوارئاغای برای فەتاح ئاغام بینی، وتی: من بۆیە بووم بەپێشمەرگە، لەبەرئەوەی زانیاریم پێگەیشت، ناوم لەلیستی تیرۆری یەکدا هەبوو، دەیانویست تیرۆرم بکەن.

ئەوانەی کە بەر شاڵاوی تیرۆری مەفرەزەی یەک کەوتبوون، بێجگە لەنوری حەمەعەلی، کەسیانم نەدەناسی، نوری لەشۆڕشی ئەیلولدا جێگری فەرماندەی هێزی خەبات بوو، تا بڵێی کوردێکی نەتەوەیی پاک و بێگەرد بوو، کوردی هەموو پارچەکانی کوردستانی وەک یەک خۆشدەویست، لەکاتی خەباتی پێشمەرگایەتیدا، هیچ تاوانێکی دژی کوردانی رۆژهەڵاتی کوردستان، ئەنجام نەدابوو، زیانی بە خەڵکی مەدەنی نەگەیاندبوو، ناوی دەهات کە بەنهێنی لەگەڵ کاژیک کار دەکات.

کاتێک لەسەرگەڵو بووم، دەنگوباسێک بڵاوبوەوە، پێشمەرگەیەکی یەک بەناوی وریا، لەلایەن ڕێکخراوی کۆمەڵەوە، لەهەڵەدن دەستگیرکراوە، دەوترا وریا بەرپرسی تیرۆری سیاسی ناوشاری سلێمانی یەک بووە، کۆمەڵێک نهێنی دەربارەی تیرۆری ناو شار لەلابووە، سکرتێری کۆمەڵە داوای لێکردوە ئەو نهێنیانە رادەست بکاتەوە، بەڵام وریا ئامادە نەبووە نهێنیەکان رادەست بکاتەوە.

وریا ئەندامی کۆمەڵە بوو، ماوەیەک لەناو شار بەنهێنی کاری کردبوو، دواتر پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کردبوو. دواجار کۆمەلە وریا رادەسپێرێ بچێتە ناو شار، کەسێک بەناوی فوئادی مەجید مسری تیرۆر بکات، ئەم جارە وریا نەک هەر ئەو کارە ئەنجام نادات، بەڵکوو ئاگاداری ئەو کەسەش داکاتەوە، کە ئەو بۆ تیرۆرکردنی راسپێردراوە، با ئاگای لەخۆی بێت.

کاتێک سەرکردایەتی کۆمەڵە، دەزانێت وریا ئەرکی خۆی ئەنجام نەداوە ، بانگی دەکەن، داوای ئەو نامانەی لێدەکەن کە بڕیاری تیرۆری سیاسی پێدراوە، وریا ئامادە نابێت نامەکان رادەستی سەرکردایەتی کۆمەڵە بکاتەوە.

لەکۆتاییدا وریا دەستگیرکرا، داوای ئەو نامانەی لێدەکرا کە بڕیاری تیرۆری ئەو کەسانەی تێدابوو وە تیرۆری کردبوون، وریا ئامادە نەبوو نامەکان رادەست بکاتەوە، لەبەرئەوە وریا لەلایەن پێشمەرگەکانی رێکخراوی کۆمەڵەوە، لەنزیک هەڵەدن، پاش ئەشکەنجەیەکی زۆر کوژرا.

بەرامبەر بەکوشتنی وریا، یەکێتی و کۆمەڵە، وە بەتایبەتی نەوشیروان مستەفاو جەبار فرمان، بەرهێرشی توندی خەڵک و پێشمەرگە کەوتن، تا ماوەیەک ئەو رووداوە دڵتەزێنە، ناکۆکی لەنێوان کادرو پێشمەرگەکانی ینکدا درووستکرد. هەزاران کەس لەکادری یەکێتی و کۆمەڵە، دژی کوشتنی وریا راستبوونەوە، کادرو بەرپرسانی تری یەکێتیش هەبوون، وریای بەهەڵە دەزانی، دەیانوت نەدەبوو وریا لەحزب یاخی ببێت، دەبو بەڵگەکانی رادەستی سەرکردایەتی کۆمەڵە بکردایەتەوە. هەر بەهۆی ئەو روداوە دڵتەزێنەوە، ماوەیەک دوای رووداوەکە، پەیوەندی نێوان جەبار فرمان و نەوشیروان مستەفا تێکچوو.

وریا نهێنیەکانی لای هەندێک رکەبەری سکرتێری کۆمەڵە درکاندبوو، ئەو بەرپرسانە سەربە باڵی داشعێراقی کۆمەڵە بوون، دواتر لەکۆمەڵە جیابوونەوە، ئاڵای شۆڕشیان پێکهێنا، دواتر دەرکەوت هەر ئەوانە پشتی وریایان گرت و هانیان دەدا نامە نهێنیەکان رادەستی سکرتێری کۆمەڵە نەکاتەوە.

ساڵی ١٩٨٤ لەکاتی نزیکبونەوەی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا، مەلا بەختیار و هاوڕێکانی، دەیانویست کوشتنی وریا، لەکۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا، بۆ لێدانی نەوشیروان مستەفا بەکاربهێنن، بەڵام نەیانتوانی ئەو کارە ئەنجام بدەن.

دوای راپەڕین و روخانی رژێمی سەدام، ساڵی ٢٠١٤ ئەو نامانەی لای وریا بوون، کە رادەستی سەرکردایەتی کۆمەڵەی نەکردنەوە، لەگۆڤاری لڤین[٣١]

---

٣١ لڤین گۆڤارێکی سیاسی مانگانیە لە سلێمانی دەردەچێت.

بڵاوکرانەوە، دیاربوو نامەکان لەلای یەکێک لەبەرپرسەکانی ینکی رکەبەری نەوشیروان مستەفا بوون. بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین، وریا قوربانی ململانێی دەسەڵاتخوازی سەرکردەکانی کۆمەڵە بوو.

**دکتورە ئیلهام:**

دکتوری ساختەو کۆلکە دکتور، یەک لە کێشەکانی پزیشکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، ئەو کەسانە بەبێ ئەوەی بڕوانامەیەکی زانستیان هەبێت، خۆیان دەکرد بەدکتۆر، دەستیان بە چارەسەری نەخۆش دەکرد. ئەو کاتەی لەسەرگەڵو بووم، هەواڵێک بڵاوبووەوە، دکتۆرەیەکی ژن پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کردوە، ئەو هەواڵەم پێخۆشبوو، لەلای خۆمەوە دەموت: تۆ بڵێی ئەوە راست بێت؟ بەڵام خۆ من زۆربەی دکتۆرە ژنەکانی سنوری پارێزگای سلێمانی دەناسم، کەسی وا لەناو دکتۆرەکاندا شک نابەم، هەستی شۆڕشگێری لەو ئاستەدا بێت، دەست لەبەرژەوەندی خۆی هەڵگرێت و چەکی پێشمەرگایەتی لەشان بکات.

پاش چەند رۆژێک دەرکەوت هەواڵەکە راستە، مەڵبەند بەفەرمی دکتۆرە ژنەکەیان بۆ نەخۆشخانە نارد، بەنامەیەک ئاگاداریان کردمەوە، لەمەولا دکتۆرە ئیلهام لەنەخۆشخانە دەوام دەکات. منیش بەخێرهاتنم کرد، هەر زوو هەستم کرد ئەو خانمە، سەروو فەساڵ و کڵتووری پزیشکی نییە، پرسیارم لێکرد: خەڵکی کوێیت؟ دەرچوی کام زانکۆیت؟ ئەویش بێ پێچ و پەنا وتی: خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستانم، پێشمەرگەی کۆمەڵەی ئێران بووم، نەخۆش کەوتم، ماوەی چل رۆژ لەنەخۆشخانە چارەسەر کرام، لەکاتی نەخۆشیەکەمدا، لەنەخۆشخانە، فێری دەرزی لێدان و تەداوی بووم.

ئەو چل رۆژ نەخۆش کەوتنە، بڕوانامەی پزیشکی دکتۆرە ئیلهام بوو، رەشبینی دایگرتم، نەمدەزانی چۆن لەگەڵ ئەو خانمە بەدکتۆرکراوەدا رەفتار بکەم. دوای ئەوەی چەند رۆژێک لەلای من دەوامی کرد، شالاوی عەلی

عەسـکەری هـات بـۆ لام، ئامۆژگـاریی کـردم، وتـی: ئـەو ژنـە لـەخۆت دووربخەرەوە. لەڕێگەی ڕێکخستنی کۆمەڵەشەوە، هەندێک زانیاریم پێگەیشت، وتیان: پێش ئەوەی پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکات، ئەو خانمە لەماڵی یەکێک لەمستەشارەکانی ڕژێمی بەعسدا بووە، بۆیە منیش بەئیلهام خانم وت: لەنەخۆشخانە دەوام مەکە.

**بڕیاری مەزاجی:**

لەبەرئەوەی نەخۆشخانە سەر بەبەشی کاروباری کۆمەڵایەتی مەڵبەند بوو، شێخ محەمەد سەرگەڵوییش بەرپرسی بەشی کۆمەڵایەتی بوو، دەیوت دەبێت دکتۆرە ئیلهام لەنەخۆشخانە وەربگریتەوە، منیش ڕازی نەدەبووم، ساردی لەنێوان من و شێخ محەمەددا دروست بوو، شێخ محەمەد لەلای عەلی بچکۆل، سـکاڵای لێکـردم، عـەلی بچکـۆل نامەیـەکی زۆر ناشـیرینی بـۆ نووسـیم، لەنامەکەدا داوای کردبوو سەردانی بکەم، بەخوێندنەوەی نامەکە زۆر تووڕە بووم. دوای خوێندنەوەی نامەکە، چووم بۆ لای عەلی بچکۆل، لەگەڵ شێخ محەمەد دانیشتبوو، لەبەرئەوەی بەنامەکەی عەلی بچکۆل تووڕە بووم، کە گەیشتم سڵاوم لێنەکردن، وتم: بۆچی بەو شێوەیە بانگم دەکەن، عەلی بچکۆل وتی: ئەگەر توانای بەرپرسیاریت نییە بۆ وازناهێنی، بۆ ئەو دکتۆرەیە لە نەخۆشـخانە وەرناگریـت، بـۆ بـەگوێی مەڵبەنـد و بـە گـوێی شـێخ محەمـەد ناکەیت؟.

وتـم: بەرپرسـی مەفرەزەیـەکی پێشـمەرگە، بـۆی هەیـە پێشـمەرگەیەک وەرنەگرێت ئەگەر بەدڵی نەبێت، ئەی بۆچی من ئەو مافەم نەبێت کەسێک لەنەخۆشـخانە وەرنـەگرم، کـە هـیچ پەیوەنـدی بەپیشـەی پزیشـکی و نەخۆشـخانەوە نییـە؟ دوای قرەقرێکی زۆر، عـەلی بچکۆل وتـی: لێرە بڕۆ، تۆمان ناوێت، وتم: باشە دەڕۆم، بەڵام نەخۆشخانەکەش لەگەڵ خۆم دەبەم، لەبەرئـەوەی ئـەو نەخۆشـخانەیە خـۆم درووسـتمکردوە، لەبەرئـەوەی

نەخۆشخانە بێ دکتۆر هیچ واتایەکی نییە، دەچم و لەگوندێکی تر نەخۆشخانە دادەنێم. عەلی بچکۆل بەو قسانەی من تووڕە بوو، وتی: زیندانیت دەکەم، وتم: ناتوانی. پێشمەرگەیەکی بانگ کرد، وتی: عەزیز بیبە بۆ زیندان، منیش بەعەزیزم وت: لێم نزیک نەکەویتەوە، بەعەلی بچکۆلم وت: من نارۆم بۆ زیندان، عەلی بچکۆل زیاتر تووڕە بوو، وتی: دەتکەم بەسینەما، منیش تووڕەتر بووم، وتم: منیش تۆ دەکەم بەتەلەفزیۆن، دوای ئەو قسەیەی من، مام عەلی بێدەنگ بوو. منیش چوومەوە بۆ نەخۆشخانە دەرگای نەخۆشخانەکەم داخست، دەمانچەیەک و کلاشینکۆفێکم هەبوون، هەر یەکێکیانم لەنزیک پەنجەرەیەکی نەخۆشخانەکەوە دانا، وتم ئەگەر هاتنە سەرم، لەدوو شوێنەوە خۆم دەپارێزم.

کەمتر لەکاتژمێریک تێپەری، کەس دیار نەبوو، هەستام بەرەو ناو گوندی سەرگەڵو بڕۆم، لەڕێگادا هەڤاڵ کوێستانی هاوڕێمم بینی، وتم: خێرە؟ وتی: هاتوم بۆ لای تۆ، وتم: لەکاتێکی خراپدا هاتیت، خەریکە زیندانم دەکەن، (لەو کاتەدا عەزیزی پێشمەرگە بەدوامەوە بوو) کەمێک وەستاین و باسی کێشەکەم بۆ کرد، وتم: ئەوە کلیلی نەخۆشخانە، تۆ بڕۆ لەوێ پشووبدە.

هاوڕێ جەباری فەرماندەی کەرتی تیپی ٤٣ پیرەمەگرون، لە چایخانەکەی سەرگەڵودا دانیشتبوو، منیش لەوێ دانیشتم، لەگەڵ هاوڕێ جەبار دەستمان بەقسە کرد، فاتح شوانی لەگەڵ عەزیزی پێشمەرگەدا، بەرەو لای ئێمە هات، هەر کە گەیشتە لامان، فاتح رووی دەمی کردە هاوڕێ جەبار و وتی: کاک عەلی بڕیاریداوە دکتۆر ببەین بۆ زیندان، هاوڕێ جەبار هەڵیدایە وە ، وتی: هێز نییە دکتۆر زیندانی بکات، بڕۆ دوور بکەوەرەوە، دیاربوو ئەو پێشمەرگانەی ئەو رۆژە لەسەرگەڵو بوون، ئاگاداری ئەو کێشەیەی نێوان من و بەرپرسی مەڵبەند بوون.

ئەنجومەنی ئاوایی سەرگەڵو، کە بیستیان عەلی بچکۆل و شێخ محەمەد دەیانەوێت من زیندان بکەن، هەڕەشەیان لەمەڵبەند کرد، وتیان ئەگەر دکتور زیندانی بکەن، بارەگاکانی مەڵبەند لەسەرگەڵو دەردەکەین.

کاتێک عەلی بچکۆل هەڵوێستی هاوڕێ جەبار و ئەنجومەنی سەرگەڵوی بینی، لەبڕیاری زیندایکردنم پەشیمان بوەوە. بەڵام من گەیشتمە ئەو بڕوایە ناتوانم لەوە زیاتر لەسەرگەڵو بمێنمەوە، دەبێت بیر لەشوێنێکی تر بکەمەوە. یەکەم هەڵبژاردەم ڕێکخراوی کۆمەڵە بوو، ئەو کاتە جەبار فەرمان بەرپرسی ڕێکخروای کۆمەڵە بوو، بارەگای ڕێکخراو لەگوندی هەڵەدنی نزیک سەرگەڵو بوو. بۆ ڕۆژی دوایی چووم بۆ هەڵەدن، سەردانی ڕێکخراوم کرد، ویستم جەبار فەرمان ببینم، سەیرم کرد جەبار فرمان لەکێشەدایە، بەهۆی کێشەی کوشتنی وریاوە، ناکۆکی لەنێوان جەبار فەرمان و نەوشیرواندا دروستببوو، جەبار ڕاپۆرتی دەست لەکارکێشانەوەی لەبەرپرسیارێتی ڕێکخراو نوسیبوو، هەواڵم پرسی وتیان: زۆر بێتاقەتە، ئیتر سەردانی جەبار فەرمانم نەکرد، بیرم لەشوێنیکی تر کردەوە.

**سینەما و تەلەفزیۆن:**

لە هەڵەدن چاوم بە جەبار فەرمان نەکەوت، عەلی شامارو هەڵۆ ئەحمەد کوردەم بینین، هاوریی نزیکم بوون، نازانم لەوێ چییان دەکرد، بەعەلی شامارم وت: ئەرێ تەلەفزیۆن خەڵک زۆر دەیبینێ یان سینەما؟ ، عەلی شامار کەمێک وەستا، پاشان وتی: تەلەفزیۆن لەسینەما زۆرتر دەبینرێت، لەبەرئەوەی تەلەفزیۆن لەزۆربەی ماڵاندا هەیە، بەڵام سینەما کەمە، لەهەر شارێکدا چەند سینەمایەک هەیە، هەموو کەسیش ناچێت بۆ سینەما. دواتر وتی: بۆ ئەو پرسیارەت کرد؟ منیش وتم: کەوابوو من سەرکەتووم، عەلی شامار وتی: لەچییدا سەرکەوتووی؟ لەسەرەتاوە تا کۆتایی چیرۆکی ئەو شەڕ و ناکۆکیەم بۆ گێڕایەوە کە لەنێوان من و عەلی بچکۆلدا رویدابوو، تا

ئەمرۆش عەلی شامار بەو تەلەفزیۆن و سینەمایە پیدەکەنێ. دوای شەڕەکەی مـن و عـەلی بچکـۆل، هـەواڵی تـەلـەفزیۆن و سـینەماکەمان بـەناو هێـزی پێشمەرگەدا بڵاوبوەوە و بوو بەنوکتەی ساڵ.

**رووداوەکەمە شارباژێر:**

کە نەخۆشخانەی مەڵبەندی دووم بەجێهێشت، شوێنی کار و حەوانەوەم نـەبوو، لـەباتی ئـەوەی واز لەپێشـمەرگایەتی بێـنم، لەگونـدێک دانیشـم، یـان بگەڕێمـەوە بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی رژێمـی عێـراق، یـان گەشـتی دەرەوەی وڵات بکەم، بۆ شوێنێکی تر دەگەڕام، تا لە ناو هێزی پێشمەرگەدا کاری تێدا بکەم و بحەوێمەوە.

سـەرەتا ڕووم لە هەڵـەدن کـرد، کـە بینـیم جـەبارفرمان لەگـەڵ سـکرتێری کۆمەڵـە کێشـەی هەیە، وتـم هەڵـەدن بـۆ مـن سـوودی نییـە. بڕیارمـدا دۆڵـی جافایەتی بەجێبێلم، بەرەو شارباژێڕ بڕۆم، بزانم دەنگوباسی مەڵبەندی یەک و هەڵەبجەیـەکانی نـاو ینـک ی ئـەو نـاوە چۆنـە؟ ، ئەگـەر بـزانم مەڵبەنـدی یـەک لـەبارە، لـەوێ دەمێنمـەوە، درێـژە بەخـەباتی پێشـمەرگایەتی وخزمـەتگوزاری تەندرووستی دەدەم.

لەگـەڵ قـادر مـەنمی و پێشـمەرگەیەکی تـردا، لـەدۆڵی جافایەتیـەوە، بـەرەو شـارباژێڕ بەڕێکـەوتین، ئـەو شـەوەی لەڕێگـەی تەگـەران پەڕینـەوە، هێنـدەی نەمابوو بەر گولەی رەبایەکانی سـەر رێگـەی قـەلاچوالان - ئـەزمر بکـەوین و شەهید ببین.

دوای دوو رۆژ، گەیشتینە گوندی حاجی مامەند، بارەگای مەڵبەندی یەک لە حاجی مامەند بوو، لەوێ لەقادر مەنمی جیابوومەوە، نازانم لەکام بارەگایە مامەوە. شەوێکیان لەبارەگایەک لەسەر کوردستانیبون و عێراقیبونی کۆمەڵە، لـەناو کادرەکانـدا گفتوگۆیـەکی تونـد دروسـتبوو، دارا جـەمیل یـەکێ لـە کادرەکانی باڵی داشعێراق بوو، بەگەرمی بەشداری گفتوگۆکەی دەکرد، بۆ

پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانی، وتەیەکی بەنرخی لینینی بەبیر هاوڕێکانی هێنایەوە، وتی: لینین وا دەڵێت، لەولاوە سەرتیپی ١١ هەورامان هەڵیدایەوە، وتی: لینین گووی خوارد.

بێدەنگی و بێزاری باڵی بەسەر گفتوگۆی ژوورەکەدا کێشا، لەدڵی خۆمدا وتم، بەخوا ئێرەش وێرانە، بەکەڵکی من نایەت، دەبێت بۆ شوێنێکی تر بگەڕێم.

**ئاوەژێ:**

بەهۆی هەڵویستی جوامێرانەی هاوڕێ جەبارەوە، بەهۆی هەڵویستی دڵسۆزانەی ئەنجومەنی سەرگەڵوەوە، لەزیندانیکردنی عەلی بچکۆل و شێخ محەمەدی سەرگەڵویی رزگارم بوو، رێکنەکەوت لەرێکخراوی کۆمەڵەو لەمەڵبەندی یەکی ینک بمێنمەوە، بەو پێشنیارەی ئەرسەلان بایزی بەرپرسی ڕاگەیاندنی ینک رازی نەبووم، کە وتی: وەرە لەڕاگەیاندن کار بکە، بڕیارمدا بەرە و ئاوەژێ، بارەگای نەوشیروان مستەفای سکرتێری کۆمەڵە بڕۆم.

دوای گەڕانەوەم لەحاجی مامەند، لەبەرگەڵو و سەرگەڵو لامنەدا، یەکسەر بەرەو گوندی ئاوەژێ بەڕێکەوتم، ئاوەژێ گوندێکی نزیکی مەرگەیە، ئەوکاتەی گەشتمە ئەوێ، پایزی ١٩٨٣ بوو. بارەگای سکرتێری کۆمەڵە، خانوویەکی گەورە بوو، لەدەرەوەی گوندەکە بەبلۆک دروستکرابوو، دەرمان و پێویستیم کۆکردەوە و لەگوندی ئاوەژێ نەخۆشخانەیەکی بچووکم دانا، بەرۆژ کارم تێیدا دەکرد، بۆ نانخواردن و حەوانەوە، دەگەڕامەوە بۆ بارەگای سکرتێری کۆمەڵە.

**محەمەد سوڵتان:**

لەو کاتەوە ببووم بەپێشمەرگە، لەگەڵ کاری پزیشکیدا، کاری رێکخستنی سیاسیشم دەکرد، لەئاوەژێ بووم بە کادری کەرتی رێکخستنی قەڵادزێ.

کاکەمین بەرپرسی کەرتی رێکخستنی قەڵادزێ بوو، هەر یەک لەمستەفای سەید قادر، محەمەد سوڵتان، مامۆستا سەعید، کەمال، عومەر قەڵادزێی،

ئەندامی کەرتی ڕێکخستن و کادر بوون. دۆستایەتیەکی باشم لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی قەڵادزێ پەیداکرد، بەڵام لەهەمووی زیاتر ئەو دۆستایەتیە بوو کە لەگەڵ مامۆستا محەمەد سوڵتان و مامۆستا سەعیددا هەمبوو، محەمەد سوڵتان ئەو کات خێزاندار بوو، ماڵی لەگوندی ئاوەژێ بوو، عایشە خانی خێزانی لەخۆی زیاتر دڵسۆزی شۆڕش و پێشمەرگەو میوانەکانی بوو. مامۆستا محەمەد سوڵتان ئەگەرچی ئەندامی کۆمەڵەبوو، بەڵام بە بەردەوامی لایەنگری یەکێتی و تەبایی نێوان هێزە کوردیەکانی کوردستان بوو، حەزی دەکرد ماڵی کورد یەکگرتوو بێت، بەداخەوە دوای ڕاپەڕین لە پێناوی یەکخستنی ماڵی کوردا، کاتێک بە مەبەستی ڕێگری لە دروستبوونی شەڕی ناوخۆیی لە نێوان ینک و بزووتنەوەی ئیسلامیدا، لە ڕانیە سەردانی بارەگای بزووتنەوەی ئیسلامی کرد، دەستڕێژی گولەیان لێکرد و شەهیدبوو.

# ٨
# گفتووگۆی ینك و حكوومەتی عێراق

دوای جەنگی جیهانی یەکەم، دەوڵەتی عێراقی نوێ لە لایەن بەریتانیاوە دروستکرا، عێراق وڵاتێکی فرەپێکهاتەیە، لە رووی نەتەوەییەوە، لە عەرەب و کورد و تورکمان و نەتەوەکانی تر پێکدێت، لە رووی ئاینی و مەزهەبیەوە، لە موسڵمان و مەسیحی و یەزیدی و شیعەو سوننە پێکدێت. کە بەریتانیا عێراقی دامەزراند، هەوڵیدا دەوڵەتی عێراق دەوڵەتێکی یەک نەتەوە و یەک ئاین و یەک مەزهەب نەبێت، هەوڵیدا عێراق، دەوڵەتی هەموو هاووڵاتیانی عێراق بێت، ئەم هەوڵەی بەریتانیا لە یەکەم دەستووری سەردەمی حوکمی پاشایەتی عێراقدا دەردەکەوێت. بەڵام کە هێزی نەتەوەپەرستی عەرەبی عێراق گەشەی کرد، دەسەڵاتدارانی عێراق لە بنەماکانی دەستووری عێراق لایاندا، مافەکانی گەلی کوردییان پێشێلکرد.

دژی ئەو پێشێلکاریانەی مافەکانی، گەلی کورد بە شێوازی جیاجیا نارەزایی نیشاندا، یەک لە شێوەکانی ئەو نارەزاییەتیە، شۆڕش و خەباتی چەکداری بووە. شۆڕش یان بەرخودانە یەک لە دوای یەکەکانی باشووری

کوردســـتان، خـــاوەنی بەرنـــامەیەکی ســـتراتیجی نەبـــوون، پەرچەکـــرداری سیاســەتی نەتەوەپەرســتی و نــادیموکراتی دەســەڵاتە یەک لە دوای یەکەکـانی عێراقی ناوەندی بوون، هەر کاتێک دەسـەڵاتی عێراقی ناوەندی، بەرامبەر بە مافەکانی گەلی کورد نەرمی نیشاندابێت، سەرکردایەتی شۆڕشی گەلی کورد بە هەمان شێوە، بەرامبەر بە دەسەڵاتی ناوەندی نەرمی نیشانداوە، لە باتی شەر و پێکدادانی سەربازی ، ئامادە بووە لە رێگەی دانیشتن و گفتووگۆوە کێشەکانی نێوان گەلی کورد و دەسەڵاتی ناوەندی عێراق چارەسەر بکات.

کێشەی گەلی کورد لە عێراقدا، نکوولّی کردنی ناسنامەی نەتەوەیی گەلـی کـورد نەبـووە، بچـووکردنەوەی خـاکی کوردسـتان و کەمکـردنەوەی ژمـارەی دانیشتوانی کورد ولاوازکردنی دەسەڵاتی کورد بووە، لە رێگەی پرۆسـەکانی بە عەرەبکـردن و راگواسـتنی خەڵکـی کوردسـتانەوە، هەوڵـدراوە رووبەری خـاکی کوردسـتان بچـووک بکـرێتەوە، ژمـارەی دانیشـتوانی گەلـی کـورد کەم بکرێتەوە. لە رێگەی بریار و سیاسەتی نادیموکرتییەوە، هەوڵدراوە دەسـەڵاتی کورد لە حوکمی عێراقی ناوەندی و لە باشووری کوردستاندا لاواز بکرێت.

گەلی کورد کە خەباتی دژی ئەو سیاسەتەی دەوڵەتی عێراق دەستپێکردوە، لە رێگەی لامەرکەزی و حوکمی زاتییەوە، ویستوویەتی سیاسەتە شۆڤینی و نادیموکراتی دەسـەڵاتی عێراقی ناوەندی رابگرێت و بـاروودۆخی کوردسـتان ئاســـایی بکـــرێتەوە، باشـــترین رێـــگە بـــۆ گەیشـــتن بەو ئامـــانجە، دوای پەرپەرچدانەوەی چەکداری، خەبـاتی دانووسـتان و گفتووگۆبووە. بەڵام کە بە لاپەرەکانی مێژووی گفتووگۆی نێوان حکوومەتەکانی عێراق و شۆڕشـەکانی کوردســـتاندا دەچیـــتەوە، هەســـتناکەیت هـــیچ بەرەیەکیـــان ( نە کـــورد نە عێراق)وەک ستراتیج بۆ چارەسەری کێشـەکان پەنایـان بـۆ گفتوگۆ بردبێت، هەست دەکەیت گفتووگۆ، وەک تەکتیکی یەکتر بەزاند و یەکتر فرویدان پەنـای بۆ براوە.

یەکێک لە گفتووگـۆ گرنگەکـانی نێوان سـەرکردایەتی شۆڕشـی ئەیلـوول و حکوومەتی عێراق، گفتووگۆ و رێککەوتنی بەیانی ١١ ئازاری ١٩٧٠ بوو، ساڵی ١٩٧٤ گفتووگـۆکە بە دەســتپێکردنەوەی شـــەڕ کۆتاییهـات، ســـاڵی ١٩٧٥ لە

ئەنجامی ڕێکەوتنی جەزائیری نێوان سەدام حوسەینی سەرۆک کۆماری عێراق و شای ئێراندا ، شۆڕشی کورد شکستی هێنا. دوای ئەو شکستە، لایەنی کوردی داوای گفتووگۆی لە حکوومەتی عێراق کرد، حکوومەتی عێراق لە خۆی بایی ببوو، ئامادە نەبوو گفتووگۆ بکات.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا، لە کاتێکدا پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ بووم، دانوونستان و گفتووگۆی نێوان ینک و حکوومەتی عێراق دەستیپێکرد، لە نزیکەوە چاودێری ڕووداوەکانی گفتووگۆ دەکەم، ئەوەی لە دەمی بەرپرسەکانی ینک وە، لەسەر هەڵویستی بەرپرسانی عێراق دەمبیست، دەسەڵاتدارانی عێراق، بۆ چارەسەری کێشەکانی نێوان گەلی کورد و دەسەلاتی عێراقی ناوەندی، پەنایان بۆ گفتووگۆ نەبردووە، بۆ کات کوشتن و خۆبەهێزکردن و فرویدانی ینک ، ئامادەییان بۆ گفتووگۆ نیشانداوە . بە خۆشم وەک کەسێک کە لە نزیکەوە بۆنی قسەی بەرپرسانی باڵای ینک م دەکرد، گومانم هەبوو کە ینک بە ڕاستی و بۆ چارەسەری کێشەی گەلی کورد لەگەڵ حکوومەتی عێراق گفتووگۆی کردبێت. ینکیش بۆ پشوودان و خۆرێکخستنەوە و خۆبەهێزکردن پەنای بۆ گفتووگۆ بردبوو، مامجەلال لە چەندین بۆنەدا وتوویەتی: لەبەر ئەوەی باری ئابووریمان لاواز بوو، پارەمان نەبوو هێزی پیشمەرگەی پێبژیەنین، لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا گفتووگۆمان کرد، تا حکوومەتی عێراق هاوکاری داراییمان بکات و هەستینەوە.

**گفتووگۆی بێ بەرنامە:**

کە گفتوگۆی نێوان ینک و حکوومەتی عێراق دەستپێکرد، بارەگای مام جەلال لەبالیسانەوە گواسترایەوە بۆ ئاوەژێ، مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و فوئاد مەعسوم و ملازم عومەر، هەر چوار بڕیار بەدەستەکەی ینک، بارەگایان لەئاوەژێ بوو، منیش لە ئاوەژێ بووم.

٣-١٢-١٩٨٣ شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق وەستا، گفتووگۆی نێوان وەفدی ینک و، ەفدی حکوومەتی عێراق دەستپێکرد.

رۆژێکیان بۆ کارێک سەردانی ژوورەکەی مامجەلالم کرد، دوای تەواوبونی کارەکەم، مام جەلال وتی: دانیشە، لەو کاتەدا مامجەلال و نەوشیروان مستەفاو فوئاد مەعسوم و ملازم عومەر، پێکەوە دانیشتبوون، لەسەر گفتوگۆ قسەیان دەکرد، دەیانوت پرۆژەکەمان بۆ گفتوگۆ ناوی چیی بێت، داوای چیی بکەین؟ منیش گوێمگرتبوو، لێرەدا خاڵێکی لاوازی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستانم بۆ دەرکەوت، کە بەرنامەی جێگیر و درێژخایەنییان بۆچارەسەری کێشەی کورد نییە، رۆژانە بەرنامە دادەنێن. زۆربەی شۆڕشەکان بەرنامەیەکی ستراتیجی و تێروتەسەلیان بۆ چارەسەری کێشەی نێوان گەلی کورد و حکوومەتی عێراق نەبووە، تا لە کاتی خۆیدا پێشکەشی حکوومەتی عێراقی بکەن.

دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ، فوئاد مەعسوم وتی، با داوای حوکمی زاتی متەتەور(ئۆتۆنۆمی پێشکەوتوتر)، بکەین، سیانەکەی تر بەو پێشنیارەی فوئاد مەعسوم رازیبوون، کۆبونەوەکە کۆتایی هات. لێرەدا ناکۆکیم لەنێوان سیاسەتی یەکدا بینی، هەموی چەند مانگێک بوو، بڕیاری مافی چارەی خۆنوسینی بۆ گەلی کوردستان دابوو، وا ئەمرۆ داوای ئۆتۆنۆمی دەکات و بۆ قۆناغی پێش مافی چارەی خۆنووسین دەگەڕێتەوە.

لەکاتی گفتوگۆی ساڵی ١٩٦٩-١٩٧٠ نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراقدا، وەفدی کورد بەسەرۆکایەتی دارا تۆفیق، سەردانی بەغدای کردبوو، لەگەڵ سەدام دانیشتبوو، سەدام پێیوتبوو: چییتان دەوێت؟ دارا تۆفیق وتبووی: بۆ گفتوگۆ هاتووین، سەدام وتبووی: دەبێت گفتوگۆ لەسەر پرۆژەیەک بکرێت، ئەی بۆچی داوای حوکمی زاتی ناکەن؟ ، دارا تۆفیق بەپرۆژەکەی سەدام رازی ببوو، سەرووی خۆی ئاگادار کردبوەوە، مەلا مستەفاش بە پرۆژەکەی سەدام رازی ببوو، ئیتر حوکمە زاتیەکەی سەدام، بوو بەپرۆژەی شۆڕشی ئەیلول، بەو شێوەیە پرۆژەی ئۆتۆنۆمیش، پرۆژەی

کورد نەبوو، پڕۆژەی سەدام حسەین بوو، بۆیە تا ماوەیەک کورد بەسەدامی دەوت، ئەندازیاری حوکمی زاتی[٣٢].

وا سەرکردایەتی ینکیش، دوای چەندان ساڵ خەبات، دوای خەباتێکی بێوچان بۆ بەجێهێشتنی سیاسەتی پدک وحزبی بەعس، دوای ئەوەی لە تەمووزی ١٩٨٣ دا، ینک بڕیاریدا ستراتیجی خۆی لە حوکمی زاتیەوە بگۆرێت بۆ مافی چارەی خۆنووسین، کەچی هەر لە شوێنی خۆیدا چەقی، هێشتا داوای ئۆتۆنۆمی (حوکمە زاتیەکەی) سەدام دەکات.

شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق راگیرا، کوژران و بریندار بون و وێرانکردنی کوردستان بۆ ماوەیەک وەستا، بەڵام کێشەی تر هاتنە پێشەوە، لەلایەکەوە سەدان کەسایەتی سیاسی دۆستی ینک، وەک ئیبراهیم ئەحمەد، بەگفتوگۆ رازی نەبوون، هەزاران کادرو ئەندامی ینک، وە بەتایبەت رێکخستنە نهێنیەکانی ناو شار، دژی گفتوگۆ هەڵویستیان نیشاندەدا، باڵی داشعێراقی ناو کۆمەڵەش، دژایەتی گفتوگۆیان دەکرد، دەیانویست بە دژایەتیکردنی گفتووگۆ، خۆیان بەهێز بکەن.

دوای راگرتنی شەڕو دەستپێکردنی گفتوگۆ، کێشەیەکی تر هاتە پێشەوە، رۆژانە کێشە لە نێوان پێشمەرگە و بەرپرسانی حکومەت درووستدەبوو، پێشمەرگە وچەکدارانی فەوجە سوکەکان شەڕیاندەکرد، بریندار و کوژراوی لێدەکەوتەوە. کە شەڕ راگیرا و گفتوگۆ دەستیپێکرد، پێشمەرگە بەچەکەوە دەچوونە ناو شار، یان بەچەکەوە لەدەزگا حکومییەکانی عێراق نزیک دەبوونەوە، پێشمەرگە وا تێگەیشتبوو، گفتوگۆ واتای ئەوەیە حکومەتی عێراق لەکوردستان نامێنێ، هەمو دەسەڵات بەدەست پێشمەرگەوە دەبێت، کاتێک بەرپرسی خاڵی پشکنینی هێزە چەکدارەکانی عێراق، داوای پێناس و مۆڵەتی هاتوچۆیان لەپێشمەرگە دەکرد، پێشمەرگە توورە دەبوون، ناکۆکی و شەڕی لێدەکەوتەوە. پێشمەرگە ئەو راستیەی نەدەبینی، کە تەنها شەڕ لەگەڵ سوپای

---

٣٢ لە کتێبی خوارووی کوردستان و شۆرشی ئەیلول ، بنیاتنان و هەڵتەکاندن چاپی سێهەم ئیبراهیم جەلال ١٩٩٩.

عێراقدا راگیراوە، هێشتا ڕێکەوتن نەکراوە، دەسەڵاتی پێشمەرگە لەکوردستان دیاری نەکراوە.

سەرکردایەتی ینک، زۆر نیگەران دەبوو کە دەیانبینی بەبێ هۆکار، پێشمەرگە بەرەو شار دەڕۆن، لەگەڵ چەکدارانی فەوجە سوکەکاندا کێشە درووستدەکەن. بۆ بەردەوامی گفتوگۆو ڕێککەوتن، لیژنەیەکی هاریکاری لەنێوان ینک و حکومەتی عێراقدا درووستکرابوو، بەڵام ئەو لیژنەیە، زۆربەی کات بەکاری لاوەکی و ناکۆکی نێوان پێشمەرگە و چەکدارەکانی حکومەتی عێراقەوە سەرقاڵ دەبوو، فریای گفتوگۆ و ڕێکەوتن نەدەکەوت.

لەو کاتەوە گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەت دەستیپێکردبوو، بەپێچەوانەی زۆرینەی کادر و پێشمەرگەوە، نە حەزم دەکرد بچمە ناو شار، نە ئەوەشم بەڕاست دەزانی کە کادر و پێشمەرگە بەو لێشاوە ڕوو لە شار دەکەن، زۆربەی کات کۆبونەوەم بەهێزی پێشمەرگە دەکرد، سیاسەتی نوێی ینک-م بۆ باس دەکردن، لە بنکە تەندروستیەکەی گوندی ئاوەژێش، چارەسەری نەخۆشم دەکرد.

نەگەڕانەوەم بۆ ناو شار، بەردەوامبوونم لە سەر خەباتی سیاسی و خزمەتگوزاری تەندرووستی لە نزیک سەرکردایەتییەوە، جێگەی ڕەزامەندی مامجەلال و بەرپرسانی تری ینک بوو، هەر میوانێکی گرنگ سەردانی مام جەلالی دەکرد، مام جەلال بانگی دەکرد و منی پێدەناساند.

**ڕوودەکەمە شار:**

لەنەخۆشخانەی گوندی ئاوەژێ دەرمانم نەمابوو، داوای دەرمانم لەسەرکردایەتی کرد، ئەوانیش وتیان بڕۆ بۆ سلێمانی دەرمان بکڕە. ڕۆژێکیان سەلاح چاوشین لەسلێمانیەوە هات بۆ ئاوەژێ، دەیویست بگەڕێتەوە بۆ سلیمانی، د. فوئاد مەعسوم هەندێک پارەی دامێ، وتی لەگەڵ سەلاح بڕۆ لەسلێمانی دەرمان بکڕەو بیهێنەرەوە.

لەگەڵ سەلاح چاوشین چووم بۆ سلێمانی، کە گەیشتمە سلێمانی، ئێوارە بوو، لە دڵی خۆمدا دەموت، ئەمڕۆ فریای دەرمان کڕین ناکەوم، دەبێت شەو

لەسلێمانی بمێنمەوە، سبەینێ بچم دەرمان بکرێم. ئەو کاتەماڵی خۆمان لەخورماڵ بوو، بیرم لەوە دەکردەوە ئەمشەو لەکوێ پشوو بدەم، لەو کاتەدا سەلاح چاوشین وتی: دکتۆر تۆ ناچیت بەهیچ لایەکدا، ئەمشەو میوانی من دەبی، سەلاح لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، وتی: من و چەند برادەرێکی تر، دەعوەتی جەمالی حەمەی خواکەرەمین، تۆش لەگەڵ من دەبیت، براکەی جەمال زیندانی سیاسی بووە، بەهۆی گفتوگۆوە، لەزیندان ئازاد کراوە، بەو بۆنەیەوە جەمال دەعوەتی کردووین. بە داواکەی سەلاح چاوشین رازیبووم، بەرەو ماڵی دەعوەتەکە بەڕێکەوتین، کە چووینە ژوورەوە، سەیرم کرد کۆمەڵێک پێشمەرگە، بە رابەرایەتی ئەبووشەهاب، لەدەوری سفرەیەکی درێژی پڕ لەخواردنەوەدا دانیشتوون، هەر کە ئەو سفرەیەم بینی، یەکسەر بەسەلاحم وت: من ناخۆمەوە، بەزەردەخەنە ئامادەکراوەکەی خۆیەوە، سەلاح چاوشین وتی: واز لەوقسانە بێنە با بڕۆین دانیشین.

تا ئەو شەوە وامدەزانی ئەو کادرو پێشمەرگانەی کە دیار نین و دەگەڕێنەوە بۆ ناو شار، کارو چالاکی سیاسی دەکەن، ژمارەی ئەندام زیاد دەکەن رێکخستن گەشەپێدەدەن، ئەو ئێوەرایە، کە ئەو هەموو کادرەم لەدەوری سفرەی خواردنەوەکە بینی، بێئومێدی و رەشبینی دایگرتم، لەدڵی خۆمدا وتم: بەخوا هەر خەریکی خواردن و خوارنەوەن، گوێ بەکارو چالاکی سیاسی نادەن، بۆیە مامجەلال و نەوشیروان هێندە لە چوونە ناوشاری پێشمەرگە نیگەران دەبن.

نازانم چۆن ئەو شەوەم لەگەڵ سەلاح چاوشین و ئەبوشەهاب و برادەرانی تردا بەڕێکرد، نازانم بڕی چەند خواردنەوەیان دەرخوارد دابووم، هێندە ئاگادار بووم، لەنیوەشەودا بەو سەیارەیەی کە ئەبوشەهاب لێیدەخوڕی، لەماڵە دەعوەتەکەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵی دایکی سەلاح چاوشین، کە گەیشتینە ماڵەوە، بیرم دێت، دایکی سەلاح وتی: ئەو کوڕە بۆ وای لێهاتووە؟ ، ئەوەندە رشابوومەوە ئاوو کانزا لەلەشمدا نەمابوو، هەمو کەس بەزەیی پێمدا دەهاتەوە، ئەو شەوە دایکی سەلاح هەندێک دەرمانی کوردەواری بۆ نواندم، بۆئەوەی رشانەوە و سک ئێشەکەم باش ببێت.

بۆسبەینێ دەورووبەری کاتژمێر دەی پێش نیوەڕۆ، لەخەو هەستام، نانی بەیانیم خوارد، ئەبوشەهاب وتی: نیازت نیە ژن بێنێت؟ ، منیش تا ئەو کاتە، قەت بیرم لەژن هێنان نەکردبوەوە، لە دڵی خۆمدا وتم من بۆ دەرمان کرین هاتووم بۆ سلێمانی بۆ ژنهێنان نەهاتووم، بە ئەبوشاهابم وت: نازانم، بیرم لەوە نەکردۆتەوە، وتی: خزمێکی خۆم هەیە، خۆشکی فلان هاوڕێمانە، لەدائیرەیەکە، با بچین سەیری بکە، ئەگەر بەدڵت بو بۆتی دەخوازم.

بە قسەی ئەبوشەهابم کرد، بەو تەندروستیە خراپەوە، بەقاتێ جلی پێشمەرگایەتیەوە، بەقەمسەڵەیەکی چڵکەنەوە، بەرەو دائیرەی کشتوکاڵی سلێمانی بەڕێکەوتین، کە گەیشتینە شوێن کاری کەسی دیاریکراو، لەو ژوورەدا سێ کچم بینی، پاش چۆن و چاکی و بەخێرهێنان، خزمەکەی ئەبوشەهابم ناسی، جوان سەیرم کرد، سەیری کچەکانی تریشم کرد، دوای ماوەیەک من و ئەبوشەهاب شوێنەکەمان بەجیهێشت. هەر لەڕێگەی گەڕانەوەدا، ئەبوشەهاب وتی: بەدڵت بوو، وتم: نەبەخوا ئەوەی تۆم بەدڵ نەبوو، ئەویتریانم بەدڵ بوو. ئەو کەسەی کە ئەبوشەهاب دەیویست بۆ منی بخوازێت، باڵابەرزێکی ئەسمەر بوو، من لەو کاتەدا ژنی ئەسمەرم بەلاوە جوان نەبوو، ژنی کاڵ و سپیم بەلاوە جوان بوو، ئەوەی تر کە من بەدڵم بوو، کچێکی قژکاڵی لێوئاڵ بوو. ئەبوشەهاب وتی: ئەوەی تریش ناسراوە، خۆشکی شەهیدێکی خۆمانە، باشە دوایی قسەی لەگەڵ دەکەم.

دوای ماوەیەک ئەبوشەهاب قسەی لەگەڵ ئەو کچە کردبوو کە بەدڵی من بوو، کچەکە وتبووی ئەگەر واز لەپێشمەرگایەتی بێنێت شوی پێدەکەم، منیش لای ئەبوشەهاب کەمێک گاڵتەم بەعەقڵی کچەکە کرد، حەزیشم کرد وەڵامی ئەو کچە وابوو، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا من هیچ بەرنامەیەکی ژن هێنانم نەبوو.

**من قوتابی مامجەلالم:**

دوای ئەوەی لە ئەبووشەهاب جیابوومەوە، لەدەرمانخانەیەک بڕێک دەرمانم کڕی و بەرەو ئاوەژێ گەڕامەوە، ڕۆژێک دوای ئەوە، لەمزگەوتەکەی

گوندی مەرگە، مامجەلال کۆبونەوەی لەگەڵ کادرانی پێشمەرگەدا دەکرد، منیش بەشداری کۆبونەوەکەم کرد، کە لەگەڵ شۆڕش حاجی چووینە ناو مزگەوتەکە، هێشتا کۆبونەوە دەستی پێنەکردبوو، مام جەلال بانگی کردم، وتی دکتور وەرە لێرە دابنیشە، لەتەنشتی مام جەلال و نەوشیروان مستەفاو مامۆستا عەبدوڵلادا دانیشتم، نەوشیروان مستەفا لەدەستی راستی مامجەلالەوە دانیشتبوو، من و مامۆستا عەبدولاش لەدەستی چەپی مام جەلالدا دانیشتین، مامۆستا عەبدوڵلا ئەندامی سەرکردایەتی یشک بوو.

لەو کۆبونەوەیەدا مام جەلال رەخنەی زۆری لەکادرو بەرپرسەکانی پێشمەرگە گرت، لەسەر ئەوەی بەبێ هۆکار دەچنە ناو شارەکان، لەگەڵ بەرپرسانی حکومەتی عێراق، لەگەڵ جاشەکاندا کێشە دروست دەکەن و شەڕ دەکەن، وتی ئەگەر کادرەکانمان وا هەڵسوکەوت بکەن، بەبێ ئەوەی دەستکەوتمان هەبێت، گفتوگۆ تێکدەچێت. لەکۆبونەوەکەدا یەک لەکادرەکان دەستی بەقسەکرد، رەخنەی لەمام جەلال گرت، دەیویست لە پێگەی مامجەلال کەمبکاتەوە رۆلی نەوشیروان مستەفا باش بنرخێنێ و دژی مام جەلال بیجولێنێ، نەوشیروان مستەفا قسەی بە کادیرەکە بڕی، وتی من قوتابی مام جەلالم.

کۆبونەوەکە کۆتایی هات، بەڵام ئەو کۆبونەوەیە و کۆبونەوەکانی تر، هەڕەشەو سزاکانی مامجەلال، سنوری بۆ سەرکێشی هەندێک کادرو پێشمەرگە دانەنا، کێشەکان بەردەوام بوون.

**پزیشکی ساختە:**

پێشمەرگایەتی بۆ کەسانی ئەکادیمی و خوێندەوار مەینەت بوو، بۆ کەسانی خێلەکی و نەخوێندەوار نیعمەت بوو، لە خەباتی پێشمەرگایەتیدا هەر کەسێک بیویستایە بەناسنامەی دکتۆر و شێخ و مەلای وەردەگرت، ئەو ناوە یان ئەو سێ پیشەیە، لە کۆمەڵگەی گوندنشینی کوردستاندا نرخییان هەیە، ناوەکە بە خەیر بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە. ئەو کەسانەی دکتور و کارمەندی تەندرووستی نەبوون، هیچ شتێکیشیان لە پیشەی پزشکی نەدەزانی

و خۆیان دەکرد بە دکتور ، زۆر بوون، هەندێک لەو کەسانە نەوسن بوون، دەیانویست بە دەرزیلێدانێک، خواردنی خۆشی ماڵە جوتیارەکانی کوردستان بخۆن. هەندێکی تریان ترسنۆک بوون، لە شەڕ خۆیان دەدزیەوە. هەندێکی تریان مێبازبوون، دەیانویست بە هۆی دەرمان و دەرزیلێدانەوە خۆیان نزیکی ژنان بکەنەوە. بەشێکی تری ئەو دکتورە ساختانە، بۆ مەبەستی سیخوری خۆیان دەکرد بە دکتور، بۆ ئەوەی لە شوێنی هەستیاری وەک نەخۆشخانەدا بمێننەوە و زانیاری وەربگرن.

لە کاتی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراقدا، ژمارەیەک کەس، وەک دکتور پەیوەندیان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، نەک هەر دکتور نەبوون، حکوومەتی عێراق بۆ کاری سیخوڕیی ناردبوونی .

ئەو کاتەی لەئاوەژێ بووم، دکتۆر سەعدون پەیوەندی پێوەکردین، سەعدون پزیشکی راستەقینە بوو، خەڵکی شەنگاڵ بوو، خزمی سامی عەبدولرەحمان و ح. س بوو، لەنەخۆشخانەکەی گوندی ئاوەژێ و سووورداش پێکەوە کارمان کرد.

دوای د. سەعدون، کەسێکی تر هات، لەئێمە بەتەمەنتر بوو، سەروگوێلاکی لەدکتۆر نەدەچوو، لەکەرکوک سەردانی لیژنەی هاریکاری کردبوو، وتبوی: من دکتۆرێکی کوردم، دەمەوێت ببم بەپێشمەرگە، خزمەت بکەم، لیژنەی هاریکاریش، نامەیان بۆ نوسیبوو، ناردبوویان بۆ مەکتەبی سیاسی. رۆژێکیان د. فوئاد مەعسوم بانگی کردم، وتی: لەڕێگەی لیژنەی هاریکاریەوە دکتۆرێکی ترمان بۆ هاتووە، ببیە بۆ لای خۆت، منیش وتم: باشە. لەگەل دکتۆردا کەمێک لە فوئاد مەعسوم دوورکەوتینەوە، دەستمان بەگفتوگۆ کرد، پرسیارم لێکرد، وتم: دەرچووی کام زانکۆیەی؟ دەمی تەتەڵەی کرد، بەهەزار حاڵ وەڵامی دامەوە، وتی: دەرچووی زانکۆی یەریڤانم، دواتر وتی من لەروسیا خوێندومە، وتم: کەی کۆلێژی پزیشکیت تەواوکردوە؟ دیسان دەمی تەتەڵەی کردەوە، وتی: ساڵی هەزارو نۆسەدو هەشتاو نۆ(١٩٨٩)، واتە لەو کاتەدا شەش ساڵی مابوو بۆئەوەی زانکۆ تەواو بکات، یەکسەر گومانم کرد کە ئەم پیاوە دکتۆر بێت، دوایی وتی: ببوورە ساڵی ١٩٦٩، وتی: ساڵی ١٩٧٠ لەروسیاوە گەڕامەوە

بۆ عێراق، ماوەی دو ساڵ کاری پزیشکیم کرد، لەبەرئەوەی شیوعی بووم، حکومەتی بەعس دەستگیری کردم، دە ساڵ زیاتر زیندانی بووم، هێندە نیە لەزیندان ئازاد کراوم. بەو قسانەی خەریک بو گومانەکەم بڕەوێنێتەوە. پێموت: دەی فەرموو با بڕۆین بۆ نەخۆشخانە، وتی: ئێستا نایەم، دەبێت بگەڕێمەوە بۆ کەرکوک، دوای دوو رۆژی تر، پێویستییەکانم لەگەڵ خۆم دێنم و دێمەوە.

لای ئێمە ناوی دکتۆر عەلی بوو، دوای دوو رۆژ دکتور عەلی گەڕایەوە، هەندێک جلوبەرگ و چەند بوتڵێک شیرو چەند قوتویەکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، وتم: ئەم قوتووانە چی تێدایە؟ وتی: ئەوە دەرمانی نەخۆشی پێستە، جارێکی تر گومانەکانم زیادی کردەوە. دوو رۆژ لەلامان مایەوە، دوای ئەوە پرسیارم لە د. سەعدون کرد، وتم: تۆ رەئیت چییە لەسەر ئەم کابرایە؟ ئایا دکتۆرە؟ د. سەعدون وتی: فڕی بەسەر دکتۆرییەوە نییە.

بۆ رۆژی دوایی بردم بۆ بنکەی تەندروستی مەرگە، بۆئەوەی لەوێ تاقی بکەمەوە، بزانم زانیاری پزیشکی لەچ ئاستێکدایە، هەندێک پرسیاری تیوریم لێکرد، هیچی نەدەزانی، دواتر ئامێرێکی شکاوی پێوانی فشاری خوێنم دایە دەستی، وتم: فشاری ئەو نەخۆشە بگرە، دەستی دایە ئامێرە شکاوەکە، ئامێرەکە کاری نەدەکرد، خۆشی نەیدەزانی فشاربگرێت، وتم: فشاری نەخۆشەکە چەند بوو، وتی سەدو بیست لەسەر هەشتا، هەر کە قسەکەی تەواوکرد، یەک زلەم بەبن گوێیدا کێشا، دوو سێ جنێویشم پێداو وتم: هەستە لێرە برۆ، تۆ دکتۆر نیت. دوای ماوەیەک زانیاریمان بۆ هات، عەلی دکتۆر نەبووە، پیاوی دەزگای ئەمنی کەرکوک بووە.

هەر ئەو دەمەی لەئاوەژێ بووم، هەواڵێک بڵاوبووەوە، وتیان: دکتۆرێک پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کردوە، ژنێکیشی لەگەڵدایە، ئەم دکتورەیان یەکەمجار سەردانی مام جەلالی کردبوو، من و د. سەعدون بەتەمابووین دکتۆرەکە لەلای مامجەلال بێتە دەرەوە، بیبینین و پێشوازی لێبکەین.

لەو کاتەدا کە دکتۆرەکە لەلای مامجەلال دەبێ، د. فوئاد مەعسوم سەردانی مامجەلال دەکات، مام جەلال دەڵێت: د. فوئاد فەرموو دانیشە، دکتۆرە

ساختەکە ترسنۆک دەبێت، وادەزانێ د. فوئاد پزیشکەو مامجەلال بۆ ئەوە بانگی کردوە ئەو تاقی بکاتەوە، بزانێت پزیشکی راستەقینەیە، یان پزیشکی ساختەیە. هەر کە د. فوئاد لەلای مامجەلال دادەنیشیت، دکتۆری ساختە دەڵێت: مامجەلال من دکتۆر نیم، مامجەلال پێیدەڵێت: ئەی بۆچی خۆت کردوە بەدکتۆر؟ ئەویش دەڵێت لەبەرئەوەی وامکرد، تا بگەمە لای تۆ، تۆش هاوکاریم بکەیت، بۆئەوەی بچم بۆ دەرەوەی وڵات. هەر لەوێدا مام جەلال هاوکاری کرد و بەرە و ئێران رەوانەی کرد، رێگەکەشی بۆ من کورتکردوە، وەک دکتۆرە ساختەکەی تر لەگەڵیدا ماندوو نەبووم.

**مەلا بەختیار:**

رۆژ لەدوای رۆژ پەیوەندیەکانم لەگەڵ مامجەلال و نەوشیروان مستەفا، گەشەی دەکرد، زۆرتر بڕوایان پێدەکردم، رۆژێکیان نەوشیروان مستەفا بانگی کردم، وتی: لەم رۆژانەدا کۆسرەت دێت بۆ ئێرە، من و تۆ و کۆسرەت بەنهێنی، گەشتێک بۆ ناو شارەکانی کوردستان دەکەین. ئەو کاتە کۆسرەت رەسوڵ هێشتا لە ناو شاردا بوو، بەرپرسی رێکخراوی کۆمەڵەی هەولێر بوو.

بەو بەرنامەیەی سکرتێری کۆمەڵە خۆشحاڵ بووم، خۆمم ئامادە کرد، وابزانم هەر ئەو رۆژە بوو، یان رۆژێک دواتر، مەلا بەختیار لە مەڵبەندی یەکەوە سەردانی ئاوەژێی کرد، دوای ئەوەی مامجەلال و نەوشیروان مستەفای بینی، بەرەو سلێمانی گەڕایەوە، ئەوەندەی پێنەچوو هەواڵ هات، سوارڕۆکەی مەلا بەختیار وەرگەراوەو بریندار بووە، هەر کە هەواڵەکەم بیست، چوومە لای نەوشیروان مستەفا و پێموت: با بچم بەلای مەلا بەختیارەوە، وتی: باشە برۆ.

سۆراخی مەلا بەختیارم کرد، لە نەخۆشخانەی دوکان بوو، چوومە نەخۆشخانەی دوکان، لەوێوە رەوانەی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانیان کرد، مەلا بەختیار قۆڵی شکابوو، بردمانە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی، لەوێ نەشتەرگەریان بۆکرد، دوای ئەوەی بەنج بەریدا، بردمانەوە ماڵی خەزوری.

مەلا بەختیار، نزیکەی دوو هەفتە، لەسلێمانی لەماڵی شێخ جەنابی خەزوری مایەوە، منیش لەگەڵی مامەوە. ئیتر بەرنامەی سەفەرە نهێنیەکەم لەگەڵ نەوشیروان مستەفاو کۆسرەت رەسوڵدا تێکچوو.

**فوئاد ئەسکەندەر:**

لەسلێمانی لەگەڵ مەلابەختیار مامەوە، بەهۆی وەرگەڕانی سوارڕۆکەیەوە و برینداربوونیەوە، خەڵکیکی زۆر سەردانی مەلا بەختیاریان دەکرد، یەکێک لەو کەسانە کە سەردانی کرد، مامۆستا فوئاد ئەسکەندەر عەلەکە بوو، کە لە ئامادەییدا وانەی کیمیای پێدەوتینەوە، ئەو مامۆستایەی دوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥، لەقوتابخانەی ئامادەیی هەڵکەوت، لەکاتی وانە وتنەوەی کیمیادا پێوتم: ئەم لوشکە لوشکە سوودی نییە، بخوێنە و ببە بەجیڤارا.

کە مامۆستام بینیەوە، هەستم بەسەرکەوتنێکی گەورە دەکرد، زۆر دڵخۆش بووم کە مامۆستاکەم وەک دکتۆر دەمبینێتەوە، زۆرتر دڵخۆش بووم، کە مامۆستاکەم وەک پزیشکی پێشمەرگە دەمبینێتەوە، هەر کە بینیم، بەخێرهاتنی گەرمم کرد، خەریک بوو بڵێم مامۆستا وا ئامۆژگاریەتم جێبەجێکرد، خەریک بوو بڵێم ئەرێ بووم بەجیڤارا؟ وتم: مامۆستا دەمناسی؟ وتی: ئەیچۆن ناتناسم، وتم: لەبیرت دێت لەپۆلی شەشدا چیت پێوتم؟ بەزەردەخەنە تایبەتە قووڵ و جوانەکەیەوە وتی: ئا ئا، هەستم کرد مامۆستاکەم خاوەنی هەستێکی بەرزی شۆڕشگێرییە، بەڵام لەبەر پاراستنی ئاسایشی خۆی، نایەوێت راستەوخۆ باسی بابەتەکەم لەگەڵدا بکات.

**بە گۆڕی شەهید ئارام:**

دوای ئەوەی برینەکەی مەلا بەختیار ساڕێژ بوو، بەرەو سەرگەڵوگەڕاینەوە، لەبەر ئەوەبوو، کۆبونەوەی سەرکردایەتی ینک، لەسەرگەڵو دەکرا، مەلا بەختیاریش ئەندامی سەرکردایەتی بوو، دەبوو لەو کۆبونەوەیەدا بەشداربێت.

دلێری سەید مەجید، لەگەڵ هەموو بەرپرسەکانی ینکدا پەیوەندی خۆشبوو، ئەو رۆژەی لەسلێمانیەوە بەرەو سەرگەڵو دەچووین، ئەویشمان لەگەڵ بوو، بەکاک بەختیار، کاک بەختیار، بەدەوری مەلا بەختیاردا دەسووڕایەوە، داوای لەشۆفێرەکە دەکرد لەسەرخۆو بەوریاییەوە لێبخورێت، نەوەک تاسەی سەیارەکە عەزیەتی مەلا بەختیار بدات و برینەکەی بکولێتەوە. بەرامبەر بەو هەڵسوکەوتەی دلێر، مەلا بەختیار بەمنی وت: کاک دلێر زۆر مرۆڤدۆستە، هاوڕێکانی خۆی زۆر خۆشدەوێت.

که گەیشتینەوە سەرگەڵو، لەمەلا بەختیار جیابوومەوە، سەردانی دۆستە سەرگەڵوویەکانی خۆمم کرد، خەڵکی سەرگەڵو پێشوازیەکی گەرمیان لێکردم، هەر رۆژەی دەعوەتی ماڵێک بووم، بۆ دەعوەتەکان هەڤاڵ کوێستانی و عەلی شامارم لەگەڵ خۆم دەبرد. هەڤاڵ کوێستانی لەڕاگەیاندن کاری دەکرد، بارەگای ڕاگەیاندن لەبەرگەڵو بوو، شەو دەگەڕایەوە بۆ بەرگەڵو. عەلی شامار لەو کاتەدا بەرپرسیارێتی نەبوو، بانگ کرابو بۆ سەرگەڵو، بۆئەوەی بیکەن بەجێگری سەرتیپی، تیپی ٥١ گەرمیان، بۆ دەعوەتەکانی ئێواران عەلی شامارم لەگەڵ خۆم دەبرد.

عەلی شامار پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ بوو، ئەندامی کۆمەڵەبوو، خەڵکی خانەقین بوو، خاوەنی هەندێک بۆچوونی تیابەتی خۆی بوو، تا بڵێیت پێشمەرگەیەکی پاک و دڵسۆز بوو، قسەی دڵی و دەمی یەک بوو، ئەوەی بڕوای پێبوایە دەیوت. دەیوت من لەهەموو بوارێکدا مارکسیم، تەنیا لەمەسەلەی ماف و ئازادی ژندا بڕوام بەمارکسییەت نییە. عەلی شامار بڕوای بەوەبوو کە دەبێت کێشەکان بەهێز چارەسەربکرێن، زۆر بڕوای بەهێزی فیزیکی ماسوولکەکانی خۆی هەبوو، تەنیا پێشمەرگەو پێشمەرگایەتی بەگرنگ دەزانی، پیشەی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانی تری بەلاوەکی و ناپێویست دەزانی.

نیوەرۆیەک لەسەرگەڵو، جەمالی ئەنجومەن دەعوەتی کردین، عەلی شامار و هەڤاڵم لەگەڵدا بوون، جەمال میوانی تریشی هەبوو، میوانەکانی مامۆستا بوون، کاتێک عەلی شامار زانی میوانەکانی تر مامۆستان، بەربووە گیانی

مامۆستا و پیشەی مامۆستایی، قسەی توندی بەرامبەر بە مامۆستا کرد، خاوەن ماڵ سەیری منی دەکرد، نەیدەزای چی بڵێت، مامۆستاکان زۆر نیگەران بوون، بەڵام نەدەکرا لەو کاتەدا قسە بکەن.

دوای ئەوەی جەمال بەڕێی کردین، ناڕەزایی و نیگەرانی خۆی بەرامبەر بەقسە رەقەکانی عەلی شامار نیشاندا.

بۆ ئێوارەکەی من و عەلی شامار میوانی ماڵێکی تر بووین، دوای نان خواردن، عەلی شامار دەستی بەقسەکرد، باسی قارەمانێتی و زانایی خۆی دەکرد، باسی نەشارەزایی و نەزانی حاکمەکانی شۆڕشی دەکرد، دەیوت کاتێک بەرپرسی زیندان بووم، سەدان جار کڵاوم لەسەر سەرحاکمەکان ناوە. دوای نانخواردن و پشوودان، لەماڵەکە هەستاین و هاتینە دەرەوە، کاتێک من لەدەرگاکە دەرچووم، عەلی شامار پێشەکەوتبوو، لەدەرگای ماڵەکە دورکەوتبوەوە، خاوەن ماڵەکە هاتە نزیکمەوە، بەگوێمدا چرپاندی وتی: دکتۆر، ئەو پیاوە خوێندەواری هەیە؟ وتم: بەڵێ، تا پۆلی شەشی ئامادەیی خوێندووە، بۆ ئەو پرسیارەت کرد؟ خاوەن ماڵەکە وتی: ئەی بۆچی کە هەندێک قسە دەکات ناڵێت دوور لەڕووی حازری، یان حەشا حازری؟ داوای لێبووردنم لێکرد، وتم کەسانی عەسکەری ئەو جۆرە پێشەکییانە بەکارناهێنن، راستەوخۆ بە بێ پێشەکی قسە دەکەن، ئەو پێشەکیانە بۆ بواری کۆمەڵایەتیە، عەلی شامار پیاوێکی عەسکەرییە لەقسەکانیدا حاشاحازری بەکارناهێنێت.

من زیاتر بۆ عەلی شامار پەست بووم تا بۆ نیگەرانی هاوڕێ سەرگەڵوییەکانم، بڕیاربوو لەو کۆبونەوەیەی سەرکردایەتیدا، عەلی شامار بکەن بەجێگری سەرتیپ، لەدڵی خۆمدا دەموت: بەخوا ئەگەر وابڕوات، عەلی شامار بەو شێوەیە لەگەڵ خەڵکدا هەڵسوکەوت بکات، هیچ پۆستێکی نادەنێ. ئەگەر پۆستیشی بدەنێ زوو لێیوەردەگرنەوە، ئەی من چی بکەم؟ چۆن ئەو هەڵانەی بۆ راستبکەمەوە؟ من دڵسۆزی عەلی شامار بووم، بەڵام لەهونەری گەیاندنی رەئی خەڵک و رەخنەگرتندا، سەرکەوتوو نەبووم.

شەوێکی زستانی ساڵی ١٩٨٤ بوو، لەماڵە میوانەکەوە بەرەو مزگەوتی سەرگەڵوو دەرۆیشتین، وتم: عەلی شامار دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم، وتی:

بڵێ: وتم: خاوەن ماڵەکە رەخنەی لەقسەکانت دەگرت، کە وردەکاری قسەی خاوەن ماڵم بۆ گێڕایەوە، لەماڵە میوانەکە دوورکەوتبووینەوە، لەحەوزی مزگەوتەکەی سەرگەڵو نزیک ببووینەوە، هەر کە قسەکە لەدەمم هاتە دەرەوە، عەلی تووڕە بوو، وتی: هەر ئێستە دەچم دەیهێنم، دەیخەمە ناو ئاوی ئەو حەوزەوە[٢٣]، وتی: دەبێت تۆ ماڵەکەم پیشانبدەی، من نازانم لەکوێوەیە؟ ، لەو کاتەدا خەریک بو تێکدەچوم، دەموت: چییم لەخۆم کرد، ئێستە چیی بکەم؟ ، خەریک بوو لەعەلی شامار زوییر دەبووم، ئا لەو کاتەدا بەختیار مستەفای برای نەوشیروان مستەفا، لێمان نزیک بوەوە، مەرحەبای کردین، هەردووکمان وەڵاممان دایەوەو بێدەنگ بووین، لەو بێدەنگیەدا سیناریۆیەکی خۆرزگارکردنم بۆ هات، سەرەتا دەستم بەپێکەنینێکی قوڵ و درێژکرد، عەلی شامار وتی: دینت بسووتێنم ئەوە بەچیی پێدەکەنی؟ وتم: بە تۆ، وتی: بۆچی بەمن پێدەکەنی؟ وتم: بەخوا کڵاوێکی گەورەم خستە سەرت، وتی کڵاوی چیی؟ وتم: گاڵتەم لەگەڵ کردی، ئەو پیاوە وای بەتۆ نەوتوە، ویستم تووڕەت بکەم، وتی: بڵێ بەگۆڕی شەهید ئارام گاڵتەم لەگەڵ کردی، ئا لەو کاتەدا دیسان حەپەسام، کەمێک وەستام، لەدڵی خۆمدا دەموت "بەدرۆ سوێند بەگۆڕی شەهید ئارام بخۆم باشە یان، خۆم و عەلی شامار لەکێشەیەک رزگار بکەم" لەکۆتاییدا بڕیارمدا، وتم: بە گۆڕی شەهید ئارام گاڵتەم لەگەڵ کردی، باشبوو عەلی شامار بەو سوێندە ئارام بوەوە و کوڵی دا، منیش هەزار رەحمەتم بۆ گۆڕەکەی شەهید ئارام نارد، کە لەچارەسەرکرنی ئەو کێشەیدا فریام کەوت.

بۆ خەوتن لەگەڵ عەلی شامار چوین بۆ ماڵی مستەفا سەرگەڵویی، خەریک بوو خەومان لێدەکەوت، سێ کەس خۆیان کرد بەژووردا، لەتەنیشت ئێمەوە راکشان، من پرسیارم لێکردن: زەحمەت نەبێت ئێوە کێن؟ کارتان چییە؟ ، یەکێکیان وتی: خەڵکی گوندی مالومەین، کاسبین، هەر کە وشەی

---

٢٣ جۆرێک لە ئەشکەنجدانی خەڵکی لادێکانی باشووری کوردستان، پێشمەرگە خەڵکیان دەخستنە ناو ئاوی ساردی حەوزی مزگەتەکانەوە و لە ئاوەکەدا فەلاقەیان دەکردن.

کاسبیان لەدەم دەرچوو، من وتم: کاسبی چیی دەکەن؟ ، هۆکاری ئەو پرسیارەی من پەیوەندی بەباری ئاسایشی کۆبوونەوەی سەرکردایەتی و خۆم و عەلی شامارەوە بوو، سێ کەسی نەناسراو، لەگەڵ ئێمەدا لەژورێکدا بخەون، دەبێت بیانناسین. لەو کاتەدا عەلی شامار هەڵیدایەوە وتی: کاسب واتای قاچاخچێتی، قاچاخچێتی واتە خیانەت لەخەڵک، کۆمەڵێ قسەی تری لەو جۆرەی بەسەردا باراندن، ئەو سێ پیاوە زلە بەرامبەربە قسەکانی عەلی شامار، فزەیان لێوە نەدەهات. لەبەر قسەکانی عەلی شامار من دەستم بەپێکەنین کرد، هەر کە من پێکەنیم، سێ پیاوەکە لێم توورە بوون، وتیان: بۆ پێدەکەنی؟ منیش کە بینیم ئەوان پێیانناخۆشە پێبکەنم، بێدەنگ بووم، بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی وەڵامی قسە توندەکانی عەلی شامار نادەنەوە، بەڵام بەپێکەنینی من بەو قسانە، توورە دەبن و هەڕەشەم لێدەکەن؟ لەو کاتەشدا عەلی شامار بەمن دەڵێت: بەخوا من نەمزانیوە تۆ هێندە ترسنۆکی، ناوێری وەڵامیان بدەیتەوە.

بەرامبەر بەتوورەبونی سێ کاسبەکە و گاڵتەپێکردنی عەلی شامار، خۆم راگرت و بێدەنگیم هەڵبژارد، دوایی بۆمدەرکەوت ئەو سێ کەسە، عەلی شامار باش دەناسن، ئەویش باش ئەوان دەناسێ، کاتی خۆی عەلی شامار لەدۆڵی جافایەتی بەرپرس بووە، زۆری لێداون، چەندین جار دەستگیری کردوون، لەئاوی ساردا فەلاقەی کردوون، بۆیە ناوێرن لەبەرامبەرعەلی شاماردا قسە بکەن.

**خانەقینی:**

کۆبونەوەی سەرکردایەتی ینک لەسەرگەڵو کۆتایی هات، برینەکەی مەلا بەختیار ساریژبوو، بریاردرا مەلا بەختیار سەردانی دەرەوەی وڵاتی بکات. منیش لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و سالار عەزیزو دلێری سەید مەجید، لەسوارڕۆیەکدا، بۆ ئاوەژێ دەگەڕاینەوە، کە گەیشتینە سەر شەقامی سەرەکی سلێمانی-دوکان، چەند پێشمەرگەیەک لەسەر شەقامەکە بەچەکەوە وەستابوون، چاوەڕوانی سوارڕۆیان دەکرد، هەڵیانبگێت و بەرەو سلێمانی

برۆن، نەوشیروان مستەفا بەو دیمەنە زۆر نیگەران بوو، پرسیاری لەدلێری سەید مەجید کرد، وتی: ئەوانە پێشمەرگەی کێن؟ لەسەر ئەو شەقامە وەستاون، دلێر وتی: ئەوانە پێشمەرگەی کاک بەختیارن، واتە مەلا بەختیار، نەوشیروان مستەفا هێندەی تر تووڕەبوو، وتی: خانەقینی بۆچی دەچن بۆ سلێمانی ؟ ، کۆمەڵێ قسەی بە خانەقینی وت.

**تەسلیمبووەوە:**

گەیشتینەوە گوندی ئاوەژێ، دەستم بەکارەکانی خۆم کردەوە، پاش نیوەڕۆیەک کادرێک هات بۆ لای سکرتێری کۆمەڵە، دیاربوو ئەو کادرە هەڵەیەکی کردبوو، بۆ لێپرسینەوە بانگ کرابوو، نەوشیروان مستەفا کادرەکەی بردە سەربانی بارەگاکە، بەبەرچاوی پێشمەرگەکانەوە، چەندان قسەی ناشیرینی پێوت، من و پێشمەرگەکان گوێمان لەقسەکان بوو، کادرەکە هیچ قسەی نەکرد، تا قسەکانی نەوشیروان مستەفا تەواوبوون. کە قسەکان تەواوبوون، تفەنگەکەی دانا، تاقم و مەخزەنی کلاشینکۆفەکەی لەخۆی کردەوە، لەتەنشت تفەنگەکەیەوە داینا، وتی ئیتر ناتوانم پێشمەرگایەتی بکەم، دەچم خۆم تەسلیم دەکەمەوە. سەباح مەرگەیی بەبێ چەک ئاوەژێی بەجێهێشت، بەرەو مەرگە رۆیشت، دواتر بەدواچوونم بۆ پەرچەکرداری کادرەکە کرد، بەڕاستی وازی لەپێشمەرگایەتی هێنا، خۆی تەسلیم کردەوە، دوای راپەڕین بینیمەوە.

ئەو دیمەنەی ئەو رۆژە لەنێوان نەوشیروان مستەفاو کادرەکەدا بینیم، رۆژانە لەنێوان بەرپرسەکان و کادر و پێشمەرگەدا دووبارە دەبوەوە، ئەگەر پێشمەرگەیەک، یان کادرێک هەڵەیەکی بکردایە، بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ، بەگوێرەی بڕیاری لیژنەی لێکۆڵینەوەی تایبەت بەو کێشەیە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەدەکرا، لەباتی بەدواداچوونی روداوەکە، دڵنیابوون لە راستی و درووستی هەواڵەکە، رەخنە و رێنمایکردنی بەهەڵەداچوەکە، بەرپرسێک بانگی دەکرد، کۆمەڵێک قسەی ناشیرینی پێدەوت. زۆربەی کات ئەو کەسە قسە ناشیرینەکانی بەرپرسەکەی پێقبووڵ نەدەکرا، وازی لەپێشمەرگایەتی دەهێنا،

بەرەو هەندەران سەری خۆی هەڵدەگرت، یان تەسلیمی رژێم دەبوەوە. ژمارەیەکی کەمی پێشمەرگەی وەک من، لەبەرامبەر ئەو رەفتارە خێڵەکیانەی بەرپرسەکان، خۆی رادەگرت و کۆڵی نەدەدا، بەردەوامی بەخەباتی پێشمەرگایەتی دەدا و بەرەی گەلی چۆڵ نەدەکرد.

لەسزادانی کادردا، نەوشیروان مستەفا قسەی سوێرو زبرو بریندارکەری بەکاردەهێنا. مام جەلالیش تورەبوونی بێسنورو گۆچانی بەکاردەهێنا. دەستەی زیندان، (ئەرسەلان و عەلی بچکۆل) پەنایان بۆ زیندان کردنی کادرەکان دەبرد، ئەرسەلان بایز ساڵی ١٩٨٢ دلێر ئیبراهیمی هونەرمەند و ئاراسی برای زیندانی کرد، ساڵی ١٩٨٣ عەلی بچکۆل بڕیاری زیندانیکردنی منی دەرکرد.

**پیاوە ئاسنینەکە:**

گفتوگۆ بەردەوام بوو، لە نەورۆزی ساڵی ١٩٨٤ نزیکبوینەوە، سەرکردایەتی ینک بڕیاری دا، دوای ئاهەنگی نەورۆز، بارەگاکانی بگوازێتەوە بۆ سورداش، ئەو بڕیارە پەیوەندی بەبەرەوپێشچونی گفتوگۆوە هەبوو، نیشانەی ئەوەبوو، متمانەی نێوان ینک و حکومەتی عێراق لەگەشەکردندایە.

مەراسیمی نەورۆزی ئەو ساڵە، لەسورداش بوو، مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و سەرکردەکانی تری ینک، ئامادەی ئاهەنگی نەورۆز بوون، ژمارەی ئامادەبوانی ئاهەنگی نەورۆزی ئەو ساڵە، لەمێژووی ئاهەنگ و کۆبونەوەی خەڵکی کوردستاندا، کەم وێنەبوو، هەندێک کەس ژمارەی ئامادەبوانی بەملیۆن دەخەملاند.

لە ئاهەنگی نەورۆزی ئەو ساڵەدا، زۆرێک لەپێشمەرگە و کادرەکانی ینک و خەڵک، عەودالی بینینی مامە ریشە بوون، مامە ریشە لەسوارڕۆیەکی مێکزەمینیدا، فەرنجیەکی هەورامی لەبەرکردبوو، لەتەنشتی شۆفێرەکەیەوە دانیشتبوو، قۆڵی راستی خۆی و گوێی فەرنجیەکەی لەجامی سوارڕۆکەوە دەرهێنابوو، ریشیشی درێژکردبوەوە، بەناو خەڵکەکەدا دەگەڕا، گەنجێکی زۆر

شوێنی کەوتبوون، هاواریان دەکرد، مامە ریشە پیاوە ئاسنینەکە، گەنجەکان دەیانویست لەنزیکەوە مامە ریشە ببینن و وێنەی لەگەڵدا بگرن.

چالاکیەکانی مامە ریشە، لەگەرمیان و لەناو شاری کەرکوکدا، مامەڕیشەی لەلای خەڵک ناودارو خۆشەویست کردبوو، بەپیاوە ئاسنینەکە ناوی دەرکردبوو. خۆشی حەزی دەکرد زۆرترین خەڵک بیناسێت، وای کرد ئەوە ببێتە جێی سەرنجی خەڵک، جەماوەرشوێنی بکەوێت.

گەنجەکان بەڕاکردن شوێن سەیارەکەی مامە ریشە دەکەوتن، هاواریان دەکرد مامە ریشە، بەڵام هیچ گەنجێک بە لای مامجەلال و نەوشیروان مستەفا و ملازم عومەر و د. فوئاد مەعسوم و ئەوانی تردا لای نەدەکردەوە.

عەودالبونی خەڵک بۆ مامەڕیشە، مامەڕیشەی ساڵێک لەوە و بەری سەرگەلۆی بیرخستمەوە، چۆن وێنەی خۆی بەسەرماندا دابەشدەکرد، چۆن راستەوخۆ خۆی بەخەڵک دەناساند.

دوای ئاهەنگە بەناوبانگەکەی نەورۆزی سورداش، سەرکردایەتی ینک مامە ریشەی بانگ کرد، لەبەرئەوەی هەڵەی کردبوو یان لەسەر نمایشەکەی نەورۆز بوو، ماوەیەک بەرپرسیارێتی کەرتی لێوەرگیرایەوەو لەسورداش دەستبەسەر کرا.

**شێرکۆ بێکەس:**

چەند رۆژێک دوای ئاهەنگی نەورۆز، مام جەلال دەعوەتی بۆ کۆمەڵێک کەسایەتی کرد، یەکێک لەوانە شێرکۆ بێکەس بوو، منیش بۆ ئەو دەعوەتە بانگ کرابووم. فەرەیدوون عەبدولقادر وتی: مامجەلال کاتی خۆی لە بەکرەجۆ زۆر عەزیەتی کاک شێرکۆمان دا، چەند جار زیندانمان کرد، لەبەر ئەوەی مەلایی بوو، هەقە داوای لێبوردنی لێبکەیین. شێرکۆ بێکەس وتی داوای لێبوردنی ناوێت، بڕوام وابوو دوای ئاشبەتال تا پەنجا ساڵی تر شۆڕشێکی تر درووست نابێتەوە، بەڵام مادام ئێوە وەک ینک ، توانیتان دوای کەمتر لە ساڵێک شۆڕش درووستبکەنەوە، هەرچیتان لە من کردوە ئازاد بن، من هیچ ناڵیم و هیچم نەوتووە.

**نەخۆشخانەی سووورداش:**

دوای ئاهەنگە جەماوەریەکەی نەورۆز، بارەگاکانی سەرکردایەتی ینک گواسترانەوە بۆ سورداش، بارەگای مامجەلال، بارەگای کۆمەڵە، بارەگای یەکێتی شۆڕشگێران، بارەگای مەکتەبی سیاسی، بارەگای مەکتەبی عەسکەری و ئەوانی تر، لەسورداش جێگیرکران، بارەگای مەڵبەندەکانی ینک، لەشارەکان نزیک کرانەوە، گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەت بەرەو پێشەوە دەچوو.

بە گوێرەی ڕێکەوتنی نێوان ینک و حکومەتی عێراق، لەسورداش نەخۆشخانەیەکمان بۆ کرایەوە، هەموبەشەکانی پشکنین و چارەسەری لەنەخۆشخانەکەدا هەبوون، رۆژانە لەسلێمانیەوە دوو پزیشکی پسپۆر سەردانی نەخۆشخانەی سورداشایان دەکرد، ئەو نەخۆشانەیان بەسەر دەکردەوە کە لەقاوش بوون، چارەسەر و ڕێنماییان بۆ نەخۆش و بریندارەکان دەنووسی، ئێمە (پزیشک و کارمەندەکانی پێشمەرگە) ڕێنمایی و بڕیاری پزیشکە پسپۆرەکانمان جێبەجێ دەکرد. لەو کاتەدا من وەک پزیشکی خولاو(موقیم) لەگەڵ پزیشکە پسپۆرەکاندا کارم دەکرد.

لەلای پێشمەرگەوە من بەرپرسیاری نەخۆشخانەی سورداش بووم، لەلای حکومەتەوە د. میران عومەر بەرپرسی نەخۆشخانەی سورداش بوو.

لەسەرەتادا تەنیا من و د. سەعدون لەنەخۆشخانەی سورداش بووین، دواتر د. شوانیش هات بۆ نەخۆشخانەی سووورداش. دوای ماوەیەک دکتۆر شوان چوو بۆ سلێمانی بۆ خولی نەشتەرگەری.

پزیشکی ددانی نەخۆشخانە، د. سەردار تاڵەبانی بوو، ژمارەیەک کارمەندی تەندروستی، کارگێڕی، پێشمەرگەی پاراستنی نەخۆشخانەمان لەگەڵدا بوو، پێشمەرگەیەکی عەرەبمان لەگەڵدابوو، ناوی کاوە عەرەب بوو، پێشتر پێشمەرگەی تیپی ۲۱ کەرکوک بوو، نازانم چۆن بوو بەپێشمەرگەی نەخۆشخانە؟ .

**شەڕی پیاوەکان لەسەر ژن:**

مانگێک زیاتر بەسەر ئیشو و کاری نەخۆشانەی سورداشدا تێپەری، پزیشکە پسپۆرەکان رۆژانە لەسلێمانیەوە سەردانی نەخۆشخانەی سورداشیان دەکرد، دوای تەواوبونی کارەکانیان، دەگەڕانەوە بۆ سلێمانی، د. میرانی بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی سورداش، سەردانی دەکردین، دوای تەواوبونی کارەکانی، دەگەڕایەوە بۆ ناو شار.

پزیشکێکی ژنیش لەنەخۆشخانەی سورداش بوو، نازانم بۆچی ئەو پزیشکە لەسورداش دەمایەوە، خەڵکی سلێمانی بوو، دەیتوانی بەیانی بێت بۆ نەخۆشخانە، دەوام بکات، دوای نیوەڕۆ بگەڕێتەوە. بەڵام ئەو دکتۆرەیە وای نەدەکرد، بەبێ ئەوەی نەخۆشی ژن سەردانی نەخۆشخانەی سورداس بکات، یان بەشێکی تایبەتی نەخۆشی ژنان لەنەخۆشخانەی سووورداش هەبێت، بەبێ ئەوەی ئەو دکتۆرەیە پێشمەرگە بووبێت، بەرامبەر بەشوێنی نیشتەجێبونی پزیشک و کارمانده پیاوەکان، لەخانوویەکی گەورەی نەخۆشخانەی سورداشدا، بەشەوو بەڕۆژ خۆی بەتەنیا دەمایەوە.

لەسورداش ئەندامی کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەبووم، بەرپرسی پۆلی پێشمەرگە بووم، شەوێک خۆم بۆ کۆبوونەوە ئامادەدەکرد، بڕیار بوو لەسەر ئابوری سیاسی، کۆبونەوەیەک بەپێشمەرگەکان بکەم، پێش ئەوەی بڕۆم بۆ کۆبونەوەکە، سەردانی دکتۆر سەردارم کرد، لەو کاتەدا کۆمەڵێک قسەی لەسەر دکتۆرە ژنەکە کرد، وتی ئەمشەو یەکێک دێت بۆ لای، دەبێت ئەمشەو کەمین بم، تا بزانم ئەو کەسە کێیە بەشەو سەردانی دەکات؟ پرسیارم لە دکتور کرد و وتم: چۆن دەزانی خەڵک دێت بۆ لای؟ وتی: لەبەیانیەوە هەر خەریکی خۆجوانکردنە، میکیاج دەکات، تێکییدەداتەوە، هەرجارەی بەشێوەیەک قژی شانە دەکات، گڵۆپەکان دەکوژێنێتەوە، دواتر دایاندەگیرسێنێتەوە. پەنجەرەی ژورەکەی دکتور سەردارو کاوە عەرەب رووبەڕوی خانوەکەی دکتۆرە خەندە بوو. دوای ئەوەی گوێم لەقسەکانی گرت، لەوێ دەرچووم، بەرەو شوێنی کۆبونەوەکە رۆیشتم. کۆبوونەوەم تەواوکرد، گەرامەوە و لە ژوورەکەی خۆم خەوتم.

نزیکی نوێژی بەیانی رۆژی ٢٢-٥-١٩٨٤بوو، تەقە لەدەرگای ژوورەکەم درا، کارگوزارەکە وتی: دکتۆر هەستە منداڵیکیان هێناوە بۆ نەخۆشخانە، باری تەندروستی باش نییە، لەخەو هەستام، بەرەو ژووری پشکنینی نەخۆشەکان رۆشتم، نەخۆشەکە منداڵیکی ٣-٤ ساڵان بوو، لەگوندێکی نزیک سورداشەوە هێنابوویان، پشکنینم بۆ کرد، بۆمدەرکەوت دوچاری نەخۆشی قورگ گیران (Croup)بووە، بەراستی نەخۆشیەکەی مەترسیداربوو، ئەگەرفریای نەکەوتمایە، مەترسی جدی لەسەر ژیانی درووست دەبوو.

"خۆزگە ئەو منالە ئەو شەوە نەخۆش نەکەوتایە، یان ئەگەر نەخۆشیش کەوت، خۆزگە لەو کاتەدا نەیانهێنایە بۆ نەخۆشخانە، ئەگەر ئەو کاتەش هێنایان بۆ نەخۆشخانە، خۆزگە زوو چاک نەبایەتەوە، بۆئەوەی من لەو کاتەدا نەگەڕێمەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، تا رووبەڕوی ئەو کێشە نەخوازراوە ببمەوە".

نەخۆشخانەم بەجێهێشت، بەدڵخۆشیەوە بەرەو ژووری نوستن گەڕامەوە، "لەوپەڕی دڵخۆشیدا بووم، ئێستە منداڵیکم لەمردن رزگار کردووە، شەویش کۆبونەوەیەکی سەرکەوتووم بە پێشمەرگەکان کردوە"، نەگەیشتمبوومە ژورەکەی خۆم، لەپڕێکدا تارمایی پیاوێکی باریکەلەی باڵابەرزی عەینەک لەچاو، بەرچاوی گرتم، خۆی کرد بەدەرگایماڵەکەی د. خەندەدا[٣٤]، هەڵوەستەیەکم کرد، بەخۆمم وت ئا، "خۆ د. سەردار راستی کرد".

کەمێک وەستام، لەدڵی خۆمدا وتم "چیی بکەم باشە"؟ ، بڕیارمدا بچم بۆ ژوورکەی د. سەردار، بزانم لەکەمینداپە یان نووستوە، کە چوومە ژوورەوە، سەردار خەوتبوو، لەکەمیندا نەبوو، لەخەوێکی قووڵدا، بەسەردەمدا کەوتبوو، پێیەکم خستە ژیر سکی، وتم: هەستە کەمین، خۆ تۆ وتت ئەمشەو کەمین دەبم، کەچی خەوت لێکەوتووە، د. سەردار وتی: چیی بووە، بەدەنگێکی نرم وتم: قسەکەت راست دەرچوو، کەسێک هات بۆ لای د. خەندە، وتی: چۆن کەسێک بوو؟ نەتناسی؟ وتم: نەمناسی بەڵام بەقەدو باڵادا لەفلان کارمەندی خۆمان دەچوو، وتی: نا ئەو نییە، من دەزانم کێیە.

---

٣٤ دکتورە خەندە، ناوێکی خوزراوە.

ناسینی ئەو کەسەم بەد. سەردار سپارد، بۆئەوەی بیناسین و لای مامجەلال سکالای لەسەر بکەین، " خۆزگە ئەو شەوە نەچوومایە بۆ ژوورەکەی دکتورسەردار". کە لەژوورەکەی د. سەردار گەڕامەوە، ویستم بخەومەوە، کاوە عەرەب هاتەسەر سەرم، وتی: (د. فایق شلۆن تقبل هزا؟ ؟ ؟ ؟ ؟ ؟ ) تۆ بەرپرسی نەخۆشخانەیت چۆن بەوە رازی دەبیت؟ بەو قسەیەی کاوە عەرەب زۆر نیگەران بووم، رەگی کەلتوری خێڵەکی لەناخی هەمووماندا خۆی مات داوە، بۆ دەرفەتێک دەگەڕێت تا خۆی چالاک بکاتەوە، لەدڵی خۆمدا وتم: "ئەگەر هەڵوێستێک نیشان نەدەم، بەکەسێک حساب دەکرێم پێوانەی کۆمەڵایەتی و شۆڕشگێری بەلاوە گرنگ نییە، هەستم کرد بەرەورووی کێشەیەکی جدی دەبمەوە، لەو کاتەدا زۆر رقم لە د. سەردار هەستا، لەبەرئەوەی باسی روداوەکەی بۆ کاوە عەرەب کردبوو، کاوە عەرەب وتی: (دکتۆر احنا کۆمەڵە، عدوانا الرئیسی شۆشگێران) واتە ئێمە کۆمەڵەین، دوژمنی سەرەکیمان یەکێتی شۆڕشگێڕانە. بۆ ئەم قسەیەی کاوە عەرەب چەند لێکدانەوەیەکم هەبوو، یان هەڵگری بۆچونێکی چەپڕەوی منداڵانە بوو، یان سیاسەتی هەواڵگری دوژمنی کوردی پەیڕەو دەکرد، بۆئەوەی دووبەرەکی لەنێوان ئەو دوو رێکخراوەدا درووستبکات، ئەوەشی دەردەخست کە کاوە عەرەب و د. سەردار، دەزانن ئەو کەسە ئەندامێکی پلەبەرزی یەکێتی شۆڕشگێرانە، هەر واش دەرچوو، عاشقەکەی دکتورە خەندە، ح. س ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان بوو.

هێشتا لەسەر جێگەکەم راکشاوم، کاوە عەرەبیش وەک ئیزارئیل بەسەر سەرمەوە وەستاوە، لەدڵی خۆمدا وتم، "ئەم زەلامە دەیەوێت ئابڕووم ببات، بەکەسێک بمناسێنێ کە بەرامبەر بەرەفتاری بێرەوشتی هەڵوێستم نییە، یان دەیەوێت لەرێگەی منەوە لەسێبەری ئەو رووداوەدا، کێشەیەک لەنێوان کۆمەڵەو شۆڕشگێڕاندا درووستبکات".

لەو کاتەدا زۆر ئیحراج بووم، "نەمدەزانی چیی بکەم، بەقسەکانی د. سەردارو کاوە عەربیشدا دەردەکەوت، میوانەکەی درەنگانی شەوی د. خەندە دەناسن، سەر بەبرادەرانی یەکێتی شۆڕشگێڕانە، باشە کە د. سەردار میوانە

درەنگ وەختەکە دەناسێت، ئەی بۆ قسەی بۆکاوە عەرەب کردوە؟ بۆ کاوە عەرەبی ناردۆتە سەر من ".

ئەگەر گومانیش لەناسنامەی میوانەکە هەیە؟ خۆ ژوورەکەی د. سەردارو کاوە عەرەب، باشترین جێگەیە بۆ چاودێرکردن و ناسینی میوانەکە، بۆ لەوێوە چاودێریان نەکرد؟ ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکن، تا ئەمڕۆش وەڵام نەدروانەتەوە؟ لەبەرئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ئەو رووداوە نەکرا؟ .

دوای بیرکردنەوە، بەکاوە عەرەبم وت، تۆ بڕۆ، لەژوورەکەم چوومە دەرەوە، دوو پێشمەرگەم بانگ کرد، وتم وەرن ئیشێکی تایبەتیم پێتانە، ئەمشەو کەسێک چوەتە خانوەکەی دکتۆرە، دەبێت بێتەدەرەوە، لەو شوێنەدا خۆتان بشارنەوە، هەر کە میوانەکە لەخانوەکە دەرکەوت، بیناسن، بێدەنگ وەرن بۆ لای من، پێم بڵێن کێیە، وتیان باشە، یەک لەپێشمەرگەکان ناوی سیروان بوو، ئەویتریان ناوی نەوزاد بوو.

جارێکی تر گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، راکشام بەڵکوو خەوم لێبکەوێتەوە، چاوەڕوانی زانیاری پێشمەرگەکانم دەکرد، بەڵام زانیاری چیی، کاتێک پێشمەرگەکان دەبینن ح. س لەدەرگای خانوەکەی دکتۆرە دێتە دەرەوە، خۆیان ناگرن، پەلاماری دەدەن، بەشەق و بۆکز دایدەگرنەوە، منیش لەدەنگی هاوارو هەڕەشەو جنێوی ح. س خەبەرم بوەوە، یەکسەر بەرەو لای رووبەڕووبونەوەکە رۆیشتم، دەستم بەناوبژییوانی کرد، میوانەکە دەمی زۆر گەرم بوو، دەستی بەقسەکردن کرد، وتی من بۆ قاوەخواردنەوە چووم بۆ لای دکتۆرە، بۆ واتان لێکردم، چەند جارێک هەڕەشەی لەمن کرد، وای دەزانی من بەو پێشمەرگانەم وتوە وای لێبکەن. تابڵێی روداوێکی ناخۆش بوو، ئابرووچوون بوو، بەڵام بەرپرسانی یەکێتی زۆر بەسادەیی لەکێشەکە نزیکدەبوونەوە، منیش نەمدەزانی چیی بکەم.

**هەورە تریشقە:**

رۆژی دوای شەڕەکە، دنیا بێدەنگ بوو، ئەو رۆژە هەموو لایەک دەوامی ئاسایی خۆی کرد، دوای نیوەرۆ لە قەشقولی لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا

یاری دووگۆڵیمان دەکرد، لەکاتی یاریکردندا، سواررۆیەکی دەبڵ کابینە هاتە ناو گورەپانی یاریگا و وەستا، مەلا بەختیار سواررۆ دەبڵ کابینەکەی لێدەخوری، برینپێچێک کە تازە هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی، لەتەنیشتی مەلابەختیارەوە دانیشتبوو، بەپەشۆکاوی لەسواررۆکە دابەزی، وتی: دکتۆر، مامجەلال بانگت دەکات، دواتر وتی: ئەم سواررۆیەم لەگەڵ خۆم هێناوە، بۆئەوەی زوو فریای مامجەلال بکەویت، تێگەیشتم پێشمەرگەکە مەلا بەختیاری نەناسییوە، وای زانیوە هاولاتییە، مەلا بەختیارم بەو پێشمەرگە نوێیە ناساند، داوای لێبوردونم لە مەلا بەختیارکرد، مەلا بەختیار هەموو گیانی پێدەکەنی، ئاگاداری پەرچەکردارەکەی مام جەلال بوو، بەلام من نەمدەزانی چیی روویداوە.

گەیشتینەوە نەخۆشخانە، خواحافیزیم لەمەلا بەختیار کرد، بەرەو خانووی پزیشکان رۆیشتم، ئەمجارەیان بەختم بوو، راستەخۆ بەر هێرشی مام جەلال نەکەوتم، تا من گەیشتمەوە نەخۆشخانە، مام جەلال کارەکانی خۆی ئەنجام دابوو، ئەو ناوەی بەجێهێشتبوو.

دەرکەوت دوای رووداوەکەی کۆتایی شەوی رابوردوو، ح. س سەردانی مام جەلالی کردوە، سکالای لەسەر کردووین، دیارە مام جەلال ئەو رۆژە درەنگ لەخەو هەستابوو، بۆیە ئیجرائاتەکانی وا بەسودی من دواکەوتبوون.

مام جەلال هاتبوو بۆ نەخۆشخانە، وتبووی هەرچی پزیشک و کارمەندی نەخۆشخانە هەیە، هیچیانم ناوێت، با برۆن واز لەپێشمەرگایەتی بێنن، تەنیا کاوە عەرەب و دکتۆر سەعدون لەنەخۆشخانە بمێننەوە، کاوە لەبەرئەوەی عەرەب بوو، د. سەعدون لەبەرئەوەی ئامۆزای ح س بوو. هەر بەوەوە نەوەستابوو، جل و بەرگ و جانتاکانی هەموومانی خستبوە دەرەوە، پێشمەرگەی لەسەر دانابوون، بۆئەوەی هەر یەکەمان جل و جانتای خۆی هەڵگرێت و بڕوات. هەر لەو کاتەدا یەکێک لەپێشمەرگەکانی دەستەی پاراستنی مامجەلال، بۆ نارەزایی دەربڕین لەسەر ئەو کارەی مامجەلال، دەستی لەپێشمەرگایەتی هەڵگرت، گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی.

کاتێک گەڕامەوە بۆ نەخۆشخانە، دکتۆر سەردارم بەوپەڕی نیگەرانیەوە بینی، خەریکبوو سورداشی بەجێدەهێشت، خەریک بوو پێیبڵێم هەموی خەتای تۆ بوو، خۆم راگرت، لەدڵی خۆمدا وتم تازە سوودی چییە، کێشەکە درووستبوو، با هێندەی تر نیگەرانی نەکەم، دواتر هەندێک هەوڵمدا دکتۆر سەردار نەڕوات، بەڵام هەوڵەکەی من سوودی نەبوو، دیاربوو مام جەلال زۆر نیگەرانی کردبوو.

**خۆپیشاندان:**

بەرامبەر بەو پەرچەکردارەی مامجەلال، تا چەند کاتژمێرێک بێدەنگ بووم، بیرم لەوە نەدەکردەوە نەخۆشخانە بەجێبهێڵم، بیستبووم مامجەلال زوو توڕە دەبێت، بەڵام زوو ئاشت دەبێتەوە، بیرم دێت دوو ساڵ لەوەو بەر لەناوزەنگ بانگی کردم، وتی: من و تۆ زوو تووڕە دەبین، تۆ دکتۆری، ئەوە دەرمانێکت نییە تووڕەبوونەکەمان کەم بکاتەوە. من ئەو کاتە واتێگەیشتم کە مامجەلال دەیەوێت تەنها من لەتووڕەبوون ئاگادار بکاتەوە، هەوڵمدەدا لەکاتی رووداوی ناخۆش و نابەجێدا خۆم رابگرم، تووڕە نەبم، بەڵام کە ئەو رۆژە ئەو هەڵسووکەتەی مام جەلالم بینی، بەو شێوەیە بەبێ لێکۆڵینەوە، هەرچی دکتۆرو کارمەند و پێشمەرگەی نەخۆشخانە بوو، هەمووی دەرکرد، جلەکانیشی فرێدابووینە دەرەوە، بۆمدەرکەوت بەڕاستی مام جەلالیش زوو تووڕە دەبێت.

لای ئێوارەوە گەڕامەوە بۆ مەکتەبی سیاسی، هەر برادەرێکی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی یەنکم دەیبینی، پێدەکەنی، لەباتی ئەوەی دڵمبدەنەوە، یان پرسیارم لێبکەن ئەو رووداوە چۆن بوو؟ بۆ وایلێهات، لیژنەی لێکۆڵینەوەی بۆ دابنێن، گاڵتەوگەپیان دەکرد، پێدەکەنین.

ملازم عومەر ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری بوو، لەباتی ئەوەی بەجدی شوێن کێشەکە بکەوێت، بەگاڵتەپێکردنەوە وتی: وەڵڵا من لەجێگەی تۆ بم، ئێستا دەچمە ناو ئەو رەبایەی حکومەت، بەهاوەن

ئێره دادەگرمەوە، دەستی بۆ ڕەبایەیەکی سوپای عێراق رادەکێشا، کە لەسورداشەوە نزیک بوو.

هێشتنەوەی کاوه عەرەب لەنەخۆشخانە، کە هۆکاری راستەخۆی ڕووداوەکە بوو، وە ئەگەری ئەوه هەبوو کاوه بەمەبەست کاری بۆ ئەو کێشەیە کردبێت، منی زۆرتر نیگەران کرد، هەڵویستی گاڵتە ئامێزی بەرپرسەکانی ینک، هێندەی تر نیگەرانی کردم، بڕیارمدا سورداش بەجێنەهێڵم، پەرچەکردارێک نیشان بدەم.

چاوپۆشیکردن لەو ڕەفتارە نابەجێیەی ح س، دەرکردنی پزیشکان و پێشمەرگەی نەخۆشخانەی سورداش، زۆربەی کادرو پێشمەرگەکانی نیگەران کرد بوو، بۆیە کاتێک پێشنیاری خۆپیشاندانم دژی مامجەلال بۆ کادرو پێشمەرگە کرد، زۆربەیان ڕەزامەندیان نیشاندا. لەگەڵ چەند کادرێکی کۆمەڵە، لیژنەیەکمان دروستکرد، سەردانی بارەگاکانمان دەکرد. داوامان لێدەکردن لە نارەزایی دەربڕین و لەخۆپیشاندان بەشداربن، کادرو پێشمەرگەی بارەگاکانی سەر بەکۆمەڵە و مەکتەب سیاسی و مەکتەبی عەسکەری و ئەوانی تر، ئامادەیی خۆیانیان نیشاندا، بەڵام پێشمەرگەی بارەگاکانی یشک، رازی نەبوون لەخۆپیشاندانداندا بەشداری بکەن، لەبەرئەوەی ح س ئەندامی سەرکردایەتی ڕێکخراوەکەیان بوو.

بۆ شەوەکەی کۆبووینەوە، لەبەردەم مەکتەبی سیاسیدا دەستمان بە دەربڕینی نارەزایی کرد، ئەو شەوە، عەبدولرەحمان قاسملۆو ژمارەیەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی حدکا، میوانی مامجەلال بوون، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ینک لەگەڵ مامجەلال، لەمەکتەبی سیاسی بوون.

نزیکەی ٢٥٠ دووسەد و پەنجا پێشمەرگە دەبووین، ئەحمەدی دادی دەستەی پاراستنی مام جەلال، یەک لە خۆپیشاندەرە چالاکەکان بوو، کە لەهەمووومان زیاتر نیگەران بوو، بەدەنگی بەرز هوتافی دەکێشاو نارەزایی دەردەبڕی. یەک لە خۆپیشاندەرانی تری ئەو شەوە، هێمنە رەش بوو ، ئەو کاتە فەرماندەی کەرت بوو، زۆر نیگەران بوو، ئەویش بەدەنگی بەرز دژی بڕیارەکەی مام جەلال هاواری دەکرد.

ئـەو شـەوە لەبـەردەمی بارەگـای مەکتـەبی سیاسـی ینـک لەسـورداش، کۆبووینـەوە، داوامانـدەکرد مـام جـەلال بەبڕیارەکـەی خۆیـدا بچێتـەوە، پزیشکەکان بگەڕێنەوە بۆ نەخۆشخانە، ح س سزا بدرێت.

کە برادەرانی مەکتـەب سیاسـی ینـک ئـەو گردبوونـەوەیان بینی، دوچاری دڵەراوکێ و نیگەرانی هـاتن، لەلایەکەوە ترسـی ئـەوەیان هـەبوو ئێمـە هێرش بکەینـە سـەریان، لەلایـەکی تریشـەوە ترسـی ئـەوەیان هـەبوو مـام جـەلال بەگردبونەوەکە بزانێت، بڕیارێکی توندتر بدات، بۆیـە نـاو بەنـاو هـەر جارەو یـەکێکیان دەهاتنـە دەرەوە، هـەوڵی سـاردکردنەوە و بڵاوەپێکردنـی گردبونەوەکەیان دەدا. داوایان لێدەکردین بەنەرمی و بەهێواشی قسـە بکـەین، بۆئەوەی مام جەلال و میوانەکانی بەم گردبونەوەیە نەزانن.
سـەرەتا فوئـاد مەعسـوم هاتـە دەرەوە، دەسـتی بەقسـە کـرد، ئامـادەبوان رێگـەیان نـەدا قسـەکانی تـەواو بکـات، رەخنـەبارانیان کـرد، خـۆی کـردەوە بـەژووردا. دوای ئـەو قـادری حـاجی عـەلی هـات، ئـەویش لەسـەر هـەمان ریسمیی فوئاد مەعسوم هەندێک قسەی کرد، قسەکانی ئەویش بێسوود بوون کاریگەری نەبوو. دوای ئەو، ئازاد هـەورامی هـات، ئازاد دەیوت: مـن لەگـەڵ ئێوەدام، ئێوە ڕاسـتن، بـەڵام کـاتی گردبوونەوەکـە گونجـاو نییـە، مامجـەلال میوانی هەیـە، بـا میوانـەکان نـەزانن، بچنـەوە شـوێنی خۆتـان، سبەینێ قسـەی لەسەر دەکەین، قسەکانی ئازادیش کۆڵی بەپێشمەگە ناڕازیەکان نەدا.

دوای ئەو فەرەیدون عەبدولقادر هـات، کاتێک فەرەیدون عەبدولقادر هـات ئێمە ماندوو ببووین، خەومان دەهات، ئەویش دەسـتی بەقسـە کـرد، لـەکۆتایی قسـەکانیدا پەیمـانی پێـداین: کـە بـۆ رۆژی دوایـی بـەزووترین کـات، داواکاریـەکانمان جێبـەجێبکات. دوای قسـەکـانی فەرەیـدون عەبـدولقادر، بڕیارمـان دا ئـەو شـەوە بـڵاوەی لێبکـەین، بـۆ رۆژی دوایـی دەسـت بەگردبونـەوە و نـاڕەزایی دەربـڕین بکەینـەوە، تـا بڕیارەکـەی مـام جـەلال دەگۆڕین.

**مەترسی:**

بۆ رۆژی دوایی چاوەڕوانی گردبونەوەی پێشمەرگە بووم، پێشمەرگە دیار نەبوون، بۆمدەرکەوت زۆربەی پێشمەرگە بەشداربووەکانی گردبونەوەکەی شەو، بەتەکتیکی بەرپرسانی ینک بڵاوەیان پێکراوە، هەر مەفرەزەیەک بەئەرکێک بەلایەکدا نێردرابوو ، سووورداش چۆڵ ببوو. سەردانی ئازاد هەورامی و فەرەیدون عەبدولقادرم کرد، فەرەیدون نوێنەری ینک بوو لەلیژنەی گفتوگۆی یەکێتی و حکومەتی عێراق دا، نوسینگەی لەکەرکوک بوو، هەر کە بینیمی وتی: دکتۆر خۆت ئامادە بکە با پێکەوە بەرەو کەرکووک برۆین، منیش بەو پێشنیارەی فەرەیدوون نیگەران بووم، وتم: من بۆ ئەوە نەهاتوم لەگەڵ خۆتا بمبەیت بۆ کەرکوک، بۆئەوە هاتووم پەیمانەکەی شەوت جێبەجێبکەیت، فەرەیدون بێدەنگ بوو، لەوە زیاتر قسەی نەکرد، منیش قسەی ترم نەکرد.

ئا لەو کاتەدا، پێشمەرگەیەکی دەستەی پاراستنی فەرەیدون وتی: دکتۆر میوانت هاتووە، کە چومە دەرەوە، هەڵۆ چەمچەماڵیم بینی، هەڵۆ فەرماندەی تیپی ٢٣ سورداش بوو، پاش چاک و چۆنی، هەڵۆ وتی: ئیمە وەک تیپی ٢٣ سورداش دژی ئەو بڕیارەی مام جەلالین، لەگەڵ ئێوەین، لەو کاتەدا هەڵۆ یەک لەفەرماندە سەربازیە نیگەرانەکانی یەکێتی بوو، ئەویش دەیویست: نیگەرانی خۆی و پێشمەرگەکانی لەگەڵ نارەزایی و نیگەرانیەکانی ئێمە یەکبخات، سنورێک بۆ ئەو سیاسەتە هەڵانەی ینک دابنێت. لای خۆمەوە بەساردی پیشوازییم لەپێشنیارەکەی هەڵۆ کرد، دەستیشم بەڕوویەوە نەنا، داوام لێکرد چاوەڕوان بێت تا ئاگاداری دەکەمەوە.

من نەدمدەویست نارەزاییەکان لەسنووری سورداش بچنە دەرەوە، لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەر تیپی ٢٣ سورداش بێنە ناو چالاکییەکەوە، نارەزایی دەربڕیین گەورە دەبێت، ئەگەر هەیە لەدەستمان دەربچێت، دوژمنان و ناحەزان بەسوودی خۆیان بیقۆزنەوە، بۆیە بەساردی وەلامی داخوازیەکەی هەڵۆم دایەوە.

هەڵۆ یەکێک لەفەرماندە قارەمانەکانی هێزی پێشمەرگە بوو، نیگەرانیەکەی گەورەبوو، وای لەهەڵۆ کرد دەست لەپێشمەرگایەتی هەڵگرێت و دابنیشێت و تەسلیم ببێتەوە.

دوای هەڵۆ، بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی سورداش هات، ناوی مامۆستا محەمەد بوو، خەڵکی قەلادزێ بوو، سەر بەحشع بوو، وتی دکتۆر ئێمەش وەک قوتابخانەکانی سورداش لەگەڵتانین، خەڵکی سورداشیش هەموویان لەو کارە نابەجێیە تووڕەن، ئەگەر ئێوە خۆپیشاندان بکەنەوە، بەمامۆستاو قوتابی و خەڵکەوە خۆپیشانداتان لەگەڵدا دەکەین.

کە گوێم لەقسەکانی مامۆستا محەمەد گرت، لەگەڵ قسەکانی هەڵۆ چەمچەماڵی نزیکم کردنەوەو لێکمدانەوە، لەدڵی خۆمدا وتم: وەزعەکە خراپە، خەریکە مەترسی لەسەر ینک درووستدەبێت، بەڵام من ئەوەم ناوێت، من نامەوێت بازنەی نارەزایی دژی یەکێتی فراوان ببێت، نامەوێت خەڵک و پێشمەرگە دژی مام جەلال و یەکێتی خۆپیشاندان بکەن، من تەنها دژی ئەو بڕیارە بەپەلەیەی مام جەلال بووم. بۆیە دەبێت هەڵویستی خۆم بگۆڕم، سنوور بۆ نارەزایی و خۆپیشاندان دابنێم و کۆتایی پێبێنم. هەر لەو کاتەدا بڕیارمدا کۆتایی بەخۆپیشاندان بێنم.

**خولی نەشتەرگەری:**

دوای ئەوەی کۆتاییم بەخۆپیشاندان هێنا، بڕیارمدا لەسورداش دووربکەومەوە، لەڕێگەی لیژنەی هاریکاری ینک و حکومەتی عێراقەوە، پسوڵەی چوونە ناو شارم بۆ کرا، چوومە شار، چەند رۆژێک لەسلێمانی و هەولێر مامەوە، سەردانی خزم و دۆستانم کرد، بیرم لەوە دەکردەوە چیی بکەم؟ د. شوان ماوەیەک لەوەو پێش لەڕێگەی لیژنەی هاریکاریەوە، لەنەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی بەشداری خولی بەهێزکردنی نەشتەرگەری کردبوو، منیش بەباشم زانی وەک ئەو، بەشداری هەمان خول بکەم.

ئێستا کە سەیری لاپەڕەی ئیرادەی شۆڕشگێری و دڵپاکی و کۆڵنەدانم دەکەم، شانازی بەخۆمەوە دەکەم، لەسەر هەڵەی کەسانی تر، بەو شێوەیە سزات بدەن و لەسەر کارەکەت دەرت بکەن، دەرفەتت هەبێت تۆڵەی خۆت بکەیتەوە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی گشتی، دەست لەتۆڵەکردنەوە هەڵگریت. لەوەش گرنگتر ئەوە بوو، بەشداری خولی پەروەردەی پزیشکیم کرد، بۆئەوەی لەئایندەدا باشتر خزمەتی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان و ینک بکەم.

لەسەرەتای مانگی ٦شەشی ١٩٨٤دا، لەکاتی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراقدا، لەنەخۆشخانەی فریاکەوتن و نەخۆشخانەی فێرکاری سلێمانی، لەژێر چاودێری د. نەوزاد عەتارو د. حلمی قەزازو دکتۆر جەمال غەفوورو دکتۆر نەوزاد ساڵح و د. دارادا، دەستم بەخولێکی پەروەردەی نەشتەرگەی گشتی کرد، ئەو خولە تا مانگی یەکی ساڵی ١٩٨٥ درێژەی کێشا، دوای تەواوکردنی خولی پەروەردەی پزیشکی، پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کردەوە، لەسنوری مەڵبەندی یەکی ینک، درێژەم بەخەباتی پێشمەرگایەتی دا.

ئەو حەوت مانگەی لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی مامەوە، لەڕووی زانست و هونەری پزیشکیەوە، سوودم وەرگرت، لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە ژمارەیەک پزیشکی وەک دکتور ڕاژان، دکتور ئاری سامی، دکتور بەسام ، دکتور ئاراس سابونچی و دکتور تاهیر عارف بوون بەهاوڕێم. هەر لەو کاتەدا ژمارەیەک کارمەندو خزمەتگوزاری تێکۆشەرم ناسی و بوون بەهاوڕێم، کە گەڕامەوە بۆ پێشمەرگایەتی، دەرمان و پێویستی پزیشکیان بۆ دەناردم.

**شیوعی ئاخر زەمان:**

ئەو ماوەیەی لەسلێمانی مامەوە، لەسەر گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراق، ڕووبەڕووی چەندان هەڵویستی ناخۆش بوومەوە، زۆربەی خەڵکی سلێمانی، بەو گفتوگۆیە، بەمیکانیزمی گفتوگۆکە ناڕازی بوون، ڕەخنەی توندیان لەینک دەگرت، هەندێک کەس دەیانوت ینک بەتەواوی خۆی داوە

بەدەستەوە، منیش بەبەردەوامی داکۆکیم لەسیاسەتی ینک دەکرد، بەڵگەم بۆ ڕەوایی گفتوگۆ دەهێنایەوە.

گۆڤاری ئەلتەلیعە ئەلعەرەبیە، چاوپیکەوتنێکی مام جەلالی بلاوکردەوە، لەسەرباسی جاوپێکەوتنەکەدا، لەزاری مام جەلالەوە نووسرابوو: لەپرۆسەی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراقدا، سەدام حسەین دادوەرە، سەر بەهیچ لایەنێک نیە. ئەو سەرباسە خەڵکی کوردستانی نیگەران کرد، ناڕەزایی زۆر لەو لیدوانە کەوتەوە، یەکێک لەپزیشکەکان وتبووی، ئیتر لەمەودوا لەگەڵ فایق قسە ناکەم، لەبەرئەوەی ئەوان بەتەواوی بوون بەجاش.

کاتێک گوێم لەو قسەیە بوو، تورەبووم، قسەی زۆرم بەو پزیشکە وت، ئاگادارم کردەوە کە دەبێت ئاگاداری دەمی بێت، ئەو برادەرە قسەکانی منی وا بلاوکردەوە کە من وتومە دەیکوژم، بەڵام باشبوو دوای کۆتاییهاتنی گفتوگۆو دروستبونەوەی شەڕ، ئەو دکتۆرە پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد.

هەڵویستێکی تری ناخۆش، کە لەسلیمانی رووبەڕووم دەبوەوە، شەڕی قرناقە و پشتئاشان بوو، شەوێکیان لەگەڵ کۆمەڵێک برادەر، لەیانەی پزیشکی دانیشتبوین، لەسەر شەڕی قرناقە و پشتئاشانی نێوان ینک و بەرەی جود، چەند کەسێک زۆر بەتوندی رەخنەیان لەسیاسەتی ینک گرت، بەتایبەتی رەخنەی توندیان ئاڕاستەی نەوشیروان مستەفا کرد. منیش داکۆکیم لەسیاسەتی ینک دەکرد، رونکردنەوەم دەدانێ. دەموت: حشع، بەبێ ئەوەی لەو کاتەدا هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ینک دا بووبێت، لە بەرژەوەندی پدک و حسک ، لەگەڵ ینک شەڕی دەستپێکرد، لەسەرەتای مانگی چواری١٩٨٣ دا، مەفرەزەیەکی هاوبەشی حشع وحسک، لەنزیک گوندی داوداوێ ی دەشتی کۆیە، کەمینیان بۆ تیپی ٩٣ کۆیە دانا، فەرماندەی تیپەکەو جێگرەکەی و ژمارەیەکی تر پێشمەرگەی ینکیان شەهید کرد. شەماڵی سەرتیپی ٩٣ کۆیە، لەلایەن سەرکردەو کادرو پێشمەرگەی ینک و خەڵکی ناوچە رزگارکراوەکانەوە، خۆشەویست و بەرێزبوو، لەکاتی هاتنە دەرەوەی حزبی شیوعیدا، شەماڵ یەکێک لەو کادرانەی ینک بوو، کە هاوکاری زۆری حزبی

شیوعی کردبوو، بەکۆڵی خۆی چەک و تەقەمەنی و خواردنی بۆ حشع گواستبووەوە، بەشەهیدکردنی شەماڵ لەلایەن پێشمەرگەکانی حزبی شیوعیەوە، پێشمەرگەی یەکێتی ئاگریان گرت، بۆ تۆڵەدەگەڕان.

وتم: دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم، پێشمەرگەکانی بەرەی جود (پدک، حشع، حسک، پاسۆک) هێرشیان کردە سەر بارەگای مەڵبەندی۳ سێی ینک، لەگوندی بالیسانی ناوچەی خۆشناوەتی، مەڵبەندیان داگیرکرد، ژمارەیەک کادری یەکێتیان شەهید کرد.

دوای ئەوەی پێشمەرگەکانی بەرەی جود، دەستیان بەسەر مەڵبەندی سێدا گرت، دەستیان دایە سوکایەتی پێکردن و ئابڕوبردنی هەندێک لەبەرپرس و کادری ینک، ئەوەش هێندەی تر پێشمەرگەی یەکێتی تووڕە کرد، قینی زۆریان لەدڵی خۆیاندا دژی پێشمەرگەکانی بەرەی جود، وە بەتایبەتی پێشمەرگەکانی حشع کۆکردەوە.

باسی ئەوەم بۆ ئەو برادەرانە کرد کە پێش شەڕی قرناقە و پشتئاشان، حزبەکانی بەرەی جود بەرنامەیان هەبووە هێرش بکەنە سەر مەڵبەندی دوی ینک و داگیری بکەن، بەڵگەم ئەوە بوو کە پێش هێرشی سەر بارەگای مەڵبەندی سێ، برادەرێکی خۆم کە خەڵکی سەرگەڵو بوو، ناوی سالاری مامە عەبە بوو، سەر بەرێکخستنی حسک بوو، هاتە لام، وتی: دکتۆر ئەگەر مەڵبەندمان گرت، تۆ مەترسیت نەبێت، رامەکە، تۆ دکتۆری، دوای ئازادکردنی سەرگەڵو ئێمە تۆ دەپارێزین، ئێمە پێویستمان بەپیشەکەی تۆیە.

دواتر باسی هەڵویستی ینکم کرد بەرامبەر حزبی شیوعی لەپاریزگای سلێمانی، وتم: لەبەرئەوەی شیوعیەکانی سنوری پارێزگای سلێمانی، دژی ینک بەشداری شەڕیان نەکرد، هیچ شەڕو پێکدادانێک لەنێوان ینک و حشع دا، لەپاریزگای سلێمانی رووی نەدا.

کەچی ئەو برادەرانە، هەر لەسەر رەخنە بریندارکەرەکانی خۆیان بەردەوام بوون، ئەوان وای بۆ دەچوون کە رێککەوتنێکی نهێنی، لەنێوان ینک و حکومەتی عێراقدا، بۆ لێدانی بەرەی جود هەبووە، ئەو شەڕەی ینک دژی

بەرەی جود، لەقرناقە و پشت ئاشان کردی، بۆ رازیکردنی حکومەتی عێراق بووە. کە بینیم قسەکانم ناچێت بەگوێیاندا، منیش وتم: ئێوە شیوعی ئاخر زەمانن، لەگەڵ کۆنەپەرستەکاندا، دژی پێشکەوتوخوازەکان شەڕ دەکەن.

**منیش وەك تۆ دەرکراوم:**

ئەو ماوەیە لەسلێمانی بووم، رۆژانە ڕووبەرووی کێشە دەبوومەوە، بەڵام بەوریاییەوە خۆم لەپەرچەکردارو هەڵوێست نیشاندان دەپاراست، لەدڵی خۆمدا دەموت "با دان بەخۆمدا بگرم، نەوەک کێشەیەکی وەک ئەوەی سورداشم بۆ دروستببێت، مامجەلال لێرەش دەرمبکات". رۆژێک لەگەڵ د. عارف عەلی پسپۆری نەشتەرگەری گشتی، ئێشکگری نەخۆشخانەی فریاکەوتن بووم، تەلەفۆنێک بۆ نەخۆشخانەی فریاکەوتن کرا، تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، خەتیبی مزگەوتی گەورەی سلێمانی، قسەی لەگەڵ کردم، وتی: بەپەلە ئیسعافێکمان بۆ بنێرن، لەمزگەوتی گەورە نەخۆشێکی مەترسیدارمان هەیە، یەکسەر ئیسعافەکەم نارد، دکتۆر عارفم لەهەواڵەکە ئاگادار کردەوە. نیو کاتژمێری پێچوو، ئنجا ئیسعافەکە گەڕایەوە، یەکێک لەبانگخوێنە نابیناکانی مزگەوتی گەورەی هێنابوو، لەنەخۆشەکە نزیکبومەوە ویستم پشکنینی بۆ بکەم، بانگخوێنەکە وتی: دکتۆر من نەخۆش نیم، هیچم نییە، لەگەڵ خەتیب شەڕم بووە، خەتیپ دەریکردووم، نەمدەویست مزگەوتی گەورە بەجێبهێڵم، خەتیب ئەم فێڵەی لەمنیش و لەئێوەش کرد. لەکاتی گفتوگۆی من و نابیناکەی مزگەوتی گەورەدا د. عارف گەییشت، پێکەوە گوێمان لەنیگەرانی و گلەییەکانی نابیناکە گرت، لەدڵی خۆمدا وتم "منیش وەک تۆ دەرکراوم". دواتر من و دکتۆر عارف هەر یەکەو کەمێک پارەمان دا بەنابیناکە و ناردمانەوە. دیار بوو ئەو نابینایەماڵی نەبوو، لەمزگەوتی گەورە دەمایەوە، خەتیب دەیویست لەمزگەوتی گەورە دوریبخاتەوە.

کاتێک لەپیلانەکەی خەتیب تێگەیشتم، زۆر نیگەران بووم، لەبەرئەوەی زوڵمی لەنابیناکە کرد، نەخۆشخانەی بۆ پیلانگێریەکەی بەکارهێنا، بەرامبەر بەو هەڵسوکەوتەی خەتیب، تورە بووم، دەمویست تەلەفۆنی بۆ بکەم، ئەوەی لەدڵمدایە پێی بڵێم، بەڵام لەمەدا دانم بۆ خۆمدا گرت، وتم قسە نەکەم باشترە، نەوەک دووچاری کێشەیەکی تر ببم و لای مامجەلال سکاڵام لەسەر بکەن.

**پارەو پێناس:**

شەوێکیان تا کاتژمێر سێ، لەگەڵ د. حلمی لەساڵۆنی نەشتەرگەری نەخۆشخانەی فریاکەوتن ماینەوە، کاتێک نەشتەرگەری تەواو بوو، جلمان لەبەرکرد، سەیرم کرد پارەو پێناسەکەم لەگیرفانمدا نەماوە، پارەو پێناسەکەم دزرابوو. بۆ سبەینێ کارمەندێکی نەخۆشخانە هاتە لام، وتی: دکتۆر ئەو پێناسەیەی تۆم لەسەر شەقامەکەی نزیک نەخۆشخانە دۆزیەوە، پێناسەکەم وەرگرتەوە و سوپاسم کرد.

بۆئەوەی دووچاری کێشەیەکی تری لاوەکی نەبم، باسی پارە دزراوەکەم نەکرد. بۆ رۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ سورداش، سەردانی مەکتەبی سیاسییم کرد، بەنامەیەک باسی دزینی پارەکەم کرد، داوام لەمەکتەبی سیاسی و سکرتاریەتی مامجەلال کرد، هەندێک پارەم بدەنێ. هەر ئەو رۆژە کەسێکی تر لەقەڵادزێوە هاتبوو، داوای هاوکاری دەکرد، کادری یشک بوو. لەو کاتەدا نەوشیروان مستەفا کارەکانی مەکتەبی سیاسی بەرێدەکرد، رەزامەندی نیشاندا بڕی پەنجا دینار بۆ من خەرج بکرێت، وە بڕی پێنجسەد دینار بۆ کادرەکەی یشک خەرج بکرێت. بڕی ئەو پارەیەی لەمن دزرابوو، سەد و سی دینار بوو، نەوشیروان مستەفا نیوەی پارە دزراوەکەشی بۆ قەرەبوو نەکردبوومەوە. سکرتێری مەکتەبی سیاسی(سکرتێری مام جەلال بوو)، ناوی ب س بوو، سەر بەیشک بوو، وتی: سەرم سوڕ دەمێنی، دەبوو پێنج سەد دیناری بۆ تۆ خەرج بکردایە، بۆچی پارەیەکی کەمی بۆ خەرج کردی؟ من لەسەری نەڕۆیشتم، گوێم نەدایە، لەبەرئەوەی دەمزانی لەدوای رووداوەکەی

سورداش، مەکتەبی سیاسی و مامجەلال لە من نیگەرانن. لەکاتی روداوەکەی سورداشدا پێش خۆپیشاندانەکە، سەردانی نەوشیروان مستەفام کردبوو، لەدژی بڕیارەکەی مامجەلال داوای هەڵوێستم لێکرد، بێدەنگی هەڵبژارد، هیچ وەلامێکی نەدامەوە، تێگەیشتم لەسەر ئەو رووداوەی سورداش لەمن نیگەرانە، بەڵام خۆی ئاسا نە پرسیاری لێکردم، نە وتی چۆن بووە، نە وتی خەتای کێ بووە.

دوای راپەڕین فایلی ب س سکرتێری مام جەلال ئاشکرابوو، دەرکەوت سیخورێکی بەوەفای رژێمی بەعس بووە، هەرچی زانیاری دەستکەوتووە، ناردویەتی بۆ دەزگا هەواڵگریەکانی رژێمی بەعس ، لەگەڵ ئەوەشدا کەس پێینەوت بەری چاوت کلی پێوەیە.

**خوێنی سێ هەورامی:**

یەک لەو یادەوەرییە ناخۆشانەی تر، کە قەت لەبیرم ناچێتەوە، قسەی منداڵە شوتی فرۆشەکەی سلێمانی بوو، هاوینی ساڵی ١٩٨٤ بوو، من و دکتۆر سەربەست، بەسوارڕۆی ئیسعاف، لەنەخۆشخانەی فریاکەوتنەوە، بۆ خانەی پزیشکان دەگەڕاینەوە، لەسەر شەقامەکە شووتی فرۆشێکمان بینی، حەزمان لەشوتی کرد، بەشۆفێری ئیسعافەکەم وت: بوەستە با شوتییەک بکڕین، من و دکتۆر سەربەست دابەزین، لەدوکانی شووتی فرۆشەکە نزیکبووینەوە، منالێکی لێبوو، لەمنالەکەم پرسی: کیلۆی شوتی بەچەندە؟ منالە دەمڕوتە تەمەن ٨-٩ ساڵەکە وتی: کیلۆی بە سێ پەنجاییە، خوێنی سێ هەورامییە، خەریک بو دووچاری شۆک دەبوم، "لەدڵی خۆمدا دەموت چی لێبکەم، کەمێک وەستام، بیرم کردەوە، وتم من بەهۆی کێشەی لابەلاوە لەسلێمانیم، باشترە جارێکی تر دان بەخۆمدا بگرم، بۆئەوەی رووبەرووی کێشەیەکی تر نەبمەوە، کەمێک وەستام" لەو کاتەدا دکتۆر سەربەست دەستی کردبوو بەپێکەنین، منداڵەکەش لەنێوان نیگەرانی و بێدەنگی من و پێکەنینی دکتۆر سەربەستادا حەپەسابوو، نەیدەزانی چی روودەدا. رووم کردە منالەکەو وتم: تۆ عەیب ناکەیت وا دەڵییت، تۆ نازانی من هەورامیم، منالەکە

هێندەی تر سەری لێتێکچوو، وتی: نا تۆ هەورامی نیت من تۆ دەناسم، تۆ مدەرسی، دیاربوو منالەکە بەکەلتوری خەڵکی سەر جادەی شار و هزری قالە دێگەڵ بیری دەکردەوە، بۆیە بە لای ئەوانەوە نابێت هەورامی دکتۆر و مدەرس بن.

لەناو سەرکردەکانی ینکدا، ئازاد هەورامی کەسێکی لەسەرخۆو هاوسەنگ بوو، زۆر کەم هەڵدەچوو، لەبەرئەوەی من زوو هەڵدەچووم، ناوبەناو رەخنەی لێدەگرتم، دەیوت تۆ زۆر کوڕی باشی تۆ قارەمانی، بەڵام وردەواڵەت هەیە. ئەو جارە کە گەڕامەوە بۆ سورداش، باسی قسەی ئەو منداڵەم بۆگێڕایەوە، زۆر تووڕە بوو، وتی بۆ لێتنەدا، دەبوو دەمت بشکاندایە.

**کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە:**

کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە، لەتەموزی ساڵی ١٩٨٤ لەهەوارگەی مێرگەپان بەسترا، منیش ئەندامی کۆنفرانس بووم، لەسلێمانیەوە گەڕامەوە، بەشداری کۆنفرانسم کرد، کۆنفرانسەکە چەند بابەتێکی گرنگی هزری و سیاسی و رێکخراوەیی کۆمەڵەی تێدا باسکرا، گۆڕانکاری سیاسی تێدا ئەنجامدرا، بەلامەوە گرنگە بەکورتی ئاماژە بەو گۆرانکارییانە بدەم.

لەڕووی رێکخستنەوە، ژمارەیەک کادری کۆمەڵە، کە تا ئەو کاتە لەناو شارەکاندا، بەنهێنی کاریاندەکرد، هاتنە دەرەوە، خۆیان ئاشکرا کرد، لەکۆنفرانسدا بەشدارییان کرد. لەهەڵبژاردنی سەرکرادیەتی کۆمەڵەدا، خۆیان بۆ پۆستی سەرکردایەتی پالاوت، ژمارەیەکیان بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێردران. لەوانە: ١. کۆسرەت رەسوڵ عەلی. ٢. عومەر فەتاح. ٣. دلێر ئەحمەد شوکری . ٤. دکتۆر خەسرەو خاڵ. ئەم چوار کەسە سەر بەباڵی کوردستانی کۆمەڵەبوون.

لەڕووی هزرییەوە، قاسملۆ وەک میوانی کۆنگرە بانگ کرابوو، وتارێکی خوێندەوە، لەوتارەکەیدا رەخنەی لەڕێبازی ماکسیزم-لینینیزم گرت، پشتیوانی لەڕێبازی سۆسیال دیموکرات کرد، ئەو وتارەی قاسملۆ بۆ ئەندامانی کۆمەڵە، هەژانێکی هزری بوو، مێشکی ئەندامانی کۆنفرانسی شڵەقاند، مشتومڕێکی

فکری و سیاسی لێکەوتەوە، دیاربوو ئەو وتارەی قاسملۆ، پشتگیری ئەو ئاڕاستەیەی ناو ینکی دەکرد، کە کۆمەڵەی لەمارکسیزم-لینینیزم دوردەخستەوە.

دەربارەی ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵە، لەکۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا، ناکۆکی و ململانێی باڵی کوردستانی و باڵی داش عێراقی گەرم بوو و یەکلایی بوەوە، ئەو ململانێیە پێش کونفرانس و لەکاتی بەڕێوەچوونی دانیشتنەکانی کۆنفرانسدا، بەزەقی دەبینرا. پێش کۆنفرانس مەلا بەختیار کە کەسی یەکەمی خەتی سیاسی داشعێراق بوو، هەڕەشەی ئەوەی دەکرد، کە بەسوود وەرگرتن لەهۆکارو شێوازی کوشتنی وریا، لەلایەن خەتی نەوشیروانەوە، جێگە بەنەوشیروان مستەفای سکرتێری کۆمەڵە لێژدەکات، کۆمەڵە دەخاتەوە سەر ڕێگەی راستی خۆی و لەلادانی راستڕەوانەی نەوشیروان مستەفا دەیپارێزێت.

کە دانیشتنەکانی کۆنفرانس دەستیانپێکرد، دەستوو پەنجەی مەلا بەختیار بەدانیشتنەکانی کۆنفرانسەوە دیار نەبوو، مەلا بەختیار لەسەنگەری بەرگریدا بوو، هێرشی نەدەکرد، لەدانیشتنەکانی کۆنفرانسدا بەهیچ شێوەیەک باسی لەکوشتنی وریا نەکرد. لە یەکێک لە دانیشتنەکانی کۆنفرانسدا مەلا بەختیار قسەی کرد، وتی کاک نەوشیروان قسەی زۆر توند و ناشیرینمان پێدەڵێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە هەمووومان زیرەکترە ولە هەمووومان گەورەترە ئێمە هەر ڕێزی لێدەگرین.

بە پێچەوانەوەی مەلا بەختیارەوە، نەوشیروان مستەفا کە لەپێش کۆنفرانسدا بێدەنگ بوو، هەڕەشەی نەدەکرد، لەدانیشتنەکانی کۆنفرانسدا، دەنگی هەڵبڕی، لەئاستی جیاجیادا هێرشی دەستپێکرد، سەرەتا لەسەر چەمکی عێراقی و چەمکی کوردستانی قسەی کرد، دواتر وتی: کۆمەڵە ڕێکخراوێکی کوردستانیە، عێراقی نییە، هەر کەسێک عێراقییە، لەکۆمەڵەدا جێگەی نابێتەوە، دواتر پرسیاری لەئەندامانی کۆنفرانسی کۆمەڵەکرد، وتی: کێ عێراقییە با کۆنفرانس جێبهێڵێت و براوتە دەرەوە، لەناو ئەندامانی کۆنفرانسدا کە ژمارەیان سێسەد کەس زیاتر دەبوو، تەنها کاکلەرەش هەستایە سەر پێ، وتی: من عێراقیم و کۆمەڵە بەجێدەهێڵم، کاکل بەبەرچاوی هەمووومانەوە،

کۆنفرانسـی بەجێهێشـت، وازی لەکۆمەڵـەهێنا. کاکـل کـادری کۆمەڵـەبوو، دەرچوی زانکۆ بوو، خەڵکی هـەولێر بوو، لەسنوری مەڵبەندی سێ کادری ڕێکخستنی کۆمەڵەبوو.

هێرشـەکانی نەوشـیروان مسـتەفا هـەر بـەوەوە نەوەسـتا، زۆر بەتونـدی وەڵامی کادرەکانی باڵی داش عێراقی دەدایـەوە، کـەریم عوسمانی هـاوڕێم کە لـەقۆناغی ئامادەییـدا، منـی بانگهێشـتی کاژێـک کـرد، لـەکاتی ڕوونکردنـەوەی بەرنامەی کاژێکدا بەمنی دەوت: دوژمنی سەرەکی کورد کۆمۆنیزم و یـەکێتی سـۆڤیەتە، لەنەمسـاوە گـەڕابووەوە، داکـۆکی لەخـەتی عێراقـی و داش عێراقیـەکانی کۆمەڵـە دەکـرد، لەکۆنفرانسـدا زۆر باسـی کۆمۆنیسـتی دەکـرد، داوای دەکرد کە کۆمەڵە لەخـەتی مارکسـیزم لانـەدات، بەرامبـەر بـەو قسـانەی کـەریم عوسـمان، نەوشـیروان مسـتەفا هەسـتایە سـەرپێ و وتـی: کۆمـۆنیزم لەئـەوروپا گـەڕوگول بـووە، ئێـوە ئێسـتا دەتانـەوێت لەکوردسـتان کۆمـۆنیزم پەیڕەو بکـەن؟ ، بێدەنگی بـاڵی بەسـەر هـۆڵی کۆنفرانسـدا کێشـا، چیـتر کـەس وەڵامی نەوشیروان مستەفای نەدایەوە.

کۆنفرانسـی سـێ، کۆنفرانسـی سـەرکەوتنی نەوشـیروان مسـتەفا و بـاڵی کوردسـتانی کۆمەڵـەبوو، لـەو کۆنفرانسـەدا نەوشـیروان مسـتەفا جارێکی تـر بەسکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێردرایەوە، ئەو کادرانەی کە لەشـارەوە هـاتبوون و سەر بەباڵی کوردستانی بوون، بەئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێردران. لـەباڵی داشـعێراقیەکانی کۆمەڵـە، تـەنیا مـەلا بـەختیار بـۆ سـەرکردایەتی هەڵبژێردرا.

خاڵێکی تری گرنگی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە، وتـاری بەرپرسێکی بـاڵای یەنک بوو، بەرپرسـەکە بـەوتارێک بەشداری کۆنفرانسـی سـێی کۆمـەڵـەی کـرد، کۆمـەڵێک گلـەیی و گازنـدەی لەتونـدڕەوی و چـەپڕەوی منـاڵانـەی ئەنـدامان و کـادرانی کۆمەڵـە گـرت، دواتـر باسـی ئـەوەیکرد کـە ژمارەیـەک لەمـەلاکانی سـلێمانی، لەمنبـەری مزگەوتەکانـەوە دژی یەنـک قسـەی تونـد دەکـەن، بۆیـە ناچارین دەمکوتیـان بکـەین و ژمارەیـەکیان لێبکوژین، هـیچ کـەس لەئەندامانی کۆنفرانس بەرامبەر بەو قسانەی مام جەلال، دەنگی ناڕەزایی هەڵنەبڕی.

کە کۆنفرانسی کۆمەڵە تەواوبوو، گەڕامەوە بۆ سلێمانی، ڕۆژێک لەنەخۆشخانەی فریاکەوتن بووم، برینداریکیان هێنا، وتیان: ئەوە مەلا ئەحمەدی خانەقایە، تەقەی لێکراوەو بریندار بووە. سەدان گەنج کەوتبوونە شوێن مەلا ئەحمەد، ئامادەیی خۆیان بۆ خوین بەخشین نیشاندەدا، دژی کردە تیرۆریەکە، دژی ئەو هێزەی تیرۆرەکەی ئەنجامداوە، هوتافیان دەکێشا .

دکتۆر دارا تۆفیق، کە لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بوو، دواتر بەلای ئیسلامی سیاسیدا وەرگەڕا، بەدەوری مەلا ئەحمەدی برینداردا دەهات و دەچوو، سەیری منی دەکرد، قسەی ناشیرینی بەینک دەوت، منیش بەرامبەر بەقسەکانی دکتۆر دارا، بەبێدەنگ دامابووم، لەدڵی خۆمدا دەموت، بەخوا ئەو برادەرە باش بڕیارەکەی خۆی جێبەجێکرد، بەڵام مەلاکە هەر بریندار کرا، نەمرد.

**خوێندنی باڵا:**

گفتوگۆی نێوان ینک وحکومەتی عێراق بەرەو کۆتایی دەچوو، خۆم ئامادەکردبوو بۆ ناو هێزی پێشمەرگە بگەڕێمە ، لەو کاتەدا دکتۆر دارا بانگی کردم، زۆر قسەی بۆ کردم، بۆئەوەی پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە نەکەمەوە، وتی وەرە با بتنێرینە دەرەوە بۆ خوێندن، کورد بەخوێندن پێشدەکەوێت، کورد بەخوێندن رزگاری دەبێت، پێشمەرگایەتی نامانگەیەنێتە ئامانج، کاتی خۆی من زۆرمکرد، سودی نەبوو. د. حلمی قەزازیش وتی ئەگەر ریکۆمێندەیشنت(پشتگیری) بۆ کۆلێژی پزیشکی پاشایەتی بەریتانی دەوێت، بۆت دەکەم، ئەوەش هەنگاوێکی تر بوو بۆئەوەی هەوڵی خوێندی باڵای پزیشکی بدەم و لەپێشمەرگایەتی دووربکەومەوە. بەڵام نەبە گوێی دکتۆر دارام کرد، نە پشتیوانیەکەی دکتۆر حلمیم وەرگرت. ئەو کاتانەی دکتور داراو دکتۆر حلمی، دەربارەی خوێندنی باڵای پزیشکی قسەیان لەگەڵ دەکردم، هەستم دەکرد بەرەو کۆڵدانی پێشمەرگایەتی و خیانەتی نیشتمانیم دەبەن، بۆیە بەگوێم نەکردن، ئامانجم ئەوەبوو، بەزووترین کات بۆ ناو هێزی پێشمەرگە بگەڕێمەوە.

**ملازم سەیید کەریم:**

لـەکۆتایی سـاڵی ١٩٨٤ دا، رۆژ لـە دوای رۆژ پەیوەنـدیی نێـوان ینـک و حکومـەتی عێـراق بـەرەو خراپـی دەچـوو، لەشـوێنی جیاجیـادا، شـەڕ لـەنێوان پێشمەرگەو سوپای عێراق و جاشەکاندا درووستدەبوو. رۆژێکیان جاشـەکان لەسـەر رێگەی تاسلۆجە، کەمینیان بۆ مـلازم سـەید کـەریم نایـەوە، تەقـەیان لێکـرد، هـەر لەوێـدا شـەهیدیان کـرد. مـلازم سـەید کـەریم، لە سـەیدەکانی هاودیان بوو، پیش ئەوەی لە دایکببێت باوکی شەهید بووە، بە ناوی باوکیەوە نـاونرابووەوە. کۆلێژی سـەربازی سـوپای عێراقـی تـەواوکردبوو لەشۆڕشـی ئەیلولدا پێشـمەرگە بـوو، پاش هەرەسی ١٩٧٥، ئاوارەی هەندەران ببوو، کە شۆڕشـی نـوێ دەسـتیپێکردەوە، سـاڵی ١٩٧٧ ئـەوروپای بەجێهێشـت، لەگـەڵ نەوشیروان مستەفا گەڕایـەوە، فەرماندەیـەکی هێزی پێشـمەرگەی کوردستان بـوو ، ئەنـدامی مەکتەبـی عەسـکەری هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان بـوو. شـەهیدکردنی مـلازم سـەید کـەریم، کۆتـایی بە گفتووگـۆی نێـوان ینـک و حکوومەتی عێراق هێنا.

# ٩

# تیرۆری سیاسی و جەستەیی

تێکۆشانی گەلی کورد لەباشوری کوردستان، گیرۆدەی چەندان جۆر لادانی سیاسی بووە، شەڕی ناوخۆیی، یان شەڕی براکوژی، یەکێک لەو لادانە سیاسیانەیە. هێزە کوردییەکان لە بری ئەوەی هەموو هێزی سیاسی و سەربازی خۆیان، ئاڕاستەی دوژمنی سەرەکی بکەن، زۆربەی کات قورسایی هێزی خۆیان، دژی یەکدی بەکارهێناوە، دوژنمی سەرەکییان لەبیرچۆتەوە. لەم جۆرە شەڕەدا، داگیرکەری کوردستان سودمەندی یەکەم بووە، خەڵکی کوردستانیش، زەرەرمەندی یەکەم بووە، چارەسەری کێشەی کورد هێندەی تر دواکەوتووە، کۆمەڵگای کوردستان دووچاری ناکۆکی و ململانێی کۆمەڵایەتی بووە، پایەکانی ئاشتی کۆمەڵایەتی کوردستان داڕماوە.

شەڕی براکوژی دوو جۆری هەیە، جۆری راستەخۆ و ئاشکرا، ئەو شەڕەیە کە بەئاشکرا، لەبەر هۆکاری سیاسی و ئایدۆلۆجی، یان لەسەر بڕیاری داگیرکەران، هێزی پێشمەرگەی حزبە سیاسیەکان، دژی یەکدی سەنگەریان گرتوە، شەڕی یەکتریان کردوە، . ئەم جۆرە شەڕەی براکوژی،

لەمێژووی نوێی گەلی کوردا، دوای دووبەرەکی ساڵی ١٩٦٤پدک، دەستی پێکرد، بەناوو شێوازی جیاواز، تا ئەمڕۆ بەردەوامە. جۆری دووەمی شەڕی براکوژی، من بەشەڕی براکوژی نهێنی، یان سڕینەوەی یەکتر، یا تیرۆری هزری و جەستەیی ناوی دەبەم، ئەو شەڕەیە کە لایەنە سیاسیەکان، بەئاشکرا دژی یەکدی شەڕ ناکەن، هێزی پێشمەرگە بۆ ئەو شەڕە بەکارناهێنن، تاوانەکە بە نهێنی بەرێوەدەبرێت، تەنیا چەند بەرپرسێکی بالای حزب، ئاگاداری پلان و کردە و ئەنجامی ئەو جۆرە شەڕەن، شەڕەکە فراوان نیە، سنوردارە، لەڕووی چەندایەتییەوە گەورە نییە، لەڕووی چۆنایەتییەوە، گەورە و کاریگەرە. ئامانجی سەرەکی ئەم شەڕە، سڕینەوە و لەڕێلادانی رکەبەرە.

کە شۆڕشی نوێ بەڕابەرایەتی ینک دەستیپێکرد، لە بەرامبەردا پدک شۆڕشی گولانی راگەیاند، شان بەشانی ئەو دوو حزبە، دوای کارەساتی ١٩٧٥، ژمارەیەک حزبی تر دروستبوون، وەک حسک و پاسۆک، حشع لەکۆتایی حەفتاکاندا لەبەرەی نیشتمانی عێراقی هاتە دەرەوە، دژی رژێمی بەعس خەباتی چەکداری دەستپێکرد، لەکۆتایی هەشتاکاندا، بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستانیش، دژی رژێمی بەعس، دەستی بەخەباتی چەکداری کرد.

ئەو حزبانە هەر هەموویان هێزی چەکداریان هەبوو، دژی هێزە چەکدارەکانی رژێمی بەعس، چالاک بوون، بەلام لەهەمان کاتدا، لەدژی یەکدی، لەشەڕی براکوژی ماڵوێرانکەریشدا، چالاک بوون.

هەر کاتێک لایەنێکیان لەبەرەیەکی شەڕی براکوژی راستەوخۆدا شکابێت، هەوڵی داوە، لەبەرەی شەڕی براکوژی نهێنیدا، پارسەنگی شکستەکەی بکاتەوە، بۆنموونە ئەگەر ینک لەسنوری ناوچەی بادیناندا لەشەڕی بەرەیی ئاشکرای براکوژیدا بەرامبەر بەپدک شکستی هێنابێت، لەشەڕی براکوژی نهێنی تیرۆری سیاسیدا، لەناوچەی سۆران، سەرکەوتنی بەدەستهێناوە.

هەندێکجار شەڕی ناوخۆیی نهێنی، لەڕیزی یەک حزبدا، لەنێوان چەند دەستەیەکدا(تەکەتول)دا بەنهێنی بەڕێوەچووە. هەندێک جار ئەو شەڕە لەنێوان رێکخراوەکانی سەر بەبەرەیەکی سیاسیدا، یان نیمچە بەرەییدا، بەنهێنی ئەنجامدراوە.

**پارتی و یەکێتی:**

لەساڵی ١٩٧٧ وە تا ئەو کاتەی من پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، تا دەستپێکردنی گفتوگۆ و کۆتاییهاتنی گفتوگۆش، زۆربەی کات هێزی پێشمەرگەی کوردستان، سەرقاڵی شەڕی براکوژی راستەوخۆ بووە، شەڕی براکوژی راستەوخۆ، لەنێوان هێزی پێشمەرگەی لایەنەکانی وەک، ینک و پدک و حسک و حشع و پاسۆک و ئەوانیتردا دەکرا. کارەساتی ئەشکەوتی باڤێ و کارەساتی هەکاری، شەڕی کانیزنانی شەمێران، شەهیدکردنی شێرکۆی شێخ عەلی و جەمالی عەلی باپیر، کارەساتی قرناقە و پشتئاشان، چەند نمونەیەکی شەڕی براکوژی راستەوخۆن.

بەڵام لەهەمان کاتدا شەڕی براکوژی رانەگەیەنراو، لە نێوان ینک و پدکدا بەنهێنی بەڕێوەچووە، جۆرێکی ئەم شەڕە نهێنییە، لەڕێگەی جاشی سەر بەحزبەکانەوە بووە، دژی پێشمەرگەی حزبە رکەبەرەکە ئەنجامدراوە. جاشەکانی سنوری چەمچەماڵ، وەک قالەفەرەج و تەحسین شاوەیس و عاسی رەئوف، کە لەسەرەتادا پێشمەرگەی پدک بوون، بۆیان نەکرا لەیەک کاتدا، رووبەرووی پێشمەرگەی ینک بوەستنەوە ودرێژە بەپێشمەرگایەتیش بدەن، بەبڕیاری سەرکردایەتی پدک، خۆیان دا بەدەستی رژێمی عێراقەوە، چەکی جاشایەتیان لەشان کرد، ئیتر لەسەنگەری جاشایەتیەوە، لەشێوەدا جاش، لەناوەڕۆکدا پێشمەرگەی پدک، هەموو توانای سەربازی حکومەتی عێراقیان، بۆ دژایەتکردنی ینک، بۆڕاوەدوونانی سەرکردەو بەرپرس و پێشمەرگەکانی ینک، بەکارهێنا. بێجگە لەشەهیدکردنی شاسوار جەلال(ئارام)، ئەنوەر حەسەن و مامە ریشە، سەدان پێشمەرگەی ینکیان شەهید کرد، زیانێکی زۆری سیاسی و سەربازییان بەینک گەیاند. ئەم جۆرە شەڕە، کە بەڕواڵەت شەڕی جاش و پێشمەرگە بوو، لەڕاستیدا شەڕی نهێنی رانەگەیەنراوی نێوان پدک و ینک بوو، ئەم جۆرە شەڕە، لەکات و شوێنی جیاوازدا، لەلایەن حزبە بەشەڕهاتووەکانەوە، دژی یەکدی پەنای بۆ براوە.

دوای راپەرین یەکێک لە چەکدارەکانی رژێمی بەعس لە لای من چەکی پێشمەرگایەتی هەڵگرت، رۆژێکیان باسی ئەوەی بۆ کردم چۆن نامەیەکی

تەحسین شاوەیسی بۆ مەسعوود بەرزانی بردوە، لە چەمچەماڵەوە گەیشتۆتە گونـدی راژانـی رۆژهەڵاتـی کوردسـتان، کە مەسـعوود بەرزانـی نـامەکەی لێوەرگرتـوە، خوێنـدوویەتیەوە، نـامەکەی تەحسـین شاوەیسـی مـاچکردوە و لەسەر سەری داناوە.

جـۆرێکی تـری شــەڕی براکـوژی رانەگەیـەنراو، تیـرۆری سیاسـی نـاو شــارەکان بــوو. لەســـەرەتای دروســـتبونی شۆڕشـــی نوێـــدا، لەســـەر دەستبەسـەراگرتنی سـلێمانی، ینـک و پـدک ململانێیـان دەسـتپێکرد، ینـک دەستپێشـخەری کـرد، لەتۆڵـەی شـەهیدەکانی ئەشـکەوتی بـاقێ و کارەسـاتی هەکاریشدا، لەشاری سلێمانی، دەستی بە هەڵمـەتێکی تیرۆری سیاسی کرد، بــەبیانوی بەعســـیبوون و شـــەهیدکردنی شۆڕشـــگێرانی رۆژهـــەڵاتی کوردستانەوە، دەیان کادری ناسراوی پدکی کوشت. ئەو تیرۆرە لەلایەکەوە تۆڵەی ئیبراهیم عەزۆو عەلی عەسکەری و حسەین بابا شێخ و دکتۆر خالدو شەهیدەکانی تری ینک بوو، لەلایـەکی تریشـەوە، بەلـەناوبردنی ئـەو کادرانـەی پدک، پدک لەسلێمانی لاواز بوو، ینک توانی دەست بەسـەر سلێمانیدا بگرێت. زۆر کەس لەو باوەڕەدان ئەگەر ینک ئەو کادرانەی پدک ی تیرۆر نەکردایـە، نەیدەتوانی لەپارێزگای سلێمانیدا ببێتە حزبی یەکەم، بەڵام ئـەمجۆرە شـەڕەی نێوان ینک و پدک، ئاشکراو راستەخۆ نەبوو.

**دەستەگەری ناو کۆمەڵە:**

کۆمەڵـەی رەنجـدەرانی کوردسـتان(کۆمەڵە)، لەسـەرەتادا نـاوی کۆمەڵـەی مارکسـی-لینینـی کوردسـتان بـوو، سـاڵی ١٩٧٠ دامـەزرا، تـا هـەرەسـی ١٩٧٥ شۆڕشـــی ئـــەیلول، وەک رێکخراوێکـــی نهێنـــی چـــالاکی دەکـــرد. دوای دروسـتبوونی ینک، کۆمەڵـەبوو بـە پێکهاتەیـەکی سیاسـی و سـەربازی ینـک و خەباتی دەستپێکرد، لەشۆڕشی نوێدا رۆڵی سەرەکی بینی.

دوای ئـەوەی کۆمەڵـە دەسـتی بـە خـەباتی سیاسـی و پێشـمەرگانە کـرد، دووچاری دەستەگەری هات، لەناو کۆمەڵەدا سێ دەستەی(تەکەتول)سـەرەکی هەبوون، دەستەی زیندان، دەستەی هەرێمەکان، دەستەی نەوشیروان مستەفا، ئەم سێ دەستەیە بەرامبـەر یـەکتر ململانێیـان دەکـرد، هـەندێکجار، ململانێکـان سنوری سیاسی تێدەپەراند.

**دەستەی زیندان و دەستەی هەرێمەکان:**

سەبارەت بەڕۆڵی کۆمەڵە لە شۆڕشی نوێدا؟ بۆچونی جیاواز لەنێوان سەرکردایەتی و کادرەکانی کۆمەڵەدا درووستبوو، سکرتێری کۆمەڵەو ژمارەیەک لەئەندامانی سەرکردایەتی، لەو باوەڕەدا بوون، لەگەڵ ئەوەشدا سیاسەتی نەتەوەپەرستی و نادیموکراتی رژێمی بەعس پەرەی سەندووە، بەلاّم هێشتا زەمینەی هەڵگیرسانەوەی خەباتی چەکداری لەکوردستاندا لەبار نییە، خەباتی سیاسی و دبلوماسییان بەگرنگ دەزانی، هەوڵیاندا لەڕێگەی ئێرانەوە، سەردانی ئەورووپا بکەن، بۆئەوەی لەدەرەوە، پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی ینک و هێزە چەپەکانی جیهان درووستبکەن، بەهەمویانەوە بەرنامەیەکی سیاسی بۆ قۆناغە نوێکە دابنێن.

شەهابی شێخ نوری سکرتێری کۆمەڵە، جەعفەر عەبدولواحید، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، جەبار فەرمان، ئەرسەلان بایز، عەلی بچکۆل، ئاوات عەبدولغەفور، دارۆی شێخ نوری و ئاسۆی شێخ نوری، هەڵگری ئەو راوبۆچوونە بوون. کاتێک ژمارەیەک لەو بەرپرسانەی کۆمەڵە گەیشتنە ئێران، ساواک دەستگیری کردن. بەگوێرەی رێکەوتنی ٦- ئازاری ١٩٧٥، ئێران رادەستی حکومەتی عێراقی کردنەوە، عێراق زیندانی کردن، لەو کاتەوە (ناوی دەستەی زیندانیان) بەسەردا بڕا. دادگای عێراق، وەک بەرپرسی حزبێکی قەدەغەکراو، دژبەری رژێمی بەعس، دادگایی کردن. لەکۆنگرەی یەکی ینکدا، کە ساڵی ١٩٩٢لەهەولێر بەسترا، دارۆی شێخ نوری و ئاوات عەبدولغەفور، دووان لەدەستگیرکراوەکانی دەستەی زیندان ، هەستانە سەر سەکۆی هۆڵی کۆنگرە، وتیان:ئێمە لە ئێران لەلایەن ح س ەوە، بۆ ساواک ئاشکرا کراین، ساواک دەستگیری کردین و رادەستی عێراقی کردینەوە، ئەو کاتە ح س سەر بە پاراستن بوو، ئێستەش ح س ئەندامی کۆنگرەی ینکە، خۆی بۆ سەرکردایەتی ینک پالاّوتوە. کەچی کۆنگرە حسابی بۆ قسەی ئەو دو ئەندامەی سەرکردایەتی جارانی کۆڕەک و ئێستەی ینک نەکرد، زانیارییەکە هەر وا بەبادا چوو.

ژمارەیەک بەرپرس و کادری کۆمەڵە، وەک شاسوار جەلال(ئارام)، مەلا بەختیار، سالار عەزیز، ئازاد هەورامی، عەبدولرەزاق، بەسیاسەتی سکرتێری کۆمەڵەو سەرکردایەتیەکەی رازی نەبوون، دوای دەستگیرکردنی سکرتێرو سەرکردایەتی کۆمەڵە، کۆمیتەی هەرێمەکانیان درووستکرد، لەدروستکردنی شۆرشی نوێدا، بەشداریان کرد، دوای دەستگیرکردنی دەستەی زیندان، ئەمان بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵەوە، بەیانێکیان دەرکرد، بەراپۆرتی شوبات ناسراوە، لەبەرئەوەی لەمانگی شوباتی ١٩٧٦ دا دەرکراوە. لەو بەیانەدا رەخنەی توند لەسەرکردایەتی کۆمەڵە گیرا، کە گۆرەپانی تێکۆشانیان چۆڵ کردووە و هەڵهاتوون. بەیانی شوبات لەکاتێکدا دەرچوو کە سەرکردایەتی کۆمەڵە(دەستەی زیندان) لەزیندانی رژێمی بەعسدا بوون. دەستەی زیندان بەو بەیانە زۆر نیگەران بوون، بەتەنیا لەرەخنەکان نیگەران نەبوون، دەیانوت دادگای رژێمی بەعس، بۆ سزادانی ئەوان، وەک بەڵگە، سوودی لەو بەیانەی کۆمیتەی هەرێمەکان وەرگرتووە، بەو هۆیەوە ناکۆکی و ململانێ لەنێوان ئەو دوو دەستەیەی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا(زیندان و هەرێمەکاندا) دروستبوو. تا ئەمرۆش ئەو ناکۆکیە بەشێوازی جیاجیا بەردەوامە.

دەستەی زیندان پێیانوابوو، بەهۆی راپۆرتی شوباتەوە، شەهاب و جەعفەرو ئەنوەر لەسێدارەدراون، گیراوەکانی تریشیان هەر یەکەی چەند ساڵێک زیندانی کراوون، بەتەواوی دژی کۆمیتەی هەرێمەکان بوون، بەڵام دەسەڵاتیان بەشی ئەوەی نەدەکرد تۆڵەی خۆیان بکەنەوە.

دەستەی زیندان کۆمیتەی هەرێمەکانیان وەک کودەتاچی سەیردەکرد، لەبەرئەوەی لەکاتی دەستگیرکردنی سکرتێرو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا، ئەو کادرانەی کە کۆمیتەی هەرێمەکانیان دروستکردوە، نەک هەر هەڵوێستیان نەبووە، بەڵکو دژایەتی سەرکردایەتی حزبەکەی خۆیانیان کردووە، لەحزب یاخی بوون، بۆیە بەردەوام داوای سزادانی کۆمیتەی هەرێمەکانیان دەکرد.

سالی ۱۹۷۹ دەستەی زیندان بەر بەخشینی رژێمی عێراق کەوتن، دوای ئازادبوونیان یەکسەر پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد، ئەوانەیان ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەبوون، لەناو ینکدا وەک ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە مامەڵیان لەگەڵدا کرا، لەسەرکردایەتی کۆمەڵەو لەسەرکردایەتی ینکدا بەرپرسیاریێتیان وەرگرت. تەکەتولی زیندان خۆیان بەتەنها بۆیان نەدەکرا دژایەتی کۆمیتەی هەرێمەکان بکەن، بۆ دژایەتی کۆمیتەی هەرێمەکان، تا ماوەیەک لەگەڵ دەستەی نەوشیروان مستەفا رێک بوون، لەوێوە دژایەتی خۆیان بەرامبەر بەدەستەی هەرێمەکان دەکرد.

لەسەردەمی شەڕو ململانێی جەلالی و مەلایی سالانی ۱۹٦٦-۱۹۷۰ دا، نەوشیروان مستەفا سیاسەمەدارێکی گەنج و رۆژنامەنووسێکی سەرکەوتوو بووە، دوای بەیانی ۱۱ ئازار، دام و دەزگا سیاسی و رۆشنبیرییەکانی جەلالی هەڵوەشاییەوە، رێگە نەدرا جەلالیەکان کارو چالاکی بکەن، نەوشیروان مستەفا نەگەڕایەوە ناو پدک، سەفەری ئەوروپای کرد، لەنەمسا دەژیا.

دوای دامەزراندنی ینک، وەک نوێنەری کۆمەڵە بەشداری لەکارو چالاکی ینکدا کردوە. سالی ۱۹۷۷ لەئەوروپاوە گەڕایەوە، دوای شەهیدبونی ئارام، وەک سکرتێری کۆمەڵە سەرپەرشتی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کرد، لەکۆبونەوەی فراوانی شێنێ لە٥-۱۲-۱۹۷۸ دا، ناوی کۆمەڵەی لەکۆمەڵەی مارکسی لینینی، گۆڕی بۆ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان(کۆڕەک).

لەئەزمونی سیاسیدا، نەوشیروان مستەفا لەئەندامانی تری سەرکردایەتی کۆمەڵە، لەکۆمیتەی هەرێمەکان و کۆمیتەی زیندان، بەتوانا تربوو، مام جەلال لەپشتیەوە بوو. لەهەڵویستی سیاسی و بڕیاری سیاسیدا، زیاتر گرێدراوی مەسەلە نەتەوەییەکان بوو، کەمتر گرنگی بە بابەتە چینایەتی و ئایدولۆجیەکان دەدا، لەمەسەلە کۆمەلایەتیەکاندا، کەسێکی کۆنەپارێز بوو. بۆ کەسێک سکرتێری رێکخراوێکی مارکسی -لینینی بێت، هەڵگری ئەو چەمکە سیاسی و کۆمەلایەتیانە بێت، ئالۆزی و ناکۆکی لێدەکەوێتەوە، بۆیە لەلایەن دەستەی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، نەوشیروان مستەفا وەک کەسێکی نامارکسی دەبینرا، بۆ سەر ئایدولۆجیای رێکخراوەکەیان بەمەترسیان دەبینی. بەو

شێوەیە لەڕوی ئایدۆلۆجییەوە ململانێ لەنێوان نەوشیروان مستەفاو دەستەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا دروستبوو.

هەرچی دەستەی زیندان بوو، سکرتێریی کۆمەڵەیان بەمافی خۆیان دەزانی، ئەگەر بۆیانبکرایە دژایەتی نەوشیروان مستەفایان دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ململانێی سەرەکی دەستەی زیندان، لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا بوو، خۆیان لەململانێی نەوشیروان مستافە بەدوور دەگرت، بەناچاری نەوشیروان مستەفایان وەک سکرتێر قبوڵ دەکرد.

بەو شێوەیە ئەو سێ دەستەییەی ناو کۆمەڵە، لەقۆناغە جیاوازەکاندا، بەشێوازی جیاجیا، شەڕو ململانێیان دەکرد، بەشێوەیەکی گشتی دەستەی نەوشیروان مستەفاو دەستەی زیندان، لەساڵی ١٩٧٩ وە تا پایزی ١٩٨٥دژایەتی دەستەی کۆمیتەی هەرێمەکانیان دەکرد، کاتێک زۆرینەی دەستەی هەرێمەکان بوون بەئاڵای شۆڕش(ئا ش)، لەکۆمەڵە جیابوونەوە، ململانێی نێوان دەستەی زیندان و نەوشیروان مستەفا دەستی پێکرد.

پێش دروستبونی ئاڵای شۆڕش، ناوبەناو ناکۆکی و ململانێ لەنێوان نەوشیروان مستەفاو دەستەی زینداندا دروستدەبوو، ئەو کیشەیەی من و عەلی بچکۆلی بەرپرسی مەڵبەندی دوو لەسەرگەڵوو، هەندێکی پەیوەندی بەو ململانێیەوە هەبوو، بەقسەی هەندێک لەهاوڕێکانم، عەلی بچکۆل منی بەدەستەی نەوشیروان مستەفا دەزانی، بۆیە دژایەتی دەکردم، نەوشیروان مستەفاش لەدژی عەلی بچکۆل پشتیوانی منی کرد. ناکۆکی نێوان نەوشیروان مستەفاو بەرپرسی ڕاگەیاندنی ینک، ئەرسەلان بایز، تا دەهات زیاتر دەبوو.

دوای ئاوارەبوون و دامەزراندنی بەرەی کوردستانی، ئەرسەلان بایز بەرپرسی ڕاگەیاندنی بەرەی کوردستانی بوو، بەرەی کوردستانی ڕۆژنامەیەکی دەردەکرد، دەستەی زیندان، بۆ دژایەتیکردنی نەوشیروان مستەفا، سودیان لەو ڕۆژنامەیە وەردەگرت، لەوێوە دەستیان بە دژایەتی نەوشیروان مستەفا کرد. لەو ڕۆژانامەییەدا عەلی بچکۆل چەند وتارێکی نوسی، ڕەخنەی لەئەدای سەرکردایەتی ینک دەگرت لەکاتی ئەنفالەکاندا، نەوشیروان مستەفا زۆر بەتوندی وەڵامی عەلی بچکۆلی دایەوە، هەوڵی دا

لەڕێگەی هێزە ئەمنیەکانی حکومەتی ئێرانەوە دەستگیری بکات، بیباتەوە قاسمە ڕەش و دادگایی بکات. عەلی بچکول خۆی نەدا بەدەستەوە، بەنهێنی سەقزی بەجێهێشت، لەڕێگەی قاچاغەوە تا پاکستان نەوەستا، بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەپاکستان مایەوە، دواتر ئاوارەی نیوزیلەندە بوو.

دوای ئەنفال و کیمیاباران و ئاوارەیی لە ئێران، نەوشیروان مستەفا دژی عەلی بچکۆل و ئەرسەلان بایز و ئاسۆی شێخ نوری و برادەرانی تری دەستەی زیندان، ململانێی بەلووتکە گەیاند، فەرەیدون عەبدولقادر خۆی لەو ململانێیە نەدەدا، جەبار فەرمانیش خۆی نەخستە ناو دەستەگەرییەکەوە. عومەری سەید عەلی کە یەک لەچالاکەکانی دەستەی زیندان بوو، بەهۆی برینداربییەوە ماوەیەکی زۆر لەئەوروپا بوو، لەکوردستان دابڕابوو، بەڵام کە بینی حاڵی هاوڕێکانی دەستەی زیندانی بەدەست نەوشیروان مستەفاوە شڕە، بۆ هاوکاری دەستەی زیندان، بەپەلە لەئەوروپا گەڕایەوە. ئەو کاتەی عومەری سەید عەلی گەڕایەوە بۆ کوردستان، ناکۆکی لەنێوان مامجەلال و نەوشیروان مستەفادا دەرکەوتبوو، بەپشتیوانی مامجەلال، عومەری سەید عەلی دەستی بەدژایەتیکردنی نەوشیروان مستەفا کرد. دژی ئەو بۆچوونەی نەوشیروان مستەفا وەستایەوە کە دەیوت با لە ئێران نەمێنینەوە، باشترە بگەڕێینەوە بۆ عێراق لەوێ خەبات بکەین. عومەری سەید عەلی لەگەڵ ئەوەدابوو، لەباتی ئەوەی پێشمەرگە بگەڕێنەوە بۆ عێراق، یان تەسلیم ببنەوە، با سەفەری ئەورووپا بکەن، لەوێ مافی پەنابەری وەربگرن و کاری سیاسی بکەن.

ساڵی ١٩٨٩، نوێنەری خاچی سوری سویدی، سەردانی ئاوارەکانی باشووری کوردستانی کرد، کە گەیشتە تاران، لەگەڵ عومەری سەید عەلی لەفڕۆکەخانەی تاران پێشوازیمان لێکرد، لەگەڵ خۆماندا بردمان بۆ سەردانی ئاوارەکان . سویدیەکە لەپێشی سوارڕۆیەکی تەکسیەوە دانیشتبوو، منیش لەگەڵ عومەری سەید عەلی لەکورسی دواوەی سوارڕۆکەدا دانیشتبووم، نێوان تاران و کرماشان بەتاکسی نزیکەی ٨-٩ کاتژمێر دەبێت، ئەو هەموو کاتە، عومەر سەید عەلی قسەی بۆ کردم، بۆچونی خۆی لەسەر ڕوداوەکان

دەربڕی، لەو بوارەدا هاوڕای بووم، بەڵام کە دەچووە سەر باسی کێشە ناوخۆییەکانی ناو کۆمەڵە و یەک و دەستەگەری، پشتیوانیم لێنەدەکرد.

عومەری سەید عەلی بەئاشکرا دژایەتی هەڵوێستەکانی نەوشیروان مستەفای دەکرد، پشتیوانی لەهەڵوێستی دەستەی زیندان دەکرد. هەوڵی دەدا منیش وەک خۆی، دژی نەوشیروان مستەفا هەڵوێست نیشان بدەم. باسی ئەو دەردیسەرییەی خۆی دەکرد کە بەدەست نەوشیروان مستەفاوە دیویەتی، دەیوت: خۆ بیستووتە چۆن بریندار بووم، بۆ چارەسەری برینەکانم گەشتی ئەوروپام کرد، لەوێ نەوشیروان مستەفام بینیوە، لە باتی ئەوەی دڵمبداتەوە و ورەم بەرزبکاتەوە، پێی وتم (مامۆستا)و (کەم ئەندام) بۆ کۆمەڵگا سوودیان نییە، بارن بەسەر کۆمەڵگاوە، هەقە بسووتێنرێن، ئەوە لەکاتێکدا من پیشەم مامۆستا بووە، بەهۆی برینداریەکەشمەوە کەم ئەندام بووم.

دواتر وتی: ئەگەر سەفەری ئەوروپات کرد، بەرهەم ساڵح بناسە، کەسێکی لێهاتوو دڵسۆزە، دەستەکەی نەوشیروان مستەفا لەئەوروپا دژایەتی زۆری دەکەن. گوێم لەقسەکانی عومەری سەید عەلی گرت، بەڵام من لەسەر رەئی خۆم مامەوە، دۆستایەتیم لەگەڵ دەستەی زینداندا باشبوو، تەنیا لەکێشەکەی سەرگەڵو، پەیوەندیم لەگەڵ عەلی بچکۆل سارد بوو، بەڵام دژایەتی نەوشیروان مستەفام نەکرد، خۆم نەخستە ناو بەردئاشی ئەو بۆچوونە ناکۆکانەی عومەری سەید عەلی و نەوشیروان مستەفاوە، کە لەسەر کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەو یەک بوو، لەبەرئەوەی بڕوام بەسەرتاپای یەک نەمابوو.

ئەبێت ئەوەش بزانین کە لە ململانێی نێوان دەستەکانی کۆمەڵەدا، مامجەلال هەرجارەو پشتیوانی لە دەستەیەکیان کردوە، لە سەرەتدا پشتیوانی دەستەی هەرێمەکان بووە، لە ساڵی ١٩٨١ بە دواوە، پشتیوانی نەوشیروان مستەفای کردوە، دوای ئەنفال و کیمیاباران، بە ئاشکرا پشتیوانی لە دەستەی زیندان دەکرد.

**داشعێراقی و کوردستانی[٣٥] :**

پێش ئەوەی ببم بەپێشمەرگە، نەمدەزانی لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا ناکۆکی و ململانێ هەیە، بەماوەیەکی کەم دوای پێشمەرگایەتی، ناکۆکی و بۆچونی جیاوازی ناو ئەندام و کادیرەکانی کۆمەڵەم بۆ ئاشکرا بوو. کاتێک گەیشتمە سەرکردایەتی، لەیەکەم دیداری نێوان سێکوچکەی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا(نەوشیروان مستەفا، مەلا بەختیار، فەرەیدون عەبدولقادر)، لەپێشوازی پزیشکێکی ئەندامی کۆمەڵەدا، هەستم بەناکۆکیی نێوان بەرپرسەکانی کۆمەڵە کرد.

لەبەرئەوەی لەسنوری هەڵەبجەوە پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد، زۆرینەی کادرو بەرپرسی ئەو سنوورە، سەر بەئاراستەی کوردستانی عێراق(داش-عێراق) بوون، لەکاتی گفتوگۆدا بۆچونی خۆمم دەرنەدەبڕی، هەردوو ئاراستەکە، وایان دانابوو سەر بەئاراستەی سیاسی داشعێراق بم. بۆیە برادەرانی داشعێراق بڕوایان بەهەر شتێک هەبوایە بۆ منیان باس دەکرد، ئەمە وایکرد، بەتەواوی لەئامانجی سیاسی ئەو ئاراستەیە تێبگەم.

لەولاشەوە برادەرانی کوردستانی، واتێگەیشتبون کە من سەر بەو باڵە عێراقییەم، بەهەمو قینی دڵیانەوە سەیری منیان دەکرد، حەزیان بەچارەم نەدەکرد، لەهەڵویستی توندی ئەوانیش بەرامبەر بە عێراقییەکان تێگەیشتم. دواتر کە هەڵویستی کوردستانی خۆمم ئاشکرا کرد، لەباڵی کوردستانی نزیکبوومەوە، لەدید و هەڵویستی باڵە کوردستانیەکەش بەتەواوی تێگەیشتم.

برادەرانی داشعێراق، تا دەهات رەخنەکانی خۆیان لەسەر سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی، فراوانتر دەکرد، وای لێهات کاریگەری خراپی لەسەر وورەی کادرو پێشمەرگە دانا، بەو هۆیەوە، دانیشتن، گەڕانەوە بۆ ژێر دەسەلاتی رژێم، رەوکردن بەرە و هەندەران، لەناو ریزی هێزی پێشمەرگەدا زیادیکرد.

---

٣٥ داشعێراق ئاراستەیەکی سیاسی ناو کۆمەڵەبوو، دەیوت دەبێت کۆمەڵە حزبێکی سیاسی کوردستانی عێراق بێت.کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق.

کوردستانی ئاراستەیەکی سیاسی ناو کۆمەڵە بوو، دەیوت دەبێت سنووری چالاکی کۆمەڵە هەموو پارچەکانی کوردستان بێت، کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان.

برادەرانی کوردستانی تا دەهات پەراوێزخستن و بەلاوەنانی باڵی داشعێراقیان توندتر دەکردەوە، لەوێشەوە فشاری دانیشتن و کۆڵدانی کادرو پێشمەرگە زیادی دەکرد، ئەو جۆرە ململانێیە، لەهەردوو لاوە، زیانی بەیەکرپزی ینک و خەباتی رەوای گەلی کورد دەگەیاند. ئەوە بۆ خۆی جۆرێکی شەڕی هزری دەروونی بوو، هەردوو ئاراستەکە دژی بەرامبەرەکانیان بەکاریاندەهێنا.

دوای ئەوەی لەسەر کوردستانی و عێراقی کۆمەڵە، هەڵوێستی خۆمم دیاریکرد، کەوتمە سەنگەری باڵی کوردستانی، رۆژێکیان پێشمەرگەیەک هات بۆ نەخۆشخانە، وتی کاک بەختیار بانگت دەکات، سەردانی مەلا بەختیارم کرد، پێکەوە دانیشتین، بەتورەبونەوە پێشوازی لێکردم، چاوی لێ سوورکردمەوە، وتی: تۆ بۆچی قسە بەهاوڕێیانی سنوری هەڵەبجە و نەخۆشخانە دەڵێیت؟ ، بۆ دەڵێیت ئەوانە تەپیون؟ توانای پێشمەرگایەتیان نەماوە، دەڵێیت خەڵک لەپێشمەرگایەتی سارد دەکەنەوە؟ تۆ نابێت ئەو قسانە بەو هاوڕێیانە بڵێیت، تۆ تازە بوویت بەپێشمەرگە، هاوکێشەکان تێنەگەیشتوویت ، ئەوان خەباتی دورودرێژیان هەیە، لەکۆتایی قسەکانیدا وتی، دەنگی دەهۆڵ لەدوورەوە خۆشە.

پێش ئەوەی هەڵوێستی خۆم لەسەر کوردستانی و عێراقی کۆمەڵە دیاری بکەم، کە لەگەڵ مەلا بەختیاردا چووم بۆ ناوەندی کۆمەڵە، باسی ئەوەم کرد کە نەوشیروان مستەفا چۆن وەک دوژمنێک پێشوازی لێکردم، بەڵام دوای ئەوەی بۆیدەرکەوت من سەر بەباڵی کوردستانیم، لەسەردانێکمدا بۆ بارەگاکەی، نەوشیروان مستەفا بەمشێوەیە بەمحەمەدی موهتەدی ناساندم: کاک محەمەد ئەمە دکتۆر فایقە، دکتۆرێکی زیرەکە، کوڕی یەکێک لەشەهیدە قارەمانەکانی شۆڕشی ئەیلولە.

دوای روونبونەوەی هەڵویستی سیاسیم لەسەر ململانێکانی ناو کۆمەڵە، بوومە جێی متمانەی سکرتێری کۆمەڵەو بەرپرسەکانی تر، ئیتر شانبەشانی کاری پزیشکی، وەک کادرێکی کۆمەڵە، کاری سیاسیم دەستپێکرد.

**ناکۆکیەکان:**

ئاراستەی کوردستانی ناو کۆمەڵە بڕوای وابوو، دەبێت کرێکاران و رەنجدەرانی باشوری کوردستان، لەگەڵ کرێکاران و رەنجدەرانی پارچەکانی تری کورستان، پەیوەندی سیاسییان هەبێت، پێکەوە کار بۆ چارەسەری کێشە چینایەتیەکان و کێشە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بکەن.

ئاراستەی داشعێراق بڕوای وابوو، دەبێت کرێکاران و رەنجدەرانی باشوری کوردستان، لەگەڵ کرێکاران و رەنجدرانی عێراقدا، پەیوەندی سیاسیان هەبێت، و پێکەوە کار بۆ چارەسەری کێشە چینایەتیەکانی کرێکارانی عێراق و کێشەی گەلی کورد بکەن.

ئاراستەی کوردستانی باوەڕی وابوو، دەبێت کوردی باشور، هاوکاری کوردانی پارچەکانی تری کوردستان بکات، لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی نوێدا، کوردەکانی باکور و کوردەکانی رۆژهەلات، هاوکاری ینکیان کرد. پێشمەرگەکانی یەکێتی چەندجارێک هاوکاری کوردانی رۆژهەلاتیان کرد، ساڵی ١٩٧٩ لەشاری سنەی رۆژهەلاتی کوردستان، هاوکاری کۆمەڵەی زەحمەتکێشی کوردستانی ئێرانیان کرد، دژی هێرشەکانی سوپای کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەنوەری مەجید سوڵتان و عەلی شیعە، دوو فەرماندەی سەربازی ینک بوون، لەو شەڕەدا شەهید بوون.

لەپایزی ساڵی ١٩٨٢دا، هێزی پێشمەرگەی ینک، شانبەشانی هێزی پێشمەرگەی حدکا و کۆمەڵەی ئێران، دژی سوپای پاسداران شەڕی کرد، دەیان شەهیدی دا.

ئاراستەی داشعێراق، ئەم سیاستەی باڵی کوردستانی کۆمەڵەی، بەموجازەفە دەخوێندەوە، پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی و حدکا ی ساڵی ١٩٨٢، بەهەولێکی یەکێتی دادەنا، بۆئەوەی قاسملۆی سکرتێری حدکا، نێوەندگیری گفتووگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراق بکات.

هەندێک لەکادرو بەرپرسانی باڵی داشعێراق، لەدژی کوردستانیبونی کۆمەڵە دەوەستانەوە، بەهیچ جۆرێک بڕوایان بەیەکێتی نەتەوەیی گەلی کورد نەبوو، بەباوەڕەوە دژایەتی ئەو جۆرە تێگەیشتنەیان دەکرد. رۆژێکیان من و

هـــەڤال کوێســـتانی و ســـالار عـــەزیز، لەســـەربانی بارەگاکـــەی مەلابـــەختیار پیاســـەمان دەکـرد، سـالار عـەزیزو هـەڤال کوێسـتانی لەسـەر ئـەو ململانێیـە قسـەیان دەکرد، سـالار دەیوت ئـەم کوردسـتانی و مـا کوردسـتانیە، هـەمووی خەتای ئەو کوردانەی تورکیا بوو، پێش ئەوەی ئەمانە بێنە لامـان، باسـی ئـەم کوردســــتانییبوونە نــــەدەکرا. هــــەموی خــــەتای ئەمانــــە بــــوو بیرۆکــــەی کوردستانیبونیان خستە نـاو بیـری سـەرکردەکانی کۆمەڵـەوە. سـالار عـەزیز مەبەسـتی ڕێکخـراوی ئـاڵای رزگـاری بـوو، هـاوڕێ خـەجۆ، بەرپرسـی ئـەو ڕێکخـراوە سیاسـیەی بـاکوری کوردسـتان بـوو. ئەو ڕێکخـراوە سیاسـیەی باکوری کوردستان، لەگەڵ ینک پەیوەندیی باشبوو، بارەگای لەنزیک بارەگای نەوشـیروان مسـتەفا بـوو، ئـەورێکخراوە لـەو کاتـەدا بـاوەڕیـان وابـوو کـە هـەرچوار پارچـەی کوردسـتان داگیرکـراوە، دەبێت هـەموو کـورد پێکەوە بـۆ ئـازادی و سـەربەخۆیی کوردسـتان خـەبات بکـات، ئـەو ڕێکخـراوە بـڕوای بەیەکێتی نەتەوەیی نێوان گەلی کورد هەبوو، بڕوای وابوو کە دەبێت یـەکێتی تێکۆشـان لـەنێوان هێزە سیاسـیەکانی گـەلی کوردسـتاندا دروست ببێت، ئەو رێکخـراوە کاریگـەری سیاسـی و هـزری لەسـەر کۆمەڵـەو یـەکێتی نیشـتمانی کوردستان هەبوو. پاش چەند ساڵێک ئەو ڕێکخـراوە هەڵوەشـایەوە، زۆربـەی کـادرو ئەندامـەکانی پەیوەنـدیان بـەپارتی کرێکـارانی کوردسـتان (پ ک ک)ەوە کرد، لەناو ڕیزەکانی پ ک ک دا درێژەیان بەتێکۆشان دا.

ئـــەوە رەئـــی یـــەک لەســـەرکردەکانی بـــاڵی داش عێـــراق بـــوو بەرامبـــەر بەکوردســـتانیبونی کۆمەڵـــە، بەپێچەوانەشـــەوە، رەئـــی ســـکرتێری کۆمەڵـــە دەربـارەی مارکسـیزم، کە داشـعێراق-دەسـتەی هەرێمەکـان بروایـان پێیبـوو، لەکۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا نیشانیدا، وتی مارکسیزم گـەڕو گول بووە، ئیتر چۆن ئەو دو ئاڕاستە هزریە ناکۆکە، دەتوانن پێکەوە لـەناو یـەک رێکخسـتندا هەڵبکەن.

لـــەناو کۆمەڵـــەدا ســـەر بـــەباڵی کوردســـتانی بـــووم، بـــەڵام بەهـــەموو هەڵسوکەوتێکی باڵی کوردستانی، رازی نەبووم، ئەو هۆکارانەی کـەوای لـەمن

کرد، لەو ململانێیەدا کوردستانی بم، پێشینەی هزری و سیاسیی خۆم بوو، کە لەگەڵ ئاراستەی کوردستانی دەگونجا.

باوکم پێشمەرگەی سەرەتایی شۆڕشی ئەیلول بوو، لەڕێگەی باوکمەوە چاوم بەدونیای کوردایەتی و سیاسەت هەڵهێنا، لەبیرمدێت ئەو نامانەی لەکاتی پێشمەرگایەتیدا بۆ باوکم دەهاتن، یان ئەو نامانەی خۆی دەینوسی، بەکوردستان یان نەمان دەستییان پێدەکرد.

هۆکاری دووەمی سیاسەتی نەتەوەیی من، لەخوێندنەوەی مێژوی کوردو کوردستانەوە سەرچاوەی گرتبوو، مێژوونووسان، تەنیا باسی مێژووی باشوری کوردستان یان باکوری کورستانیان نەکردووە، باسی مێژووی هەموو گەلی کوردیان کردووە، باسی مێژووی هەر چوارپارچەی کوردستان و باسی دابەشکردنی کوردستانیان کردووە. کاتێک ئەو کتێبانەی مێژووم خوێندۆتەوە، سیاسەتێکی نەتەوەیی لەبیرمدا جێگیر بووە، بەقسەی باش و خراپی رۆژانەی بەرپرس و کادری کۆمەڵە، ئەو تێگەیشتنە لەبیرمدا هەڵنەکەنرا.

لەناو سیاسیەکانی باشوری کوردستاندا، بیرمەندی سیاسیمان نەبووە، بەڵام شیعری شاعیرەکانی کوردستان، پڕیەتی لەهزری نەتەوەیی، شیعرەکانی ئەحمەدی خانی، مەلای جەزیری، حاجی قادری کۆیی، فایق بێکەس، شێرکۆ بێکەس، قانع، عەبدوڵڵا پەشێو، لەتیف هەڵمەت، مانیفیستۆی شۆڕشی نەتەوەیی گەلی کوردن. شاعیرەکانیش وەک مێژونوسان، کوردستانیانە، نەک پارچەگەریانە، سەیری دۆزی رەوای گەلی کوردیان کردووە. من یەکێک لەو کەسانەم کە شیعری شاعیرەکانی کوردستانم خوێندۆتەوە، لەخوێندنەوەی شیعرەکاندا، دیدێکی کوردستانیم پەیداکردووە.

لەپۆلی پێنجی ئامادەییدا، رێکخراوی کاژیک م ناسی، رێکخراوێکی سیاسی نەتەوەیی بوو، بە نهێنی کاری دەکرد، بۆ ماوەیەک بەنهێنی لەگەڵ کاژیک کارم کرد، لەو ماوەیەدا دوو پێوانەی سیاسی گرنگ فێربووم، یەکەم بیری نەتەوەییم پێشکەوت، دووەم فێری زەبت و رەبتێکی(دسپلین) وردی حزبی بووم.

هەمیشــە دەوڵــەتی عێـراقم بــەوڵاتێکی داگیرکــەری کوردســتان زانیــووە، لەقۆناغی ناوەندیدا دەفتەر خدمەی سەربازیم پڕ نەکردەوە، لەبەرئەوەی قەت ئامــادە نــەبووم خزمــەتی ســەربازی بـۆ حکومــەتی عێـراق بکـەم. کاتێـک خوێندکاری زانکۆ بووم، خۆم بەکەسێکی عێراقی نەدەزانی، لـە سـەرژمێری ساڵی ١٩٧٧دا، ناوی خۆمم لەو سەرژمێرییەدا تۆمار نەکرد، هـەمو شکستێکی دەوڵەتی عێراقم، بەسەرکەوتنی گەلی کورد دەزانی.

لەبـەدواداچونی خۆشـمەوە بۆمارکسـیزم و شۆڕشـی سۆسیالیسـتی، کـە لەخــەباتی چینــی کرێکــاری وڵاتــانی ســەرمایەداری و تێکۆشــانی وڵاتــانی سۆسیالیستی و خـەباتی گـەلانی بندەستی وەک کـورد، پێکدێت، کوردسـتانی بـوونی کۆمەڵـەو یـەکێتی نەتـەوەیی گـەلی کـوردم، دژ بەبنـەماکانی ماکسـیزم-لینینزم نەدەزانی.

بۆیە کاتێک کە بووم بەکۆمەڵە، لەگـەڵ ئاراسـتە کوردسـتانیەکەی کۆمەڵـەدا بـووم، کـاتیکیش بـووم بە پێشـمەرگە هــەر لەگـەڵ ئاراسـتە کوردسـتانیەکەی کۆمەڵـەو یەکێتیـدا بـووم، نـە هاوڕێیـەتی و پشـتگیری داشـعێراقیەکان بـەلای عێراقچێتیـدا رایانکێشــام، نــەڕووگرژی و قســە ســوێری بەرپرســانی بــاڵی کوردستانی، لەکوردستانی بوون دووریانخستمەوە.

**ئالای شۆڕش:**

دەتوانین بڵێین باڵی داشعێراق درێژکراوی کۆمیتەی هەرێمەکانە، ئەگـەرچی لەکۆنفرانسی یەک و دووی کۆمەڵەوە، تا دەهـات بـاڵی داشـعێراق پاشەکشـەی دەکرد، بەڵام کۆنگرەی سێی کۆمەڵە لەمێرگەپان، وێسـتگەی کۆتاییهـاتنی بـاڵی داشعێراقیی ناو کۆمەڵـە بـوو، مـەلا بـەختیار کـە رابـەری بـاڵی داشـعێراق بـوو، پێش کۆنفرانس هەڕەشەی لەپێگەی سیاسی نەوشیروان مستەفا دەکرد، بـەڵام کاتێک کۆنفرانس دەستپێکرد، ئەوەی هێرشی دەکرد، نەوشیروان مستەفا بوو، نەک مەلا بەختیار، بەپێچەوانەوە مەلا بەختیار هەندێک قسەی کرد، بەو قسانە نەوشیروان مستەفای گەورەتر کرد.

تا ئەو کاتە نەمدەزانی نەوشیروان مستەفا لەهەموو سەرکردایەتی کۆمەڵە زیرەک ترە، لەبەرئەوەی بەکەمی قسەی دەکرد، وا مەلا بەختیار شاهیدی بۆدا، بەبڕوای من لەو قسانەی مەلابەختیاردا، نەوشیروان مستەفا قازانجی کردو مەلا بەختیار زیانی کرد.

لەکۆنفرانسی سێدا نەوشیروان مستەفا کۆمەڵێک کادری نوێی باڵی کوردستانی هێنایە پێشەوە، ئەوکادرانە بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردران، شوێنی ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کۆمەڵەیان گرتەوە کە سەر بەباڵی داشعێراق بوون و بۆ سەرکردایەتی هەڵنەبژێردرانەوە.

لەکۆنفراسی سێدا دژایەتی هزری سیاسی مارکسی-لینینی کرا، قاسملۆ سۆسیاڵ دیموکراتی لەکۆمۆنیزم و مارکسیزم پێباشتر بوو، نەوشیروان مستەفا وتی: کۆمۆنیزم لەئەوروپا گەڕو گول بووە.

بۆیە دەتوانم بڵێم لەکۆنفرانسی سێ دا، دوو ڕێگە لەبەردەم باڵی داشعێراقدا هەبوو، دەستبەرداری هێڵە سیاسی و هزرییەکەی ببێت، پەیڕەوی لەهێڵی کوردستانی کۆمەڵە بکات، یان لەناو کۆمەڵە دەربچێت، لەدەرەوەی کۆمەڵە، ڕێکخراوێکی سیاسی نوێ درووستبکات. بەڵام باڵی داشعێراق، هیچکام لەو دوو هەڵبژاردەیەی پەیڕەو نەکرد، دەستبەردای هێڵە فکری و سیاسییەکەی خۆی نەبوو، پەیڕەوی هێڵی کوردستانی کۆمەڵەی نەکرد، دەستیان لەکۆمەڵە نەکێشایەوە، بەنهێنی لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، دەستیان بەدروستکردنی حزبێکی نوێ کرد. حزب لەناو حزبدا، بیانووی نییە، پیلانگێڕیەکی گەورەیە دژی حزبی دایک دەکرێت، زەمینە بۆئەوە خۆشدەکات حزبی دایک، دژی منداڵە زۆڵەکەی، هەموو جۆرە سیاسەتێکی لەباربردن بەکاربێنێت.

دوای کۆنفرانسی سێ، گەڕامەوە بۆ سلێمانی، درێژەم بەخولی نەشتەرگەری دا، بۆ ماوەی چەند مانگێک لەململانێکانی ناو کۆمەڵە دوورکەوتمەوە. ڕۆژێک نەوشیروان مستەفا من و دکتۆر زریانی بانگ کرد، وتی: دکتۆر هەژار و دکتۆر حەسان(د. کەمال) چیتر وەک ئەندامی کۆمەڵە لەناو ێنکدا کار ناکەن، دەبێت ئێوە هەموو بەرپرسیارێتی تەندروستی ناو

شۆڕش لەئەستۆ بگرن. دوای ئەو راسپاردەیەی نەوشیروان مستەفا، کاتیک لەنەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی بووم، رۆژێک دکتۆر هەژار و دکتۆر حەسان سەردانیان کردم، وتیان: ئێمە واز لەپێشمەرگایەتی دەهێنین، گەشتیی دەرەوەی وڵات دەکەین، تۆش وەرە لەگەڵمان با بچین بۆ دەرەوەی وڵات و بخوێنین. من بەپێشنیارەکەی دکتۆر هەژار و دکتۆر حەسان رازی نەبووم، ئەوان لەگەڵ هەندێک هاورێی تریان گەشتی دەرەوەی وڵاتیان کرد، لەئەوروپا مافی پەنابەریان وەرگرت.

ئەو قسانەی نەوشیروان مستەفا و دکتۆر هەژار و دکتۆر حەسان، واتای ئەوەبوو، کە نەوشیروان مستەفا ئاگاداری رووداوەکانی ناو ریزەکانی باڵی داشعێراقە، لەوانەیە ئاگادار بووبێت دکتۆر هەژار و دکتۆر کەمال پەیامێکی وایان بۆ من هەیە، بۆیە بانگی کردم و لەهەڵویستی ئەوان ئاگاداری کردمەوە.

دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و حکومەتی عێراق، زانیاریمان بۆدەهات، داشعێراقییەکان بەناوی ئالای شۆڕشەوە(ئا ش)، بەنهێنی کار دەکەن.

ئەو کاتەی لەگوندەکانی ناوچەی شارباژێڕ بووین، داش عێراقیەکان ئاستەنگیان بۆ دروستدەکردین، بەڵام بەهۆی دروستبوونی شەڕی شاخی کەتوو، لەنێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەدا، بارەگاکانی مەڵبەندی یەک، بەنەخۆشخانەشەوە، لەناوچەی شارباژێڕ گوێزرانەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ . کە گەیشتینە ناوچەی قەرەداغ، چووینە گوندی سێوسێنان، گوندی سێوسێنان بارەگای بەکری حاجی سەفەر و شێخ عەلی و ماڵی عیماد ئەحمەدی لێ بوو.

هەوڵمدەدا شوێنێک بۆ نەخۆشخانە بدۆزمەوە، لەکاتی گەڕاندا بۆ جێگەی نەخۆشخانە، پێشمەرگەیەکی قەڵەوی دەستەی بەکری حاجی سەفەر، بەرە و رووم هات، قسەی توندی بەرامبەرم کرد، بەو قسانە دەیویست بڵێت بۆتان نییە لەم گوندە نەخۆشخانە بکەنەوە، منیش رووبەڕوی بوومەوە، وەڵامی قسەکانیم دایەوە، لالۆ عەبدولرەحمانی پێنجوێنی، هاتە پێشەوە، لەپێشمەرگە قەڵەوەکە تووڕە بوو.

بەکری حاجی سەفەر تێکۆشەرێکی ماندو و پیاوێکی باش بوو، قەناعەتی وابوو کە سەرکردایەتی ینک زوڵم لەبرادەرانی ئاڵای شۆڕش دەکات، لەبەرئەوەی پێش جەبار فەرمانیش بەرپرسی مەڵبەند بوو، کەمێک نیگەران بوو، بەڵام پێشمەرگەکانی کێشەیان بۆ ئێمە درووستدەکرد.

لەگەڵ پێشمەرگەکانی بارەگای شێخ عەلی، تا دەهات پەیوەندییم پێشدەکەوت، سەردانی بارەگای شێخ عەلیم دەکرد، کۆمەڵێک گۆڤارو کتێبی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان لەلا بوو، ئەو کتێبانەیان بە جدی دەخوێندەوە، فەرماندەی مەفرەزەکەی شێخ عەلی کوڕێکی هەڵەبجەیی بوو، کراوە بوو، حەزی دەکرد منیش وەک ئەوان نووسینەکانی سەرکردەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی (مەنسوری حکمەت و ئیرەجی ئازەرین) بخوێنمەوە، منیش جار جار گۆڤارو رۆژنامەکانم لێوەردەگرتن، دەمخوێندەوە، دواتر گفتوگۆشمان لەسەر دەکردن. من دەمویست پێشمەرگەکانی شێخ عەلی، لەکاریگەری چەمکە سیاسی و فەلسەفیەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران دووربخەمەوە، ئەوانیش دەیانویست بمخەنە ژێر کاریگەری ئەو چەمکانەی ئەوانەوە کە خۆیان باوەڕیان پێی بوو.

دەتوانم بڵێم، چۆن باڵی کوردستانی کۆمەڵە، کاریگەری ڕێکخراوە سیاسیەکانی باکوری کوردستانی لەسەر بوو، باڵی داش عێراقی کۆمەڵەش(ئا ش)، کاریگەری حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی لەسەربوو.

**خوێنی مەنسور و سەمیر:**

زۆرینەی کادرو پێشمەرگەی دوورخراوەی سنوری ناوچەی قەرەداغ، سەر بەئاڵای شۆڕش بوو، ئێمەش وەک ستافی نوێی مەڵبەند، سەر بەباڵی کوردستانی کۆمەڵە بووین، ناکۆکی هزری و سیاسیمان لەگەڵ یەکدی هەبوو.

ڕۆژانە ناکۆکی و قسە و قسەڵۆک لەنێوان پێشمەرگەکانی سەر بە (ئا ش)و پێشمەرگەکانی تردا روویدەدا. رۆژێکیان لەنەخۆشخانە دانیشتبووم، لەپڕ مەنسوری ئەنوەر بەگیان هێنا، مەنسورم بەسەری بریندارو جەستەی خوێناویەوە بینی، زۆر نیگەران بووم، مەنسوری ئەنوە ر بەگ کوردستانی

بـوو، هاوڕێیـەکی نـزیکم بـوو، کـە پرسـیارم کـرد چـی رویـداوە؟ ، وتیـان: پێشمەرگەکانی دەستەی پاراستنی بەکری حاجی سەفەر، لەناو بازاری گوندی سێوسێنان دا پەلاماریان داوە.

مەنسوری ئەنوەر بەگ کوڕەزای مەحمود خانی دزلّییە، خوی و رێبوار و بـەختیار و کـاوە و ئـاریزی بـرای پێشـمەرگە بـوون، مەنسـور و براکـانی هـەر هــەموویان بــاڵی کوردســتانی کۆمەڵــەبوون، ماوەیــەک لــەوەوپێش، کـار و چالاکیان لەسنوری مەڵبەندی یەکدا بەڕێوەبردبوو، پێش ستافی نوێی مەڵبەند بـەرەنگاری داش عێراقیـەکان ببوونـەوە. هۆکـاری راسـتەوخۆی ئـەو رووداوە ناخۆشە، بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە چەند رۆژێک لەوەوپێش برایـەکی مەنسـورو برایەکی عیماد ئەحمەد، دەمـە قاڵـەیان ببـوو. دەوتـرا: ژمارەیـەک لەپێشـمەرگە خانەقینیـەکانی بـەکری حـاجی سـەفەر، لەتوڵـەی براکـەی عیمـاد ئەحمـەدا، پەلاماری مەنسورویان داوە، وایان بەسەردا هێنان.

چەنـد رۆژ دوای برینـدارکردنی مەنسـور، لـەماڵـەوە دانیشـتبووم، لـەناو بـازاری گونـدی سێوسـێنان هـات و هاوارێـک پەیـدا بـوو، چوومـە دەرەوە، سـەیردەکەم، کـاوە و بـەختیاری بـرای مەنسـور، بەشـەق و لەقـە بەربوونەتـە گیانی سەمیری برای عماد، سـەمیر لەسـەر زەوی کـەوتوە و خـوێن لەسـەر و گوێلاکی دەچۆڕێت، پێشمەرگەیەکیش فیشەکی بردۆتە پێشەوە، هاوار دەکـات، هەر کەسـێک دەسـتیان بگرێت دیکوژم. من لێیـان چوومـە پێشـەوە، لەخۆمم رادەبینـی کـە سـەمیر لەمـەرگ رزگـار بکـەم، مـاڵی ئـەنوەر بـەگیش لـەتاوانێک دووربخەمەوە، خۆم کرد بـەناو شـەڕکەرەکاندا، پاڵم بەبـەختیار و کـاوەوە نـا، لەسـەمیرم دوورخسـتنەوە، خـۆم کـرد بـەدیوار بـۆ سـەمیر، لەلێدانی زیـاتر پاراسـتم، کـە خـەڵکی گونـدی سیوسـێنان منیـان بینـی کەوتمـە نێـوانی شەڕکەرەکانەوە و ناوبژیوانیم کردن، هاتن بەهانامەوە، هاوکاریان کردم.

سـەمیرم بـرد بۆ نەخۆشـخانە، مـاوەی چەنـد کاتژمێرێک لەگەڵیدا خـەریک بووم، زۆر هەوڵمدا خوێنی لوتی بوەستێنمەوە، سـوودی نـەبوو، خـوێنی لـوتی سەمیر نەدەگیرسایەوە، کە سـەیرم کرد خوێنبەربوونەکەی ناوەستێ، خەریکە مەترسی لەسەر ژیانی دروست دەبێت، عیماد ئەحمەدم ئاگادار کرد، دەبێت

سەمیر بگاتە لای پزیشکی پسپۆری لووت، بۆئەوەی نەشتەرگەری بۆ بکرێت، ئەگینا ژیان لەدەستدەدات. هەر ئەو شەوە بەنهێنی، لەگوندی سێوسێنانەوە، سەمیر رەوانەی سلێمانی کرا، نەشتەرگەری بۆ کرا، لەمردن رزگاری بوو.

**کۆبوونەوە:**

ئاڵای شۆڕش رێکخراوێک بوو، لەناو رێکخراوێکی تردا کاری دەکرد، بڵاوکراوەی هەبوو، وەک حزبێک راوبۆچوونەکانی خۆی لەبڵاوکراوەکاندا بڵاودەکردەوە، بەڵام بەفەرمی نەماندەزانی لەکوێوە و چۆن رابەرایەتی دەکرێت؟ . ئەو کاتەی پزیشکی مەڵبەندی یەک بووم، ئەندامی کەرتی رێکخستنی قەرەداغ بووم، بارەگای کەرتی رێکخستن، لەگوندی دووکانی ناوچەی قەرەداغ بوو، مەلا ئەحمەد کەلاری ، بەرپرسی کەرتی رێکخستنی قەرەداغ بوو، من بەرپرسی پۆلی جەماوەر بووم، هەرچی ئەندامی کۆمەڵەی سنوری قەرەداغ و دەربەندیخان و گوندەکانی ئەو ناوچەیە بوون، سەر بەو پۆلە بوون. رۆژێکیان بۆ کۆبونەوەی کەرتی رێکخستن بانگ کراین، لەکۆبونەوەکەدا باسی ئەو برووسکەیە کرا، کە لەنەوشیروان مستەفای سکرتێری کۆمەڵەوە، بۆ کەرتەکانی رێکخستن هاتبوو، لەبروسکەکەدا ئەم چەند دێڕەم بیردێتەوە: ئاڵای شۆڕش لەناو کۆمەڵەدا دروستبووە، دەیەوێت لەکۆمەڵە جیاببێتەوە، با کادرەکان کۆبونەوە بەجەماوەر بکەن، کۆبوونەوە بەپێشمەرگە بکەن، خەڵک تێبگەیەنن، کە جیابونەوە خزمەت بەدۆزی رەوای گەلی کورد ناکات، باس لەزیانەکانی جیاببونەوە بکەن. لەکۆبونەوەکەدا کەرتی رێکخستن بەناوەڕۆکی بروسکەکە رازی بوو، بڕیارماندا جێبەجێی بکەین.

دوای ئەوەی لەکۆبونەوەکەی کەرتی رێکخستنی قەرەداغ گەڕامەوە، بڕیارمدا لەسەر لایەنە خراپەکانی جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش دەست بەکۆبوونەوە بکەم، هەردوو هاورێی خۆشەویستی پێشمەرگایەتیم، مامۆستا سۆران خانەقینی و مەلا ئەحمەدی دەلووجە، ئەو کاتە وەک ئەندام پۆل لەکاری رێکخستندا هاوکارییان دەکردم، ئاگادارم کردنەوە بۆ کارێکی وا

ئامـــاده بـــن، پـــاش ئامـــادەبوونی ئـــەوان، بڕیارمانـــدا کۆبونـــەوە لەگونـــدی سێوسێنانەوە دەستپێبکەین.

وەک لەسەرەتادا باسم کرد، سێ بارەگای هێزی پێشمەرگەی سەر بەئاڵای شۆڕش لەگوندی سێوسێنان بوون، بەڵام پەیوەندیم لەگەڵیان خراپ نەبوو، بەتایبەت دوای ئەوەی ناوبژیوانی شەڕی نێوان براکانی مەنسورو براکەی عمادم کرد و نەمهێشت لەوە زیاتر کێشەکە قووڵببێتەوە.

ئەگەر دژی جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش، لەگوندی سێوسێنانەوە دەست بەکۆبونـــەوە بکـــەم، ورەی کـــادر و ئەنـــدامانی بـــاڵی کوردســـتانی کۆمەڵە بەرزدەبێتەوە، بەڵام مەترسی پەلاماری پێشمەرگەکانی ئاڵای شۆڕش بۆسەر کۆبونەوەکە، چاوەڕوانکراو بوو. کاتێک برادەرانی بەرپرسی ینک، لەسنوری سێوسێنان و دەورووبەری، لەکات و شوێنی ئەو کۆبونەوەیە ئاگادار کرانەوە، پاراستنی ئاسایشی کۆبونەوەکەیان بەگرنگ زانی، ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە، لەگەڵ چەند بەرپرسێک، ئەو شەوە ئەرکی پاراستنی کۆبونەوەکەیان لەئەستۆ گرت. سەردار ناوتاقی فەرماندەی تیپی مەڵبەند بوو، بەخۆی و مەفرەزەکەیەوە لەدەوری مزگەتەکەی سێوسێناندا وەستابوو، مامۆستا عەلی ئەو کاتە رابەری سیاسی تیپی مەڵبەند بوو، ئەویش ئەو شەوە لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەدا لەقۆڵێکی ترەوە وەستابوو، شەوکەت حەمە ساڵح هەورامی هاوڕێم، بەرپرسی کاروباری کۆمەڵایەتی ناوچەی قەرەداغ بوو، بەخۆی و پێشمەرگەکانیەوە، لەدەوری مزگەوتەکەی سێوسێنان مایەوە، تا کۆبونەوەکە تەواو بوو.

ئامادەبوانی کۆبونەوەکە خەڵکی گوندی سێوسێنان بوون، کۆبونەوەکە بە سەرکەوتویی کۆتایی هات، لەکۆبونەوەکەدا باسی هیچ کەس بەخراپی نەکرا، بەگشتی باسی لایەنە خراپەکانی جیابونەوەی حزبی سیاسی کرا، دواتر وەک هەواڵێک، خەلک ئاگادار کرایەوە کە برادەرانی ئاڵای شۆڕش دەیانەوێت لەیەکیتی جیاببنەوە، داوا لەخەڵک کرا کە فشار بخەنە سەر ئاڵای شۆڕش بۆئەوەی جیانەبنەوە، داوایان لێبکرێت لەگەڵ کۆمەڵە پێکبێنەوە. لەڕۆژانی دواییدا، لەسەر هەمان بابەت، کۆبونەوەم بەنزیکەی ١٠-١٢ گوندی ناوچەی

قەرەداغ کرد، ئاڵای شۆڕش هیچ پەرچەکردارێکی بەرامبەر بەکۆبونەوەکان نیشان نەدا.

لەو کاتەدا کە دژی جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش کۆبونەوەمان دەکرد، مەلا بەختیار تازە لەسەرکردایەتی گەڕابوەوە، باسی ئەوەی دەکرد کە لەگەڵ مام جەلال دانیشتنی کردووە، رێککەوتوون دوای جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش لەکۆمەڵە، ببنە ڕێکخراوێکی تری ناو ینک، وەک کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان لەناو ینکدا کار بکات.

**دەستگیردەکرێ:**

دوای کۆتایهاتنی کۆبونەوەکان، رۆژانە کەرت و تیپی هێزی پێشمەرگە، لەناوچەکانی ترەوە، بەرەو ناوچەی قەرەداغ دەهاتن، هێزێکی زۆر لەقەرەداغ کۆکرایەوە، بۆچونی خەڵک وابوو، ئەم هێزە بۆ لێدانی ئاڵای شۆڕش هاتووە. ئەحمەد کرێکار کادرێکی بەئەزمونی کۆمەڵەبوو، سەر بەباڵی کوردستانی بوو، لەگەڵ تیپی ٢١ کەرکوک هاتبوو، رۆژێکیان لەسەر باری سیاسی ناوچەی قەرەداغ گفتوگۆمان کرد، لەو گفتوگۆیەدا دڵنیابووم، کە ئەو هێزە بۆ دەستگیرکردنی سەرکردەکانی ئاڵای شۆڕش هاتووە.

دوای کۆبونەوەکانی کەرتی رێکخستنی قەرەداغ، دژی جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش، دوای هاتنی هێزی پێشمەرگە بۆ ناوچەی قەرەداغ، وە بەتایبەتی بۆ سنوری ئەو گوندانەی بارەگای ئاڵای شۆڕشی لێ بوو، مەلابەختیار هیچ هەنگاوێکی بۆ خۆپاراستن نەنا، ئەو هەموو هێزە لەدەوروبەری گوندی تەکیەی قەرەداغ کۆبووەوە، مەلا بەختیار لەشوێنی خۆی نەجوولا. تا شەوێکی پایزی ساڵی ١٩٨٥، مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی ینک، چوونە سەر بارەگاکەی مەلا بەختیار، هەر لەوێدا دەستگیریان کرد، لەهەمان کاتدا، دەستیان بەسەر چاپەمەنی و بەڵگەکانی ئاڵای شۆڕشدا گرت.

لەو کاتەدا کە پێشمەرگە، پەلاماری گوندی تەکیەی قەرەداغی دا و مەلا بەختیاری دەستگیرکرد، لەسنوری دۆڵی جافایەتیدا، نزیک لەسەرکردایەتی

ینک، پێشمەرگە دایان بەسەر شێخ عەلی و مامۆستا پشکۆدا، دەستگیریان کردن. ئەو سێ کەسە بە بەرپرسی سەرەکی ئاڵای شۆڕش دانرابوون، دەستگیرکران و زیندانی کران و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کرا.

لە رابوردوودا کاتێک مەلا بەختیار ئەندامی سەرکردایەتی ینک بوو، لە چەندان پیلانگێریدا دژی رکەبەرەکانی ینک، بەشداری کردووە[36]، کەچی بیری چووبوو، ئەگەر هەیە ینک پیلانگێری دژی خۆی بکات و دەستگیری بکات.

ئەو ماوەیەی هێزی پێشمەرگەی ینک بەرەو قەرەداغ هات، و دەورووبەری بارەگای مەلابەختیاری گرت، مەلا بەختیار هیچ هەنگاوێکی نەنا تۆئەوەی لەئەگەری دەستگیرکردن رزگاری ببێت، هوکارەکانی ئەمانە بوون.

١. مامجەلال پەیمانی بەمەلا بەختیار دابوو، ئەگەر لەکۆمەڵە جیاببێتەوە، دوای جیابوونەوە، بۆی هەیە وەک حزبێکی نوێ لەناو ینک دا، شانبەشانی کۆمەڵەو شۆڕشگێران، درێژە بەخەبات بدات، مەلا بەختیار بڕوای بەو پەیمانەی مامجەلال کردبوو، لەو باوەڕەدا نەبوو دەستگیری بکەن.

٢. مەلا بەختیار لەو باوەڕەدا بوو ئەگەر سەرکردایەتی ینک هێز بنێرێنە سەری، هەوڵی دەستگیرکردنی بدەن، هێزی پێشمەرگەی ینک، فەرماندە سەربازییەکانی ینک، ئەو بڕیارە جێبەجێناکەن، دژی ینک دەوەستنەوە، داکۆکی لەمەلا بەختیار دەکەن.

٣. دوای دەستگیرکردنی مەلا بەختیارو هاوڕێکانی، نامەیەکمان دەستکەوت، سالار عەزیز و مامۆستا جەعفەر لەئێرانەوە بۆ مەلا بەختیاریان ناردبوو، داوای لێدەکەن ناوچەی قەرەداغ بەجێبهێڵێت، بێتە سەر سنوری ئێران، یا لەگەڵ پارتی و ئێران پەیوەندی دروستبکەن، نوسیبویان: مانەوەت لەو ناوەدا ژیانت دەخاتە مەترسییەوە.

مەلا بەختیار وەڵامی دابوونەوە: قەناعەتم بەوە نیە هێندە لەینک دووربکەوینەوە، بەباشی نازانم پەیوەندی لەگەڵ پارتی و ئێراندا دروستبکەین،

---

٣٦ لە پیلانگێری گوندی کانیزنانی شەمێران و پیلانگێری دژی شێرکۆی شێخ عەلی، مەلا بەختیار رۆڵی سەرەکی بووە.

من دەمەویت کێشەکان لەگەڵ سکرتێری کۆمەڵە چارەسەر بکەم و لەناو ینکدا وەک ڕێکخراوێک بمێنینەوە.

بەو شێوەیە پڕۆسەی لەدایکبوونی ئاڵای شۆڕش، لەڕەحمی کۆمەڵەدا، بەپیلانێگێریەکی سیاسی و بەکودەتایەکی سەربازی سەرکەوتوو، بەسوودوەرگرتن لەسادەیی سەرکردەکانی ئاڵای شۆڕش، لەناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستاندا، لەباربرا.

**پلینۆمی کۆمەڵە:**

دوای دەستگیرکردنی مەلا بەختیار و شێخ عەلی و مامۆستا پشکۆ، بەئامادەبونی ٦٠ شەست کادرو بەرپرسی کۆمەڵە، پلینۆمی کۆمەڵە، لەسەر کێشەی ئاڵای شۆڕش بەسترا، بەزۆرینەی دەنگی پلینۆم، بێجگە لەئازاد هەورامی و ملازم عومەر، بەتاوانی خیانەت لەکۆمەڵە، بڕیاری سزای کوشتن بەسەر هەرسێ بەرپرسی ئاڵای شۆڕشدا سەپێنرا. دواتر مام جەلال ڤیتۆی بڕیارەکەی پلینۆمی کرد، بڕیارەکە جێبەجێنەکرا.

لەبەرئەوەی شێخ عەلی برایەکی شەهید بوو، رابەر سیاسی یەکەم مەفرەزەی شۆڕشی نوێ بوو، زوو ئازاد کرا. لەکاتی ئەنفالەکان و کشانەوەی ینکدا بۆ ئێران، مامۆستا پشکۆ دەرفەتی بۆ لوا، لەڕێگەدا رایکرد، مەلابەختیار تا دوای ئەنفال لەزیندانی ینکدا مایەوە، ساڵی ١٩٨٩ ئازادکرا.

ئەو ماوەیەی کە ئەو سێ بەرپرسەی ئاڵای شۆڕش لەزیندانا بون، عیماد ئەحمەد سەرپەرشتی ئاڵای شۆڕشی دەکرد، لەکوردستان پاشەکشەیان کرد، لەورمێی رۆژهەلاتی کوردستان بارەگایان دانا، لەگەڵ حکومەتی ئێران و لەگەڵ پارتیدا پەیوەندییان پێشخست.

بە هۆی دەستگیرکردنی بەرپرسەکانی ئاڵای شۆڕشەوە، کێشە لەسەر بەڕێوەبردن و بەرپرسیارێتی لەنێوان کادرەکانی ئا ش دا دروستبوو، ژمارەیەکی زۆر لەکادرە باشەکانی ئاڵای شۆڕش کۆڵیان لەتێکۆشاندا و گەڕانەوە بۆ عێراق.

**پیلانی تیرۆر:**

دوای دەستگیرکردنی بەرپرسەکانی ئاڵای شۆڕش، دوای بڕیاری پلینۆمی کۆمەڵە بۆ سەپاندنی مەرگ بەسەر ئەو سێ بەرپرسەدا. لەبەرگەڵو، بۆمبێک لەسەر ڕێگەی نەوشیروان مستەفا و فوئاد مەعسومدا تەقییەوە، بەرپرسانی یەنک لەو باوەڕەدابوون، پاشماوەکانی ئاڵای شۆڕشی ناو یەنک، ئەو کردە تیرۆریستیەیان ئەنجامداوە، لەسەر ئەو هەوڵە تیرۆریستییە، ژمارەیەک پێشمەرگە دەستگیرکران و کوژران.

ژمارەیەک کادری ئاڵای شۆڕش، بەنهێنی لەناوچەی قەرەداغ و گەرمیان مابوونەوە، بڕیاری کوشتنی چەند کادرێکی کۆمەڵەیان دابوو، لەلیستی ناوەکاندا، ناوی من و شەوکەتی حەمەساڵح و مەنسوری ئەنوەربەگی تێدابو بوو.

لالۆ عەبدولرەحمان پێنجوێنی، ئەو هەواڵەی لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە پێگەیشتبوو، بەمنی وت:

ئاگاداری خۆت بە، ئاڵای شۆڕش بەتەمان تۆ و شەوکەت و مەنسور بکوژن، من ئەو زانیاریەی لالۆم بەجدی وەرنەگرت، وتم ئاڵای شۆڕش تەواوبوون هیچیان پێناکرێت. ماوەیەک دوای ئەو هەواڵە، ئەشرەف سیوسێنانی دۆستی حشع، هاتە لام، وتی: دکتۆر ئاگاداری خۆت بە، دوێنێ شەو ئازادی فەقێ عەلی کادری ئاڵای شۆڕش میوانی من بوو، وتی: بڕیاری ئاڵای شۆڕشم پێیە کە چەند کەسێک بکوژم، دەمەوێت ئەمشەو دکتۆر فایق بکوژم، تۆ هاوکاریم بکە. ئەشرەف وتی: هەوڵی دنیامدا تا ڕێگەم لێگرت و پەشیمانم کردەوە، بەڵام هەر دەبێت ئاگاداری خۆت بیت.

منیش کەوتمە خۆ، بەڵام دوای ماوەیەک هەواڵمان بۆ هات: ئەو کادرانەی ئاڵای شۆڕش(ئازاد و شاسوار) کە ویستبوویان من و شەوکەت و مەنسور بکوژن، لەسنوری ناوچەی گەرمیاندا کوژراون. بەو شێوەیە کێشەی داش عێراق و ئاڵای شۆڕش، کە ماوەی ٤-٥ ساڵ لەڕووی سیاسی و هزری و ڕێکخستنەوە، ڕیزەکانی کۆمەڵەو یەنک ی سەرقاڵکردبوو، کۆتاییهات.

سەرکردایەتی ئاڵای شۆڕش تا ڕاپەڕین لەئێران مایەوە، دوای ڕاپەڕین لەگەڵ حزبی زەحمەتکێشان بەسەرۆکایەتی قادر عەزیز، یەکییان گرت، لەناو زەحمەتکێشاندا زۆر نەمانەوە، یەکە یەکە گەڕانەوە ناو ڕیزەکانی ینک.

**شەڕی کۆمەڵەو شۆڕشگێران:**

یەکێتی شۆڕشگێران کوردستان(یشک، شۆڕشگێران) ساڵی ١٩٨٣ لەیەکگرتنی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان و هێڵی گشتی ناو ینک پێکهات. بزووتنەوەی سۆسیالیست دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول، ساڵی ١٩٧٥ لەنێوان هەندێک لەسەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول(مەلایی و جەلالی)دا، لەعێراق درووستبوو، سەیدا ساڵح یوسفی و عەلی عەسکەری دیارترین سەرکردەی بزووتنەوە بوون.

دوای ئەوەی ینک دامەزرا، بزوتنەوە لەناو ینکدا دەستی بەخەبات کرد، لەسەرەتادا لەڕووی ژمارەی پێشمەرگە و پێگەی جەماوەریەوە بەهێزبوو، لەکارەساتی هەکاریدا، سێ لەسەرکردەکانی (عەلی عەسکەری، دکتۆر خالد، حسەین بابەشێخ) و ژمارەیەکی زۆر لەپێشمەرگەکانی شەهید بوون. سەیدا ساڵح یوسفی سکرتێری بزوتنەوە، لەعێراق بەنهێنی کاری دەکرد، بەنامەیەکی بۆمبڕێژکراو تیرۆر کرا. بەو شێوەیە بزوتنەوە دووچاری کێشەی سەرکردایەتی هات و کەوتە پاشەکشێ.

ساڵی ١٩٧٩ بزوتنەوە دابەشبوو، ئەوانەی کە پێشتر مەلایی بوون، ڕیزەکانی ینک یان بەجێهێشت، حزبی سۆسیالیستی دیموکراتیان(حسک) پێکهێنا، ئەوانەی پێشتر جەلالی بوون، لەناو ینکدا مانەوە. ساڵی ١٩٨٣ بزوتنەوە جەلالیەکە، لەگەڵ هێڵی گشتی ناو ینک یەکیان گرت، یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستانیان( یشک) دامەزراند، فوئاد مەعسووم سکرتێری یشک بوو.

دوای کۆتاییهاتنی کێشەکانی ئاڵای شۆڕش، شەوکەتی حاجی موشیر بە بەرپرسی مەڵبەندی یەک دانرا، شەوکەت ئەندامی سەرکردایەتی یشک بوو. لەسنوری مەڵبەندی یەک بەگشتی و لەناوچەی قەرەداغ بەتایبەتی یشک زۆر

لاواز بوو، لەڕووی سیاسی و پێشمەرگایەتی و جەماوەریەوە دەرنەکەوتبوو، بۆیە هەرکات بەرپرسانی ئەو ڕێکخراوە لەدەزگاکانی یەنک دا پۆستیان وەردەگرت، کادر و جەماوەری کۆمەڵە، ئەو پۆستانەی بەلایقی یشک نەدەزانی، ناڕەزاییان نیشان دەدا، دەیانوت هەمووی خەتای مامجەلالە پشتیوانی یشک دەکات. بە پێچەوانەی رەئی جەماوەر و کادر و پێشمەرگەی کۆمەڵەوە، نەوشیروان مستەفا قەت دژی یشک، دژی بەرپرسەکانیان هەڵویستی نیشان نەدەدا.

لەبەرامبەردا یشک وا بیریدەکردەوە کە خۆیان خاوەنی ینک بن، بەشەهدیبونی سەرکردەکانیان، کۆمەڵە گۆڕەپانەکەی بۆ بەرژەوەندی خۆی قۆرخکردوە، ئەوانی پەراوێز خستوە، بۆچوونیش هەبوو کە سەرکردەکانی کۆمەڵە بوونەتە هۆی جیابونەوەی باڵی بزوتنەوەی سۆسیالیست، بۆیە یشک لاواز بووە، هەندێک لەبەرپرسەکانی یشک رقیان لەکۆمەڵە دەبووەوە، لەبەرئەوەی کۆمەڵە رێکخراوێکی مارکسی بوو، جار جار لەناو خەڵکدا دەیانوت: کۆمەڵە کافرن.

بۆیە هەر کاتێک دەرفەتیان هەبوایە، یشک دەستیان بەدژایاتی کۆمەڵە دەکرد، هەوڵیان دەدا لەسەر حسابی کۆمەڵە خۆیان بەهێز بکەن. هاتنی شەوکەتی حاجی مشیر بۆ ناوچەی قەرەداغ، وەک بەرپرسی مەڵبەندی یەک، دەرفەتێک بوو بۆئەوەی لەسەر حسابی کۆمەڵە، یشک هەوڵبدات خۆی بەهێزبکات.

**نەشتەرگەری بە پێوە:**

یەکەم هێرشی یشک لە مەڵبەندی یەک بۆ سەر من بوو، دەیانویست من لە نەخۆشخانەی مەڵبەند دەربکەن و بە دکتورێکی ئەندامی یشک شوێنەکەم پڕبکەنەوە. کادر و ئەندامانی یشک ، لەناو خەڵک و پێشمەرگەدا، دەستیان دایە پروپاگەندە بۆ پزیشکێک، کە ئەندامی خۆیان بوو، گوایە پاش ماوەیەک پزیشکێکی سەر بە یشک دەگاتە قەرەداغ، دبێتە پزیشکی نەخۆشخانەی مەڵبەندی یەک، دەیانوت: دکتۆرێکمان بۆ دێت، ئەوەندە زیرەکە، بەپێوە

نەشتەرگەری دەکات. منیش ئەو دکتۆرەم باش دەناسی، راستە ئەندامی ئەوان بوو، بەڵام ئەوە نەبوو ململانێ لەگەڵ مندا بکات، هی ئەوەش نەبوو کێشە بۆ من درووستبکات.

ئەندام و کادرو بەرپرسانی کۆمەڵەش، کاتێک گوێیان لەو پرۆپاگەندانەی برادەرانی شۆڕشگێران بوو، نیگەران بوون، هاتنە لام، ئەو باباتەیان لەگەڵ باسکردم، وتیان: ئەگەر تۆ پێت باش بێت، ئێمە ناهێڵین ئەو دکتۆرە بگاتە مەڵبەند. من گوێم بەو پرۆپاگەندانەی برادەرانی شۆڕشگێران نەدا، لەبەرئەوەی ئەو پزیشکەم باش دەناسی، لەقۆناغی ئامادەییدا لەقوتابخانەکانی هەڵەبجە و سلێمانی هاوڕێم بوو، کاتێک هاتە زانکۆی موسڵیش هەر پەیوەندی باشم لەگەڵیدا هەبوو، کە لەکاتی گفتوگۆشدا پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد، جارێکی تر یەکترمان بینییەوە، هاوڕێیەتی و دۆستایەتیمان نوێ کردەوە.

بە برادەرانی کۆمەڵەم وت گوێی پێ مەدەن، با شۆڕشگێران هەر بەو دکتۆرەوە خۆیان هەڵکێشن، ئەو دکتۆرە هیچ مەترسیەکی بۆ سەر من و بۆ سەر کۆمەڵە نییە، ئەو دکتۆرە، لەقسەی من دەرناچێت، حەزی بەحزبایەتی و سیاسەت نییە، تاقەتی ململانێی حزبی نییە، لێگەڕێن با بێتە نەخۆشخانەی مەڵبەندو هاوکاری من بکات.

پاش چەند رۆژێک دکتۆر حەسەن هەڵەبجەیی، ئەندامی یشک گەیشتە گوندی سێوسێنان، پێشوازیەکی گەرمم لێکرد، بۆ ماوەیەک لەنەخۆشخانەی مەڵبەندی یەک مایەوە، لەچارەسەرکردنی نەخۆش و بریندارەکاندا هاوکارییەکی باشی کردم، ئەو ماوەیە کە من و دکتۆر حەسەن لەنەخۆشخانە پێکەوە بووین، هەرگیز باسی ناکۆکی و ململانێی نێوان کۆمەڵەو شۆڕشگێرانمان نەدەکرد، دۆستایەتیمان تا ئاستێکی بەرز پێشکەوت.

**مام وریا:**

وریا کادرێکی کۆمەڵەبوو، خەڵکی ناوچەی هەورامان بوو، لەسنوری تیپی ١١ هەورامان پێشمەرگە بوو. شەوێک لەکاتی پەڕینەوەی مەفرەزەیەکی هێزی پێشمەرگەدا، لەسنوری گوندەکانی شارەزوور، بەبێ ئەوەی هیچ شەڕو

پێکدادان لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزە چەکدارەکانی رژێمدا ڕوودات، وریا گولەیەکی بەردەکەوێت و شەهید دەبێت.

بە قسەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵەو دۆستەکانی وریا، کادرێکی یشک ی سنوری ناوچەی هەورامان، تەقەی لەوریا کردوەو شەهید کردوە، دوای شەهیدبوونی، هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ڕووداوەکە نەکرا، تاوانباری فەرمی نەناسرا، کەس لەسەر شەهیدکردنی سزانەدرا.

**مامۆستاعەلی:**

مامۆستا عەلی خەڵکی گەرمیان بوو، لەسنوری ناوچەی قەرەداغ کادری کۆمەڵەبوو، کەسێکی ئایدۆلۆجی بوو، بەردەوام لەگەڵ یشک لە ناکۆکی و ململانێدا بوو. ماڵی لەگوندی مەسۆیی قەرەداغ بوو. شەوێکیان دوای بانگی عیشا، لەگوندی مەسۆییەوە تەقەیەکی زۆر کرا، هەر کە تەقە دەستی پێکرد، شەماڵی بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستنی شۆڕشگێڕان، بەسوارڕۆ لە گوندی سێوسێنانەوە بەرەو گوندی مەسۆیی بەڕێکەوت. دوایی بۆماندەرکەوت، پێشمەرگەیەکی خەڵکی شارەزور، سەر بە یشک، بەبێ هۆکار، تەقەی لەماڵی مامۆستا عەلی کردوە، بەڵام خۆشبەختانە کەس زیانی بەرنەکەوتبوو. بە بۆچونی من ئەو بەرپرسەی یەکێتی شۆڕشگێران، کە لەسێوسێنانەوە بەرەو گوندی مەسۆیی بەڕێکەوت، ئاگاداری پیلانەکە بووە، ئەگینا بۆ لەگەڵ تەقەکردنەکەدا، بەپەلە، بەرەو مەسۆیی، بەرەوڕووی تەقەکە دەڕوات.

**سارووخی ئاراستەکراو:**

نەخۆشخانە لەبینای قوتابخانەی گوندی سێوسێناندا بوو، کات تەموزی ١٩٨٦ بوو، چالاکی داستانی پێشمەرگە دژی هێزەکانی رژێم لەلوتکەدا بوو، لەو کاتەدا حەڤدە بریندارمان هەبوو.

نیوە شەوبوو، لەسەر بان راکشابووم، خەریکبوو خەوم لێدەکەوت، دەنگی تەقینەوەیەک گوندی سێوسێنانی هەژاند، هەر لەگەڵ درووستبونی دەنگی تەقینەوەکەدا، هەستامە سەرپێ، لەخوارووی نەخۆشخانەکەوە پزیسکی ئاگرم

بینی، بەکلاشینکۆفەکەی دەستم، مەخزەنێک فیشەکم بەشوێنی پزیسکەکەوە نا. لەسەر بان هاتمە خوارەوە، پێشمەرگەکانی نەخۆشخانەم بانگ کرد، وتم: بچن بۆ ناو گوند، بزانن ئەو تەقینەوەیە چی بوو؟ بەرکوێ کەوتوە؟ زیان هەیە؟ بریندار هەیە؟ ، ئەگەر بریندار هەبوو، بیهێنن بۆ نەخۆشخانە. پێشمەرگەکان بەرەو ناو گوند بەڕێکەوتن، دوای چەند چرکەیەک گەڕانەوە، ئەشرەف خانەقینی وتی: دکتۆر نازانم ئاربیجی(R P C)بووە یان هاوەن بووە، بەر دیواری حەوشەی ماڵێک کەوتووە، هیچ زیانێکی گیانی نەبووە.

لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بەرەو نەخۆشخانە دەچووین، دەنگی تەقینەوەیەکی تر نەخۆشخانەی هەژاند، بەپەلە گەیشتمە نەخۆشخانە، چەند کەسێک لەپێشمەرگەکان بەهۆی بەردو شوشەوە بەسوکی بریندار ببوون. یەکسەر چومە لای سەید محەمەد[٣٧]، تا هەواڵی بزانم، سەیرم کرد سەید محەمەد بەسوکی بەهۆی شوشەی پەنجەرەی نەخۆشخانەکەوە بریندار بووە.

دوای ئەوەی لەژیانی برینداڕەکان دڵنیا بوومەوە، بەرەو ئەو شوێنە چووم کە نەخۆشم تێدا دەپشکنی، سەیرم کرد تەقینەوەی دووەم بەر مێزو کورسیەکەی خۆم کەوتووە. کەس نەیدەزانی چی روویداوە، ئەوە لوغم بوو، ئاربیجی بوو، یان هاوەن بوو؟ کەس نەیدەزانی کە ئایا پەیوەندی لەنێوان ئەو دو تەقینەوانەدا هەیە، یان نییە؟ ، شەماڵی مەکتەبی رێکخستنی یەکێتی شۆڕشگێران پەیدابوو، لێمان نزیک بووە و وتی: ئەوە ساروخی ئاراستەکراوبوو، هەردوو ساروخەکە پێکەوە بوون، دەستی بۆ باشووری نەخۆشخانە درێژکرد، وتی هەردووکی لەوێوە ئاراستەکران، ئەو شوێنەی کە شەماڵ دەستی بۆ درێژکرد، ئەو شوێنە بوو کە لە کاتی تەقینەوەکەدا پزیشکی ئاگری لێهەستا، یەکسەر کەوتمە گومانەوە.

کاتژمێرێک دوای تەقینەوەکان، کاتژمێر یەکی شەو، لەگوندی سێوسێنانەوە تراکتورێک بەرەو قەرەداغ بەڕێکەوت، رێگەم لەتراکتورەکە گرت، بەشۆفێری تراکتۆرەکەم وت: بۆ کوێ دەچیت؟ ، وتی: ئیشم هەیە بۆ قەرەداغ دەچم، وتم:

---

٣٧ سەید محەمەد خەڵکی کفری بوو کادرێکی کۆمەڵەبوو، لە چالاکیەکدا برینداربوو، دوای ئەنفالەکان لەگەڵ مەلا ئەحمەد و هاورێکانی تریدا لە ئەشکەوتی داری خلە شەهید بوون.

بەو نیوە شەوە ئیشی چیت هەیە؟ نابێت بڕۆیت، لەو کاتەدا من لەگەڵ شۆڤێری تراکتورەکە قسەم دەکرد، جەمیل هەورامی ئەندامی مەڵبەندی یەکیتی، سەر بە یشک ، لەسەر بانەکەیماڵی خۆیانەوە بانگی کردم، وتی: دکتۆر ڕێگە بدە با تراکتۆرەکە بڕوات، وتم: کاک جەمیل ئەگەر ئەم تراکتورە ئێستا بڕوات، ئەو تاوانبارەی کاری تەقینەوەکانی ئەنجام داوە، سواری تراکتورەکە دەبێت، بەئاسانی خۆی دەگەیەنێتەوە ناو حکومەت. جەمیل هەورامی لەسەر بۆچوونەکەی خۆی سووربوو، ڕێگەی بەتراکتورەکە دا بەو شەوە بڕوات بۆ قەرەداغ.

بۆ سبەینێ هەواڵ بڵاوبوەوە، ئەو کەسەی تاوانی تەقینەوەکانی نەخۆشخانەی ئەنجام داوە، شەو لەڕێگەی تراکتورەکەی گوندی سێوسێنانەوە، گەیشتۆتەوە قەرەداغ. هەر ئەو ڕۆژە هەواڵ بڵاوبوەوە، ئەو تاوانبارەی تەقینەوەکەی نەخۆشخانەی ئەنجامداوە، لەسەر ڕێگەی نێوان سێوسێنان و بەلەکجاڕ، دوو پێشمەرگەشی شەهید کردووە.

ئەو ڕوداوە زۆر کاریگەری نەرێنی لەسەر کردبووم، بیرم نەدەچوەوە، وای بۆدەچووم جەمیل هەورامی شتێکی لەسەر بزانێت، ڕۆژێکیان چووم بۆ ماڵی جەمیل هەورامی، پرسیارم لێکرد، وتم: ئەرێ ئەنجامدەری تەقینەوەکەی نەخۆشخانەتان نەدۆزیەوە، جەمیل هەورامی و شەوبۆی خێزانی، هەردوکیان لەیەک کاتدا، وەلامیاندامەوە، وتیان: بەڵێ زانیمان کێیە، جەمیل وتی: ئەو کەسە کاتی خۆی فەرماندەی مەفرەزەکەی من بوو، برایەکی لای حکومەت دەستگیرکرابوو، حکومەت پەیامی بۆ ناردبوو، ئەگەر بێیتەوە ناو حکومەت، دژی پێشمەرگە چالاکیەکمان بۆ بکەیت، براکەت ئازاد دەکەین. وتم: باشە بۆچی دژی نەخۆشخانە ئەو چالاکیەی کرد، شەوبۆی خێزانی جەمیل وتی: ئاخر دیواری نەخۆشاخانەکە ئەستور بوو، وتویەتی ئەوێ باشە، دیوارە ئەستورەکە نایەڵێت زیانی زۆر بەر پێشمەرگە بکەوێت.

ئتر لەسەری نەڕۆشتم، "لەدڵی خۆمدا وتم: خۆ ساروخی دووەم بەر مێزو کورسیەکەی من کەوتبوو"، دیسان لەدڵی خۆمدا وتم: ئەی بۆ لەسەر ڕێگەی سێوسێان و بەلەکجاڕ، ئەو دوپێشمەرگەیەی شەهید کرد؟ دوای ڕاپەڕین ئەو تاوانبارە بوەوە بەپێشمەرگەی ینک، لەشەڕی نێوان ینک و بزوتنەوەی ئیسلامیدا کوژرا.

**دەعوەتی ژەهراوی:**

رۆژێکیان پێشمەرگەیەکی مەکتەبی ڕێکخستنی یشک هاتە لام، وتی: دەمەوێت لەنەخۆشخانە ببم بەپێشمەرگە، وتم: بۆ دێیتە لای ئێمە؟ ، بۆ لەمەکتەبی یشک نامێنیتەوە، وتی: لەگەڵ بەرپرسی مەکتەب تێکچووم، ناتوانم لەوێ بمێنمەوە. منیش وتم: چی دەزانی؟ وتی: نانەوایی دەزانم، دەستم بەڕوویەوە نەنا، لەنەخۆشخانە وەک نانەوا وەرم گرت.

ئەو پێشمەرگەیە زۆر خۆی لەمن نزیک دەکردەوە، رۆژێکیان وتی: دکتور مۆڵەتم بدە سەردانی ماڵەوەمان بکەم، وتم: دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ خانەقین؟ وتی: ناچمەوە خانەقین، دەچمە گوندێکی نزیک کەلار، دەنێرم بەشوێن ماڵی خۆماندا، دێن بۆ لام، لەوێ دەیانبینم، دواتر وتی: بەتەمام هاوسەرگیری بکەم، وتم: باشە بڕۆ، بەلام زوو وەرەوە. هەفتەیەکی پێنەچوو، پێشمەرگەکە گەڕایەوە، هاتە لام، وتی: دکتۆر دەستگیرانم گرتووە، ئەڵقەیەک لە پەنجەیدا بوو، پیشاندام، وتی: لەم ماوەیەدا دەیگوازمەوە، بەو بۆنەیەوە دەعوەتێک بۆ دکتۆر و بریندارەکانی نەخۆشخانە و کاروباری کۆمەلایەتی قەرەداغ دەکەم. منیش سوپاسم کرد، دوای ئەوە دەستی بەکاری نانەوایی کردەوە.

لەو کاتەدا سامان گەرمیانی، بەرپرسی سەربازی مەڵبەندی یەک بوو، رۆژێکیان هات بۆ لام، وتی: هەواڵێکی گرنگ هەیە، دەبێت بیزانیت، کە گوێم لێگرت، وتی: نانەواکەی نەخۆشخانە پیاوی ڕژێمی بەعسە، پیلانی داناوە ژەهرخواردتان بکات. بە سامانم وت: بڕیاریداوە بەبۆنەی ژنهێنانەوە دەعوەتمان بکات، دیارە دەیەوێت لەدەعوەتەکەدا ژەهرخواردمان بکات، وتی: بەڵێ وایە. یەکسەر بیرم لەوە کردەوە کە ژنهێنانەکەی سیناریۆ بێت و لەئاهەنگی نانخواردندا ئیشی خۆی بکات. لەسەرەتادا وای بۆ دەچووم کە ئەو کارە تەنیا دەستی ڕژێمی تیدابێت، بەلام گومانم لا درووست بوو، ئەو پیلانە دەستی یشکی تێدایە.

"باشە ئەگەر ئەم کوڕە تەنیا پیاوی ڕژێمە، بۆ بەرپرسە گەورەکان ژەهرخوارد ناکات؟ بۆچی ئەم پیاوەی ڕژێم، بەرپرسی مەڵبەندو بەرپرسی

کاروباری کۆمەلایەتی مەڵبەند دەعوەت ناکات و ژەهرخواردیان ناکات؟ ، ئەو کاتە چالاکیەکەی گەورەتر دەبێت، پاداشتی زیاتر وەردەگرێت". "ئەی بۆ ئەو دەعوەتەی بۆ مەکتەبی رێکخستنی یشک نەکرد، هەوڵی ژەهراویکردنی ئەوانی نەدا؟ ، ماوەیەک لەوەپێش لەلای ئەوانەوە هاتوە بۆ نەخۆشخانە؟ بۆ ئەوانی ژەهرخوارد نەکرد؟ ئەی بۆ ئامانجی ژەهرخواردکردنەکە تەنیا من و شەوکەت حەمەساڵح، دوو هاوڕێی کۆمەڵەی خەڵکی هەورامان دەگرێتەوە؟ کە لەچاو بەرپرسەکانی تردا، پلەو پایەیەکی وامان نییە، تا هەڕەشەی جدیی لەسەر ئاسایشی رژێم دروستبکەین" ؟

تاوانبارەکە چاودێری کرا، تاوەکو دەزگیرانە ساختەکەی سەردانی کرد، ئەو رۆژەی دەزگیرانە ساختەکە گەیشتە سێوسێنان، هەردووکیان دەستگیرکران، ماوەی چەند کاتژمێرێک لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا، هەردووکیان دانیان بەتاوانەکەیاندا نا، دەزگیرانی تاوانبارەکە، ژنێکی خێزاندار بوو، منالێکیشی لەگەڵدا بوو، نە دەزگیرانی بوو نە خێزانی بوو، جاسوسی دەزگا سیخوڕییەکانی رژێمی بەعس بوو.

پیلانەکە وا بووە ژنە سیخورەکە، خواردنێک بۆ نەخۆشخانە و کاروباری کۆمەلایاتی دورست بکات، ژەهر بکاتە خواردنەکەوە، من و شەوکەت و پێشمەرگەکان خواردنەکە بخۆین، دوای ئەوە هەردوو تاوانبار، گوندی سێوسێنان بەجێدەهێلن، دەچنە گەرمیان، لەوێ بەرپرسی ناوچەی گەرمیانی یشک وەریاندەگرێت و دەیانگەیەنێتەوە ناو رژێم.

رۆژێک دوای لێکۆڵینەوەکە، بەرپرسانی مەڵبەند هاتنە گوندی سێوسێنان، بڕیار درا هەر ئەو رۆژە تاوانبارەکان بکوژرێن، من پێشنیارم کرد، لەو شوێنەدا بکوژرێن کە مانگێک لەوەوبەر، دوو ساروخی ئاراستەکراویان بەگوندی سێوسێنان و نەخۆشخانەوە نا، بەرپرسەکان بەپێشنیارەکەم رازی بوون، هەردوو تاوانبارەکە برانە شوینی تەقاندنی ساروخەکان، بەچەکی B K Cرەمی کران و کۆتایی بەژیانیان هات.

**هێرۆخان:**

ژنە سیخورەکە کوڕێکی سێ ساڵەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، لەناو پێشمەرگەدا بۆچونێک دروستبوو، دەبێت: منداڵەکەش لەگەڵ دایکیدا بکوژرێت، دەیانوت: ئەگەر ئەو منداڵە بمێنێت، گەورە ببێت هەر جاش و جاسوس دەردەچێت، با هەر لەئێستەوە لەناوی ببەین، خەریک بوو منداڵەکەش رەمی بکرێت، لەو کاتەدا هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەدی هاوسەری مامجەلال، لە ناوچەی قەرەداغ بوو، ئەو رۆژە لەگوندی سێوسێنان بوو، بەرامبەر بەو بۆچوونە کە دەیویست منداڵەکەش بکوژرێت، نارەزایی نیشاندا، رێگەی لەکۆشتنی منداڵەکە گرت. لەرێگەی خەڵکی ناوچەکەوە، منداڵەکە رەوانەی ناو حکومەت کرایەوە.

**سەرتیپەکە:**

شەوکەتی حاجی موشیر لەمەڵبەندی یەک نەمابوو، لەسەرەتای مانگی چواری ساڵی ١٩٨٧، لەگەڵ هێزی پێسمەرگەی مەڵبەندا لە شەڕی داستانی رزگاری بووم، لەگوندی پیرکەی دۆڵەڕوت، بنکەی تەندروستیم دانابوو، چارەسەری برینداری شەڕەکەم دەکرد. لە شەڕەکەدا فەرماندەیەکی کەرت بریندارببوو، خەریکی تەداویکردنی برینەکەی بووم، بەرپرسی مەڵبەند هاتە لامان، بریندارەکە بەبەرپرسی مەڵبەندی وت: تکایە فریا کەون، بەرپرسەکە وتی: فریای چی بکەوین؟ بریندارەکە وتی: لەکاتی هێرشدا بۆ سەر رەبایەکەی دوژمن، بەچاوی خۆم بینیم، دلێر جاف لەپشتەوە، تەقەی لەشیخ جەعفەر دەکرد، بەرێکەوت بەرینەکەوت.

دلێر جاف فەرماندەی تیپ بوو، ئەندامی سەرکردایەتی یشک بوو. بەرپرسی مەڵبەند تەنها گوێی لێگرت و هیچی نەوت.

شەڕی داستانی رزگاری تەواوبوو، لەناوەڕاستی مانگی پێنجدا گەڕاینەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ، ئەو کاتە قەرەداغ رزگار کرابوو، هێزی مەڵبەندی یەک بۆ دەستبەسەراگرتنی سەربازگەی گڵەزەردە کۆکرایەوە، هێزەکەمان بردە سەر شاخی گڵەزەردە، پێشمەرگە پەلاماری سەربازگەکەی دا، هێزەکانی رژێم رایانکرد، سەربازگەکەیان چۆڵکرد، تەقەیەکیان بەرووی پێشمەرگەدا نەکرد،

کتوپر جهاز ئاگاداری بەرپرسی مەڵبەندی کرد، وتی: دلێرجافی فەرماندەی تیپ بریندارە، پاش کەمێک قسەکەری جهازەکە وتی: بریندارەکە شەهید بوو. لای خۆمەوە وای بۆ دەچووم کە ئەو سەرتیپە لەلایەن پێشمەرگەوە کوژرابێت، بەرامبەر بەوەی لەشەڕی داستانی رزگاریدا، هەوڵیدا بەرپرسی سەربازی مەڵبەند بکوژێت، دواتر لەناو خەڵک و لەناو پێشمەرگەدا بڵاوبوەوە کە دلێر جاف بەدەستی خودی پێشمەرگە کوژراوە.

## ٩. مەڵبەندی یەك

لەسەرەتای مانگی یەکی ساڵی ١٩٨٥ دا، لە خولی پەروەردەی نەشتەرگەی بووم، ئاگادار کرامەوە کە سلێمانی بەجێبهێلم، پەیوەندی بەمەڵبەندی یەکەوە بکەم، ئەو کات بارەگای مەڵبەند لەشارباژێڕ بوو. جەبار فەرمان بەرپرسی مەڵبەند بوو، پەیوەندیم لەگەڵ جەبار فەرمان باشبوو، لەبەرئەوەی ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٣، کاتێک لەسەرگەڵو بووم، جەبار فەرمان لەگوندی هەڵەدن بەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵەبوو، هاوکاری باشی نەخۆشخانەی دەکرد. بەشێوەیەکی گشتی جەبار فەرمان لەگەڵ پزیشکەکانی ناو شۆڕشدا، پەیوەندی باشبوو.

دابەشبوونی کۆمەڵە بەسەر باڵی کوردستانی و باڵی داشعێراقدا، کاریگەری لەسەر پزیشکانیش کردبوو، دکتۆر هەژار و دکتۆر حەسان، کە پێش من پێشمەرگە بوون، لەسنوری مەڵبەندی یەکدا کاریان کردبوو، لەژێر کاریگەری سیاسەتی داش عێراقیەکاندا بوون، من و د. زریانیش، سەر بەباڵی کوردستانی بووین.

**نەخۆشخانەی کانی دڕکە:**

پاش ئەوەی لە سلێمانی گەڕامەوە، پەیوەندیم بەنەخۆشخانەی مەڵبەندی یەکەوە کرد، نەخۆشخانە لەگوندی کانی دڕکە بوو، گوندی کانی دڕکە نزیک ناحیەی بەرزنجەی ناوچەی شارباژێڕە، لەنێوان گوندی بزەینان و گوندی شوکێ دایە. بارەگای مەڵبەند لەگوندی شوکێ بوو.

نەخۆشخانەکە، دوو یاریدەدەری پزیشک و دوو پێشمەرگەی لێبوو، دو یاریدەدەری پزیشکەکە عادل و نەجم بوون، هەردووکیان خەڵکی خانەقین بوون، مامۆستا محەمەد پێشمەرگەی نەخۆشخانە بوو، ئەویش خەڵکی خانەقین بوو، من نەمدەزانی، پرسیاریشم نەکرد، ئەو سێ کەسە لەگەڵ جەبار فرمان هاتبوون بۆ نەخۆشخانە، یان پێشتر لەوێ بوون؟ پێشمەرگەی چوارەمی نەخۆشخانە ناوی ئەحمەد بوو، خەڵکی مەریوانی رۆژهەڵاتی کوردستان بوو.

کانی دڕکە گوندێکی کەم ئاوی بچوک بوو، سەرەڕای بچووکی و وشکی گوند، لەسەر رێگەی گوندەکە سەنێرگایەکی گەورە هەبوو، یەکەم داواکاریم لەکاروباری کۆمەلایەتی مەڵبەند، ئەوەبوو بەخەڵکی گوند بڵێن: ئەم زستانە، سەنێرگاکەی ناو گوند بدەن بەئاودا، لەئایندەشدا سەنێری حەیوانەکانیان لەناو گوندا نەڕێژن، لەدووری گوندەوە، شوێنێک بۆ سەنێرگای گوند دیاری بکرێت.

داواکاریەکەی من لەلایەن بەرپرسی کۆمەلایەتی ناوچەی شارباژێڕەوە رەدکرایەوە، لەبەرئەوەی بەرپرسەکە لەباڵی داش عێراقییەکانی کۆمەڵەبوو، زۆر نیگەرانیش ببوو کە جەبار فەرمان بەرپرسیارێتی مەڵبەندی وەرگرتووەو من پزیشکی مەڵبەندی یەکم، بۆیە ئامادە نەبوو هاوکارییمان بکات.

**ژیانێکی تر:**

لەکاتی خوێندنی زانکۆدا، لەکاتی کاری پزیشکیدا، رێکنەکەوت هاوسەرگیری بکەم، لەکاتی گفتوگۆی ینک و حکومەتی عێراقدا، پێشمەرگە زۆر گرنگی بەهاوسەرگیری دەدا، چەند جارێک هاورێکانم پێیانوتم هاوسەرگیری بکە، هەندێک هەوڵ هەبوون، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم. دوای درووستبوونەوەی شەڕ لەنێوان حکومەتی عێراق و ینک دا، لە شارباژێر بووم، رۆژێک وتیان: خێزانی شۆڕش ئیسماعیل نەخۆشە، شۆڕش ئەو کاتە فەرماندەی تیپی مەڵبەند بوو، منیش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکە، سەردانی ماڵی شۆڕشم کرد. دوای ئەوەی دەرمانم بۆ نەخۆشەکە نوسی، لەگەڵ

شۆڕش و نەرمینی خیزانیدا دەستمان بەقسە کرد، لەویش وتیان: بۆ ژن ناهێنی، منیش وتم ئەگەر کەسێک هەبێت بەدڵمبێت دەیهێنم، نەرمین وتی: هاوپۆلێکی خۆم هەیە، حەز دەکات شوو بەپێشمەرگە بکات، بۆ تۆ زۆر باشە. دواتر لەسەرئەوە ڕێککەوتین کە ئەویش ئاگادار بکرێت، ئەگەر ڕازی بێت، لەکات و شوێنی گونجاودا یەکتر ببینین.

کە بە مەهابادیان وتبوو: داوای وێنەی منی کردبوو، وتبوی: نەوەک ناشیرین بێت، منیش دوو وێنەی خۆمم بۆ نارد، وێنەکانی بەدڵ ببوو، خزمان سەردانی ماڵی باوکی مەهابادیان کرد، ماڵی باوکی لاریان نەبوو. ڕۆژێکیان مامە حەمەشەریفم و مەهاباد و چەند خزمێکی تر سەردانیان کردم، هاتنە گوندی شارستێنەی ناوچەی شاربازێڕ، لەوێ لەگەڵ مەهاباد یەکترمان بینی، هەردولامان بەیەکتر ڕازی بووین، بڕیاری هاوسەرگیریماندا.

ماڵی باوکی مەهاباد بە هاوسەرگیرییەکە ڕازی بوون، بەڵام لەبەرئەوەی جەلالی بوون، داوایان دەکرد: مامجەلال نامەیەک بۆ باوکی مەهاباد بنوسێت، سوپاسی بکات کە ڕازیبوون کچێکیان لەگەڵ پێشمەرگەیەکی ینکدا هاوسەرگیری کردوە.

چەند جارێک ئەو داوایەیان لەڕێگەی تارقی برامەوە بەگوێمدادا، دوو جار براکەم بۆ ئەو مەبەستە هاتە لام، منیش بەبراکەمم وت: خۆ تۆ دەزانی نزیکەی ساڵێکە من مامجەلالم نەدیووە، ئەو لەمن زوییر بووە، منیش نامەوێت بۆ کارێکی وا بڕۆم بۆ لای مامجەلال، یان کەسێک بنێرم، داواکارییەکی وای لێبکات.

بە تارقم وت: دوای کۆتاییهاتنی گفتوگۆ، کە مەڵبەندەکانی ینک ڕێکخرانەوە، حاکم شوانی برازای مام جەلال بەناوی پێشمەرگەی بارەگاکانی سەرکردایەتیەوە، داوای لەمامجەلال کردبوو، دکتۆر فایق بگەڕێتەوە بۆ نەخۆشخانەی سەرکردایەتی، مام جەلال وتبووی نامەوێت ئەو د. فایقە لەمنەوە نزیک بێت، دەبێت بەبەردەوامی سەد کیلۆمەتر لەمنەوە دوور بێت.

به تارقی برامم وت: قەناعەتیان پێبکە با واز لەو داواکارییە بێنن، دواتر دەرکەوت کە تارق قەناعەتی بەماڵی مەهاباد کردبوو، واز لەو داواکارییە بێنن، ئەوانیش چیتر باسییان نەکرد.

ئەو کاتە هەر پێشمەرگەیەک هاوسەرگیری بکردایە، یەک بەبڕێک پارە هاوکاری دەکرد، بەهۆی تێکچوونی پەیوەندییم لەگەڵ مامجەلالدا، لەو هاوکاریەش بێبەش کرام.

بە هۆی شەڕی ئێران-عێراق و شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای عێراقەوە، سنوری ئازادکراوی ناوچەی شارباژێڕ تەسکبوەوە، لەبەهاری ساڵی ١٩٨٥ دا، بارەگاکانی مەڵبەندی یەک گوێزرانەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ، لەگوندی سێوسێنانی ناوچەی قەرەداغ نەخۆشخانەم کردەوە، لەوێ مەهاباد هات بۆ لام، باوکی مەهاباد (لالۆ عەبدولڕەحمان پێنجوێنی)ی کردبوو بەوەکیلی خۆی، بۆئەوەی مەهاباد لەمن مارە بکات. دوای ئەنجامدانی کاری پێویست، مام هادی ماڵەکەی خۆی پێشکەشکردین، لەگوندی سێوسێنان، لەماڵەکەی مام هادی، تا ماوەیەک ماینەوە.

ساڵێک دواتر، هێرۆ خان سەردانی ناوچەی قەرەداغی کرد، لەو کاتەدا دایکی مەهابادیش بەسەردان لە سێوسێنان بوو، مەهابادو دایکی دەیانوت: با بە هێرۆ خان بڵێین تۆ لەمەڵبەند نەمێنی، بڕۆیتەوە بۆ سەرکردایەتی بۆ لای مامجەلال، ئەوان ئاگاداری کێشەکەی سورداش نەبوون، بێجگە لەوەی کە مامجەلالیان خۆشدەویست، دەشیانویست من تووشی کێشە نەبم، لەنزیکی مام جەلالەوە پارێزراو بم، دەترسان منیش وەک زاواکەی تریان، وەک ملازم حەمەشەوقی، شەهید بکرێم، کچێکی تریشیان بێوەرژن بکەوێت.

راستە مەهاباد ئامادەبوو لەگەڵ پێشمەرگەیەکی وەک مندا هاوسەرگیری بکات، ئەو ژنانەی لەو کاتەدا هاوسەرگیریان لەگەڵ پێشمەرگەدا دەکرد، بەپەنجەی دەست دەژمێردران، بەڵام لەوە بگەڕێتەوە، دیدگای من و مەهاباد، بۆ ژیان و سیاسەت، لەیەکەوە دووربوو، هەر بەدووریش مایەوە، لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، هەڵگری دیدوو چەمکی جیاواز بووین، لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ،

نـه ئـەو دەستبەرداری ئـەو چەمکانـەی خـۆی بـووە کـە لەگـەڵ بۆچـونی منـدا ناکۆکن، نە من دەستبەرداری ئەو چەمکانەی خـۆم بـووم، کـە لەگـەڵ بۆچـونی ئەودا ناکۆکن. لەڕووی سیاسەتی ناوخۆی ینک وە، من سـەر بەکۆمەڵـەبووم، ئەو لەخەتی گشتی و یەکێتی شۆڕشگێڕانەوە نزیکبوو. تا ئـەمڕۆش دوای ٣٢ ساڵ ئـەو نـاکۆکی و بۆچوونـە جیاوازانـە لەنێوانمانـدا بەردەوامـە، بـەڵام لەبـەر بەرژەوەنـدی منـداڵ، لەبـەر ئەوەی بـڕوام بە بۆچـوونی جیـاواز و بـەماف و ئازادی ژن هەیە، ناکۆکی و ململانێکانمان، هاوسەنگی خێزانی لێتێک نـەداوین، کێشــەی جــدیمان نیــە. دەتــوانم بڵــێم شــێوازی پەیوەنــدی نێــوان مــن و هاوســـەرەکەم، کۆنفیـــدراڵی خێزانیـــە، لـــەڕووی ئـــابوری و سیاســـییەوە سـەربەخۆین، لە رووی بەرژەوەندی منداڵـەکان و بەرژەوەندی نەتـەوەییەوە، یەکدەگرینەوە.

خـاوەنی د وو کـچ و دوو کـوڕین، لەبـەرواری ١٣-٤- ١٩٨٦ شـێنێی کچـم لەسێوسـێنان لـەدایک بـوو. دوای ئـەنفال ئـاوارەی ئێـران بـووین، لەشـاری سەقزی رۆژهـەڵاتی کوردسـتان لـە٥-١- ١٩٩٠شـرامی کـوڕم لـەدایک بـوو. تـا راپـەڕین لەرۆژهـــەڵاتی کوردســـتان ماینـــەوە، دوای راپـــەڕین گەڕاینـــەوە بـــۆ باشـوری کوردسـتان. لاکـۆی کـوڕم سـاڵی ١٩٩٥ لەسـلێمانی لـەدایک بـوو. شانیای کچیشم ساڵی ١٩٩٩ لەسلێمانی لەدایک بووە.

**نەخۆشخانەی سێوسێنان:**

لەســەرەتای ســاڵی ١٩٨٥ دا، گفتوگـۆی نێـوان ینـک و حکومــەتی بــەعس کۆتـایی هـات، شـەڕ دەسـتپێکردەوە، بارەگاکـانی مەڵبەنـدی یـەک لەشـارباژێڕە گوێزرانــەوە بــۆ ناوچــەی قــەرەداغ، بارەگاکــانی مەڵبەنــد بەســەر گوندەکانــدا دابەشکران، نەخۆشـخانە لەگوندی سێوسێنان جێگیرکـرا. لەبەرئـەوەی رژێمـی بـەعس قوتابخانـەی ئـەو گوندانـەی داخسـتبوو کـە لـەژێر دەسـەڵاتی هێـزی پێشمەرگەدا بوون، نەخۆشـخانەمان بردە قوتابخانەکەی سێوسـێنان، دەسـتمان بەچارەسەرکردنی نەخۆش و برینداری خەڵک و پێشمەرگە کرد.

**سامان گەرمیانی بریندارە:**

بەهاری ساڵی ١٩٨٥ بوو، خەریک بوو نەخۆشخانە لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێ، چەند فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەری ڕژێم، دەستیان بە بوردومانی بارەگاکانی مەڵبەند کرد، چەندین جار بەساروخ، ناو گوندو دەوروبەری گوندی تەکیەیان بۆردومان کرد، زۆر نیگەران بووم، وام پێشبینی دەکرد هەمو کادرو پێشمەرگەکانی مەڵبەند شەهید و بریندار بووبن. کۆڵەپشتێک دەرمانی پێویستم پێچایەوە، لەگوندی سێوسێنانەوە تا گوندی تەکیە رامکرد، هێشتا فڕۆکەکان ئاسمانی ناوچەکەیان بەجێنەهێشتبوو، گەیشتمە بارەگای مەڵبەند.

بەسەر پێشمەرگەکاندا گەڕام، هەواڵم پرسین، وتم سەلامەتن؟ ، سامان گەرمیانی ئەو کاتە بەرپرسی سەربازی مەڵبەند بوو، بەورەیەکی بەرزەوە وەلامی دامەوە، وتی: هەمو سەلامەتن تەنیا من لاقم بریندار بووە، سەیری برینەکەیم کرد، خۆشبەختانە برینەکەی مەترسیدار نەبوو، پارچەی ساروخی فڕۆکەی بەرکەوتبوو، سەرەتا تەداوی برینەکەیم کردو دواتر دەرمانی ئەنتیبایۆتیک و دەرمانی ئازارکوژم پێدا. خەریک بوو بەرەو نەخۆشخانە بگەڕێمەوە، جارێکی تر فڕۆکەکان هاتنەوە سەر ئاسمانی ناوچەکە، لەو کاتەدا ویستم سامان بگرمە کۆڵم و بیگەیەنمە ژێر تاشە بەردێک، بۆئەوەی لەئەگەری بریندابوونەوە بیپارێزم، سەیرم کرد زۆر قورسە، ناتوانم بیکەمە کۆڵ، لەبەرئەوەی بالاشی بەرزبوو، نەمتوانی لەزەوی هەڵیبگرم، لەدڵی خۆمدا وتم "نایتوانم"، بیرۆکەی بەکۆڵهەلگرتنم گۆڕی، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی تردا چووینە ژێر باڵی، خۆی لاقە بریندارەکەی بەرزکردەوە، گەیاندمانە ژێر تاشە بەردەکە. بۆ جاری دوەم فڕۆکەکان ناوچەکەیان بۆردومان کردەوە، بەلام خۆشبەختانە زیانی گیانیمان نەبوو.

کە پێشمەرگەکان بینیان بەزوویی فریایانکەوتم، ماوەی ٤-٥ کیلۆمەتری نێوان ئەو دوو گوندەم بە ڕاکردن بڕیووە، زۆر دڵخۆشبوون، بۆردومانی فڕۆکەکانیان لەبیرچوەوە، ورەیان بەرزبووەوە. حاکم برایم، حاکمی مەڵبەندی

یەک بوو، لەهەموویان دڵخۆشتربوو کە بەزوویی گەیشتمە لایان و لێم پرسینەوە.

لەو رۆژەوە، پەیوەندییەکی دۆستانەم لەگەڵ پێشمەرگەو کادر و بەرپرسانی مەڵبەندی یەک درووستکرد، لەدوای درووستبونەوەی شەڕی نێوان ینک و حکومەتی عێراق، ئەوە یەکەم چالاکی تەندروستیم بوو.

**پسووڵەکان:**

لەنەخۆشخانەکەی سێوسێنان دەستمان بەئیشوو کار کرد، عادل و نەجم، لەپشکنین و چارەسەرکردنی نەخۆش و بریندارەکاندا هاوکارییان دەکردم. دوای ماوەیەک د. حەسەن هەڵەبجەییش پەیوەندی پێوەکردین، وەک پزیشک لەنەخۆشخانەی سێوسێنان کاری لەگەڵ کردم. نەخۆشخانە پێشدەکەوت، نەخۆشەکانی ناوچە رزگارکراوەکانی قەرەداغ سەردانیان دەکردین، چارەسەریان وەردەگرت، چالاکی پێشمەرگە بەردەوامبوو، بریندارى چالاکییەکانمان چارەسەر دەکرد.

لەکاتی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتدا، کاتێک لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی، خولی نەشتەرگەری پزیشکیم دەبینی، ژمارەیەک پسوڵەی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانیم لەگەڵ خۆم هێنابوو، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر لەشاخ رووبەڕووی نەخۆشیەکی کتوپر ببمەوە، نەتوانم چارەسەری بکەم، بەو پسوڵانە نەخۆش و برینداەکان رەوانەی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی دەکەم، وەک ئەوەی ئەو نەخۆشە لەنەخۆشخانەیەکی قەزاو ناحیەکانی پارێزگای سلێمانیەوە، رەوانەی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی کرابێت.

بە هۆی ئەو پسوڵانەوە نەخۆشەکە لەرێگەدا دووچاری گیروگرفت نابێت، یەکسەر دەگاتە نەخۆشخانەی فریاکەوتن. ئەو نەخۆش و بریندارانەی کە بەو پسوڵانە دەمنناردن بۆ نەخۆشخانەکانی سلێمانی، ئامۆژگاریم دەکردن، تا گەیشتنیان بەنەخۆشخانە، ناوی من نەهێنن، ناوی خۆشم لەسەر پسوڵەکان نەدەنوسی، بەڵام پێمدەوتن دوای گەیشتنتان بەنەخۆشخانە سەیری

بارودۆخەکە بکەن، ئەگەر بەگونجاوتان بینی، بڵێن لەناوچە رزگارکراوەکانەوە هاتووین.

چەند نەخۆشێکم بەو شێوەیە رەوانەی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی کرد. جارێکیان لەگوندی بەڵخەی ناوچەی قەرەداغ، ژنێکی نەخۆش سەردانی کردم، بەگونجاوم بینی بەو پسوڵەیە بینێرم بۆ نەخۆشخانەی فریاکەوتن، لەبەرئەوەی گومانم هەبوو دووچاری نەخۆشی ریخۆڵەکوێرە بووبێت، نەخۆشەکە بەسەلامەتی گەیشتبووە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی، نەشتەرگەری ریخۆڵەکوێرەیان بۆ کردبوو، دوای دوو رۆژ، گەڕایەوە بۆ بەڵخە، دوای هەفتەیەک، لەسێوسێنان تەقەڵی نەشتەرگەریەکەم بۆ دەرهێنا.

**بوردومانی سێوسێنان:**

لەنێوان ساڵانی١٩٨٥-١٩٨٦ دا، سوپای رژێمی عێراق، چەندین جار بەفڕۆکەو بەتۆپی دوورهاوێژ وساروخی کاتیۆشا، گوندی سێوسێنانی بۆردومان کرد، جارێکیان فریادی کوڕی حەمەی حاجی سابیر بەپارچەی تۆپ بریندار ببوو، بەپسوڵەیەکی نەخۆشخانە، منداڵە بریندارەکەم رەوانەی نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی کرد، پزیشکەکانی نەخۆشخانە، چارەسەری برینەکەیان کردبوو، رێزیشیان لێگرتبوو.

لەگەرمیانەوە بریندارێکی بەرگری میللیان هێنا بۆ نەخۆشخانە، چارەسەری برینەکەیمان کرد، برینەکەی بەرەو سارێژبوون دەچوو، رۆژێکیان سوپای رژێم لەسنوری دەربەندیخانەوە، دەستی بەبۆردومانی گوندی سێوسێنان کرد، زۆربەی گولەتۆپەکان بەر نەخۆشخانە کەوتن، دوای کۆتایی هاتنی بۆردومانەکە، سەردانی بریندارەکەم کرد، کە گەیشتمە سەری، سەیردەکەم گیانی لەدەستداوە، زۆر سەیرم کرد، پشکنینی وردم بۆکرد، هیچ برینێکی نوێم لەسەر لەشی نەبینی، بۆیە وای بۆچووم کە بەهۆی دەنگ و پاڵپەستۆی هەوای تەقینەوەی بومبەکانەوە، مێشکی یان سیەکانی تەقیبن و گیانی لەدەستدابێت، یان دووچاری جەڵتەی دڵی فراوان بووبێت، بەو هۆیەوە گیانی لەدەستدابێت.

**لاقی عوسمان:**

پێشمەرگەیەکی برینداری تیپی ٥٣ شێروانەیان هێنا بۆ نەخۆشخانە، ناوی عوسمان بوو، خەڵکی کەلار بوو، لاقی بەگولە بریندار ببوو، چەند رۆژێک بەسەر برینداربوونیدا تێپەڕیبوو، لاقە بریندارەکەی رەش ببوەوە، دووچاری گانگرینی وشک هاتبوو، لەگەڵ دکتۆر حەسەن لەسەر بڕینەوەی لاقی بریندارەکە، راوێژمان بەیەکتر کرد، پێمان وابوو دەبێت لاقی ببڕدرێتەوە، لەگەڵ پێشمەرگە بریندارەکەش قسەمان کرد، رەزامەندی لەسەر بڕینەوەی لاقی نیشاندا.

بە هاوکاری دکتۆر حەسەن، بەبەکارهێنانی دەرمانی مۆرفین و بەنجی زایلۆکاین، نەشتەرگەریەکی سەرکەوتوی بڕینەوەی لاقم بۆ کرد، بەبێ گیروگفتی خوێنبەربوون و هەوکردن، ئازاری کاتی و ئازاری درێژخایەن، برینەکەی سارێژ بوو.

دوای راپەڕین، عوسمانم لەنەخۆشخانەی سلێمانی بینییەوە، ئەو منی ناسییەوە، هات بۆ لام، باسی لاق بڕینەوەکەی بۆ گێرامەوە، وتی: دەمێکە بەلاقی دروستکراو، کارو چالاکی ئەنجام دەدەم، بەتەندروستیەکی باشەوە قسەی لەگەڵ دەکردم. کاتی بینینی ئەو پێشمەرگەیە لەدوای راپەڕین، یەکێک لەکاتە خۆشەکانی ژیانم بوو، کە تیادا، تامی سەرکەوتنی سیاسی و سەرکەوتنی پیشەیی خۆمم دەکرد.

**بریندارەکانی حسك:**

بە هۆی شەڕی ناوخۆوە، بەهۆی گفتوگۆی نێوان ینک و حکوومەتی عێراقەوە، پەیوەندی ینک، لەگەڵ هێزە کوردستانییەکان، لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ، بە قۆناغی سست بوون و دابڕان گەیشتبوو. دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراق، دوای سەرکوتکردن و بچوککردنەوەی ئاڵای شۆڕش، ینک وەک هێزیکی تۆکمەی دژبەری حکومەتی بەعس، لەناوچە رزگارکراوەکانی کوردستاندا هاتەوە مەیدان. لەگەڵ هێزە

کوردستانیەکان پەیوەندی نوێکردەوە، لەگەڵ حکومەتی ئێران پەیوەندی درووستکرد.

رۆژێکیان چەند بریندارێکی حسکیان هێنا بۆ نەخۆشخانەی سێوسێنان، لەشوێنی خۆم هەستام، چومە دەرەوە، بەدەستی خۆم بریندارەکانم بردنە ژوورەوە، پشکنینم بۆ کردن، چارەسەرم بۆ دیاریکردن، ماوەیەک لەنەخۆشخانە مانەوە، باری تەندروستیان باشبوو، دوای چاکبوونەوە، بەدڵخۆشی نەخۆشخانەیەن بەجێهێشت.

بەو پێشوازی و هاوکارییەی من بۆ بریندارەکانی حسک، سەرجەم بەرپرس و کادرانی حسک دڵخۆش بوون، محەمەدی حاجی مەحمود لەیادەوەرییەکانی خۆیدا، ئەو پێشوازییەی منی، بەکارێکی ئەرێنی سیاسی باس کردووە، بەهۆکارێکی ئاشتی نێوان حسک و ینکی داناوە، ئەمە لەکاتێکدایە ئەو هەڵوێست و هاوکارییەی من، پێش ئەوەی حزبی و سیاسی بووبێ، پیشەیی و، ئینسانی بووە، هیچ بەرپرسێکی ینک، ئاگاداری نەکردبوومەوە بەو شێوەیە لەگەڵ بریندارەکانی حسکدا بجوڵێمەوە.

**خولی فریاکەوتنی سەرەتایی:**

تا دەهات پزیشک و کارمەندی تەندروستی زیاتر پەیوەندییان بەنەخۆشخانەی سێوسێنانەوە دەکرد، هەندێک پزیشک و کارمەندی تەندروستیش لەسنوری تیپەکانی پێشمەرگەدا دەمانەوە، وەک دکتۆری تیپ کاریان دەکرد. بەڵام لەبەر فراوانبونی چالاکی پێشمەرگە، لەبەر ئابلۆقەی ئابوری و تەندروستی رژێم بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکان، پێویستی زیاترمان بەدەرمان و پزیشک و کارمەندی تەندروستی بوو. بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکورییانە، خولی فریاکەوتنم بۆ ژمارەیەک پێشمەرگەی خوێندەوار کردەوە، سەرەتا داوام لەفەرماندەی تیپەکانی سنوری مەڵبەند کرد، هەر تیپە و دوو پێشمەرگەی خوێندەوار بنێرن، بەمەرجێک ئەو پێشمەرگانە ئارەزووی فێربونییان هەبێت. پاش ماوەیەک دوانزە پێشمەرگە پەیوەندییان

پێوە کردم، لەنەخۆشخانەکەی سێوسێنان دەستم بەوانە وتنەوەی تیوری و کرداری کرد، بابەتێکی خولەکە فێربونی دەرزی لێدان و کانیولا دانان و مغەزی پێدانی نەخۆش بوو، بابەتێکی تری تەداویکردنی برینی نەخۆش بوو، لەگەڵ پێدانی دەرزی ئەنتیبایۆتیک و دەرمانی ئازارشکێن، شارەزاکردنی پێشمەرگەکان بەچەندین نەخۆشی باو، وە چۆنیەتی رەوانەکردنی بریندار بۆ لای پزیشک و نەخۆشخانە.

خولەکەمان بەباشی بەڕێوەدەچوو، بەڵام خواردنمان کەم بوو، ئێوارەیەکیان لەنەخۆشخانە نانمان نەمابوو، بەخوێندکارەکانم وت: بڕۆن وەک فەقێی جاران، لەگوندی سێوسێنان نان کۆبکەنەوە. ئا لەو کاتەدا سوارڕۆیەکی مەڵبەند هاتە بەردەم نەخۆشخانە، سەیرم کرد ئەو سوارڕۆیە پڕە لەئاردو برنج و رۆن، ئازوقەی بەشی کۆمەلایەتی مەڵبەند بوو، بەرپرسی مەفرەزەکەی کۆمەلایەتی پێشمەرگەیەک بوو ناوی هیوا قازانقایی بوو، پێشتر دەمناسی، وتی: دکتۆر ئەگەر ئازووقەتان بەو شێوەیە کەمە، با هەندێک لەم ئازوقەییەی مەڵبەندتان بۆ داگرم، منیش ئەو خوڵقەی هیوام پێخۆشبوو، قبوڵم کرد، لەسوارڕۆکە هەندێک ئازووقەمان داگرت، بۆ ماوەیەک دڵم خۆش بوو.

دوای ئەوە سوارڕۆکە بەرەو گوندی بەلەکجار، بەرە و بارەگای مەڵبەند بەڕێکەوت، هێندەی پێنەچوو هەمان سوارڕۆ، لەبەلەکجارەوە گەڕایەوە، هیوا بەهەڵەداوان و بەشڵەژاویەوە هاتە لام، وتی دکتۆر کاک ئاوات عەبدولغەفوری بەرپرسی کاروباری کۆمەلایەتی تووڕەبووە، لەبەرئەوەی بەبێ ئاگاداری ئەو، ئازووقەم داوە بەنەخۆشخانە، وتوویەتی دەبێت بەزووترین کات بچیت ئازوقەکە بهێنیتەوە. منیش ناچار بووم ئازوقەکەیان بدەمەوە، ئازووقەکە فەردەیەک ئارد و فەردەیەک برنج و تەنەکەیەک رۆن بوو. چاوەڕوانم دەکرد دواتر مەڵبەند هەندێک ئازوقەمان بۆ بنێرن، بەڵام ئەو چاوەڕوانییە ئەنجامی نەبوو.

**سەنگاو ئازاد دەکرێ:**

شەوکەتی حاجی موشیر، بەرپرسی مەڵبەندی یەک بوو، ئامادەکاری بۆ شەڕ دەکرد، مەفرەزەی پزیشکیم ئامادە کرد، بۆئەوەی برینداری شەڕەکە چارەسەر بکەم.

نەخۆشخانەی سسێوسێنان لەسنوری کار و چالاکی تیپی ٥٥ قەرەداغدا بوو، پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ ئاوات قارەمانی فەرماندەی ئەو تیپەدا هەبوو، لەگەڵ تیپی ٥٥ قەرەداغدا بەرەو ناوچەی بازیان بەڕێکەوتین، نەمدەزانی کوێ ئازاد دەکەین، شەوی پێش چالاکیەکە فەرماندەکان لەگوندێک کۆبونەوەیان کرد، منیش لەگەڵیان دانیشتم، تەنها گوێم دەگرت، نەمدەمزانی بەرنامەی ئازادکردنی کوێ دادەنێن، فەرماندەکان باسی کرداری شەڕەکەیان دەکرد، بەڵام ناوی شوێنەکەیان نەدەهێنا.

بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی، لە شارۆچکەی سەنگاو نزیک بووینەوە، مەفرەزەی پزیشکی و جهازی مەڵبەند لەگوندی کربچنەی نزیک سەنگاو بوو. ئەوەی بیری سەرقاڵ دەکردم چۆن نەهێڵم پێشمەرگەیەکی بریندار شەهید ببێت، لەو کاتەدا بیرم لای بریندااری شەڕ بوو، بۆ یەکەم جار ڕۆژنامەنووسێکم لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بینی، کامێرەیەکی ڤیدیۆی بەدەستەوە بوو، خۆی ئامادەکردبوو، لەگەڵ دەستەی یەکەمی هێرشی پێشمەرگەدا وێنە بگرێت، ڕۆژنامەنووسەکەم نەدەناسی، سەرم لەهەڵسوکەوتی سوڕمابوو، دەربارەی ئەو ڕۆژنامەنوسە پرسیارم لەشەوکەتی حاجی موشیر کرد، وتی: ئەوە ڕۆژنامەنوسێکی ئێرانیە، چالاکی ئازادکردنی سەنگاو تومار دەکات.

کە شەڕ دەستیپێکرد، شەوکەت لەبەر چاوی ئێمە ون بوو. لەگەڵ حەمەڕەحیمی جهاز پێکەوە دانیشتین. حەمەڕەحیم جهازەکەی واخستە کار، کۆنترۆڵی تەلەفۆن و جهازی دەزگاکانی ڕژێمی عێراقی کرد، گوێمان لەقسەی بەرپرسانی حکومەت دەگرت، بزانین بەرامبەر هەڵمەتی پێشمەرگە بۆ ئازادکردنی سەنگا و چی دەڵێن، بەڕێوەبەری ناحیەی سەنگاو هاتە سەر خەت، ئاگاداری بەرپرسانی سەرووی خۆی دەکرد، دەیوت: سەنگاو لەلایەن

مخەربەکانەوە هێرشی لەسەرە، داوای هاوکاری لەچەمچەمال دەکرد، داوای هاوکاری لەفەرماندەیەکی سەربازی نزیکی سەنگاو دەکرد، دەیوت: فریام کەون. نە سوپاو نە قایمقایم بەڵێنیان پێنەدا ئەو شەوە فریای بکەون، داوایان لێدەکرد: ورەی بەرزبێت، بەرگری بکات تا رۆژ دادێت.

بەڕێوەبەری ناحیە، کەبینی بەو شەوە کەس فریای ناکەوێت، دەستی بەگلەیی کرد، رووی کردە بەرپرسەکان و وتی: چەند رۆژێک بوو، من هەستم بەوە کردبوو، مخەربەکان هێرش دەکەنە سەر سەنگاو، ئێوەم ئاگادار کردەوە، بەڵام ئێوە بڕواتان بەمن نەکرد، زانیاریەکانی منتان بەهەند وەرنەگرت، ئەوە ئەنجامەکەی بوو.

ئەو گفتوگۆییەی نێوان بەڕێوەبەری ناحیە و بەرپرسەکانی، کاتژمێرێکی نەخایەند، خەریک بوو شەڕ کۆتایی دەهات، هەواڵیان هێنا بەڕێوەبەری ناحیە خۆیداوەبەدەستەوە، ناحیەی سەنگاویش ئازادکرا.

ئازادکردنی سەنگاو، خۆڕادەستکردنی بەڕێوەبەری ناحیە، رووداوێکی خۆش بوو، بەڵام شانبەشانی هەواڵی خۆش، هەواڵی ناخۆشیش هات، یەک لە هەواڵەناخۆشەکان، بەهۆی تەقینەوەی لوغمەوە ژمارەیەک پێشمەرگە شەهید بوون، ژمارەیەکیش بریندار بوون، زۆربەی شەهید و بریندارەکانیش پێشمەرگەی تیپی ٥٥ قەرەداغ بوون.

پێش ئەوەی بچمە ناوچەی قەرەداغ، باسی ئازایەتی پێشمەرگەکانی ناوچەی ئەوبەری سیروانم بیستبوو، کە لە دەرووبەری دەربەندیخان و سنووری قەرەداغ پێشمەرگایەتیان دەکرد، دەمزانی لەشۆڕشی نوێدا، یەکەم رەبایەی سوپای عێراق، لەلایەن مەفرەزەیەکی پێشمەرگەوە گیراوە، سەلامی کوێخا عەزیزی ئەوبەری فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە بوو. ئەو ماوەیەی لەناوچەی قەرەداغ مامەوە، لەنزیکەوە ئازایەتی و دڵسۆزی و رێکوپێکی پێشمەرگە ئەوبەریەکانم بۆدەرکەوت، ژمارەیەک لەشەهیدو بریندارەکانی ئەو شەڕە، خەڵکی ئەوبەری سیروان بوون.

ئەو شەوە مزگەوتەکەی گوندی کربچنەم کرد بەنەخۆشخانەی کاتی، ژمارەیەک برینداریان بۆ هێنام، بریندارەکانم چارەسەر کرد، لەناو

برینداره‌کاندا دو وپێشمه‌رگه به‌سه‌ختی به‌رکه‌وتبوون، یه‌کێکیان لوغم به‌لاقیدا ته‌قیبویه‌وه، هه‌ر ئه‌و شه‌وه له‌ژێر کاریگه‌ری ده‌رمانی په‌سه‌دین و زایلۆکایندا لاقیم بڕییه‌وه، پێشمه‌رگه‌ی تیپی ٥٥ قه‌ره‌داغ بوو، خه‌ڵکی گوندی داری زایینی ناوچه‌ی قه‌ره‌داغ بوو. له‌به‌رئه‌وه‌ی مۆخی ئێسقانه‌کانی تێکه‌ڵی خوێن ببوو، پاش ماوه‌یه‌ک خوێنبه‌ره‌کانی مێشکی گیران، له‌هۆش خۆی چوو، دوای سێ رۆژ شه‌هید بوو.

برینداریکی تریان هێنا، ناوی به‌کر بوو، پێشمه‌رگه‌ی تیپی ٥٥ قه‌ره‌داغ بوو، خه‌ڵکی عه‌ربه‌ت بوو، میزڵدانی بریندارببوو، سۆنده‌ی میزم بۆ دانا، له‌ژێر کاریگه‌ری ده‌رمانی په‌سیدین و به‌نجی زایلۆکاییندا، میزڵدانییم دووریيه‌وه. هه‌ستم ده‌کرد له‌دوای میزڵدانیه‌وه برینی تری هه‌یه، به‌لام له‌به‌ر نه‌بوونی به‌نجی گشتی، نه‌مده‌توانی له‌وه زیاتر سکی بکه‌مه‌وه، دوای ماوه‌یه‌کی که‌م، باری ته‌ندروستی تێکچوو، ناردم بۆ ئێران بۆ ته‌واوکردنی چاره‌سه‌ری، به‌داخه‌وه دوای دوو مانگ له‌ئێران شه‌هید بوو.

**چاڵه نه‌وته‌کانی که‌رکوك:**

له‌پایزی ساڵی ١٩٨٦ دا، شه‌وکه‌تی حاجی موشیر سه‌ردانی سه‌رکردایه‌تی کرد، ده‌یانوت له‌م رۆژانه‌دا ده‌گه‌ڕێته‌وه، تیپی ٥٥ قه‌ره‌داغ ئاماده‌کاری شه‌ڕی ده‌کرد، منیش مه‌فره‌زه‌ی پزیشکیم ئاماده کرد، ئه‌و کات سوارڕۆمان هه‌بوو، ئازادی تیپی ٥٧ سه‌گرمه سوارڕۆیه‌کی بۆناردبووین، ئازاد گرنگی به‌پزیشک و خزمه‌تگوزاری پزیشیکی ده‌دا، له‌به‌رئه‌وه‌ی ده‌رچووی په‌یمانگای پزیشکی بوو.

پڕ به‌سوارڕۆکه ده‌رمان و پێویستی شه‌ڕم پێچایه‌وه، له‌گه‌ڵ پێشمه‌رگه‌کانی تیپی ٥٥ قه‌ره‌داغ، به‌ره‌و ناوچه‌ی بازیان به‌ڕێکه‌وتین، شه‌و گه‌یشتینه گوندی مه‌حمودیه، چاوڕوان بووین شه‌وکه‌تی حاجی موشیر بگه‌ڕێته‌وه، شه‌وکه‌ت گه‌یشت، به‌لام خۆی به‌ته‌نیا نه‌بوو، چه‌ندان تراکتور چه‌ک و ته‌قه‌مه‌نی له‌گه‌ڵ خۆی هێنابوو، نه‌مده‌زانی ئه‌و چه‌ک و ته‌قه‌مه‌نیه چییه؟ له‌کوێ و که‌ی شه‌ڕی پێده‌کرێت، هه‌ر چه‌ک و ته‌قه‌مه‌نی نه‌هێنابوو،

ژمارەیەکی زۆر چەک بەدەستی لەگەڵدا بوو، بەبێدەنگی ملی ڕێگەیان گرتبوو، کە لێیان نزیک بوومەوە، دەرکەوت ئەوانە پاسدارن.

بەرپرسی مەڵبەند لەگەڵ فەرماندە سەربازیەکان کۆبوەوە، من بەشداری کۆبونەوەکەم نەکرد، پاسدارەکانیش بەشداری کۆبونەوەکەیان نەکرد، لەدەرەوەی ئەو ژوورەوە وەستابووم کە کۆبونەوەکەی تێدا دەکرا، بە بەرزبونەوەی دەنگی ئامادەبواندا، بۆمدەرکەوت، لەناو ئامادەبواندا ناڕەزایی هەیە، بەڵام نەمدەزانی ناڕەزایی لەسەر چییە و، کەسی ناڕازی کێیە؟

.

کۆبوونەوە تەواوبوو، لەگوندی مەحمودیەی نزیک ڕێگەی سلێمانی- چەمچەماڵ دەرچووین، بەرەو گوندی قازانقایە و مێوڵی بەڕێکەوتین، بۆ ڕۆژی دوایی خۆم لەناو کۆمەڵێ پاسداردا بینییەوە.

بۆ ئێوارەکەی، لەبازیانەوە بەرەو سەنگاو بەڕێکەوتین، چەند گەلابەیەکمان لە چەک و تەقەمەنی باركردبوو، کە گەیشتینە سەر جادەی سەگرمە، شەوکەتی حاجی موشیر پێیوتم: ئەو پاسدارانە بەرەو رووی سەنگاو ببە، لێرە دووریان بخەرەوە، کەمێک سەرقاڵیان بکە. منیش لەگەڵ پاسدارەکان ڕۆشتم، لەسەر شاخەکەوە ناحیەی سەنگاوم پیشاندان، بەرپرسی هێزی پاسدارەکان ناوی مقەدەم تارانی بوو، نازانم ناوی راستەقینەی بوو، یان ناوی نهێنی بوو؟ ، مقەدەم بەمنی وت:قەت سەردانی ئێرانت کردووە، منیش وتم: نەخێر، تا ئێستا سەردانی ئێرانم نەکردوە، وتی: هیوادارم بتوانی سەردانی ئێران بکەیت، هیوادارم دوای ئەم جەنگە ناڕەوایەی سەدام بەسەریدا سەپاندین، بتوانیت سەردانی ئێران بکەیت، لەخزمەتتدا دەبین. بەو قسانەی نێوان من و مقدم تارانی، بەسەیرکردنی گەرمیان لەسەر شاخی سەگرمەوە، کەمێک کاتمان کوشت.

بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتینە گەرمیان، من نەمدەزانی ئەو هێزە بۆچی کۆکراوەتەوە، لەکوێ شەڕ دەکەین، بەڵام ئەمجارە لەسەنگاو دوورکەوتینەوە، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەم جارە بۆ ڕزگارکردنی سەنگاو نەهاتووین، حەزم دەکرد بزانم چی دەکەین، بەڵام هیچم دەست نەدەکەوت، پرسیارم لەشەوکەت

کـرد؟  وتـم: دەڵێـی ئـەمجارە لەپشـتەوە پـەلاماری سـنگاو دەدەیـن، بەزەردەخەنەیەکی درێژ وەڵامی دامەوە، ئیتر بێدەنگیم لێکرد.

هێزەکـەمان دابەشکرد، بەشێکی ئازادی سـەگرمە سـەرکردایەتی دەکرد، بـەرەو چاڵەنـەوتی جەبـەلبۆر، بەڕێکـەوت، بەشـەکەی تـری هێزەکـە، مـەحمود سـەنگاوی فەرمانـدەی تیپـی ٥١ گـەرمیان سەرپەرشـتی دەکـرد، بـەرەو چاڵەنـەوتی زەمبوور، بەڕێکـەوت. من لەگـەڵ هێزەکـەی مـەحمود سـەنگاوی بـووم، دەرمانـەکانم لەگونـدێکی نزیـک قـادر کـەرەم لـەسـوارڕۆکە داگـرت، یاریدەدەرێکی پزیشکم لەلای دەرمانەکان دانا، ڕێنمایی پێویستم پێدا، قاعدەی کاتیۆشاکەم لەسەیارەکەی خۆم بار کرد، لەگەڵ هێزەکەدا بەڕێکەوتم.

هێزەکـەی ئێمـە لـەنێوان نـاحیەی قادرکـەرم و لەیلانـدا تێپـەڕی، کـە لـەو ناوچەیە نزیـک بوینـەوە، مـەحمود سـەنگاوی وتـی: بـۆ دابینکردنـی ئاسایشـی ڕێگەکـەمان، دەبێـت ڕێگاکـە تاقیبکەینـەوە، خـۆی سـەیارەکەی لێـدەخوری، کڵاشـینکۆفێکی لەتەنیشـت خۆیـدا دانـابوو، ئـەکرەمی بـرای حەمـەرەش ڕەشاشێکی بیکەیسـی بەدەسـتەوە بـوو، لەکورسـی دواوەی لاندکرۆزەکـەدا دانیشـتبوو، منـیش کڵاشـینکۆفێکم بەدەسـتەوە بـوو، لەتەنشـتی مـەحمود سەنگاویەوە دانیشتم. بـەرەو جادەی لـەیلان بەڕێکەوتین، چەنـد کیلۆمـەترێک لەقادر کەرەم دوورکەوتینەوە، سەیری ڕێگاوبانمان دەکرد، لـەپڕ دوو چەکدار هاتنە سـەر ڕێگەمان، من وامزانـی ئەو چەکدارانە جاشـن، خـەریکبوو تەقـەیان لێبکەم، مـەحمود سـەنگاوی وتـی: دکتـۆر ئەوانـە بـرادەری خۆمـانن ئاگاداربـە. پاش ئەوەی ڕێگەکەمان تاقیکردەوە، بۆمان دەرکەوت کەمین لەسـەر ڕێگا نییە، گەڕاینـەوە بـۆ لای هێزەکـە، مـەحمود سـەنگاوی فـەرمانی بەهێزەکـە کـرد بجووڵێت.

ئـەو هێـزەی مـەحمود سـەنگاوی سەرپەرشـتی دەکـرد، دەبـوو بەکاتیۆشـاو هاوەنی ١٢٠ملم، هێرش بکاتە سەر چاڵەنەوتی زەمبوور، ئەو هێزەی ئازادی سـەگرمە سەرپەرشـتی دەکـرد، دەبـو بەهـەمان چـەک، هێـرش بکاتـە سـەر چاڵەنەوتی جەبەلبۆر. ئەم دوو هێزە لەژێر سەرپەرشتی بەرپرسی مەڵبەندی یەکدا بـوون. لەهـەمان کاتـدا هێزێکی مەڵبەنـدی دوو ئامادەکرابوو، بۆئـەوەی

بەساروخی کاتیۆشاو هاوەنی ١٢٠ ملم، چاڵەنەوتەکانی باباگوڕگوڕ بۆردومان بکات، بۆردومانی باباگوڕگوڕ، راستەوخۆ لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە سەرپەرشتی دەکرا. بۆردومانی چاڵەنەوتەکانی کەرکوک، هەر هەمووی لەژێر فەرمانده‌یی نەوشیروان مستەفا دا بوو.

بڕیار بو شەوی ٦-١٠-١٩٨٦ کاتژمێر یەک، لەسێ قوڵەوە، تۆپخانەکانی هێزی پاسدارانی ئێران، بەچاوساخی هێزی پێشمەرگەی ینک، بەساروخی کاتیۆشا و هاوەنی ١٢٠ ملم، هێرشی چاڵەنەوتەکانی کەرکوک بکەن، ئاگر لەنەوتەکە بەربدەن.

شوێنی چالاکییەکەی ئێمە لە شوێنەکانی تر دوورتر بوو، چاڵەنەوتی زەمبوور دەکەوێتە باشووری کەرکوک، نزیک رێگەی بەغدایە، چاڵەنەوتی جەبەلبۆر دەکەوێتە رۆژهەلاتی کەرکوک، چاڵەنەوتی باباگوڕگوڕ دەکەوێتە باکوری کەرکوک. بێجگە لەوەی کە رێگەی هێزەکەی ئێمە دووربوو، لەرێگەدا گەلابە پڕ تەقەمەنییەکەمان چەقی، لەدەرهێنانەوەی گەلابەکەشدا کەمێک دواکەوتین، لەبەر ئەوە هێزەکەی ئێمە لەکاتی دیاریکراودا نەگەییشت، پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسیاری یەکەمی هێزەکەدا کرا بۆ دواخستنی هێرشەکە، هێرشەکە بۆ ماوەی کاتژمێرێک دواخرا. تا کاتژمێر دووی شەو، هێزەکەی ئێمەش هەموو ئامادەکاریەکی بۆ بۆردومانی چاڵەنەوتی زەمبوور تەواوکرد.

کاتژمێر دووی شەو، لەلولەی کاتیۆشا و هاوەنەکانەوە، ئاگربارانی چاڵەنەوتی زەمبوور دەستی پێکرد، سێ قاعدەی هاوەنی ١٢٠ ملم، یەک قاعدەی ساروخی کاتیۆشای دوانزەیی، بۆردومانی چاڵەنەوتی زەمبوریان دەکرد.

ئەو بەرپرسانەی لەو بۆردومانەدا بەشدارییان کرد، مەحمود سەنگاوی فەرماندەی تیپی ٥١ گەرمیان بوو، جەلال جەوهەر رابەر سیاسی تیپی ٥١ گەرمیان بوو، دلێر جاف جێگری فەرماندەی تیپی ٥١ گەرمیان بوو، مام جەلال فەرماندەی یەکێک لەکەرتەکانی تیپ ٥١ گەرمیان بوو.

پاسدارەکان دەستیان بەبۆردومانی چاڵەنەوتەکە کرد، کە گولەتۆپەکان دەتەقین، دەمژماردن و سەیری چاڵەنەوتەکەم دەکرد، بزانم کەی ئاگر

دەگرێت، گولەی هاوەنەکان کورتیان دەهێنا، بەڵام گولەی کاتیۆشاکە باش دەڕۆیشت، سەد گولەی کاتیۆشامان پێبوو، گولەی ٦٠ شەستەمی کاتیۆشاکە، ئاگری بەردایە چاڵەنەوتەکە، دەوروبەری چاڵەنەوتەکەی رووناک کردەوە.

بە ئاگرگرتنی چاڵەنەوتەکە زۆر دڵخۆش بووین، لەبەرئەوەی ئامانجەکەمان پێکا. هێندەی نەبرد سوپای رژێم هاتە دەنگ، بەتۆپی ئینفلاق وەڵامی بۆردومانەکەی دایەوە، بەتۆپ ئاسمانی شوێنەکەی ئێمەی داگرتەوە، تۆپەکە لەسەر سەری ئێمە دەتەقیەوە، بەپارچە بەسەرماندا دەهاتە خوارەوە، لەترسی ئاگربارانەکە، هەندێک لەو پێشمەرگانەی لەگەڵماندا بوون، ویستیان دووربکەونەوە، مەحمود سەنگاوی هاواری لێکردن، لێیان توڕەبوو، ورەی بەرزکردنەوە.

سەرەڕای ئاگربارانی تۆپە ئینفلاقەکانی سوپای رژێم، هێزەکەی ئێمە لەسەر کاری خۆی بەردەوام بوو، هەموو گولە کاتیۆشا و گولە هاوەنەکانی گرتە چاڵەنەوتەکە، بۆ ماوەی دوو کاتژمێر چاڵەنەوتەکەمان بوردومان کرد، خۆمان پێچایەوەو پاشەکشەمان کرد.

لەکاتی گەڕانەوەدا، مەحمود سەنگاوی سەیارەی لێدەخوڕی، من لەتەنشتیەوە دانیشتبوم، دەیوت: سبەینێ تەلەفزیۆنی ئێرانی چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەکات، منیش وتم: بەخوا باشترە چاوپێکەوتن نەکەییت، نەوەک تەلەفزیۆنی ئێرانی وەک پێشمەرگە دیمانەکە نمایش نەکات، وەک پاسدار بماننناسێنێ. ئالەو کاتەدا کە قسەمان دەکرد، لەپشتمانەوە لەڕووی چاڵەنەوتەکەی زەمبوورەوە، گڕێکی زۆر گەورە بەرزبووەوە، دەنگێکی زۆر بەرز بەدوایدا هات، سەرەتا هەموومان شڵەژاین، نەماندەزانی چیی روویدا، دواتر بۆماندەرکەوت کە ئەوە تەنکی چاڵەنەوتەکە بووە تەقیوەتەوە.

بۆ سبەینێ گەیشتینە ناوچەی زەنگنەی گەرمیان، ناوی ئەو گوندەم لەبیر نەماوە کە تییاداماینەوە، لەو گوندە پشوماندا و نانمان خوارد، هەر ئەو رۆژە گەرمیانمان بەجێهێشت، گەڕاینەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ.

ئێوارە لەڕێگەی رادیۆوە، گوێم لەهەواڵەکان گرت، رادیۆی تاران هەواڵەکەی وەک چالاکی سەربازی فەتحی یەکی سوپای پاسداران

بڵاوکردەوە، فەتحەکان ئەو چالاکیانە بوون کە لەڕێگەی قەرارگای رەمەزانی سوپای پاسدارانەوە ئەنجام دەدران، لەهەواڵەکەدا هاتبوو کە چاڵەنەوتەکانی باباگوڕگوڕ و زەمبور بەر هێرشی کوڕەکانمان کەوتن، چاڵەنەوتی زەمبوور بەتەواوی سووتا، چالەنەوتی باباگوڕگوڕ زیانی زۆری بەرکەوت، بەڵام باسی لەزیانی چاڵەنەوتی جەبەلبور نەکرد. پرسیارم کرد بۆچی بۆردومانی چاڵەنەوتی جەبەلبور نەکراوە، وتیان برادەران نەیانتوانیوە شوێنی چاڵەنەوتەکە بدۆزنەوە.

کە لەشەڕەکە گەڕاینەوە، بۆمدەرکەوت لەو کاتەدا من پاسدارەکانم بەرەو سەنگاو بردبوو و لە هێزەکەم دورخستبوونەوە، بەبڕیاری بەرپرسی مەڵبەند، پێشمەرگەکان پڕ بەعەرەبانەیەکی تراکتۆر، گولەتۆپی هاوەنی ١٢٠ یان گلداوەتەوە. دە رۆژێک دوای شەڕەکە، لەگەڵ شەوکەت و ئازادی سەگرمە، هاوەن و گولەتۆپەکانمان برد بۆ بناری شارەزوور، تۆپبارانی جاشەکانی حەمەخانی حاجی دارامان پێکرد، بەڵام هیچ لەو گولەتۆپانە ئامانجی خۆی نەپێکا. لەکاتی بارکردنی هاوەنەکەدا، پشتم وەرگەڕا، تا مانگێک بەئازاری پشتمەوە دەتلامەوە.

**نەخۆشخانە دەکەم بە زیندان:**

مەلابەختیار کەسی یەکەمی ئاڵای شۆڕش بوو، خەڵکی خانەقین بوو، بەهۆی کێشەی ئاڵای شۆڕشەوە زیندانیکرا، وەک تاوانبار سەیردەکرا، لەو کاتەدا هێرشە تیرۆریستیەکانی دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم، لەناو هێزی پێشمەرگەدا بەلووتکە گەیشتبوون، ئەو کەسەی کە ویستی من و برادەرەکانم دەعوەت بکات و لەدەعوەتەکەدا دەرمانخواردمان بکات خەڵکی خانەقین بوو، لەبەرگەڵوش لەبەردەم بارەگاکانی سەرکردایەتی ینک دا، لوغمێک بەنەوشیروان مستەفاو فوئاد مەعسومدا تەقییەوە، دوو پێشمەرگەی خانەقینی بەئەنجامدەری ئەو تاوانە دانران.

بەو هۆیەوە هەڵمەتی رەشکردن و تاوانبارکردنی خانەقینیەکان، لەناو ینکدا دەستی پێکرد، جەبار فەرمان هەولی زۆریدا گومان لەسەر خانەقینیەکان

نەهێڵێت، بەڵام دەرەقەت نەدەهات، هەڵمەتی رەشکردنی خانەقینیەکان، تەنها لەناو ریزی پێشمەرگەدا نەبوو، لەناو جەماوەری ناوچە رزگارکراوەکانیشدا دەنگی دابوەوە. لای خۆمەوە دژی ئەو هەڵمەتە دەوەستامەوە، بەشەڕێکی سیاسی خێڵەکیم دەبینی، لەبەرئەوەی لەنەخۆشخانەو لەناو دامودەزگاکانی تری ینکدا، سەدان کادرو هەزاران پێشمەرگەی خەڵکی خانەقینم دەناسی، کە لەکوردایەتی و ئەخلاق و هەلوێست و قوربانیداندا، نموونەیی بوون.

رۆژێکیان یەکێک لەکارمەندەکانی نەخۆشخانەی سێوسێنان، لەگەڵ گەنجێکی خەڵکی گوند، دووچاری دەمەقاڵێ ببوو، گەنجە سێوسێنانیەکە، سوکایەتی بەکادرەکەی نەخۆشخانە کردبوو، زانیبووی خەڵکی خانەقینە، سووکایەتی بەخەڵکی خانەقینیش کردبوو. کادرەکەی نەخۆشخانە هاتە لام، سکاڵای کرد، منیش بەو رووداوە زۆر نیگەران بووم، پێشمەرگەی پاراستنی نەخۆشخانەم نارد بەشوێن گەنجەکەدا، هێنایان بۆ نەخۆشخانە، هەرچی بشێ و نەشێ بەو گەنجەو بەخەڵکی سێوسێنانم کرد، بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک گەنجەکەم لەژوورێکی نەخۆشخانەکەدا زیندان کرد، بەو توورەبوون و پەرچەکردارەم، دژی ئەو گەنجەی سێوسێنان، وەڵامی ئەو ناهەقیەم دایەوە کە بەرامبەر بەخانەقینیەکان دەکرا.

**نەخۆشخانەی بەلەکجار:**

چەند جارێک سوپای رژێم، بۆردومانی نەخۆشخانەی سێوسێنانی کرد، زیانی گیانی و ماڵی بەر خەڵکی سێوسێنان کەوت، دووجاریش هەوڵی تیرۆرکردنی خۆم و بریندار و کارمەندانی نەخۆشخانە درا، بڕیارماندا نەخۆشخانە لەسێوسێنان بگوێزینەوە، لەنزیک گوندی بەلەکجار، لەبناری قۆپی قەرەداغ، لالۆ عەبدولڕەحمان نەخۆشخانەیەکی نوێی بۆدروستکردین، بەنەخۆشخانەی بەلەکجار ناسرا.

بە تەواوی بیرم نایەت کەی چوینە نەخۆشخانە نوێکە، بەڵام بەنزیکی لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٦ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٧دا بوو، بەجێگیربوونمان لەنەخۆشخانە نوێکەدا، بۆردومانی هێزەکانی سوپای عێراقمان لەکۆڵ بوەوە،

چوونکە ئەو شوێنەی نەخۆشخانەکەی لەسەر دروستکرابوو، لەئەحداسیەی سوپای عێراقدا نەبوو. دوای ئەوەی نەخۆشخانەمان گواستەوە، ژمارەیەک پزیشک و کارمەندی تەندروستی پەیوەندییان پێوەکردین، د. ناسح قەرەداغی، د. جەلال عوسمان، د. ناجح گوڵپی(پزیشکی ڤیتەرنەری) د. مەحمود(پزیشکی ڤیتەرنەری و تورکمانی شیعە مەزهەب)، لەگەڵ ژمارەیەک کارمەندی تەندروستی، بوون بەپێشمەرگە و هاتنە لامان.

نەخۆشخانەی بەلەکجار، لەناو چەند گردۆڵکەیەکی دامێنی شاخەکانی قۆپی قەرەداغ دا بوو، ژمارە و قەبارەی ژووری نوستنی نەخۆش و بریندار، ژووری نەشتەرگەری و تەداوی، ژوری دەرمانخانە، ژوورەکانی تاقیگە و تیشک، بەگوێرەی پێوانەی نەخۆشخانە بناغەیان بۆ دانرابوو، لەبەرئەوەی خۆیشم لەدارشتنی نەخشەی نەخۆشخانەکەدا بەشداریم کرد.

**خەوی وا بە مامجەلالەوە ببینە:**

شەوێک خەوم بەشەوکەتی حاجی موشیرەوە بینی، لەخەوما بەبڕیاری مام جەلال، بەرپرسیارێتی مەڵبەندی لێوەرگیرابووەوە، ڕۆژی دوای خەوەکە، سەردانی بارەگای مەڵبەندم کرد، شەوکەت و عومەر فەتاح لەبارەگای مەڵبەند دانیشتبوون، بەبێ مەبەست، بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریم لەسەر ڕەوشی بەرپرسی مەڵبەند هەبێت، بەپێکەنینەوە وتم: کاک شەوکەت، ئەمشەو خەوێکی وام دیوە، کە خەوەکەم گێڕایەوە، هەردووکیان پێکەنین گرتنی، شەوکەت وتی: ئەگەر ئازای خەوی وا بەمام جەلالەوە ببینە.

تێگەیشتم خەوەکە ڕاستی بوو، بەبڕیاری مام جەلال، شەوکەتی حاجی موشیر بەرپرسیارێتی مەڵبەندی لێوەرگیراوەتەوە، لەشوێنی ئەو قادری حاجی عەلی دانراوە.

چۆن پێشتر بەلادانی جەبار فرمان لەبەرپرسیارێتی مەڵبەند نیگەران بووم، بەهەمان شێوە، بەلادانی شەوکەتیش، لەبەرپرسیارێتی مەڵبەند نیگەران بووم، لەبەرئەوەی ئەو دوو بەرپرسەی مەڵبەند، لەگەڵ نەخۆشخانەو پزیشک و کارمەندانی نەخۆشخانەدا، باش دەجووڵانەوە، دەرمان و پێویستی تری

خزمەتگوزاری تەندرووستیان بۆ دابین دەکردین، منیش پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ هەردووکییاندا هەبوو.

مامجەلال زوو زوو پۆست و پلەی لەبەرپرسەکان وەردەگرتەوە، کەسانی تری لەشوێنیان دادەنا، هۆکاری ئەم بڕیارانەی مامجەلال خۆی دەیزانی، بەڵام بەبڕوای من جەبارفرمان و شەوکەتی حاجی موشیر، لەبەڕێوەبردنی کاروباری مەڵبەندی یەکدا سەرکەوتو بوون.

**هێرشەکانی مەڵبەند:**

شەوکەت لەمەڵبەندی یەک نەما، قادری حاجی عەلی بەرپرسیاری مەڵبەندی وەرگرت، حامید حاجی غالی لە شوێنی مام روستەم، بەرپرسیاری سەربازی مەڵبەندی وەرگرت. کە دەستەی بەڕێوەبەری نوێی مەڵبەند گەیشت، بەرپرسی مەڵبەند بڕیاری کۆبونەوەیەکی فراوانی دا، منیش بەشداری کۆبونەوەکەم کرد، وام دەزانی بەرنامەیەکی نوێیان بۆ بەرەنگاربونەوەی رژێم داناوە، دەیانەوێت کار و چالاکیەکانی مەڵبەند باشتربکەن، کەچی هەموو بەرنامەکەیان، دژایەتیکردنی دەستەی مەڵبەندی پێشوو بوو، لەکۆبونەوەکەدا هێرشی ناڕەوایان کردە سەر بەرپرسانی مەڵبەندی پێشوو.

منیش وەڵامی زۆرێک لەقسەکانیانم دایەوە، حامید حاجی غالی یەک لەو کەسانە بوو، کە هێرشی زۆری دەکرد، بۆیە منیش رووبەڕووی بومەوە، وەڵامی یەکترمان دایەوە.

دوای کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەکە، هێرشی دەستەی نوێی مەڵبەند بۆ سەر نەخۆشخانە دەستی پێکرد، یەکەم هەنگاوی مەڵبەند دژی نەخۆشخانە، ئەو سوارڕۆیەیان لیوەرگرتمەوە کە لەسەردەمی شەوکەتی حاجی موشیردا، تیپی ٥٧ پەنجاو حەوتی سەگرمە بۆ نەخۆشخانەی ناردبوو. رۆژێکیان قادری حاجی عەلی بانگی کردم، وتی: دکتۆرئەو سوارڕۆیەی نەخۆشخانە هی تۆپی ١٠٦، بۆ ئێوە ناشێت، بیدەن بەتیپی ٥١ گەرمیان، بۆ ئەوان سوودی باشتری دەبێت، نازانم پەیمانی دا سوارڕۆمان بۆ دابین بکات یا نا، منیش وتم: باشە، سوارڕۆکەم رادەستی حەمەڕەشی فەرماندەی تیپی ٥١ کرد، بەڵام تا ئەنفال و

کیمیابـاران، تـا کشـانەوەی هێزەکانمـان بـۆ سـەر سـنوور، سـوارڕۆمان پێنەدرایەوە.

دوای ئـەوە بەرپرسـانی نـوێی مەڵبەنـد وتیـان: بینـای نەخۆشـخانەکـەتان گەورەیە، شوێنی تاقیگەو تیشک چۆڵبکەن، بیدەن بەبارەگای تیپی مەڵبەند، بەم داوایـەی مەڵبەنـد رازی نـەبووم، چەنـد جارێـک داواکـەیان دووبـارەکردوە، نیگەران بووم، هەڵوێستم وەرگرت، پێموتن هەر کەسێک بیەوێت نەخۆشـخانە بکـات بـەبارەگا، بـۆ ئـەو مەبەسـتە لێمـان نزیـک بکەوێتـەوە، شـەڕی لەگـەڵ دەکـەین. بـەو هەڵوێسـتە تونـدەی مـن، مەڵبەنـد لەسـەر بڕیارەکـەی خـۆی نەڕۆیشت و پاشگەز بووەوە.

**عەیبێك:**

دوای ئەوەی سوارڕۆکەیان لێوەرگرتمـەوە، رێگـەم نـەدا تیپی مەڵبەند بێتـە ناو بینای نەخۆشخانە، بانگیان کردم بۆ ڕێکخراوی کۆمەڵە. لەساڵی ١٩٨٢ تا ئەو رۆژە، کادری چالاکی کۆمەڵە بووم، لەناوچـەکانی مەنگوڕایـەتی و مەرگـە و سـورداش وشـاربازێڕ و قـەرەداغ، بەباشـی ئـەرکی حـزبیم ئـەنجام دەدا، لەناکۆکیەکانی نێوان کۆمەڵە و ئـالای شۆڕشـدا، دژی ئـالای شـۆڕش چالاکانـە کارم دەکرد.

کـە گەیشـتمە رێکخـراو، حامـدی حـاجی غـالی دانیشـتبوو، دوای سـڵاو و بەخێرهاتن، حامید وتـی: تـۆ زۆر کـوڕی باشـی، دکتـۆری باشـی، پێشـمەرگەی باشی، کۆمەڵی باشـی تـری پێوەپێچـام، بـەڵام یـەک عـەیبت هەیـە، منیش یـەک هەناسـەی قووڵم هەڵکیشا، دووچـاری تـرس و دڵـەراوکێ بـووم، لـەدڵی خۆمـدا دەمـوت: "ئـاخۆ عەیبەکـەی مـن چـی بێـت"؟ ، ئـاخۆ چ تۆمـەتێکیان بـۆ درووستکردبم؟ ، دوای بێدەنگیەک، حامید وتی: عەیبەکەت ئەوەیە زۆر حەزت لەکۆبوونەوەیە، بەرامبەر بەقسەکەی حامید پێکەنین گرتمـی، پشـوویەکم دا و ئوخـەیم کرد. حامید لەسـەر قسـەکانی رۆیشـت، وتـی: دکتـۆر گیـان تـۆ هـەقت چییـە بەسـەر کۆبونـەوە و کـەرتی رێکخسـتنی کۆمەڵـەوە، تـۆ تـەنیا کـاری پزیشکیی بکە، واز لەکاری رێکخستنی کۆمەڵە بێنە، لەو کاتـەدا کـە حامید ئـەو

قسانەی دەکرد، عومەر فەتاح هەمو گیانی خۆی کردبوو بەچاو و گوێ و خستبویە سەر من، تا بزانێت پەرچەکرداری من چیی دەبێت؟ .

دیار بوو ئەو قسانەی حامید دەیکرد، قسەی دڵی عومەر فەتاحیش بوو، لەڕاستیدا دەبوو عومەر فەتاح ئەو قسانەی بکردایە، بەڵام بۆچی خۆی ئەو قسانەی نەدەکرد، نازانم؟ دواتر ئەوەم بیرهاتەوە کە لەکۆبونەوەی مەڵبندیشدا، زۆربەی ئەو قسانەی دژی ئەندامانی مەڵبەندی پێشوو دەکران، هەر حامید دەیکردن، وا لەباتی ڕێکخستنی کۆمەڵەش هەر حامید قسە دەکات، هەر حامید بڕیار دەدات. نازانم هۆکارەکەی ئەوەبوو کە قسەی بەرپرسی بەشی سەربازی مەڵبەند قورسایی هەبوو، لەبڕیاردا سیاسیەکان ڕۆڵیان نییە، یان قادر حاجی عەلی و عومەر فەتاح، حامید بۆ هێرش بەکاردەهێنن، خۆیان لەململانێ دووردەخەنەوە، یان بەرامبەر بەوەی حامید لەهاوسۆزی ئاڵای شۆڕش دوورکەوتبوەوە، ئەو دەسەڵاتەیان پێدابوو.

حامد و عومەر فەتاح، داوایان لێکردم کە دەست لەکاری ڕێکخستن بەربدەم، چیتر وەک کادر کار نەکەم، بەو داواکارییەش ڕازی بووم، دەستم لەچالاکی ڕێکخستن هەڵگرت، وازم لەکەرتی ڕێکخستن هێنا.

بەو شێوەیە لەنەخۆشخانەی بەلەکجار، لەتۆپ و تەیارەی ڕژێم ڕزگارمان بوو، بەڵام لەهێرش و پیلانگێری ناوخۆیی ناو ینک، ڕزگارمان نەدەبوو.

بەدوای هۆکاری ئەو ڕەفتارو هەڵویستانەی ستافی نویی مەڵبەندا دەگەڕام، تا بزانم بۆ بەو شێوەیە لەگەڵ مندا هەڵسوکەوتییان کرد، ئایا ئەوە سیاسەتی سەرکردایەتی ینکە بەرامبەر بەمن؟ مەڵبەندی نوێ جێبەجێی دەکەن، یان داواکاری بەرپرسە ناوچەییەکانی سنوری مەڵبەند بوو؟ یان لەبەر ئەوەبوو، لەکۆبوونەوەی مەڵبەندا، داکۆکیم لەبەرپرسانی پێشووی مەڵبەند کرد؟ .

دوای ماوەیەک بۆمدەرکەوت دوورخستنەوەی من لە کاری ڕێکخستن، سیاسەتی گشتی کۆمەڵەو ینک بووە، بۆ ئەوەی کادر ڕۆڵی لە ناو ریزەکانی پێشمەرگەو جەماوەردا، نەمێنێت، بۆ ئەوەی پێشمەرگە و جەماوەر بیرنەکەنەوە و ڕەخنە نەگرن و دەستە و تاقمی تری وەک ئاش دروستنەکەن.

ئەو هەڵوێستانەی ستافی نوێی مەڵبەند، کاریگەری خراپی لەسەر دڵسۆزی و حەزی من بۆ کارەکەم بەجێنەهێشت، هەر زوو ناکۆکیاکانم لەگەڵ مەڵبەندا وەلانا، هەوڵی جدیم دا نەخۆشخانە بکەمە دەزگایەکی چالاکی مەڵبەندە نوێکەش، پەیوەندییەکی هاوسەنگیش لەگەڵ بەرپرسانی مەڵبەندا درووست بکەم.

**بورجەکەی قەرەداغ:**

زستانی ساڵی ١٩٨٧بوو، مەڵبەند ئامادەکاری بۆ شەڕدەکرد، مەفرەزەیەکی پزیشکیمان لەگەڵ دکتۆر ناسح ئامادە کرد، لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بەڕێکەوت، شەڕی ئەمجارە، لەسەر شاخەکانی نێوان قەرەداغ و سلێمانی بوو، لەو شەڕەدا، پێشمەرگە دەستیان بەسەر چەند رەبایەیەکی سوپای عێراقدا گرت، سوهاد خانەقینی، فەرماندەی کەرت لەتیپی ٥٥ قەرەداغ، بەچەکی ئاربیجی(R P C)، فڕۆکەیەکی کۆپتەری خستەخوارەوە.

ئەگەرچی ئەو شەڕە لەڕووی سەربازی و سیاسی و جەماوەرییەوە گرنگ بوو، نزیک شاری سلێمانی بوو، مۆراڵی خەڵکی کوردستانی بەرزکردەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا، زیانێکی گەورەمان بەرکەوت، چەندان پێشمەرگەی قارەمان شەهید بوون.

یەکێک لەشەهیدەکان جێگری فەرماندەی تیپی ٥٥ قەرەداغ، حەمەسەعیدی حاجی غەریب بوو، خەڵکی ناوچەی شارەزور بوو، حەمەسەعید هاوڕێیەکی نزیکم بوو، بەسەختی برینداربوو، دوای برینداربوونەکەی وتبوی: ئەگەر بمگەیەننە لای دکتۆر فایق شەهید نابم، بەداخەوە دوای ئەوەی لەگۆڕەپانی شەڕەکە دوریانخستبوەوە، شەهید ببوو. کاتێک پێشمەرگەکان ئەو قسەیەی حەمەسەعیدیان بۆ گێڕامەوە، بەتەواوی دڵتەنگ بووم، چەند جارێک گریام. یەک لەشەهیدەکانی تری ئەو شەڕە، هاوڕێیەکی ترم بوو، ناوی ئازاد بوو، فەرماندەی مەفەرەزی تیپی ٥١ گەرمیان بوو، خەڵکی کەرکوک بوو. شەهیدێکی تری ئەو داستانە، سالاری برای سەردار عەبدوڵلا بوو، سالار پێشمەرگەی تیپی ٥٣ شێراونە بوو، خەڵکی کەلار بوو، لەو شەڕەدا بریندار

ببوو، لاقی بەگولە شکابوو، سەرداری برای لەشەڕگەکەوە لەگەڵی هاتبوو بۆ نەخۆشخانەی بەلەکجار، کاتێک سالارم بەبرینداری بینی، بێهۆش بوو، خوێنی زۆری لێ رۆشتبوو، لەوە دەچوو مۆخی ئێسقانە شکاوەکەی، تێکەڵی خوێنی بوبێت و دوچاری جەڵتەی مێشکی کردبێت. سەردار عەبدوڵای برای زۆر بەورەبوو، نەمانتوانی هیچ بۆ برینە سەختەکەی سالار بکەم، لە نەخۆشخانە دوا هەناسەی سپارد و شەهید بوو.

هەر لەو شەڕەدا برینداریکی تریان هێنا، پێشمەرگەی تیپی ٥٥ قەرەداغ بوو، خەڵکی سلێمانیە، پارچەیەک بەر سکی کەوتبوو، ریخۆڵە ئەستوورەی بریندارکردبوو، باری تەندروستی خراپ نەبوو، لەژێر کاریگەری دەرمانی کێتامینیدا، نەشتەرگەریم بۆ کرد، ریخۆڵە بریندارەکەیمان وەک کۆلۆستۆمی هێنایە دەرەوە، نەشتەرگەریەکە سەرکەوتو بوو، دوای ماوەیەک ناردم بۆ ئێران، لەوێ نەشتەرگەری داخستنەوەی کۆلۆستمیان بۆ کرد. سەمەد تا ئێستا لەژیاندا ماوە، لەشاری سلێمانی دەژی.

**ریخۆڵەکوێرە:**

پێشمەرگەیەک دووچاری سک ئێشە هاتبوو، سەردانی نەخۆشخانەی کرد، دوای پشکنین، بۆمدرەکەوت دووچاری نەخۆشی ریخۆڵەکوێرە بووە. هەوڵمدا لەڕێگەی پەیوەندییەکانی مەڵبەندەوە، نەخۆشەکە بنێرم بۆ ناو شار، بۆئەوەی نەشتەرگەری بۆ بکرێت[٣٨]. سەردانی بەرپرسێکی مەڵبەندم کرد، تا لەڕێگەی دۆستانەوە نەخۆشەکە بنێرین بۆ نەشتەرگەری، بەرپرسەکەی مەڵبەند وتی: لەم کاتەدا ناتوانین کار بۆ ئەو نەخۆشە بکەین، هەوڵبدەن خۆتان چارەسەری بکەن. دوای ئەوەی لەمەڵبەند گەڕامەوە، لەگەڵ دکتۆر ناسح و دکتۆر جەلال

---

٣٨ هەندێک سەرۆک جاش و بەرپرسی رژێم، بەنهێنی پەیوەندییان بەهێزی پێشمەرگەوە هەبوو، لەرووی هەواڵگرییەوە سوودمان لێوەردەگرتن، جار جارەش بریندارو نەخۆشمان بۆ دەناردن، ناسنامەی چەکداریان بۆ دەکردن و لەنەخۆشخانەکانی رژێم، چارەسەری برین و نەخۆشیەکانیان بۆ دەکردن.

قسەم کرد، وتم: دەبێت خۆمان نەشتەرگەری ریخۆڵەکوێرەی بۆ بکەین، ئەگینا دەمرێت.

دکتۆر ناسح، بەدەرمانی کیتامین و دەرمانی ڤالیۆم نەخۆشەکەی بەنج کرد، دکتۆر جەلال بوو بەیاریدەدەری نەشتەرگەر و یارمەتیدام، نەشتەرگەریەکەم بۆ کرد، نەشتەرگەرییەکە سەرکەوتوو بوو، ریخۆڵەکوێرەی نەخۆشەکە هەوی کردبوو، ئەگەر نەشتەرگەریمان بۆ نەکردایە، ریخۆڵەکوێرەکەی دەتەقی و دەمرد. ناوی ئەو پێشمەرگەیەم لە بیرنەماوە، خەڵکی شارەزوور بوو، لەئەنفالی دوودا بێسەروشوێن کرا.

**ملازم کەریمی پاسۆك:**

دوای تەواوبوونی خولی شەڕی ناوخۆی ساڵانی ١٩٧٦-١٩٨٦، هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان لەیەک نزیکبوونەوە، زۆربەی حزبەکان بنکەو بارەگایان لەناوچاکانی ژێر دەسەلاتی ینکدا کردەوە. بارەگای پاسۆک لەگوندی تەکیە بوو، رۆژێکیان فرۆکە جەنگیەکانی سوپای عێراق، گوندی تەکیەیان بۆردومان کرد، ملازم کەریم سەلامی بەرپرسی پاسۆک بریندارببوو، دوای کەمێک گەیاندیانە نەخۆشخانە، برینەکەیم بینی، پارچەی ساروخی فرۆکە سکی و ریخۆڵە ئەستوورەی بریندارکردبوو. لەو کاتەدا عومەر فەتاح سەردانی نەخۆشخانەی کرد، پێموت: ئێستە باری تەندروستی خراپ نییە، بەڵام برینداریەکەی گرانە، پێویستی بەنەشتەرگەری گەورە هەیە، دەبێت بەبەنجی گشتی نەشتەرگەری بۆ بکرێت، لای ئێمە پزیشکی بەنجی گشتیمان نییە. عومەر فەتاح وتی: با بیگەیەنینە نەخۆشخانەی بەرگەڵو، لەوێ بەنجی گشتی هەیە، دکتۆر هەڵۆ تازە بووە بەپێشمەرگە، پسپۆری نەشتەرگەری گشتیە، لەوێ نەشتەرگەری بۆ دەکات.

دوای ئەوەی دەرزی ئەنتیبایۆتیک و مغەزی و ئازارکوژم بۆ کرد، یاریدەدەری پزیشک، سیروان عەلی رەزام لەگەڵدا نارد، بەسەیارەکەی عومەر فەتاح بریندارەکەمان گەیاندە نزیک رێگەی سەرەکی سلێمانی تاسڵوجە،

لەوێوە لەسەرپشتی گوێدرێژ گەیاندیانە سنوری دۆڵەڕوتی باکوری سلێمانی، لەوێش بەسوارڕۆ، بریندارەکە گەیەنرابوە نەخۆشخانەی بەرگەڵو.

لەنەخۆشخانەی بەرگەڵو بەنجی گشتی و ژوری تایبەتی نەشتەرگەری هەبوو، هەر کە بریندرەکە گەیشتبوو، دوای ئامادەکاری پێویست، دکتۆر هەڵۆو دکتۆر شوان نەشتەرگەریان بۆ کردبوو. ملازم کەریم کۆلۆنی بریندارببوو، کۆلۆستۆمیان بۆ کرد، پێشمەرگەکانی ینک، دوو بوتڵ خوێنیان بەبریندارەکە بەخشی، ئەو نەشتەرگەریە لەناو خەڵک و پێشمەرگەدا، بەباشی دەنگی دایەوە، ڕاگەیاندنی ینک باسی تێکەڵبوونی خوێنی یەکێتی و پاسۆکی دەکرد، ئەوەیان وەک ئاشتیی یەکجارەکی نێوان هێزە سیاسیەکانی باشوری کوردستان باس دەکرد.

دوای ڕاپەڕین، پاسۆک خۆی هەڵوەشاندەوە، زۆربەی ئەندام و کادرو بەرپرسەکانی، پەیوندییان بەپدک وە کرد، ساڵی ١٩٩٦لە خولی دوای ڕاپەڕینی شەری براکوژیدا، لەشەڕێکی نێوان ینک و پدک دا، لەگوندی زیارەت، لەنزیک سەری ڕەش، ملازم کەریم وەک بەرپرسێکی پدک، لەشەڕی ناوخۆدا، بەگولەی پێشمەرگەکانی یەکێتی شەهید کرا.

**ڕۆڵی نەخۆشخانە لە ئاشتەواییدا:**

لەباسی نەخۆشخانەی سێوسێناندا، دەربارەی چارەسەری بریندارەکانی حسک قسەم کرد، باسی ئەوەم کرد کە بەو پێشوازییەی بریندارەکانی حسک، بەرپرسانی حسک چەندە دڵخۆش بوون، بەو بڕوایە گەیشتن کە ئاشتبونەوە لەگەڵ ینکدا دەکرێت. بریندار بوونی کەریم سەلام، چارەسەرکردنی سەرەتایی لەنەخۆشخانەی بەلەکجاردا، ناردنی بۆ نەخۆشخانەی بەرگەڵو، بەخشینی خوێنی بەرپرسەکانی ینک بەو بریندارە، چارەسەرکردنی و ڕزگارکردنی لەشەهیدبوون، زیاتر پاسۆک و ینک ی لەیەک نزیک کردەوە، برادەرانی پاسۆک متمانەیان بەینک کرد.

پێش ئەوەی حشع لەگەڵ ینک ئاشت ببێتەوە، حشع لەناوچەی قەرەداغ مەفرەزەی پێشمەرگەیان هەبوو، لەشەڕێکدا لەگەڵ سوپای ڕژێمدا، برینداریکیان هەبوو، هاتنە لای من داوایان کرد بریندارەکەیان چارەسەر بکەم، بەوپەڕی گەرمییەوە پێشوازییم لێکردن، بریندارەکەم وەرگرتن، ئەوەی پێویست بو بۆمکرد. ئەو بریندارە ناوی تەوفیق بوو، خەڵکی گوندی بەلەکجاری ناوچەی قەرەداغ بوو. ئەو شێوە هەڵسوکەتەی من و هاوڕێکانم لەگەڵ بریندارەکەی حشعدا، یەکێک لەو هۆکارانە بوو، حشع متمانەی بەینک کردوو ئاشت بوەوە.

دوای ئاشتبونەوە و ڕێکەوتنی ساڵی ١٩٨٦ نێوان حزبەکانی باشوری کوردستان، بەرپرس و کادرو پێشمەرگەکانی پدک، دەهاتنە ناوچەی قەرەداغ، عەبدوڵا ئاغا، برای شەهید فەتاح ئاغا، بەرپرسی سەربازی لقی چواری پارتی بوو، لەبەرئەوەی برای شەهید فەتاح بوو، هەر کە عەبدوڵا ئاغام بینی، خۆمم پێناساند، کردمە هاوڕێیەکی نزیکم، هەرچەند عەبدوڵلا ئاغا لەوێ کەم مایەوە، بەپیلانگێری سەرۆک جاشێک شەهید بوو، بەڵام ئەو پەیوەندییە تایبەتەی من و ئەو، لەبەهێزکردنی ئاشتی دا ڕۆڵی بینی.

ئەکبەر حەیدەر یەک لەپێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلولە، خەڵکی خانەقینە، کە منداڵ بووم، لەگوڵپ ئەکبەر حەیدەرم بە پێشمەرگایەتی دیبوو، دوای ئاشتبوونەوەی ساڵی ١٩٨٦، سەردانی ناوچەی قەرەداغی کرد، دووچاری نەخۆشی بوو، لەنەخۆشخانەی بەلەکجار خەواندم، نەخۆشیەکەی پێویستی بەوەبوو بۆ ماوەیەک لەنەخۆشخانە بمێنێتەوەو دەرمان وەربگرێت، چەند ڕۆژێک لەنەخۆشخانە مایەوە، سەرەڕای ڕێزلێنان، چارەسەری نەخۆشیەکەیمان کرد، کە چاک بووەوە، نەخۆشخانەی بەجێهێشت، سوپاسنامەیەکی جوانی بۆ نووسین.

# ١٠
# دەرمان و
# پێداویستی پزیشکی

یەک لە پێویستیەکانی خەباتی چەکداری، خزمەتگوزاری تەندروستییە، لەشۆڕشی نوێدا، ژمارەیەکی باش پزیشک و کارمەندی تەندروستی، پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، خزمەتگوزاری تەندروستیان پێشکەش کرد، بۆ تەواوکردنی ئەو خزمەتگوزارییە، داوو دەرمان پێویست بوو. سەرچاوەکانی پەیداکردنی دەرمان، لەشۆڕشی نوێدا، بەشێوەیەکی گشتی ئەمانە بوون:

**١. لە ڕێگەی ڕێکخستنی ناو شارەوە:**

یەک لەدیاردە هەرەباشەکانی شۆڕشی نوێ، ژمارەیەک پزیشک و کارمەندی تەندروستی پەیوەندییان بەیەک وە کرد، هەندێکیان بوون بەپێشمەرگە، هەندێکیان وەک ئەندام و کادری چالاکی حزب، لەناو شارەکاندا بەنهێنی مانەوە، کارو چالاکی ڕێکخستنیان بەڕێوەدەبرد، کاری سەرەکی ئەو پێکهاتەیە، کۆکردنەوە و ناردنی دەرمان بوو بۆ هێزی پێشمەرگە.

کاتێـک لەشــار ئەنـدامی کۆمەڵــەبووم، چەنــدانجار بــەنهێنی دەرمــانم کۆدەکردەوە، دەرمانەکـەم دەگەیانـدە ڕێکخەرەکـەم، ئـەویش دەینـارد بـۆ نـاو هێزی پێشمەرگە.

ســاڵانی ١٩٨٢-١٩٨٣لەســەرگەڵو لەنەخۆشـخانەی مەڵبەنـدی دوو بـووم، جـەبار فـەرمان بەرپرســی ڕێکخـراوی سـلێمانی کۆمەڵــەبوو، لــەدابینکردنی دەرمانی نەخۆشخانەی سەرگەڵودا، ڕۆڵی سەرەکی هەبوو.

سـاڵی١٩٨٥-١٩٨٧ لەناوچـەی قـەرەداغ پزیشـک بـووم، ئەنـدامی کـەرتی ڕێکخسـتنی کۆمەڵــەش بـووم، بەرپرسـی پـۆلی جـەماوەر بـووم، پۆلەکـەمان لەســنوری قــەرەداغ و دەربەنــدیخان و ســلێمانی ئەنــدامی هــەبوو، یــەک لــەکارەکانی ئـەو کاتــەم، دابینکردنــی دەرمــان بــوو بـۆ نەخۆشـخانە، داوام لەڕێکخستنی ناو شار دەکرد، دەرمانمان بۆ بنێرن.

ئەو کاتەی من لەقەرەداغ بووم، مـەلا ئەحمـەدی دەلوجـە ئەندام پـۆل بـوو، پەیوەنـدی باشـی لەگـەڵ ڕێکخسـتنی نـاو شـارەکان هـەبوو، ئـەوم ئاگـادار دەکردەوە تـا ڕێخسـتنەکانی نـاو شـار دەرمانمـان بـۆ بنێرن، مـەلا ئەحمـەدیش بەباشی ئەرکی خۆی جێبەجێدەکرد، یـەکێک لـەکارەکانی، پەیداکردنی دەرمـان بـوو. خۆشـک و برایـەک هـەبوون بـەناوی قـادر کۆشـکی و پـوورە جـەیران، ئەندامی چالاکی کۆمەڵەبوون، خەڵکی گوندی کۆشکی ناوچەی قەرەداغ بـوون، لەسلێمانی دەژیـان، یـەک لـەکارە بەردەوامـەکانی قـادر و جـەیران، دابینکردنـی دەرمانی نەخۆشـخانەی مەڵبەندی یـەک بـوو، لـەو ماوەیـەدا لـەپێناو پاراسـتنی ژیانی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکاندا، ژیـانی خۆیانیـان دەخسـتە مەترسیەوە، دەرمانیان بۆ دابین دەکردین.

کاتێک لەنەخۆشـخانەکانی مەڵبەنـدی یـەک بـووم، عومـەر فەتاع بەرپرسـی ڕێکخـراوی سلــێمانی کۆمەڵــەبوو، ئــەو دەرمانــەی ڕێکخســتنی ناوشــار کۆیدەکردنەوە، دەهاتنە بارەگای ڕێکخراو، ڕێکخراو بۆ نەخۆشخانەی دەنارد.

**٢. لە ڕێگەی خزم و دۆستەوە**

هەر پزیشکێک، کارمەندێکی تەندروستی، یان بەرپرس و کادرێک، کەسێکی بــاوەڕپێکراوی دام و دەزگـا تەندروســتیەکانی شــاری بناسـیبایە، لەڕێگـەی

کەسی باوەڕپێکراوەوە، یان لەو کاتەدا کە خزمان سەردانیان دەکردین، هەواڵمان بۆ دۆستە باوەڕپێکراوەکە دەنارد، بڕێک دەرمان بۆ نەخۆشخانە بنێرێت.

لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی ژمارەیەک کەسی باوەڕم پێکراوم هەبوون، لەوانەیە هەندێکیان ئەندامی ڕێکخستن بووبن، بەڵام پەیوەندییان بەمنەوە نەبووبێت، کاتێک بەکەسێکدا هەواڵم بۆ دەناردن، دەرمان و پێویستی پزیشکیم بۆ بنێرن، یەکسەر دەرمان و پێویستیەکانیان بۆ دەناردم.

لەنەخۆشخانەکانی سلێمانی ئەم کەسانە دەرمانیان بۆ دەناردم، مەهدی تاقیگە، ئەحمەد ساڵحی برینپێچ، شەفیقە خانی نێرس، عەبە سمێڵی کارگوزار.

جارێکیان زۆر پێویستمان بەدەرمانی گروپکردنی خوێن بوو، سوهامی خێزانی ئاراسی حەمەلاو لە قەرەداغ سەردانیکردین، سوهامم ڕاسپارد بچێتە سلێمانی، لەوێوە بڕوات بۆ لای مەهدی تاقیگە، داوای دەرمانی گروپکردنی خوێنی لێبکات، سوهام وتی چۆن بڕۆم، دەترسم هاوکاریم نەکات، وتم بڕۆ پێی بڵێ کوێرە و هەقت نەبێت، ئەوە نهێنی نێوان من و مەهدیە. سوهام چوبوو بۆ لای مەهدی، نهێنیەکەی درکاندبوو، مەهدی تێرپێکەنی بوو، لەبەرئەوەی چاوی کزبوو، عەینەکی لەچاودا بوو، سوهامیش کە دیبوی مەهدی چاوی کزە، ئەو پێیدەڵێت کوێرە، تەریق ببووەوە. بەڵام دوای دوو ڕۆژ، سوهام گەڕایەوە، پێداویستیەکانی لەگەڵ خۆی هێنا.

ئەو ماوەیەی لەشاخ پێشمەرگە بووم، کتێبی پزیشکیم پێویستبوو، تا بخوێنمەوە و لەزانستی پزیشکی دانەبڕێم، جارێکیان مەهابادی هاوسەرم بەنهێنی دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی، ڕامسپارد سەردانی دکتۆر تاهر هەورامی بکات، داوای ئەو کتێبەم بۆ بکات، ناوی کتێبەکەم لەسەر پارچەیەک کاغەز بۆ نووسی، مەهاباد چووبوە ماڵی دکتۆر تاهر، داوای کتێبەکەی کردبوو، دکتۆ تاهر کتێبەکەی خۆی بۆ ناردبووم.

هەر کاتێک تارقی برام سەردانی دەکردم، لیستی هەندێک دەرمانی گرنگم بۆ دەکرد، دەموت کە گەڕایتەوە لەگەڵ خۆت ئەو دەرمانانە بێنە، یان بەکەسێکی باوەڕپێکراودا ئەو دەرمانانەم بۆ بنێرە.

**٣. لە چالاکی پێشمەرگەدا:**

هەندێک جار پێشمەرگە بۆ پەیداکردنی دەرمان چالاکی دەکرد، مەفرەزەیەک دەچووە سەر کۆگایەکی دەرمان، بۆ ماوەیەک حەرەسی کۆگاکەی باڵبەست دەکرد، دەستی بەسەر دەرمانی کۆگاکەدا دەگرت، دەرمانەکەی دەگەیاندە نەخۆشخانەی ناوچە رزگارکراوەکان. هەندێ جاریش لەچوارچیوەی چالاکی گشتیدا، پێشمەرگە دەستکەوتی هەمەجۆری دەبوو، وەک چەک و تەقەمەنی و ئازوقە و دەرمان، دەرمانەکان دەنێردران بۆ نەخۆشخانە.

ساڵی ١٩٨٦، دەستمان بەسەر شارۆچکەی سەنگاودا گرت، کۆمەڵیک دەستکەوتی باشمان هەبوو، یەک لەوانە دەستمان بەسەر دەرمانی بنکەی تەندروستی سەنگاودا گرت، دەرمانەکەمان هێنا بۆ نەخۆشخانەی سێوسێنان، چارەسەری سەدان نەخۆش و بریندارمان پێکرد.

بەهاری ساڵی ١٩٨٧، شارۆچکەی قەرەداغ ئازادکرا، دەست بەسەر دەرمان و پیویستیە پزیشکیەکانی شارۆچکەی قەرەداغ دا گیرا، گەینرانە نەخۆشخانەی بەلەکجار، سودی زۆرمان لیوەرگرت.

**٤. لە دەرەوەی کوردستان:**

جار جار دەرمان و پێویستی پزیشکیمان لە ریگەی وڵاتانی دۆستەوە بۆ دەهات، کاتێک پەیوەندیمان لەگەڵ ئیران پێشکەوت، هێرشی کیمیاوی رژێمی عێراق دەستپێکرد، دەرمان و قناعی گازی کیمیاویمان لەئێرانەوە بۆ هات.

دەرمانی برینداەرکان:

لەبەرئەوەی بەبەردەوامی لەشەڕدابووین، بریندارمان زۆربوو، بۆئەوەی برینەکان هەو نەکەن، دەرمانی ئەنتیبایۆتۆکم بۆ بەکاردەهێنان، دەرمانی پەنسلین و جێنتامایسینم بەلاوە باشترین ئەنتی بایۆتیک بوو، پێکەوە بەکارم دەهێنان. بە بەکارهینانی ئەو دوو دەرمانە، هیچ یەکێک لەبریندارەکانم، دوچاری هەوکردنی برین نەهاتن.

دەرمانێکی تر کە بەکارم دەهێنا، دەرمانی کوشتنی ئازار بوو، دەرمانی پەسیدین و مورفینم بۆ دەهات، بۆ ئازار بەکارم دەهێنا، هەندێک دەرمانی تری وەک ئەسپرین و پەراسیتۆڵم، بۆ ئازاری سووک بەکار دەهێنا.

دەرمانی کیتامین، یەک لەو دەرمانانە بوو، لەکاتی نەشتەرگەریدا وەک بەنج بـەکارم دەهێنـا، هەنـدێک جـار برینـداری کتـوپڕ رووی تێـدەکردین، بـۆ نەشـتەرگەری دەرمـانی کێتـامین و دەرمـانی دیازیپـامم تـێکەڵ دەکـرد، نەشتەرگەریمان پێدەکرد، بەدەرمانی کێتامین نەشتەرگەری ریخۆڵەکوێرە و سک کردنەوە و دوورینەوەی دەمارم بۆ نەخۆش و بریندارەکانم کردووە.

بۆ لاق بڕینەو، سوودم لەبەنجی زایلۆکاین و دەرزی پەسیدین و مۆرفین وەردەگرت، بەو دەرمانانە چەندان نەشتەرگەریم کردووە.

یـەک لـەو چارەسـەریانەی تـر، لەسـەردەمی پێشـمەرگایەتیدا سـودم لێوەرگرتـووە، راکێشـانی لاق بـوو، خـەڵکی ناوچـە رزگارکراوەکـان، یـان پێشمەرگە، دوچاری پشت ئێشە دەبوون، نزیکەی ٧-٩ کیلۆ کێشم دەبەست بەدەزگای راکێشانی پێست و ماسولکەوە، لەسەر قەرەوێڵە بەڕاکشاوی بۆ ماوەی ١٠-١٢ رۆژ دەمهێشتنەوە، زۆربەی کات نەخۆشەکە سوودی لەو چارەسەرییە دەبینی.

لەکاتی شەڕ و بۆردوماندا، پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنی لاقیان دەشکا، بێجگە لەوەی کە ئەنتیبایۆتیک و ئازار کوژم بۆ بەکاردەهێنان، لەهەمان کاتدا، لەڕێگەی پێستەوە، یان لەڕێگەی ئێسقانەوە، بەکێشی ٧-٩ کیلۆ، بۆ ماوەی زیاتر لەدوو هەفتە، لاقە شکاوەکەیم رادەکێشا، بۆئەوەی ئێسقانە شکاوەکان شوێنی خۆیان بگرنەوە، لاقی کورت نەبێتەوە، بەڵام ئەنجامی راکێشانەکە بۆ کـورت نـەهێنانی لاقـە شـکاوەکان زۆر سـود بـەخش نـەبوو، هەنـدێک لەپێشـمەرگەکان لاقیـان کـورت دەبـوەوە، دواتـر بەنەشـتەرگەری چارەسـەر دەکران.

**نەخۆشی تر:**

بەشێوەیەکی گشتی، پزیشکی پێشمەرگە چارەسەری نەخۆشی توێژی گەنج و نێرینەی دەکرد، کاتێک کەسە بەتەمەنەکان، ژنان و منداڵان، نەخۆش دەکەوتن، دەیانتوانی بچنە ناو شارو چارەسەری خۆیان بکەن، بۆیە ئێمە لەگـەڵ نەخۆشـی درێژخایـەن، نەخۆشـی ژنـان و منـاڵان، زۆر پەیوەندیـدار نەدەبووین. زۆربەی کات رێنمایی ئەو جۆرە نەخۆشانەم دەکرد سەردانی

نەخۆشخانەکانی شار بکەن، لەوێ چارەسەری نەخۆشیەکەیان بکەن، یان بەنامەی تایبەت نەخۆشەکانم بۆ لای پزیشکی تایبەت دەنارد.

دوو جار روبەڕوی نەخۆشی لەبارچونی هاوسەری پێشمەرگە بوومەوە، بەسەرکەوتویی کورتاجم بۆ کردن.

چەندجارێک منداڵی نەخۆشم بۆ لای پزیشکی پسپۆری منداڵان ناردوە، جارێکیان لەسەرگەڵو، منداڵێکی نەخۆشم نارد بۆ سلێمانی بۆ لای دکتۆر نەجات محەمەد کەریمی پسپۆری منداڵان، زۆر بەگەرمی پێشوازی لەمناڵە نەخۆشەکە کردبوو، نەک هەر پارەی بلیتی پشکنینی لێوەرنەگرتبوو، لەگیرفانی خۆشی دەرمانی بۆ کڕیبوو.

فەرماندەیەکی پێشمەرەگە زۆر هاوڕێم بوو، لەهاوسەرگیریدا دواکەوتبوو، کاتێک هاوسەرگیری کرد، نەیدەتوانی جووت ببێت، هاواری بۆ هێنام، منیش دەرمانم بۆ نووسی، ناردی دەرمانەکەی بۆ هات، بەکاریهێنا، کێشەکەیم چارەسەرکرد، بوو بەخاوەنی چەند منداڵێک، لەو کاتەوە هێندەی تر هاوڕێیتی لەگەڵمدا بەهێزبوو، کە دەکەوتینە گفتوگۆ و ململانێی سیاسیەوەوە، وەک جاران بەرامبەرم نەیدەخوێند، وایدەزانی ئەگەر قسەکانی بەدڵم نەبێت، نیگەرانم بکات، نهێنیەکەی دەدەرکێنم.

**حەبی ڤالیۆم:**

بۆ گالتە، بۆ خۆشکردنی هەوای پێشمەرگایەتی، جار جار دەرمانم بەکاردەهێنا، ساڵی ١٩٨٢ لەسەرگەڵو لەباتی دەرمانی هێورکەرەوەی ڤالیۆم، دەرمانی لازیکسم (LAZIX)بۆ کادرەکەی هاوڕێم بەکارهێنا، تا لەباتی ئەوەی لەکۆبوونەوەدا لەسەر خۆ قسە بکات، میزڵدانی بئاوسێت، تەنگاو ببێت، نەتوانێت قسە بۆ ئامادەبوان بکات.

ساڵی ١٩٨٦ کاتێک لەسێوسێنان بووم، حامدی حاجی غالی هات بۆ لام، وتی:

دکتۆر ئەو دەردە پیسەم بۆ چارەسەر بکە، منیش هەستام دەرمانێکم بۆ نوسی، بۆئەوەی دەردە پیسەکەی گرانتر ببێت، دەردەکەی کوشندە نەبوو،

دەرمانەکـەش مەترسـی لەسـەر ژیـانی دروسـت نـەدەکرد، لەویشـەوە بـۆ ماوەیەک، ئاوو هەوای پێشمەرگایەتیم خۆشکرد.

دوای کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان، ئاوارەی سەقز بووین، مام جەلال لەئەوروپا گەڕابووەوە، لەگەڵ بەرپرسەکانی ینک دانیشتنی دەکرد، دەربارەی ئەنفال پرسیاری لێدەکردن. ڕۆژێکیان عومەر فەتاح مام جەلالی دەعوەت کردبوو، قادری حاجی عەلیش بانگ کرابوو، دیاربوو مام جەلال ویستبووی پرسیار لەقادر و عومەر بکات، قادری حاجی عەلی ترسابوو نەتوانێت وەک پێویست وەڵامی پرسیارەکانی مام جەلال بداتەوە، بۆئەوەی لەسەر خۆبێت، بتوانێت بەبێ هەڵچوون وەڵامی پرسیار و ڕەخنەکانی مام جەلال بداتەوە، پێشمەرگەیەکی ناردبوو بۆئەوەی حەبێکی ڤالیۆمی بۆ بنێرم. حەبی ڤالیۆم بەبڕی ٢-٥ ملیگرام ئارامبەخشە، بەڵام ئەگەر بڕی لەوە زیاتر قوتبدرێت، کەسەکە دەخەوێت، منیش لەباتی حەبی ٢ملگرامی، حەبێکی ١٠ ملیگرامیم بۆ قادری حاجی عەلی نارد، وتم: بە کاک قادر بڵی نیو کاتژمێر پیش گەیشتنی مام جەلال، ئەو حەبە بخوات، قادری حاجی عەلی حەبەکەی خواردبوو، کاتێک مام جەلال گەیشتبوو، قادری بەخەواڵویی بینیبوو، وایزانیبوو نەخۆشە، سەروو دڵی نەگرتبوو، پرسیاری ئەنفالەکانی لێنەکردبوو. بەو شێوەیە قادری حاجی عەلی لەپرسیارو سەرزەنشتەکانی مام جەلال ڕزگاری ببوو.

**دەرزی تیستیستیرۆن:**

دوای ئـەنفال و کیمیابـاران، ئـاوارەی دیـوی ئێـران بـووین، بارەگـای پێشـمەرگە لەسـەر سـنور بـوو، مـاڵی پێشـمەرگە و بەرپرسـەکان لەشـارو شـارۆچکەکانی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان بـوو، زۆربـەی کـات پێشـمەرگە لـەناو شارەکاندا دەمایەوە، ئەو پێشـمەرگانەی خولیـای وەرزشـیان هـەبوو، لەسـەقز، تیپێکی تۆپی پێیان، بەناوی تیپی وەرزشی قەندیل پێکهێنا. مامۆسـتا سـەمەد، سامی هەورامی برای شەهید ئازاد هەورامی، مامۆستا عەدنان کەرکوکی، کە هەرسـێکیان وەرزشـکاری پێشـوی شـاری کـەرکوک بـوون، ئـەو تیپـەیان دامەزراند. کاتێک من لەسنەوە ماڵم گواستەوە بۆ سەقز، لەڕێگەی سامیەوە

پەیوەندیم بەتیپی قەندیلەوە کرد، بۆ مەشق و یاری نافەرمی، لەگەڵ تیپدا یاریم دەکرد، بۆ یارییە فەرمیەکانیش، وەک پزیشکی تیپەکە کارم دەکرد. سامی سەرۆکی تیپ بوو، سەمەد راهێنەری تیپ بوو، عەدنان ئیداری تیپ بوو، منیش پزیشکی تیپ بووم.

یاریکەرەکانی تیپ، بەگوێرەی شارەزایی و لێهاتوویییان، لەتیپ و مەڵبەندەکانی پێشمەرگەوە دەستنیشان دەکران، لەمەهابادەوە، لەمەریوانەوە، لەپاوەوە، پێشمەرگە دەهاتنە سەقز، بەشداری چالاکی تیپەکەیان دەکرد.

تیپی قەندیل، لەگەڵ یەکێتی تۆپی پێی ئێران، پەیوەندی درووستکرد، وەک تیپێکی فەرمی ناسرا، بەشداری چالاکییە وەرزشیەکانی شاری سەقزو کێبرکێکانی رۆژهەڵاتی کوردستانی دەکرد.

چەند جارێک تا کۆتایی کێبرکێکان دەرۆیشتین، بەڵام ئێرانیەکان حەزیان نەدەکرد پلەی یەکەم وەربگرین. جارێکیان لە کێبڕکێیەکدا، لەگەڵ تیپی وەرزشی پیرۆزی سەقز، بۆ یاری کۆتایی ماینەوە، من زۆرم حەز دەکرد ئەو یارییە ببەینەوە، یاریکەرەکانم بانگ کردە ماڵەوە، وتم: وەرن یەکی دەرزییەکتان بۆ دەکەم، بۆئەوەی توانای فیزیکی و ئیرادەی بردنەوەتان بەهیزبێت، تا ئەم یارییە ببەینەوە، بەڵام نابێت لای کەس باسی بکەن. هەموو یاریکەرەکان رازی بوون، تەنها بورهان رازی نەبوو، بورهان پێشمەرگەیەکی خانەقینی بوو، کوڵەکەی پشتی بەرگری تیپ بوو، ئەو وتی دکتۆر من حەز ناکەم دەرزیم لێبدەیت، منیش دەرزیم بۆ ئەونەکرد.

لەدەرمانخانەیەکی سەقز، چەند دەرزییەکی تیستستورون (TESTESTERON)م کڕی، پێش دەستپێکردنی یاری بەدوو کاتژمێرێک، هەر یاریکەرێک، بەماسولکە دەرزییەکم بۆ کرد، کە یاری دەستییێکرد، یاریکەرەکان وەک ئەسپ بازیان دەدا، گۆڵیان دەکرد، یان پەناڵتیان لێدەگیرا، یاریکەرەکانی تیپی پیرۆزی سەقز دەرەقەتیان نەدەهاتن، بەڵام بەداخەوە دادوەری یارییەکە بێلایەنانە لەگەڵ یارییەکەدا نەدەجوولایەوە، گۆڵەکانی ئێمەی بەفاوڵ و ئۆفسساید حساب دەکرد، پەناڵتیەکانیشی بۆ نەدەگرتین. لەکۆتاییدا بەیەک گۆڵ یاریەکەمان دۆڕراند، کاسی دوەمیمان وەرگرت.

# ١١
# کیمیاباران و ئەنفال

کە گفتوگۆی ینک و حکومەتی عێراق کۆتاییهات، گفتوگۆی نێوان ینک و ئێران دەستیپێکرد، ینک لەگەڵ ئێران پەیوەندی ئاساییکردەوە، سوپای پاسدارانی ئێران و هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لە یەک نزیکبوونەوە. لەهەمان کاتدا، بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی ئێران، ینک و پدک یان ئاشت کردەوە، دوای ئەوە هێزە سیاسیەکانی تری باشوری کوردستان، لەگەڵ ینک ئاشتبونەوە.

ئێران هێزە کوردییەکانی لەیەک نزیک کردەوە و ئاشتی کردنەوە، دوای ئەوە، پەیوەندی لەنێوان هیزە کوردییەکان و ئۆپۆزسیۆنی عێراقدا دروست کرد، بەو شێوەیە ئێران توانی بەرەیەکی سیاسی عێراقی ، دژی حکوومەتی عێراق پێکبهێنێت.

لەدروستبوونی شەڕی عێراق - ئێراندا، تا سەرەتای ساڵی ١٩٨٧، هەرێمی کوردستان کەمترین شەڕ و پێکدادانی بەخۆوە بینی، سوپای عێراق لەناوچە سنورییەکانی هەرێمی کوردستان کشایەوە، قورسایی شەڕی عێراق-ئێران،

لەبەرەی شەڕی خواروی عێراق و ئێراندا بوو، تا ئەو کاتە کوردستان مەیدانی شەڕ نەبوو.

ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان ئارام بوون، دەرفەتێکی باشیان بۆ پشودان و پاراستنی سەربازی هەڵهاتووی سوپای عێراق و خۆرێکخستنی هێزی پێشمەرگە رەخساندبوو، هەزاران سەرباز لەبەرەی شەڕی عێراق-ئێران هەڵهاتبوون، لەناوچە رزگارکراوەکانی کوردستاندا خۆیان لەشەڕ دەپاراست.

کە لایەنە سیاسیەکانی باشووری کوردستان ئاشتبوونەوە، لایەنە کوردستانیەکان، لەئۆپۆزسیۆنی عێراق نزیکبوەوە، رێکەوتنی سەربازیان پێکهێنا، بەرەیەکی شەڕ دژی عێراق کە لە کورد و ئۆپۆزسیۆنی عێراق پێکهاتبوو، بە سەرپەرشتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کوردستان کرایەوە. سوپای پاسدارانی ئێران و هێزی پێشمەرگە، لەچەند کردەیەکی سەربازی هاوبەشدا، پەلاماری نەوتی کەرکووکیاندا، پەلاماری شارباژێر و سلێمانیان دا، پەلاماری هەڵەبجەیان دا، بەرنامەی ئازادکردنی قەڵادزێ و دووکانیان دانا.

دەتوانم بڵێم بەهۆی هاوپەیمانی هێزە کوردیەکان و ئێرانەوە، بەرەی شەڕی عیراق-ئێران، لەکوردستاندا کرایەوە، بەو شێوەیە لەباتی ئەوەی لایەنە سیاسیەکانی باشووری کوردستان، شەڕ لەماڵی خۆیان دووربخەنەوە، کوردستان لەشەڕی عێراق-ئێران بپارێزن، دۆزی رەوای گەلی کورد تێکەڵی شەڕی ناڕەوای ئێران-عێراق نەکەن، هەڵەیەکی ستراتیجییان کرد، ئاگری شەڕەکەیان هێنایە ناو ماڵی خۆیان، دۆزی رەوای گەلی کوردیان تێکەڵی شەڕی ناڕەوای عێراق-ئێران کرد. سیاسەتی راست لەو کاتەدا ئەوەبوو، با پەیوەندی سیاسی لە نێوان ینک و حزبەکانی تر و ئێراندا هەبوایە، بەلام نەدەبووایە ئەو پەیوەندیانە، سەری بۆ رێککەوتنی سەربازی و چالاکی هاوبەشی هێزی پێشمەرگە و سوپای پاسداران بکێشایە.

ئیتر ئاسایشی عێراق، تەنیا لەخواروی عێراق و کەنداوەوە، مەترسی لەسەرنەبوو، لەکوردستانیشەوە، هەڕەشە لەئاسایشی عێراق دەکرا، ئەمە وای لەرژێمی بەعس کرد، هەرێمی کوردستان وەک بەرەیەکی شەڕ دابنێت، هێزی

پێشمەرگەی کوردستان، وەک سوپای پاسداران سەیربکات، خەڵکی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان، وەک هاوڵاتی ئێرانی سەیربکات. ئەمە وایکرد، چۆن لەساڵانی رابوردوودا، سوپای رژێم دژی هێزە ئێرانیەکان و خەڵکی ئێران، چەکی کیمیاوی بەکاردەهێنا، لەساڵی ١٩٨٧ بەدواوە، لەهەرێمی کوردستانیشدا، چەکی کیمیاوی دژی پێشمەرگە و جەماوەری کوردستان بەکاربێنێت.

**داستانی رزگاری:**

دەمزانی ێنک بەرنامەی شەڕێکی هەیە، دەمویست پزیشک و کارمەندانی نەخۆشخانە، بەشداری ئەو شەڕە بکەین، هەمو ئامادەکارییەکم کرد، بۆئەوەی وەک مەفرەزەی پزیشکی، لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەندی یەکدا، بەشداری ئەو شەڕە بکەم.

کۆتایی مانگی ئازاری ١٩٨٧بوو، هەواڵم زانی کە هێزەکەی مەڵبەند کۆبوەتەوەو بەرەو سنوری بازیان بەڕێکەوتووە، بڕیارمدا شوێنیان بکەوم، لەگەڵ دوو هاوکارمدا، بەکۆڵەپشتی دەرمانەوە، بەپەلە کەوتینە شوێن هێزەکە، هەر ئەو رۆژە بەهێزەکە گەیشتینەوە. ئاوو هەواو سروشتی ناوچەکە تا بڵێی خۆش بوو، شەو لەنزیک گوندی بارۆیی، بەرەو رێگەی سەرەکی سلێمانی - بازیان بەڕێکەوتین، لەسەر جادەی تاسڵوجە بۆ بەری دۆڵەڕوت پەڕینەوە.

ئەو شەوەی لەڕێگەی سەرەکی نێوان سلێمانی و تاسڵوجە نزیک بووینەوە، سەیری رووناکی گڵۆپەکانی شاری سلێمانیم کرد، بیرم لەلای رێگەی پەڕینەوەو ئەگەری کەمینی دوژمن نەمابوو، هەمو هێزی سەرنجی خۆم ئاڕاستەی رووناکی شار کردبوو، لەدڵی خۆمدا دەموت: ئەوە چەند ساڵە شارم نەدیووە، ئای شاروو ئاوەدانی چەندە خۆشی. بەڵام جارێکی تر بەخۆمم دەوت: ئەگەر ئازادی لەو شارەدا نەبێت، تامی رووناکی و شارستانی وەک ژەهر وایە.

ئەو شەوە بەپەلە، بەبێ کێشە، رێگەی سەرەکی نێوان سلێمانی و تاسڵوجەمان بڕی، پێش ئەوەی دنیا رووناک ببێتەوە، لەناوچەی مەترسیدار

دووركەوتینەوە، گەیشتینە گوندی هەنارانی خوارووی ناوچەی دۆڵەڕووت، بۆ نیوەڕۆ لەگوندی قزلەر ماینەوە، ئێوارەی ئەو ڕۆژە، گەیشتینە سەرگەڵوو بەرگەڵو.

هێزەكانی مەڵبەندی یەک شوێنی تایبەتیان بۆ دەستنیشان كرابوو، منیش بەگوێرەی پەیوەندی كارو دۆستایەتیم، لەسەرگەڵو و بەرگەڵو، سەردانی دۆست و هاوپیشەكانی خۆمم دەكرد و لەلایان دەمامەوە.

كە گەیشتینە بەرگەڵو، هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندەكانی ترم بینی، كە فەرماندە و پێشمەرگەی مەڵبەندی دووی كەركوک و مەڵبەندی سێی هەولێرم بینی، تێگەشتم كە شەڕێكی گەورە بەڕێوەیە، بەڵام لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندەكانی تردا، مەفرەزەی پزیشكی نەهاتبوو، لەبەرئەوەی شەڕەكە لەنەخۆشخانەی بەرگەڵو نزیک بوو، بۆیە برادەرنی مەڵبەندی یەكیش بەپێویستیان نەزانی بوو مەفرەزەی پزیشكییان لەگەڵدابێت، وە داوایان لەمن نەكرد مەفرەزەی پزیشكی ئامادە بكەم.

**حەفتاوپێنج هەزار دینار:**

لەگەڵ بەرپرسانی مەڵبەندی یەک و مەڵبەندی سێ، بەرەو هەڵەدن دەڕۆیشتین، پێشمەرگەیەک هاتە پێشەوە و وتی: كاک كۆسرەت میوانت هاتووە، میوانەكە لەهەولێرەوە هاتبوو، پیاوێكی كامڵی چاكەت و پانتۆڵ لەبەر بوو، دوای سڵاو و هەواڵپرسین، میوانەكە وتی: كاک كۆسرەت ناردبووت بەدوامدا، چووم بۆ بالیسان، لەوێ نەبوویت، وتیان: ڕۆشتوە بۆسەرگەڵو، بۆیە هاتم بۆ ئێرە، خێربوو ناردبووت بەدوامدا؟ . كوسرەت ڕەسوڵی بەرپرسی مەڵبەندی سێ وتی: بەخێربێیت، ناردبووم بەدوادا بۆئەوەی هاوكاری شۆڕش بكەیت، پیاوە دەوڵەمەندەكە وتی بەسەر چاو ئامادەم، هاوكارییەكە چەندە، هەر بەسەرچێوە، بەرپرسی مەڵبەندی سێ وتی: حەفتاو پێنج هەزار دینارمان بۆ بنێرە، میوانەكە وتی: بەسەر چاو، كە گەڕامەوە بۆتان دەنێرم، خواحافیزی كردو لەچاو ونبوو.

لەساڵی ١٩٨٥ بەدواوە، بۆ دابینکردنی کار و چالاکی هێزی پێشمەرگە، سەرکردایەتی یەنک داوای هاوکاری لەسەرمایەدارەکانی کوردستان دەکرد، مەڵبەندی یەک چەندان جار سەرمایەداری شاری سلێمانی بانگ کرد، داوای هاوکاری لێدەکردن، هاوکارییان نەدەکرد، بۆیە هەندێک سەرمایەدریان فڕاندو زیندانیان کردن، سەرمایەدارەکانی دەڤەری سلێمانی زۆر گیربوون، بەزەحمەت هاوکاری پێشمەرگەییان دەکرد، کە ئەو سەرمایەدارەی هەولێرم بینی وا بەئاسانی ئامادەیە ئەو بڕە پارەیە بنێرێت، دووچاری سەرسوڕمان هاتم.

سەرمایەدارەکانی هەولێر، دەستکراوەبوون، هاوکاری باشی مەڵبەندی سێیان دەکرد. بۆیە مەڵبەندی سێ پارەی لەخۆی زیاد دەبوو، زیادەکەی دەنارد بۆ سەرکردایەتی. بەڵام لەسنووری پارێزگای سلێمانی، جاری وا هەبوو مەڵبەند سەرمایەدارێکی سلێمانی بانگ دەکرد، داوای هاوکاری لێدەکرد، کەچی ئامادە نەدەبوو کەمترین هاوکاری بکات، بۆیە مەڵبەند بەسەرمایەدارەکانی دەوت: چۆن هاوکاری شەڕی قادسیەی سەددام دەکەن، دەبێت بەو شێوەیەش هاوکاری ئێمە بکەن، کەچی کەسیان ئامادە نەبوون پێنج هەزار دینار هاوکاری شۆڕش بکەن. دڵنیام بەدە سەرمایەداری سلێمانی، بڕی حەفتاوپێنج هەزار دینار، هاوکاری مەڵبەندیان نەکردوە، کە ئەو سەرمایەدارە هەولێریەم بینی، بەبێ دودڵی، بەبێ ناڕەزایی دەربڕین، ئامادەیی نیشاندا بری حەفتاو پێنج هەزار دینار، هاوکاری پێشمەرگە بکات، زۆر دڵخۆش بووم.

دوای ئەنفال و کیمیاباران، ئاوارەکانی هەڵەبجەو گەرمیان و بادینان، لەئۆردوگا زۆرەملێکانی حکومەتی عێراقدا، لەنزیک هەولێر نیشتەجێ کران، کەسوکاری ئاوارەکان دەیانوت: دەوڵەمەندەکانی هەولێر، زۆر باش هاوکاری خەڵکی لێقەوماوی ئەو ئۆردوگایانەیان کردووە.

**لەگەڵ شۆڕش ئیسماعیل:**

کە چووم بۆ شەڕی داستانی رزگاری، لەسەرگەڵو شۆڕش ئیسماعیلم بینی، ئەو کاتە فەرماندەی تیپی ٤٧ پیرەمەگروون بوو، دەربارەی هۆی کۆکردنەوەی هێزی پێشمەرگە، گرنگی ئەو شەڕەی بەڕێوەیە، پرسیارم لێکرد، وتی: بەتەماین بەپشتیوانی سوپای پاسدارانی ئێران، دژی سوپای عێراق، شەڕێکی گەورە بکەین، شەڕەکە دوو قۆناغە، قۆناغی یەکەم هێزی پێشمەرگە شاخ و گردۆڵکە و ڕێگە ستراتیجیەکانی دەوروبەری سلێمانی کۆنترۆڵ دەکات، لەهەمان کاتدا سوپای پاسداران لەسنور دەپەڕێتەوە، هێزەکانی حکومەتی عێراق، لەچوارتا و ماوەت تێکدەشکێنێت، بەرەو ئەو ناوچانە دێت کە هێزی پێشمەرگە کۆنترۆلی کردوون، بەو شێوەیە ئەو هێزەی سوپای عێراق کە لەناوچەی شاربژێردایە، بەکوژران و بەخۆبەدەستەوەدان بێکاریگەر دەکرێت. لەقۆناغی دووەمدا، هێرش دەکەین بۆ سلێمانی و ئازادی دەکەین.

**لەگەڵ فەرمیدوون عەبدولقادر:**

شەوی پێش دەستپێکردنی شەڕی داستانی رزگاری، لەگەڵ مام ڕۆستەم میوانی فەرەیدون عەبدولقادر بووین، دوای نانخواردن و پشوودان، خاوەن ماڵ و مام ڕۆستەم، لەسەر شەڕەکە دەستیان بەگفتوگۆ کرد، فەرەیدوون زۆر دڵی بەشەڕەکە خۆشبوو، دەیوت: بۆ سبەینێ لەم ناوەدا فڕکان فڕکانێک دەبێت، سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوە، دواتر وتی: کاتێک سوپای پاسداران لەم ناوچەیە نزیک دەبێتەوە، پێشمەرگەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان رادەکەن، فریاناکەون سوارڕۆکانیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن، هەرشتێکیان هەیە بۆ خۆمان بەجێدەمێنێت، سوارڕۆی جوان و مۆدێل بەرزمان دەستدەکەوێت.

بارەگای حزبەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان، لەگوندەکانی دۆلی جافایەتی بوو، لەلایەن حکومەتی عێراقەوە هاوکاری دەکران، سوارڕۆی مۆدێل بەرزی بۆ دەناردن، بەرپرسەکانی ینک چاویان لەسەر ئەو سوارڕۆ نوێیانە بوو، بەئاواتەوە بوون لەو شەڕەدا دەستیان بەسەردا بگرن.

**پیرکە و قەیوان و ئەزمڕ:**

سەرلەبەیانی رۆژی ١٣-٤-١٩٨٧ هێزی پێشمەرگە جووڵا، هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەک بەرەو دۆڵەڕوت بەڕێکەوت، منیش لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەندی یەکدا بووم، گەیشتینە گوندی قزلەر، شێخ جەعفەروتی: دکتۆر تۆ لەگوندی قزلەر بمێنەرەوە، ئەگەر بریندارمان هەبوو، بریندارەکانت بۆ دەنێرین بۆ ئێرە. منیش وتم: ئێرە لەبەرەی شەڕەوە دوورە، تا بریندارەکان دەگەنەلای من، هیلاک دەبن، با بێمە پێشەوە، شێخ جەعفەر بەپێشنیارەکەم رازی بوو، لەگەڵ هێزەکە چوومە پێشەوە، گەیشتمە گوندی پیرکە، لە قوتابخانەکەی گوندی پیرکەدا، نەخۆشخانەی کاتیم کردەوە.

گوندی پیرکە لەڕەبایەکانی سەر شاخی قەیوانەوە نزیک بوو، بەڕۆژ نەماندەتوانی بەناو گوندەکەدا هاتووچۆ بکەین، لەبەرئەوەی لەسەربازگەی ساردلوی کەناری شاری سلێمانی سوپای رژێمەوە دەردەکەوتین. قوتابخانەی گوندەکە بەدووری ٤٠٠-٥٠٠ مەترێک لەچاڵاییەکی باشوری گوندەکەدا بوو، لەسەربازگەکەوە دەرنەدەکەوت، لەژورێکی قوتابخانەکەدا، دەرمان و پێویستیەکانم دانا، بۆ پێشوازی بریندارەکان خۆم ئامادە کرد.

دوای عەسر نزیکەی سەد پاسدارێک لەگوندی پیرکە نزیک بوونەوە، جلی کوردیان لەبەردابوو، چەکی کلاشینکۆفیان پێبوو، پەڕۆیەکی رەش بەناو چاوانیانەوە بەسترابوو، بەرەنگی سپی، لەسەر پەڕۆکە نوسرابو (ئەڵلاهو ئەکبەر)، پاسدارەکان لەناو گردۆڵکەکانی باشوری پیرکەدا خۆیان شاردەوە.

چاوەروان بووین تا کاتژمێر ١٢ شەوی ١٣/١٤-٤-١٩٨٧، لەهەمو بەرەکانی شەڕەوە تەقە دەستیپێکرد، دوای کەمتر لە١٠ دەقیقە، نزیکترین رەبایە، رەبایەکەی کەلکی قەیوان، تەقەی خۆشی لێکرا، تەقەی خۆشی تەقەی سەرکەوتن بوو، دوای ئەوەی پێشمەرگە هێرشی بۆ سەر خاڵێکی دوژمن دەبرد، ئەگەر خاڵەکەی بگرتایە، سەلیەیەک (٣٠) فیشەکی گرداری بەئاسماندا دەتەقاند، دەنگی تەقەکە دەهات، لەهەمان کاتدا فیشەکە گردارەکانیش دەبینران. یەکەم تەقەی سەرکەوتن لەڕەبایەکەی کەلکی قەیوانەوە کرا، ئەو رەبایە لەگوندی پیرکەوە نزیکبوو، بەگوێی خۆم دەنگی تەقەکەم دەبیست،

بەچاوی خۆشم گڕی گولە گڕدارەکانم دەبینین، کاتێک لەنزیکەوە شەڕگەکەم بینی، چاوم بەسەرکەوتنەکان شاد بوو، هەستم بەخۆشیەکی لەڕادەبەدەر دەکرد.

ڕەبایەکەی کەڵکی قەیوان بۆ تیپی ٥٥ قەرەداغ دانرابوو، ئاوات قارەمانی فەرماندەی تیپ، لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەدابوو کە ڕەبایەی یەکەمیان گرت، خۆشباختانە لەو شەڕەدا پێشمەرگەکانی تیپ ٥٥ بێ زیان بوون.

ئەو شەوە هەموو ڕەبایەی سەر لوتکەی شاخەکان ئازادکران، نزیکەی ٥٠ سەربازی سوپای ڕژێم، لەڕەبایەکاندا دەستگیرکران، بۆ ڕۆژی دواتر لەدۆڵەڕوتەوە گواسترانەوە بۆ زیندانی بەرگەڵو.

ئەو پاسدارانەی ئێوارە بینیمن، بۆ گرتنی بورجەکەی ئەزمر دانرابوون، پەلاماری بورجەکەیان دا، بەڵام بورجەکەیان بۆ نەگیرا، زۆربەیان کوژران، تەرمی هەندێکیان بەجێما. ئەو تەرمە بەجێماوانە بوون بەبەڵگەیەکی بینراو، کە سوپای پاسدارانی ئێران، بەشداری شەڕی داستانی ڕزگاری کردوە.

١٩٨٧-٤-١٦/١٥

بە گوێرەی ڕێکەوتنی هێزی پێشمەرگەی ینک و قەرارگای ڕەمەزانی سوپای پاسدارانی ئێران، دەبوو لەو کاتەدا کە هێزی پێشمەرگە ڕەبایەکانی دەوروبەری سلێمانی ئازاد دەکات، سوپای پاسداران لەسەر سنورەوە، هێرش بکات، چوارتا وماوەت و دەوروبەری، لەهێزەکانی سوپای عێراق پاک بکاتەوە، بەڵام سوپای پاسداران لەهیچ شوێنێکەوە نەجوولا، هێرشی نەکرد، هێرشی سەر بورجەکەی ئەزمریش شکستی هێنا، ئیتر سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە، بێ پشتیوان مایەوە، قۆناغی یەکەمی پرۆسەی ئازادکردنی سلێمانی تەواو نەکرا، سلێمانی لەکیمیابارانی ڕژێمی سەدام دوورکەوتەوە، وەک هەڵەبجەی لێنەهات.

قۆناغی یەکەمی داستانی ڕزگاری بەتەواوی جێبەجێنەکرا، قۆناغی دوەمی پرۆسەکەش کاری بۆ نەکرا، سوپای عێراق کەوتەوە خۆی، دەستی بەدژە هێرش کرد، ڕۆژی یەکەم هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا. بۆ ڕۆژی دوایی ١٥-٤، وە شەوی ١٦/١٥ -٤، بۆ یەکەم جار سوپای عێراق، دژی هێزی

پێشـــمەرگەو خـــەڵکی ناوچـــە رزگارکراوەکـــان، چـــەکی کیمیـــاوی بـــەکارهێنا، لەسـەربازگەکانی دەوروبـەری سـلێمانیەوە، بـەتۆپی دوورهـاوێژ وسـاروخی کاتیۆشـا، بۆردومـانی سـەنگەرەکانی هێـزی پێشـمەرگەی کـرد، لەبەرئـەوەی سـەنگەرەکانی هێـزی پێشـمەرگە، لەسـەر لوتکـەی چیاکـان بـوون، چەکـە کیمیاوەکە لەهـەوا قورسـتر بـوو، لەسـەنگەرەکاندا نەدەمایـەوە، بەرەو نزمـایی دەچوو و دەنیشت، بۆیە چەکی کیمیاوی، زیانێکی ئەوتۆی بەهێزی پێشمەرگە نەگەیانـد، هەنـدێک چاوسـوووربوونەوە و تەنگەنەفـەسـی و کۆکـە نـەبێت، تەندروستی پێشمەرگەکان تێکنەچوو.

شانبەشـانی بۆردومـانی چـەکی کیمیـاوی سـەنگەرەکانی هێزی پێشـمەرگە، شـەوی ١٥/١٦-٤-١٩٨٧، سـوپای عێـراق، گونـدەکانی سـەرگەڵو و بەرگـەڵو، قزلـەر، سـنگر، مێولاکـە، مالومـەی بەچـەکی کیمیـاوی بۆردومـان کـرد، لـەو گوندانەدا ژمارەیەک هاولاتی شەهید و برینداربوون، ژمارەیـەک پێشـمەرگەش بەخەستی برینداربوون.

زۆرتـرین زیـانی گیـانی و مـادی بـەر گونـدی قزلـەر کـەوت، بەلام گونـدی پیرکـە بـەر بۆردومـانی کیمیـاوی نەکـەوت، لەبەرئـەوەی زۆر لەسـوپاوە نزیـک بوو، سوپای عێراق لەو بڕوایـەدا نـەبووە بنکـەی پاشـەوەی هێزی پێشـمەرگە، لەگونـدی پیرکـە بێـت، بـەو شـێوەیە حـەزی خـۆم بـۆ نزیکبونـەوە لەشـەڕگەکە، بەتەنگـــەوەهاتنم بـــۆ بریـنـــدارەکان، تـــا بـــەزووترین کـــات بیـــانبینم و زوو چارەسەری برینەکانیان بکەم، بووە هۆی ئـەوەی لەگونـدی قزلـەر نەمێنمـەوە، لەبۆردومانی کیمیاوی راستەوخۆی سوپای عێراق رزگارم بوو.

**مەهدی دیارنەما:**

نازانم شەوی کیمیابارانەکە بوو یـان شـەوێک دواتربـوو، سـامان گـەرمیانی خۆی کرد بەقوتابخانەکەی گونـدی پیرکـەدا، لەخـەو خەبـەری کردمـەوە، وتـی: دکتۆر هەسـتە، چارەسـەری ئـەو بریـندارە بکـە، دەسـتی بریندارەکـەی گرتبوو، پێشی کەوتبوو، منیش لەشوێنی خۆم هەستام، کە لەبریندارەکە وردبوومـەوە، هەستمکرد باش نابینێت، بۆنێکی تایبەتی لێدێت، دوای پشکنین، بۆمدەرکـەوت

بەگازی کیمیاوی خەردەل بریندار بووە، ئەو شەوە ئاسۆی شێخ نوری و خولەکۆمەڵە و دوو کارمەندی تەندروستیم لەگەڵ بوون، داوام لێکردن هاوکاریم بکەن: یەکسەر دەستکێشم لەدەستکرد، بریندارەکەم بردە حەمامی قوتابخانەکە، بە ئاو و سابون شۆردمان، جلەکانیم فڕێدا، وتم: جلەکانی بسوتێنن، دەستێک جلی نوێمان بۆ پەیداکرد و لەبەرمانکرد. بریندارەکە دووچاری دڵ تێکەڵبون و رشانەوە هاتبوو، دەرزی چارەسەری رشانەوەم بۆ کرد، چاوەکانی سورببوونەوەو ئاویان دەکرد، قەترەی حەساسیەتی چاوم کردە چاوەکانی و رێنماییم کرد کە دەبێت رۆژی ٦-٨ چار ئەو قەترەیە بکاتە چاوەکانی، رینماییم کرد کە چی بکات و چۆن لەسەر چارسەری خۆی بەردەوام بێت تا چاک دەبێتەوە.

ئەو بریندارە ناوی مەهدی بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، لەکاتی بۆردومانەکەدا لەگوندی قزلەر خەوتبوو، دەیانوت پێشمەرگەیە، لەو کاتەدا مۆڵەت بووە، هاتووە بۆ گوندی قزلەر تا بنێرێت بەشوێن کەس و کاریدا بێن بۆ لای و بیبینن. دوای ئەوە زۆر بەدوای مەهدیدا گەڕام، نە لەسەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتیدا، نە دوای راپەڕین، مەهدی، یەکەم برینداری چەکی کیمیاویم، نەبینیەوە، ئەگەری بەهێز ئەوەیە مەهدی بۆ چارەسەر گەڕابێتەوە سلێمانی، لەوێ ئەنفال کرابێت.

**شەهید و بریندار:**

لەئازادکردنی رەبایەکانی سوپای رژێمدا، شەهیدو بریندارمان نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی رژێم دەستی بەدژە هێرش کرد، پێشمەرگە بەرگری کرد، شەهیدی و بریندارمان دا. ئەو رۆژانەی لەگوندی پیرکە بووم، ژمارەیەک بریندارم بینی، چارەسەرم کردن، یەک لەبریندارەکان ناوی سەربەست بوو، لەتیپی ٢١ کەرکوک، فەرماندەی کەرت بوو، گولەبەر سکی کەوتبوو، کاری پێویستم بۆکرد، بەعەرەبانەی تراکتۆ بەرەو نەخۆشخانەی بەرگەڵو بەرێمکرد،

عوسمانم لەگەڵ نارد[39] لەنەخۆشخانەی بەرگەڵو، دکتۆر هەڵۆ و دکتۆر شوان نەشتەرگەریان بۆ سەربەست کرد، چارەسەر کراو چاکبوەوە.

مامە قالە، لە تیپی ٥٥ قەرەداغ فەرماندەی کەرت بوو، گولە بەر سکی کەوتبوو، بەهەمان شێوە رەوانەی نەخۆشخانەی بەرگەڵوم کرد، لەوێ کاری نەشتەرگەری بۆ کرا، چاک بوەوە. بێستون سابورئاوایی رابەری سیاسی تیپی ٢٣سورداش بوو، گولە بەر ملی کەوتبوو، لەپێشەوە لێیدابوو لەدواوە دەرچوبوو، بەڵام خۆشبەختانە گولەکە تەنیا ماسولکەکانی ملی گرتبوو، خوێنبەر و خوێهێنەر، دەمارو بۆری هەوا و حەبلی شەوکی، نەگرتبوو. باسی مەترسیەکانی برینداری ملم بۆ بێستون کرد، وتم هێچ مەترسیت نەبێت تۆ سەلامەت دەرچوویت.

حاجی بەکر فەرماندەی مەفرەزە بوو، بەگولەی دۆشکەی دوژمن قۆڵی بریندار بوو، چەندان پێشمەرگەی تر بریندار بوون، ناویانم بیر نەماوە.

لەو شەڕەدا، چەندان شەهیدمان هەبوو، دوو فەرماندەی کەرت شەهیدبون، هەردوکیان ناویان خەبات بوو، خەباتی بچکۆل کە ئێستاش وێنەی لەبەر چاومە، لەتیپی ٢١ کەرکوک بوو، خەڵکی شاری کەرکوک بوو، بەباڵا و کێش بچوک بوو، بەڵام بەڕەوشت و ئازایەتی و ئیدارەدانی شەڕ، تا بڵێی گەورەبوو. خەباتی دووەم لەتیپی ٥٧ سەرگرمە بوو، ئامۆزای ئاوات قارەمانی بوو، من ئەوم نەدیبوو، بەڵام ئەو پێشمەرگانەی کە خەباتیان دەناسی، بەخەباتە بچکۆلی کەرکوک دەیانچواند.

**سەددام دادوەرە:**

بۆ ماوەی چەند رۆژێک، پێشمەرگە بەرگری لەو سەنگەرانە کرد، کە لەشەوی یەکەمی شەڕەکەدا ئازادی کردبوون، بەڵام کە هێرشەکەی سوپای عێراق درێژەی کێشا، پێشمەرگە پاشەکشەی کرد، سوپای عێراق زۆربەی

---

٣٩ عوسمان یەک لەو پێشمەرگە خوێندەوارانە بوو، لەخولی فێربونی فریاگوزاری سەرەتایی سێوسێناندا بەشداری کردبوو، باش لەخولەکە تێگەیشتبوو، لەسەر داوای خۆی لەنەخۆشخانە لەگەڵ خۆم مایەوە.

شوێنەکانی خۆی گرتەوە. لەو کاتەدا مام جەلال داوای لەهێزی مەڵبەندی یەک کرد، بچن بەهانای پێشمەرگەکانی مەڵبەندی سێی هەولێرەوە، کە بەرزاییەکانی گوندی گەورەدێیان بەدەستەوە مابوو، ئەو کاتە مام جەلال لەکوردستان بوو، سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد، ناوی شەڕەکەی نابوو (داستانی رزگاری). مام جەلام لەئازادکردنی سلێمانی بێ هیوا ببوو، بەوە رازی بوو، خاڵە ستراتیجیەکەی گوندی گەورەدێ، بەدەستی هێزی پێشمەرگەوە بمێنێتەوە.

هێزەکەی مەڵبەندی یەک بەدەم داواکەی مام جەلالەوە چوو، منیش لەگەڵ هێزەکەدا بەرێکەوتم، دۆڵەڕوتمان بەجێهێشت و گەیشتینە گەورەدێ، گەورەدێ لەسنوری ئێرانەوە نزیکە، بۆ هاتوچۆ و پەیوەندی لەگەڵ ئێران، گرنگ بوو، بۆیە مام جەلال دەیویست، هەرچی کردوە بەرزاییەکانی گەورەدێ لەدەستی پێشمەرگەدا بمێنێتەوە. بۆ ئەو مەبەستە، لەلایەکەوە هەموو هێزی پێشمەرگەی لەوێ کۆکردەوە و داوای لەفەرماندەکان کرد، دژە هێرش بکەن، ئەو ناوچایە بپارێزن، لەلایەکی ترەوە، داوای لەئێرانیەکان دەکرد، سوپای پاسداران بجوڵێن، هاوکاری پێشمەرگە بکەن. بەلام نە فەرماندەکانی پێشمەرگە، نە ئێرانیەکان هێرشیان نەکرد.

شەو لەنزیک گەورەدێ بووین، فەرماندەکانی پێشمەرگە و بەرپرسی مەڵبەندەکان کۆبوونەوە، منیش ئاگاداری رێنماییەکانی مامجەلال بووم، ئاگاداری وەلامی بەرپرسەکانیش بووم، هەرچەندە مامجەلال داوای شەڕی لێدەکردن، بەپرسەکان لەو باوەڕەدا بوون، بەردەوامیدان بەشەڕ، بێجگە لەوەی ژمارەیەکی زۆرتر شەهیدو بریندار دەدەین، هیچ ئەنجامێکی نابێت. بۆیە ئامادە نەبوون دژە هێرش بکەن، بەشێوەیەکی دبلۆماسی وەلامی مامجەلالیان دەدایەوە، هەوڵیاندەدا دڵی مام جەلال راگرن و هێرشیش نەکەن.

لەو کاتەدا کە هەموومان نیگەران بووین، بەهادینی حەلیم، پێشمەرگەی دەستەی ملازم عومەر، دەستی بەگیرفانی چۆخەکەیدا کرد، گۆڤارێکی دەرهێنا، ئەو گۆڤارە بوو کە لەکاتی گفتوگۆی نێوان ینک و حکومەتی عێراقدا، چاوپێکەوتنی لەگەڵ مام جەلالدا کردبوو، سەرباسی گۆڤارەکە هەرای

نـابوەوە، لەبەرئـەوەی مـام جـەلال وتبـوی: لەگفتوگۆكانـدا، سـەدام حسـەین دادوەرە سەر بە هیچ لایەک  نییە.

بەهادین لـەو كاتـەدا گۆڤارەكـەی دەرهێنا، سەرباسـەكەی خویندەوە، هـەر هـەمووومان دەسـتمان بەپێكـەنین كـرد، بـۆ ماوەیـەكی كـورت بـەهادین دڵـی خۆشكردین، بەهادین پێشمەرگەیەكی قسـە خـۆش بـوو، مـام جـەلال مۆڵـەتی پێدابوو چ كاتێک ویسـتی، لەسـەر كـێ ویسـتی، قسـە بكـات، ناوەكـەی بخاتـە رسـتەوە، دڵـی ئامـادەبووان خـۆش بكـات.  بـەڵام دەرهێنـانی گۆڤارەكـە لـەو كاتەدا، مەبەستی سیاسیشی هـەبوو، بەهادین دەیویست بڵێت، مـام جـەلال تـا دوێنێ وا باسی سەدامی دەكرد، ئەمرۆش ئێرانی هێناوەتە سەر سەدام.

### قزلەر و كانی توو:

لەگەورەدێ هێرش بۆ سـەر سـوپای رژێم نـەكرا، هێزەكـەمان پاشەكشـەی كـرد، گەڕاینـەوە شـوێنی خۆمـان، بـۆ بـەیانی لەپیركـەوە، بـەرەو سـەرگەڵو كشاییینەوە، كە لەگوندی قزلەر نزیک بووینـەوە، بۆنێكی زۆر نـاخۆش دەهـات، نەمانتوانی بچینە ناو گوندەكە، بەتولەرێیەكی پشتی گوندەكەدا هەڵگەڕاین، تـا نزیكی رێگـەی سـەرگەڵو بوینـەوە. لـەو كاتـەدا سـەیری نـاو گونـدم كـرد، ئـەو گونـدەی چەنـد رۆژ لەوەوبـەر، لەهــەرەتی بــەهاردا، خــۆی بـۆ پێشــوازی پێشــمەرگە و كەســو كــاری پێشــمەرگە ئامــادەدەكرد، ئێســتا خانوەكــانی رووخاون، بۆنی كیمیاوی لیدێت، پەپوو لەسەری دەخوێنێ.

هــەر ئـەو رۆژە گەیشـتینە بەرگـەڵو، پـێش ئـەوەی بگەمـە نەخۆشــخانە، دەربـارەی چـەكی كیمیـاوی لەلایـەن پێشـمەرگە و بەرپرسـەكانەوە چەنـدان پرسـیارم لێكـرا، منـیش وەڵامـم دەدانــەوە، لەوەڵامەكانـدا، رەچـاوی ورەی پێشمەرگەم دەكرد.  كە گەیشتمە نەخۆشـخانەی بەرگەڵو، برینداری جۆراو جۆری چـەكی كیمیـاوییم بینـی، ئەوانـەی كـە برینەكـەیان سـوک بـوو، رۆژانـە سـەردانی نەخۆشـخانەیان دەكـرد، تـەداوی دەكـران، بـۆ پشـودان دەگەڕانـەوە بارەگاكـان.  ئەوانەشـی كـە برینییـان قـورس بـوو، لەنەخۆشـخانە كـەوتبوون،

چارەسەر دەکران، لەژێر چاودێری وردا بوون. یەکێک لەبریندارەکان شوانێکی گوندی کانی توو بوو، بەخەستی بریندار ببوو، دکتۆر هەڵۆ پێیوتم ئەو شوانە چۆتە سەر شوێنی تەقینەوەی بۆمبەکە، دەستی لەپارچەی بۆمبە کیمیاویەکە داوە، بۆیە بەخەستی بریندارببووە، هەموو پێستی سوتابوو، کۆئەندامی هەناسەدانی بەخەستی بریندارببوو، بەزەحمەت هەناسەی بۆ دەرا، چاوەکانی بەتەواوی سووتابوون، دوای دوو رۆژ شەهید بوو.

**خۆزگە نەخۆش بوومایە:**

پێش ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ قەرەداغ، قادری حاجی عەلی هەواڵی بۆ ناردم کە مام جەلال دەعوەتی مەڵبەندی یەکی کردووە. لەسەر رووداوەکەی سورداش، ماوەی سێ ساڵ لەمامجەلال دورکەوتبوومەوە، کاتی خۆشی وتبوی ئەبێ ئەو دکتۆر فایقە ١٠٠ سەد کیلۆمەتر لەمنەوە دوور بێت، بەڵام من گرنگیم بەو رووداوە نەدا، تا رادەیەکیش لەبیرم چووبووەوە، وامدەزانی مام جەلالیش لەبیری چۆتەوە.

کاتێک گەیشتینە ماڵی مام جەلال، بەساردی پیشوازی لێکردم، هەستم کرد مام جەلال رقی خۆپیشاندانەکەی سووررداشی لەدڵدا ماوە، لەدڵی خۆمدا وتم: دەبوو نەهاتمایە.

لەکاتی نان خواردندا بەرپرسەکان لەسەر چەکی کیمیاوی پرسیاریان دەکرد، مام جەلال خۆی وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، لەوێشدا حسابی بۆ پیشەکەم نەدەکرد، هێندەی تر نیگەران بووم.

ئاوات قارەمانی بۆ دەعوەتەکەی مام جەلال نەهات، من ئاگادار بووم قادری حاجی عەلی پێیوت، وەرە بۆ دەعوەتەکەی مامجەلال، ئاوات بەتوڕەییەوە وتی: نایەم، نازانم هۆکارەکەی چی بوو. کاتێک مامجەلال هەواڵی ئاوات قارەمانی پرسی، وتی بۆ نەهاتووە، قادری حاجی عەلی وتی: نەخۆشە، منیش لەدڵی خۆمدا دەموت، خۆزگە منیش وەک ئاوات قارەمانی خۆم نەخۆش بخستایە.

**شارۆچکەی قەرەداغ:**

دوای شەڕی داستانی رزگاری، ماوەیەک لەبەرگەڵو مایینەوە، لەو رۆژانەدا کە لەبەرگەڵو بووین، هێزێکی هاوبەشیی پێشمەرگەی کوردستان (ینک، پدک، حسک، حشع، پاسۆک)، بەفەرماندەیی جەبار فەرمان، لەشەڕیکی کەم وێنەدا، ناحیەی قەرەداغیان ئازاد کرد. ئازادکردنی ناحیەی قەرەداغ دوای شکستی داستانی رزگاری، ورەی پێشمەرگەی بەرزکردەوە.

دوای چەند رۆژێک، هێزەکەمان گەڕایەوە بۆ قەرەداغ، پێش ئەوەی بگەینەوە مەڵبەند، لەگوندێکی ناوچەی بازیان فڕۆکەی پیلاتۆس هاتە سەرمان، بەخەستی بۆردومانی کردین، جاری یەکەم قادری حاجی عەلی و مامۆستا ساڵح و من، لەخانویەکی دوو نهۆمدا بووین، ساروخی فڕۆکەکان قاتی سەرەوەی خانوەکەی رووخاند بەسەرماندا، بەڵام خۆشبەختانە برینـدار نەبووین. بۆ جاری دووەم فڕۆکەکان هاتنەوە سەرمان، لەو کاتەدا قادری حاجی عەلی و مامۆستا ساڵح و عەلی حەمەساڵحی برازای مام جەلال، لەناو مەلجەئدا بوون، من و ئاوات قارەمانی و شێخ جەعفەر لەدەرەوەی مەلجئەکەدا بوین، فڕۆکەکان بۆردومانییان دەستپێکرد، شێخ جەعفەر فریاکەوت خۆی کرد بەمەلجەئەکەدا، من و ئاوات قارەمانی فریانەکەوتین، لەدەرەوەی مەلجەئەکە ماینەوە، لەسەر زەوی راکشاین، ئەو جارەش ساروخەکە دو مەتر لەدووری ئێمەوە تەقیەوە، بەڵام زیانمان پێنەگەیشت. بۆ ئێوارەکەی سەرکەوتین بۆ سەر شاخی گڵەزەردە، پێشمەرگە ئامادەکرا بۆ دەستبەسەراگرتنی بارەگای فەوجێکی سوپای رژێم، هێزی پێشمەرگە نەگەیشتە سەر بارەگای فەوجەکە، هەرچی سەربازو ئالیاتی فەوجەکە بوو، بەرەو سلێمانی هەڵهات.

**بزووتنەوەی ئیسلامی:**

لەبەهاری ١٩٨٧دا، حکوومەتی عێراق ژمارەیەک گوندی ناوچەی شارەزووری راگواست، خەڵکی هەڵەبجە دژی سیاسەتی راگواستنی گوندەکان، راپەرینی دەستپێکرد، هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەک تازە

گەشتبوەوە ناوچەی قەرەداغ، قسە لەسەر ئەوە دەکرا، پێشمەرگە پشتیوانی راپەڕینەکە بکات، بەڵام بەداخەوە راپەڕینەکە هێندەی نەخایاند، سوپای عێراق، بەفرۆکە جەماوەری راپەریوی بۆردومان کرد، راپەڕینی سەرکوت کرد. چەندان کەسی مەدەنی شەهیدو بریندار بوون، یەک لەشەهیدەکان ژنێک بوو، ناوی حەفسە مەیکە عەلی بوو، خاڵۆزای باوکم بوو. ئەو کەسانەی برینداربوون، برانە نەخۆشخانە بۆ چارەسەرکردن، سوپای عێراق دەستی بەسەر بریندارەکاندا گرت، زیندە بەچاڵی کردن.

لەئەنجامی ئەو راپەڕینە سەرنەکەوتووەدا، بەشێک لەدانیشتوانی هەڵەبجە، شارەکەیان بەجێهێشت، ئاوارەی ئێران بوون، هەردو زانای ئاینی هەڵەبجە، مەلا عوسمان و مەلا عەلی، لەگەڵ خەڵکی هەڵەبجەدا روویان لە ئێران کرد، ئەو دوو کەسایەتیە و سەدان کەسی تری ئیسلامی، بزوتنەوەی ئیسلامییان درووستکرد، بزووتنەوە دەستی بەخەباتی چەکداری کرد.

پاش ماوەیەک پێشمەرگەی بزوتنەوەی ئیسلامی هاتنە سنوری قەرەداغ، بەرپرسی مەفرەزەی پێشمەرگەکانی بزووتنەوە، مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا عوسمان بوو، ئەو مەلا ئیبراهیمە بوو کە لە قۆناغی خوێندنی ناوەندیدا، لەهەڵەبجە هەوڵی لەگەڵم دەدام پەیوەندی بە ئیسلامیەکانەوە بکەم.

**زانیاری لەسەر چەکی کیمیاوی:**

کاتێک لەڕێگەی رادیۆوە، گوێم لەهەواڵی بەرەکانی شەڕی ئێران -عێراق دەگرت، دەمبیست سوپای عێراق، دژی سوپای پاسدارانی ئێران، چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە، دووچاری دڵەراوکێ دەبووم، دەموت:

ئاخۆ چەکی کیمیاوی چۆن بێت؟ ، ئەگەر سوپای عێراق، دژی هێزی پێشمەرگە چەکی کیمیاوی بەکاربێنێت، چۆن بریندارەکانی ئەو چەکە چارەسەر بکەم؟ . لەلایەکەوە دووچاری دڵەراوکێ دەبووم، لەلایەکی تریشەوە هەوڵم دەدا زانیاری لەسەر چەکی کیمیاوی بەدەستبێنم، بەڵام نەمدەزانی چۆن ئەو زانیاریەم دەستبکەوێت.

من و پزیشکەکانی تری هاوڕێم، هیچ زانیاریەکمان دەربارەی چەکی کیمیاوی نەبوو، لەبەرئەوەی لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی عێراقدا، وانەی چەکی کیمیاوی نەدەخوێنرا، تەنیا پزیشکانی سەر بەوەزارەتی بەرگری عێراق، لەدەرەوەی کۆلێژە پزیشکیەکان، لەنەخۆشخانە سەربازییەکاندا، دەربارەی چەکی کیمیاوی وانەیان دەخوێند.

**دەفتەرەکەی مەحموود:**

سالّی ١٩٨٦عومەر فەتاح بەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵەبوو، بارەگای ڕێکخراو لەبەلەکجار بوو، نەخۆشخانەی مەڵبەند لەسێوسێنان بوو، عومەر فەتاح سەردانی نەخۆشخانەی کرد، وتی: دکتۆر با گەشتێک بەم گوندانەی ناوچەی قەرەداغدا بکەین. لەگەڵ عومەر فەتاح و کافیّ خان و چەند پێشمەرگەیەکدا، لەگوندی سێوسێنانەوە بەرەو گوندی مەسۆیی ڕۆیشتین. کەسێکمان بینی لەپێشمانەوە بەرەو گوندی مەسۆیی دەرۆیشت، سەری بەپاکی تاشرابوو، هێواش ڕێی دەکرد، پێش ئەوەی بیگەمێ، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەو ڕێبوارە سەربازی هەڵهاتووە. کە زۆرتر لێی نزیک بوومەوە، دەفتەرێکی قەبارە گەورەم لەبن دەستیدا بینی، چاکووچۆنیم لەگەڵ کرد، وتم: ناوت چییە؟ لەکوێوەی هاتویت و بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: ناوم مەحمودە، سەربازی هەڵهاتووی سوپای عێراقم، لەبنەڕەتدا خەڵکی گوندی مەسۆیی قەرەداغم، برایەکم لەو گوندەیە، منیش دەچم بۆ لای ئەو. وتم: براکەت ناوی چییە؟ ، وتی ناوی وەهابە، دارتاشە. منیش وەهابم دەناسی، وەهاب ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، کەمێک مەیلی بەلای ئالای شۆڕشدا هەبوو، بەڵام پەیوەندییم لەگەڵی باش بوو.

وتم: ئەی ئەو دەفتەرە چییە؟ وا بەجوانی لەژێر باڵتدا هەڵتگرتوە، وتی: ئەوە وانەی خولی پەروردەی چەکی کیمیاویە، کاتێک لەناو سوپادا سەرباز بووم، خولی پەروەردەی چەکی کیمیاویم دیووە، وانەکانم لەم دەفتەرەدا نوسیوەتەوە، بەشتێکی گرنگم زانیوە، بۆیە لەگەڵ خۆم هێناومە.

بەو قسەیەی مەحمود زۆر دڵخۆشبووم، لە دڵی خۆمدا وتم، وا زانیارییم لەسەر چەکی کیمیاوی دەستکەوت، بە مەحموودم وت: من پزیشکم، لەنەخۆشخانەی مەڵبەند ئیش دەکەم، زۆر پێویستم بەو دەفتەرەی تۆیە، داوات لێدەکەم بیدەی بەمن. مەحمود بەداواکەی من رازی نەبوو، وتی: دەفتەرەکەت نادەمێ هی خۆمە، چەند جارێکیتر لەسەر گرنگی وانە تۆمارکراوەکانی ناو دەفەتەرەکە، قسەم لەگەڵ کرد، بەڵام سوودی نەبوو، مەحمود رازی نەبوو دەفتەری خولی پەروەردەی چەکی کیمیاویەکەیم پێبدات. منیش بەشێوەیەکی کاتی لەداواکردنی دەفتەرەکە کۆڵمدا، بەڵام بیرم لەوەکردەوە، لەرێگەی وەهابی برایەوە ئەو دەفتەرە بەدەستبێنم.

دواتر وەهابی برای مەحمودم بینی، باسی گرنگی دەفتەرەکەی مەحمودم بۆ کرد، وەهاب بڕیاریدا هاوکاریم بکات، دوای چەند رۆژێک وەهاب قەناعەتی بەمەحمودی برای هێنا دەفتەرەکەم بۆ بنێرێت. بەو شێوەیە دوای هەفەتەیەک لەگفتوگۆی نێوان من و مەحموودو وەهاب، مەحمود رازی بوو دەفتەری خولی پەروەردەی چەکی کیمیاوییم بۆ بنێرێت.

دەفتەرەکەی مەحمود، زانیاری باش و تێروتەسەلی، لەسەر چەکی کیمیاوی و جۆرەکانی تێدابوو، زانیاری لەسەر شێوازی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی تێدابوو، زانیاری لەسەر خۆپاراستن و چارەسەری برینداری چەکی کیمیاوی تێدابوو، چەند جارێک وانەکانی ناو دەفتەرەکەم خوێندەوە، سودی زۆرم لێوەرگرت.

نازانم ئەو دەفتەرە خوا ناردی یان رێکەوت بوو، هەرچۆنێک بێت، زانیاری دەفتەرەکە بۆ من بەسوود بوو، لەئەگەری هێرشی چەکی کیمیاویدا، دڵەراوکێ و نیگەرانیم کەم بوەوە، بڕوام بەوە هێنا، ئەگەر سوپای عێراق، چەکی کیمیاوی بەکاربێنێت، دەتوانم بریندارەکان چارەسەر بکەم، ئەو دەفتەرە بۆ من وەک ئەوە وابوو، خولێکی پەروەردەی چەکی کیمیاویم دیبێت، تیایدا دەرچووبم.

**ناميلكە وەرگێڕدراوەكان:**

كە لەگەڵ مەڵبەندی یەک بەشداری شەڕی داستانی رزگاریم كرد، پێش شەڕەكە سەردانی نوسینگەی فەرەیدون عەبدولقادرم كرد، فەرەیدون عەبدولقادر لەناو ڕیزەكانی ینک و كۆمەڵەدا، زۆربەی كات بەرپرسی ڕاگەیاندن و كاری دبلۆماسی بوو. كاتێک چوومە ژێر خەیمەكەی، خەریكی نوسین بوو، سەیری دەوروبەریم كرد، دوو ناميلكە سەرنجیان ڕاكێشم، لەبەرئەوەی لەسەر چەكی كیمیاوی نوسرابوون. فەرەیدون لەزمانی فارسیەوە وەریگێرابون بۆ سەر زمانی كوردی، چاوم پێیاندا خشاند، دەربارەی چەكی كیمیاوی هەندێ زانیاریان تێدابوو، بەڵام وەک دەفتەرەكەی مەحمود پڕ لەزانیاری نەبوون، بەفەرەیدون عەبدولقادرم وت: دەستخۆش بۆ وەرگێڕانی ئەو ناميلكانە، بەڵام بۆچی كۆپیتان بۆ ئێمە نەناردوە، مەبەستم ئەوەبوو ئەو ناميلكانە لەڕاگەیاندنی سەركردایەتی ینک چاپ كراون، بۆچی كۆپیتان بۆ نەخۆشخانەی مەڵبەندەكان نەناردوە، فەرەیدون عەبدولقادر ئەو رەخنەیەی پێخۆش نەبوو، دواتر بەفەرەیدون عەبدولقادرم وت: دەبوو ئێمە، واتە پزیشكانی شۆڕش، وەرگێڕانی ئەو ناميلكانەمان لەئەستۆ بگرتایە، وتی: ئەگەر خەڵک ئەو كارە نەكەن، خۆمان دەیكەین.

سەرەڕای ئەو مشتومڕەی لەگەڵ فەرەیدون عەبدولقادردا كردم، بەخوێندنەوەی ئەو ناميلكانە، زانیارییەكانی خۆمم لەسەر چەكی كیمیاوی زیاتر كرد.

**دكتۆر ناسح و خولی چەكی كیمیاوی**

لەساڵی ١٩٨٧بەدواوە، چارەسەركردنی بریندارى چەكی كیمیاوی، لەئەركە سەرەكیەكانی پزیشكی پێشمەرگە بوو، لەسەر ئەو بنەمایە، دەبوو پزیشكان و كارمەندان دەربارەی چەكی كیمیاوی شارەزایی پەیدابكەن، بۆیە بڕیاردرا ژمارەیەک پزیشک، لەسەركردایەتی و مەڵبەندەكانەوە، بۆ خولی پەروەردە و راهێنانی چەكی كیمیاوی بنێردرێن، لەسەر خۆپاراستن و چارەسەركردنی بریندارى چەكی كیمیاوی شارەزا بكرێن ، مەڵبەندی یەک د. ناسح

قەرەداغیمان نارد، پاش دە ١٠ ڕۆژێک، دکتۆر ناسح لەخولەکە گەڕایەوە، ئەویش زانیاریەکی باشی وەرگرتبوو، ناوەڕۆکی خولەکەی بۆ هەمووومان باس کرد.

**لەهەولێر چارەسەرکران:**

شەوی ١٣/١٤-٤-١٩٨٧، قۆناغی یەکەمی شەڕی داستانی رزگاری دەستپێکرد، دوو ڕۆژ دوای ئەوە، سوپای عێراق، دەستی بە بوردومانی سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە کرد، گوندەکانی دۆڵەرووت و دۆلی جافایەتی، بە چەکی کیمیاوی بوردومانکرد. پێشمەرگە و خەڵکیی گوندەکانی دەوروبەری شەڕگەکە، بەچەکی کیمیاوی بریندابوون، ژمارەیەکیش شەهید بوون. من و دکتۆر هەڵۆو دکتۆر شوان و پزیشکەکانی تری نەخۆشخانەی سەرکردایەتی، بریندارەکانمان بینی و چارەسەرمان کردن. گوندی قزلەر بەگرانی بەر بۆردومانی چەکی کیمیاوی کەوتبوو، ژمارەیەک پێشمەرگە لەقزلەر بەچەکی کیمیاوی بریندارببوون، دوو لەو بریندارانەم بینی و چارەسەرم کردن، بەڵام نە ئەو کاتەی لەپیرکە بووم، نە ئەو کاتەی لەنەخۆشخانەی بەرگەڵو بووم، بریندارنی مەدەنی گوندی قزلەرم نەبینی. دوای ڕاپەڕین کە گەڕامەوە سلێمانی، دۆستێکم باسی برینداری چەکی کیمیاوی گوندی قزلەری بۆ کردم، وتی ئەو ڕۆژەی بریندارەکانی گوندی قزلەریان هێنا بۆ نەخۆشخانە، من لەنەخۆشخانەی هەناوی سلێمانی بووم، کە پزیشکی ئێشکگر زانی برینداری چەکی کیمیاوی داخلی نەخۆشخانە بوون، چارەسەری نەکردن، بەتەلەفۆن ئاگاداری ئەمنی سلێمانی کرد، ئەمن هات بریدنارەکانی برد و بێسەروشوێنی کردن.

لەهەمان کاتدا، ڕۆژانی ١٥، ١٦-٤-١٩٨٧، سوپای عێراق، گوندەکانی سنوری مەڵبەندی سێی ناوچەی خۆشناوەتی، بالیسان و شێخ وەسانان و دەوروبەری، بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کرد. بریندارو شەهیدەکانی دەڤەری خۆشناوەتی، هەرە زۆرینەیان لەخەڵکی مەدەنی ناوچەکە بوون، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا، هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی سێ لەشەڕی داستانی

رزگاریدا بوو، پێشمەرگە بەر هێرشی چەکی کیمیاوی نەکەوتبوو. لەو کاتەدا دکتۆر زریان لەسنوری مەڵبەندی سێ بوو، بریندارەکانی چەکی کیمیاوی ئەو ناوچەیەی، چارەسەر کردبوو. ژمارەیەک لەبریندارەکان چوبوون بۆ هەولێر، بەنهێنی لەنەخۆشخانەکانی شاری هەولێر چارەسەر کرابوون. دوای راپەڕین دکتۆر محەمەد خۆشناو (وەزیری تەندروستی حکومەتی هەرێم)ئەمەی دەربارەی بریندارەکانی چەکی کیمیاوی خۆشناوەتی بۆگێڕامەوە، وتی: کاتی کیمیابارانی ساڵی ١٩٨٧، من خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بووم، لەبەشی هەناوی نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر، لەژێر سەرپەرشتی دکتۆر حەمەنەجم جاف وانەم دەخوێند، ئەو رۆژەی بریندارەکانی کیمیابارانی ناوچەی خۆشناوەتیان هێنان بۆ نەخۆشخانە، دکتۆر حەمەنەجم جاف ئێشکگربوو، بریندارەکانی داخلی نەخۆشخانە کرد، وەک نەخۆشی رەبۆ (ASTHMA)چارەسەری کردن، ئەمنی هەولێر هات بۆ نەخۆشخانە، بەدوای ئەو بریندارانەدا دەگەڕا کە لەناوچەی خۆشناوەتیەوە هێنرابوون، وتی: دکتۆر حەمەنەجم بەئەمنەکانی وت: برینداری چەکی کیمیاوی نەهاتۆتە نەخۆشخانە، ئەمنەکان بڕوایان بەقسەی دکتۆر کردو نەخۆشخانەیان بەجێهێشت. دکتۆر محەمەد خۆشناو دەیوت: دوای ماوەیەک بریندارەکان باری تەندروستیان باشبوو، لەنەخۆشخانە دەرچوون.

هەفتەیەک تا دە رۆژ دوای شەڕی داستانی رزگاری، شەڕی رزگارکردنی شارۆچکەی قەرەداغ دەستیپێکرد، سوپای رژێم دژی هێزی پێشمەرگەو خەڵکی ناوچەی قەرەداغ، چەکی کیمیاوی بەکارهێنا. ژمارەیەک پێشمەرگەو خەڵکی مەدەنی، لەگوندەکانی داری زاین و تلەزەیت و نەوتی بریندار بوون. لەو کاتەدا دکتۆر ناسح لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بوو، بریندارەکانی چارەسەر کردبوون، دوای ماوەیەک لەشەڕی داستانی رزگاری گەڕامەوە، ژمارەیەک برینداری چەکی کیمیاوی ناوچەی قەرەداغم بینی و چارەسەرم کردن.

**خەردەل:**

ئەو گازە کیمیاویەی لەبەهاری ساڵی ١٩٨٧ دا، دژی پێشمەرگەو خەڵکی مەدەنی بەکارهات، گازی خەردەل بوو، لەو بریندارانەی لەژێر چاودێری پزیشکانی پێشمەرگەدا بوون، شوانەکەی گوندی کانی تو شەهید بوو، ژمارەیەک برینداری گوندی بالیسان و شێخ وەسانان شەهید بوون.

خەردەل مادەیەکی کیمیاویە کوشندەیە، بەر هەر کەسێک بکەوێت، چاکبونەوەی زەحمەتە، خەردەل بەدوو شێوە بەرکەوتوەکە برییندار دەکات، راستەوخۆ بەرکەوتووەکە بریندار دەکات، برینێکی درێژخایەن لەسەر پێست، چاو، یان لەبۆریەکانی هەناسەداندا، دروستدەکات، ئەو برینە چاک بونەوەی بۆ نییە، برینی درێژخایەنیش یەکێکە لەهۆکارەکانی دروستبوونی نەخۆشی شێرپەنجە.

لەهەمان کاتدا مادەی کیمیاوی خەردەل، کاریگەری لەسەر خانەکانی لەشی مرۆڤ دەکات، دەبێتە هۆی گۆڕینی مادەی D N A لەخانەکانی لەشی مرۆڤدا، بەو شێوەیە حاڵەتی میوتەیشن (MUTATION) لەجینەکانی لەشی مرۆڤدا درووستدەکات، ئەگەری دروستبوونی نەخۆشی زگماکی لەنەوەی بریندارەکاندا درووستدەبێت، وە ئەگەری دروستبوونی نەخۆشی شێرپەنجە لەبریندارەکاندا زۆرتر دەبێت.

مادەی کیمیاوی خەردەل، لەسەرەتادا کاریگەری کوشندە و کتوپری لەسەر بریندارەکان لاوازە، بەتایبەتی ئەگەر بریندارەکە برێکی کەمی ئەو مادە کیمیاوییەی بەربکەوێت، بەڵام لەدوورمەودادا، مادەی خەردەل چەکێکی کیمیاوی زۆر زیانبەخشە، برینی درێژخایەن دروستدەکات، وەهۆکاری دروستبونی شێرپەنجەیە.

مادەی کیمیاوی خەردەل، لەسەرەتادا بۆ چارەسەری نەخۆشی شێرپەنجە بەکارهاتووە، بەڵام دوای ماوەیەک دەرکەوتووە، خەردەل خۆی شێرپەنجەی خوێن درووستدەکات، بۆیە لەبواری پزیشکیدا رێگری لەبەکارهێنانی کراوە، تەنها وەک چەکی کیمیاوی لەبواری سەربازیدا بەکاردێت.

یەک لەکێشەکانی تری مادەی کیمیاوی خەردەل، دەرمانێکی تایبەتی نییە دژی بەکاربهێنرێت، تریاکANTI DOT ئەنتی دۆتی نییە، تا بری مادە کیمیاویەکەی لەشی بەرکەوتووەکە کەم بکاتەوە، دەرمانێکی تایبەت نییە بۆئەوەی برینی گازی خەردەل چاک بکاتەوە، تەنها کارێک کە پزیشک دەتوانێت بۆ بەرکەوتووی چەکی کیمیاوی خەردەلی بکا، بەرکەوتوەکە لەشوێنی بۆردومانەکە دووربخاتەوە، بە پەلە جل و بەرگی بریندارەکەیە بگۆردرێت، بریندارەکە بە ئاوو سابوون بشوات، بۆئەوەی رێگە نەدرێت مادە کیمیاویەکە بچێتە ناو خوێن و شانەکانی جەستەوە. دەبێت برینی نەخۆشەکە، وەک سوتاوی پێست و چاو و قورگ، وەک سوتاوی کۆئەندامی هەرس، کۆئەندامی هەناسەدان، چارەسەر بکرێت.

ژمارەیەکی زۆر لەبریندارى چەکی کیمیاوی، لەسالانی ١٩٨٧ -١٩٨٨، بەمادەی کیمیاوی خەردەل بریندار بوون، تا ئەمرۆش بەدەست برینەکانیانەوە دەناڵێنن و چاکنەبوونەتەوە[٤٠].

**بوردومانی فرۆکەکان:**

کاتێک شارۆچکەی قەرەداغ ئازادکرا، پێداویستیە سەربازیەکانی ناحیەکە، دەستیان بەسەرداگیرا، دوو ناقلەی سەربازیش دەستیان بەسەردا گیرابوو، ئەو دوو ناقلەیە، لەژێر سێبەری داربەڕوەکانی ئیمام هەمزەدا، نزیک گوندی بەلەکجار، شاردرابوونەوە. دڵمان بەو ناقلانە خۆشبوو، ئاواتەخوازبووین رۆژێک لەرۆژان، بەو ناقلانە شەڕی رژێم بکەین.

پاشنیوەڕۆیەک دوو فڕۆکە هاتنە سەر ئاسمانی ناوچەکە، دەستیان بەبۆردومانی ناقلەکان کرد، لەبۆردومانەکەدا چەندان ساروخیان بەکارهێنا، ساروخەکان راستەخۆ بەر ناقلەکان نەکەوتن، بەڵام لەبەرئەوەی وەرزی هاوین بوو، بەتەقینەوەی ساروخەکان، پوشی دەورووبەری ناقلەکان گڕی گرت، یەک لەناقلەکان ئاگری تێبەربوو، ئەو رووداوە بەبەرچاوی پێشمەرگەوە

---

٤٠ لەکتێبی لەتوێشوی پزیشکێکی پێشمەرگەوە، کە ساڵی ٢٠٠٧ دەرچوە بەدرێژی باسی چەکی کیماوی و هەڵمەتە کیمیاویەکانی سوپای عێراقم کردوە.

بوو، کە سەیرم دەکرد ناقلە دەسووتێ، کەس بەفریای ناقلەکانەوە ناچێت، کەس ئامادە نییە ئاگرەکە بکوژێنێتەوە، بانگی پێشمەرگەکانم کرد، وتم: وەرن با بڕۆین ئەو ئاگرە بکوژێنینەوە، با نەهێڵین ناقلەکان بسوتێن، ئەو ناقلانە بەخوێنی شەهیدان دەستیان بەسەردا گیراوە، گەینراونەتە ئێرە، نابێت ئەو ناقلانە بەبەرچاومانەوە بسووتێن. کەس بەدەممەوە نەهات، فڕۆکەکان بە ئاسمانەوە بوون، بەتەنیا بەرەو رووی ئاگرەکە رۆیشتم، لەو کاتەدا عومەر غەریبیش لەگەڵم هات، گەیشتینە ناو دارەکانی ئیمام هەمزە، یەکی لقێک داری تەڕی داربەروەکانی ئیمام هەمزەمان لێکردەوە، دەستمان بەکوژاندنەوەی ئاگرەکە کرد، ئاگری پووشەکەمان کوژاندەوە، بەڵام ئاگری بۆدی ناقلەکەمان بۆ نەدەکوژایەوە، لەو کاتەدا کاوەی شۆفێری مامۆستا ساڵح ژاژڵەیی، فریامان کەوت، دەزگایەکی ئاگرکوژانەوەی سوارڕۆی پێ بوو، دوو فڕە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی کرد بەسەر ئاگری بۆدی ناقلەکەداو کوژاندیەوە. من و عومەر غەریبیش سوپاسی کاوەمان کرد، بەسەرکەوتویی گەڕاینەوە بۆ لای ئەو بەرپرس و کادرو پێشمەرگانەی لەکوژاندنەوەی ئاگرەکەدا هاوکاریان نەکردین.

**ئێرە شەلەمچەیە٤١:**

ئەوە قسەی بەرپرسی مەڵبەندی یەکە، قسەی قادری حاجی عەلییە. لەقۆناخی ئامادەییدا، لەدوورەوە قادری حاجی عەلیم دەناسی، لەقوتابخانە هاوپۆل بووین، کەسێکی بێدەنگ بوو، ماڵیان لە گەرەکی عەقاری بوو، لەقوتابیە خۆشگوزەرانەکانی شار بوو، ئەو جۆرە کەسانە ئەو کات پێیان دەوترا کوڕی عەقاری، کوڕی عەقاری واتای ئەوەبوو، بورجوازیانە دەژی.

---

٤١ شەلەمچە شارۆچکەیەکی زۆر گەرمی خواروی ئێران بوو، ماوەیەکی درێژ شەڕی عێراق -ئێران تێیدا بەردەوام بوو، هەزاران کەسی تێدا کوژرا.

قادری حاجی عەلی زانکۆی تەواوکرد، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، تەنیا خۆی پێشمەرگە نەبوو، حەمەجەزای هونەرمەند و براکانی تری هەموویان پێشمەرگە بوون.

قادری حاجی عەلی لەشاخیش عەقاریانە دەژیا، کاتێک بووبە بەرپرسی مەڵبەندی یەک، کە گەرمای هاوینی ناوچەی قەرەداغی بینی، وتی: ئێرە ئەڵێی شەلەمچەیە*، من ناتوانم لەم گەرمایەدا کاروباری مەڵبەند بەڕێوەببەم، بارەگاکانی مەڵبەندی لەبەلەکجار چۆڵکرد، گواستنیەوە بۆ قۆپی قەرەداغ.

سەرەتا لەقۆپیەکان کەپری دروستکرد، دواتر خانوی درووستکرد، بێجگە لەنەخۆشخانە، زۆربەی بەشەکانی مەڵبەندی بردە قۆپی قەرەداغ. بارەگای مەڵبەند بوو بەبارەگای تیپی ٥٥قەرەداغ. زیندانی مەڵبەند، کرا بەبارەگای لەشکری ٩ نوی بەدر، بارەگاکانی تری مەڵبەند زۆربەی بەسەر ئۆپۆزسیۆنی عێراقیدا دابەشکران.

**نەوشیروان مستەفا و بەهادین نوری:**

لەو سالانەی دواییدا، ڕێگەی هاتوچۆی ئەوروپا بۆ یەکێتی کرایەوە، ناوبەناو مامجەلال و نەوشیروان مستەفا، لەڕێگەی ئێرانەوە، سەردانی دەرەوەی ولاتیان دەکرد، سالی ١٩٨٦ کاتێک بۆردومانی نەوتەکەی کەرکوکمان کرد، مامجەلال لەدەرەوەی ولات بوو، نەوشیروان مستەفا لەکوردستان بوو، ئەو سەرپەرشتی چالاکی بۆردومانی چالەنەوتەکانی کەرکوکی کرد.

سالی ١٩٨٧ نەوشیروان مستەفا لەدەرەوەی ولات بوو، مامجەلال سەرپەرشتی شەڕی داستانی رزگاری کرد. لەکۆتایی سالی ١٩٨٧ دا، نەوشیروان مستەفا لەئەوروپا گەڕایەوە، پێش ئەوەی بڕواتەوە سەرکردایەتی، لەقۆپی قەرەداغ سەردانی مەڵبەندی یەکی کرد، لەبارەگای نوێی مەڵبەند، کۆبونەوەیەکی فراوانی بەبەرپرس و کادرەکانی ێنکێ کرد.

لەبەشێک لەقسەکانیدا وتی: زانیاریمان دەستکەوتووە کە سوپای عێراق بە نیازە جارێکی تر چەکی کیمیاوی دژی هێزی پێشمەرگە بەکاربێنی. من ئەو

کاته زۆر گرنگیم بەو قسەیە نەدا، لەبەرئەوەی وامدەزانی سوپای عێراق تەنیا چەکی کیمیاوی خەردەل بەکاردێنێت. لەشەڕی داستانی رزگاری و شەڕی ئازادکردنی شارۆچکەی قەرەداغدا، رژێم چەکی کیمیاوی خەردەلی بەکارهێنا، هێندە کوشندە نەبوو، ئەو کاتە کاریگەرییە درێژخایەنەکانیشی دەرنەکەوتبوون، واشماندەزانی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەلایەن سوپای عێراقەوە، لەئایندەشدا پەرچەکردارە، بۆ خۆپاراستن بەکاری دەهێنێت، وەک ئەوەی لەبەهاری سالی ١٩٨٧ دا بینیمان.

لەسەرەتای شوباتی سالّی ١٩٨٨ دا، نەوشیروان مستەفا بروسکەی بۆ پزیشکانی شۆڕش کرد، لەبروسکەکەدا دەڵێت: زانیاریمان پێگەیشتوە کە لەئایندەیەکی نزیکدا، رژێمی بەعس بەچەکی کیمیاوی ناوچە رزگارکراوەکان بۆردومان دەکات، لەگەڵ بروسکەکەدا زانیاری لەسەر چەکی کیمیاو و رێنمایی بۆ خۆپاراستن ناردبوو، داوای کردبوو، پزیشکان و هاوکارەکانیان، بەجدی کار بۆ پاراستنی ژیانی برینداری چەکی کیمیاوی بکەن.

دوای ئەوەی بروسکەکەم وەرگرت، سەردانی نەخۆشخانەم کرد، لەگەڵ دکتۆر ناسح و دکتۆر جەلال و برادەرانی تردا قسەم کرد، لەکۆتایی کۆبونەوەکەدا بڕیارماندا، بەنوسراو، دەربارەی چەکی کیمیاوی رێنمایی بۆ خەڵک و پێشمەرگە، دەربکەین و بڵاوی بکەینەوە.

بەو زانیاریەی لەبروسکەکەی نەوشیروان مستەفاوە وەرمان گرت، لەگەڵ هەندێک زانیاری تر کە زوربەی لەدەفتەرەکەی مەحمودا دەرمهێنا، پەڕەیەکی ئەی فۆر، زانیاری و رێنمایم نوسی، بەشێوەیەکی گشتی نوسینەکە لەچەند بەشێک پێکهاتبوو، بەشی یەکەمی بریتیبوو لەوەی، چۆن بۆردومانی چەکی کیمیاوی دەناسی و لەبورومانی چەکی کلاسیکی جیای دەکەیتەوە، بەشی دوەمی باسی ئەوەی دەکرد چۆن خۆت لەبریندااربوونی چەکی کیمیاوی دەپارێزیت، بەشی کۆتایی باسی لەوە دەکرد، ئەگەر بەچەکی کیمیاوی بریندار بوویت، چۆن کاریگەری مادە کیمیاویەکە لەسەر لەشت کەم دەکەیتەوە، چۆن دەگەیتە نزیکترین ناوەندی پزیشکی، بۆ چارەسەرکردنی برینەکەت.

لەبەرئەوەی مەڵبەند بەشی ڕاگەیاندنی نەبوو، نوسینەکەمان نارد بۆ لای بەهادین نوری[42]، بۆئەوەی بۆمان تایپ بکات. نزیکەی ٥٠٠ نوسخە لەڕێنماییەکانی بۆ ڕاکێشاین. دوای ئەوەی کۆپی ڕێنماییەکانمان پێگەیشت، زۆربەیمان بەسەر گوندە قەرەباڵغەکان و بەسەر تیپەکانی پێشمەرگەدا دابەشکرد. کاتێک بۆردومانی کیمیاوی و ئەنفال دەستیپێکرد، بۆمان دەرکەوت کە ڕێنماییەکان لەپاراستنی گیانی خەڵکدا سوودیان هەبووە.

هێندەی پێنەچوو، ڕاستی قسەکەی نەوشیروان مستەفا دەرکەوت، بەڵام ئەمجارەیان چەکە کیمیاوییەکەی سوپای عێراق، زۆر کوشندە بوو، تێکەڵەی مادەی خەردەل و مادەی گازی دەمارەکان و جۆرەکانی تریش بوو، ئەمجارە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی پەرچەکرداری هێرشی هێزی پێشمەرگە و سوپای پاسدارانی ئێران نەبوو، بۆ خۆپاراستن نەبوو، بەرنامە بوو، هێرشکردن بوو، بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەهەر ناوچەیەکدا، سەرەتای پرۆسەیەکی ئەنفال بوو.

**کیمیابارانی بەلەکجار:**

لەکۆتایی شوباتی ١٩٨٨دا، لەو کاتەدا کە بارەگاکانی سەرکردایەتی ینک، لەسەرگەڵوو بەرگەڵو لەژێر ئاگری هێرشی بەردەوامی ئەنفالی یەکی سوپای عێرقدا بوون، چەند فڕۆکەیەکی جەنگیی سوپای عێراق، هاتنە ئاسمانی ناوچەی قەرەداغ، دەستیان بەبۆردومانی گوندی بەلەکجارو بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە و گوندی بەڵخە کرد، لەژێرزەمیندا خۆمان پەنادا بوو، هەستم کرد ئەو بومبانەی لەدووری ٥٠٠-٦٠٠ مەترێک لەنزیک ماڵەکەمەوە دەتەقنەوە، دەنگیان نزمە، گومانی بۆردومانی کیمیاویم کرد، لەژێرزەمینەکە هاتمەدەرەوە، دووکەڵی خەستی بۆمبەکانم بینی، هەستم بەبۆنێکی ناخۆش کرد، تێگەیشتم کە بەچەکی کیمیاوی بۆردومان دەکرێین. مەهاباد و شێنێم لەژێرزەمینەکە

---

٤٢ ماوەی چەند ساڵێک بوو بەهادین نوری لەحزبی شیوعی عێراق جیابوبوەوە، لەگوندی تەکیەی ناوچەی قەرەداغ لەزێدی خۆی دانیشتبوو، هەندێک چالاکی سیاسی و ڕۆشنبیری هەبوو.

هێنانـــه دەرەوە، بـــەدەنگی بـــەرز هـــاوارم لەدرواســـێکانم کـــرد، وتـــم: لەژێرزەمینـەکان وەرنـە دەرەوە، بەچـەکی کیمیـاوی بۆردومـان کـراوین، هـەر لەهــەمان کاتــدا، پــەڕۆو خــاولی تــەرمان لەگــەڵ خۆمــان بــرد، لەشـوێنی بۆردومانەکـە دوورکەوتینـەوە، داوام لەپێشـمەرگەکان و خێزانـەکانیان کـرد: پەڕۆی تەڕ بەکاربێنن، لەناوچەکە دوورکەونەوە، بەرەو بەرزاییەکان برۆن.

زۆربەی پێشمەرگەکان بەگوێیان کردم، هەواڵم بۆ خەڵکی گوندی بەلەکجار نـارد: بەچـەکی کیمیـاوی بۆردومـان کـراوین، دەبێـت بـەگوێرەی ڕێنماییـەکان بجوڵێنـەوە، دەبێت لەشـوێنی بۆردومانەکـە دووربکەونـەوە، نابێـت دەسـتکاری پارچەی بومبەکان بکەن .

بارەگـای لەشـکری نـۆی بـەدر، لەشـوێنی زینـدانی مەڵبەنـد بـوو، چەنـد قومبەلەیەکی کیمیاوی، لەبەردەم بارەگاکەیاندا تەقیبوونـەوە، پێشـمەرگەکانیان نـەک هـەر لەشـوێنی تەقینەوەکـە دوور نەکەوتنـەوە، لـەدوورەوە چـاوم لێبـوو، چووبونە سەر بومبە تەقیوەکان، دەستکاری پارچەکانییان دەکرد. هـەواڵم بۆ ناردن: نابێت بەو شێوەیە لەگەڵ مادەی کیمیاویدا هەڵسوکەوت بکەن، بـەڵام گوێیان بەڕێنماییەکان نەدا. بۆ ڕۆژی دوایی، سێ لەپێشـمەرگەکانی لەشـکری نـۆی بـەدر، بەبریندارییـەکی سـەختەوە، گەینرانـە نەخۆشـخانە، دوای چەنـد ڕۆژێک یەکێکیان شەهید بوو.

لەبۆردومانی کیمیـاوی گوندی بەلـەکجار و دەوروبەریـدا، مـادەی کیمیـاوی خـەردەل بـەکارهات، بـەڵام لەبەرئـەوەی بۆردومانەکە بەفرۆکە بـوو، بڕەکـەی زۆربوو، ئامانجەکەی باش پێکابوو، بریندارو شەهید هەبوو.

**هەڵەبجە کیمیاباران دەکرێت:**

لـە٢١-٢- ١٩٨٨ وە، هێـرش بـۆ سـەر بارەگاکـانی سـەرکردایەتی، لـەدۆڵی جافایـەتی، دەسـتی پێکـرد، زۆربـەی هێـزی پێشـمەرگەی مەڵبەنـدی یـەک، بـۆ پاراستنی بارەگاکانی سـەرکردایەتی، بـانگی شـەڕی بەرپەرچدانـەوەی ئـەنفالی یـەک کـرا. قـادری حـاجی عـەلی و شـێخ جەعفـەر، لەگـەڵ هێزەکـەی مەڵبەنـدا

بـوون، دکتـۆر جـەلال عوسـمان وەک مـەفرەزەی پزیشـکی، لەگـەڵ هێزەکـەی مەڵبەندی یەکدا بوو.

ڕۆژانـە هـەواڵی بـەرەکانی شـەڕی سـەرکردایەتیمان پێدەگەیشـت، هێرشـی دوژمن بەردەوام بوو، پێشمەرگەش لەشەڕێکی بەرەیی فراواندا، ڕووبـەڕووی سـوپای عێـراق سـەنگەری گرتبـوو و شـەڕی دەکـرد، هـەواڵی شـەهیدو برینـداربونی پێشـمەرگەمان دەبیسـت. هـەواڵ دەهـات کـە سـوپای عێـراق، بەرامبەر بەسەنگەری پێشمەرگە، چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە.

لەدرێژەکێشان و گەرمبوونی هێرشی سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی ینکدا، هـەواڵی ڕزگـارکردنی هەڵەبجـە هـات، ئـەو هەواڵـە لەچەنـد سـەرێکەوە دڵـی خۆشـکردین، لەلایەکـەوە شـاری هەڵەبجـە و ناوچـەی هـەورامان و بەشـێکی ناوچـەی شـارەزور، ئـازادکرا، لـەو لاشـەوە وامانـدەبینی کـە بـەهۆی شکسـتی سوپای ڕژێمەوە لەهەڵەبجە، فشاری سـەر بارەگاکانی سـەرکردایەتی لـەدۆڵی جافایەتی کەم دەبێتەوە. بۆ کەسێکی وەک منیش کە خەڵکی دەڤەری هەڵەبجە بووم، هێندەی تر دڵخۆشبووم، کە زێدی خـۆم ئـازاد کـراوە، بـەهیوابووم بـەو زوانە سەردانی هەڵەبجەی ئازاد بکەم.

هـەر لـەو کاتـەدا، دەنگوباسـێک بڵاوبـوەوە کـە دوای ئـازادکردنی هەڵەبجـە، دەربەندیخان ئـازاد دەکرێت، خـۆ ئەگـەر دەربەنـدیخان ئـازاد بکرێت، ناوچـەی قەرەداغ و شـارەزورو هـەورامان، هەموی بەیەکـەوە دەبەسـرێنەوە، دەسـەڵاتی حکومـەتی عێـراق لـەو سـنورەدا کۆتاییـدێت. ئـەو خەونـە خۆشـە هێنـدەی نەخایاند، مۆتەکە سەر دڵی هەمووومانی گرت. لەکەناڵی تەلەفزیۆنی ڕژێمـەوە، هـەواڵی داگیرکردنـی بارەگاکـانی سـەرکردایەتی، لەبەرگـەڵو و گونـدەکانی دەورووبـەردا، بـەناوی سـەرکەوتنی پڕۆسـەی ئـەنفالی یـەک بڵاوکرایـەوە. هاوولاتیەکی هـەژاری گونـدی مالوومـە، لەکـەناڵی تەلـەفزیۆنی عێراقـەوە، وەک سەرکردەیەکی دەستگیرکراوی هێزی پێشمەرگە پیشانی خەڵک درا.

خەمی داگیرکردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی ینک کۆن نەبووبوو، لەڕێگەی بێتەڵـەوە، هـەواڵی کیمیابـارانی هەڵەبجـە هـات: ڕۆژی ١٦-٣-١٩٨٨فڕۆکـەکانی

رژێم شاری هەڵەبجەیان بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کردووە، نزیکەی ٥٠٠٠ پێنج هەزار کەس شەهید بوون، دەیان هەزار کەس بریندار بوون.

کاتێـک ئـەو هەواڵـەم بیسـت، بـڕوام نـەدەکرد هەواڵەکـە راسـت بێـت، لەبەرئەوەی وای بۆدەچوم ئەمجارەش رژێم هـەر چەکی کیمیاوی خـەردەلی بـەکارهێنابێت، خـەردەلیش لەماوەیـەکی کەمـدا، هێننـدە خـەڵک شـەهید ناکـات. دەفتەرەکەی مەحمودم دەرهێنا، دەستم بەخوێندنەوەی کردەوە، با بزانم رێـی تێدەچێت لەیەکـەم کـاتژمێری بۆردومـانی چـەکی کیمیاویـدا، هـەزاران کـەس شـەهید ببن؟ کە گەیشـتمە سـەر چـەکی کیمیـاوی گـازی دەمارەکـان (گـازی ئەعساب)، جاریکی تر بەوردی خوێندمەوە، بۆمدەرکەوت، ئەگەرسوپای عێراق لـەبۆردومانی کیمیـاوی هەڵەبجـەدا، گـازی دەمارەکـانی بـەکارهێنابێت، دەکرێ لەچرکەکانی یەکەمی بۆردومانەکەدا، لەشارێکی وەک هەڵەبجەدا، کە ژمـارەی دانیشتوانی خۆی لەشەست هـەزار کـەس دەدا، هـەزاران کـەس شـەهید ببن و دەیان هەزار بریندار ببن.

دواتـر بیـرم لـەو پۆلـە فڕۆکانـە کـردەوە، کـە رۆژانـە بەئاسـمانی ناوچـەی قەرەداغدا، بەرەو ناوچەی شارەزوور دەفرین، جاری وا هەبوو حەڤدە فڕۆکە پێکـەوە، بـەرەو شـارەزور دەفـڕین، لەوسـەرەوە دەهاتنـەوە سـەر ئاسـمانی قـەرەداغ، بـەرەو ئاسـمانی گـەرمیان و کـەرکوک دەگەڕانـەوە، دیـاربوو ئەو فڕۆکانە بە چەکی کیمیاوی هەڵەبجەییان بوردومان کردبوو.

**کیمیابارانی شاناخسێ:**

دوای کۆمـەڵکوژی هەڵەبجـە، ١٨-٣-١٩٨٨هـەواڵی کیمیبـارانی گونـدی شاناخسێی ناوچەی شارباژێڕ هـات، ئەو هەواڵـەش زۆر دڵتەزێن بوو، چەند مەفرەزەیەک لەو پێشمەرگانەی لەشەڕی ئەنفالی یەکدا کشابوونەوە، لەگوندی شاناخسـێ مابوونـەوە، فڕۆکـەکانی رژێـم، بەچـەکی کیمیـاوی گـازی دەمـار، بۆردومـانی کردبـوون، نزیکـەی ١٥-٢٠ کـەس شـەهید بـوون، دووان لەشەهیدەکانم دەناسی، یەکێکیان دکتۆر هادی بوو، یاریدەدەری پزیشک بوو، پێشـمەرگەیەکی بەجـەرگ بـوو، کـوڕیکی دڵسـۆزو بـەوەفا بـوو، ماوەیـەک لەسورداش لەنەخۆشخانە کاری لەگەڵ کردم، لەوێوە بووین بەهاوڕێ، دوای

کۆتاییهاتنی گفتوگۆی نێوان یەک و رژێم، گەڕایەوە بۆ سنوری تیپی ٢١ کەرکوک. دەمێک بوو دکتۆر هادیم نەدیبوو، زۆرم خۆشدەویست، کە هەواڵی شەهیدبونیم بیست، زۆر نیگەران بووم. لەناو شەهیدەکاندا پێشمەرگەیەکی ترم دەناسی، ناوی شەهید کەمال بو، نازانم بۆچی بەشەهید کەمال بانگ دەکرا، خەڵکی پێنجوێن بوو، خێزاندار بوو، بەشەهیدبونی ئەویش زۆر نیگەران بووم.

بەڵی لەماوەی کەمتر لەهەفتەیەکدا، هاوسەنگی هێز پێچەوانە بوەوە، ئێمە بەتەمابوین دوای هەڵەبجە، شاری دەربەندیخانیش ئازاد بکەین، هەڵەبجەو دەربەندیخان و قەرەداغ لە یەک بدەینەوە، بەئازادی چالاکیان تێدا بکەین، کەچی زوو خەوە خۆشەکەمان لێتێکچوو، لەباتی خەوی خۆش، خێو بەرۆکی گرتین، خەریک بوو بەتەواوی بمانخنکێنێت.

بارەگاکانی سەرکردایەتی یەک داگیرکران، پێشمەرگە دۆڵی جافایەتی چۆڵ کرد، رژێم دەستی بەسەردا گرت، هەڵەبجە لەشارێکی ئازدکراوەوە، بوو بەشاری مەرگی چەکی کیمیاوی، روخێنراو چۆڵکرا، پێشمەرگەو پاسدار هەنگاوێک بەرەو دەربەندیخان پێشنەکەوتن.

هێندەی پێنەچوو باسی شەهدیدبونی خەڵکی هەڵەبجەو تالانکردنی سامانیی هەڵەبجەییەکان دەستی پێکرد، باسی ئەوەمان دەکرد بۆ ئەو شەڕە لەهەڵەبجە کرا؟ ئایا ئەو شەڕە پێویست بوو؟ لەکاتی شەڕەکەدا بۆ حساب بۆ ژیانی خەڵکی شارەکە نەکرا؟ ، لەگفتوگۆیەکی وادابوین، شێرکۆ مرانەیی ئەندامی مەڵبەندی یەک هەڵیدایەوە، وتی: خەڵکی هەڵەبجە هەموی جاشن، با بکوژرێن.

ئەم چەمکە هەڵەیە لەناو هزری هەندێک لەبەرپرسەکانی یەکدا هەبوو، منیش زۆر بەتوندی وەڵامم دایەوە، وتم: تۆ هەڵەی، ئەگەر سەیری پێشمەرگە و بەرپرس و فەرماندەکانی یەک بکەیت، دەبینی چەندیان خەڵکی هەڵەبجەو دەڤەری شارەزورو هەورامانن، مەفرەزەی یەکەمی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ، لەهەڵەبجەوە دەستی پێکرد، یەکەم شەهیدی ئەم شۆڕشە خەڵکی هەڵەبجە بوو، لەچاو شارو ناوچەکانی تری کوردستاندا، هەڵەبجە کەمترین جاشی هەیە. وتم: تۆ من دەناسی، دەزانی خەڵکی ئەو دەڤەرەم، دەزانی بنەماڵەی ئێمە چەند شەهیدمان داوە.

**کیمیابارانی سێوسێنان:**

کاتژمێر شەشی ئێوارەی نەورۆزی٢١-٣- ١٩٨٨ بوو، لەژوورەوە گوێم لەهەواڵەکانی رادیۆی ئیسرائیل گرتبوو، گوێم بە دەنگێکی نامۆ زرنگایەوە، وەک دەنگی تلکردنەوەی بەرمیل وابوو، دەنگەکە درێژەی کێشا، وتم با برۆمە دەرەوە بزانم ئەوە دەنگی چییە؟ ، هەستمکرد دەنگە نامۆکە لەگوندی سێوسێنانەوە دێت، کە سەیری سێوسێنانم کرد، چەندان پزیسکی ئاگر، لەگەڵ دەنگە نامۆکاندا، لەناو گوندەکەوە بەرزدەبوونەوە، نەمتوانی لێکدانەوەیەکی راست بۆ ئەو رووداوە بکەم. بیرم بەلای ئەوەدا نەدەچو ئەوە بۆردومانی چەکی کیمیاوی بێت، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا، هیچ شەڕو پێکدادانێکی سەربازی لەو ناوەدا نەبوو، فڕۆکە بەئاسمانی ناوچەکەدا نەدەفڕی، لەو بڕوایەدا نەبووم لەسەربازگەکانی دەوروبەری دەربەندیخانەوە، بەساروخی کاتیۆشای کیمیاوی، سێوسێنان بۆردومان بکرێت.

پاش چەند دەقیقەیەک، پێشمەرگەیەکی بەشی دارایی مەڵبەند هاتە لام، هەموو بۆردومانەکەی گوندی سێوسێنانی دیبوو، بۆیگێرامەوە کە بەچاوی خۆی دەیان ساروخی دیوە، لەدەربەندیخانەوە ئاراستەی گوندی سێوسێنان کراون، وتی گوندەکەی وێرانکرد، بەلام ئەویش نەیدەزانی، سێوسێنان بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کراوە.

هێندەی پێنەچوو دکتۆر ناسح لەنەخۆشخانەوە هات بۆلام، وتی بریندراری چەکی کیمیاوی سێوسێنان گەیشت، لەگەڵ دکتۆر ناسح بەرەو نەخۆشخانە بەڕێکەوتین ، لەڕێگەدا قسەمان لەسەر جۆری چەکەکە دەکرد، وتم ئەمجارە کام جۆرە کیمیاویەی بەکارهێناوە، د. ناسح وتی: بەگوێرەی نیشانەی برینی ئەو کەسە بێ کە گەیشتوە، چەکی کیمیاوی دەمارەکانی بەکارهێناوە.

دنیا تاریکی کردبوو، ئێمە هێشتا نەگەشتبووینە نەخۆشخانە، لەگەڵ دکتۆر ناسح دەربارەی چەکی کیمیاوی و بریندارەکان قسەمان دەکرد، لەپڕ کەسێک هاواری کرد، وتی: فریام کەون، من دەنگەکەم ناسیەوە، وتم: کەمالی[٤٣]؟ ئەوە

---

٤٣ کەمال هاولاتیەکی گوندی سیوسینان بوو.

چیتە؟ وتی: بەڵی دکتۆر کەمالم، کیمیاویم بەرکەوتوە، وتم: وەرە بۆ لای ئێمە، وتی: هیچ نابینم، وتم: باشە لەشوێنی خۆت بوەستەو قسە بکە تا دەگەینە لات، من و دکتۆر ناسح گەیشتینە لای کەمال، دەستمان گرت، گەیاندمانە نەخۆشخانە، جلەکانیمان گۆڕی، لەحەمامەکەی نەخۆشخانەدا شوردمان، دەرزی ئەترۆپینمان بۆ کرد، کەمال چاک بوەوە، ئیستا لەژیاندا ماوە، لەناحیەی سێوسێنان دەژی. دوای ئەوەی بۆماندەرکەوت گوندی سێوسێنان بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کراوە، ئاگاداری تیپی ٥٥ قەرەداغ و هێزی پێشمەرگەی ناوچەکەو خەڵکی گوندەکانی ترمان کرد، بچن بەدەم خەڵکی سێوسێنانەوە، لەماڵەکانی خۆیان دەریان بکەن، بیانگەیەننە نەخۆشخانە. هێزی پێشمەرگەو خەڵکی گوندەکانی کۆشک و مەسۆیی و تەکیەو بەلەکجاڕو بەڵخە، بەدەنگمانەوە هاتن، ئێمەش ژمارەیەک لەکارمەندەکانی خۆمان نارد بۆسەر چەمی دێوانە، وتمان هەر برینداریک گەیشتە لاتان، دەرزیەکی ئەترۆپینی بۆ بکەن، وە ئەگەر گونجاو بوو، بەئاوی چەمەکە بیانشۆن، ڕەوانەی نەخۆشخانەیان بکەن.

بەدەمەوەچوون و چارەسەری بریندارەکانی چەکی کیمیاوی سێوسێنان، کارێکی سەرکەوتو بوو، هەمو بریندارەکان چاک بوونەوە، کەسیان شەهید نەبوون، لەیەکەم چرکەکانی بۆردومانە کیمیاویەکەی گوندەکەدا ٦٨-٧٠ کەس شەهید بوون، هەر هەمویان خەڵکی مەدەنی ئەو گوندە بون، بێجگە لەشەهید نەریمان هەورامی پێشمەرگە، لەو کاتەدا لەسێوسێنان میوان بوو.

لەکاتێکدا ئێمە خەریکی چارەسەری بریندارەکانی سێوسێنان بووین، پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکەش، سەرقاڵی بەخاک سپاردنی تەرمی شەهیدەکان بوون، کاتژمێر یانزەو نیوی هەمان شەو، سوپای عێراق، بەساروخی کاتیۆشا، گوندی دوکانی ناوچەی قەرەداغی کیمیاباران کرد. بە هۆی کیمیابارانی سێوسێنانەوە، خەڵکی گوندەکە لەئەگەری بۆردومانی کیمیاوی بەئاگاهاتبوون، وە هەڵکەوتەی جوگرافی گوندی دوکانیش، وەک گوندی سێوسێنان تەخت نییە، بەقەدپاڵی شاخەوەیە، گازی کیمیاوی لەهەوا قورسترە، بۆیە کیمیاویەکە بەرەو خوارووی گوند، بۆ چەم ئاڕاستەی گرتبوو

لەگوند دورکەوتبوەوە، ریژەی چڕی کیمیاویەکە لەهەوای گوندی دوکاندا بەکەمی مابوەوە، زیانی قورسی بەخەڵک نەگەیاند، تەنیا چەند کەسێک بەسوکی بریندار بوون. دوای سێ رۆژ یەکێک لەبریندارەکانی گوندی دوکانم بینی، ئاسەواری برینی چەکی کیمیاوی گازی خەردەلی لەسەربوو، نەمزانی لەکیمیابارانی گوندی دوکاندا، رژێم تەنیا گازی خەردەلی بەکارهێنابوو، یان گازی دەماریشی بەکارهێنابوو؟ .

**مەهاباد و شێنێ لە ئەنفال دەگەڕێنەوە:**

دوای ئەوەی هێزی پێشمەرگەو سوپای پاسدارانی ئێران، دەستیان بەسەر هەڵەبجەدا گرت، بۆئەوەی دەربەندیخان و سلێمانی و ناوچەکانی تری ژێر دەسەلاتی رژێم پارێزراو بن، وای بۆدەچووم سوپای عێراق هەوڵی داگیرکردنی ناوچەی قەرەداغ دەدات، بۆیە پێشبینی هێرشی سوپای عێراقم بۆ ناوچەی قەرەداغ دەکرد، چەند جارێک لەگەڵ هاوسەرەکەم قسەم کرد، بۆئەوەی بەنهێنی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و خۆی پەنا بدات، تا بزانین چی روودەدات، کەچی رازی نەدەبوو، پیاوێکی سێوسێنانی بەتراکتور هاتوچۆی سلێمانی دەکرد، هەواڵم بۆ نارد بێت مەهاباد و شێنێ بگەیەنێتەوە سلێمانی، خاوەنی تراکتورەکە هات بۆ بەلکجار، بەلام مەهاباد ئامادە نەبوو بڕواتەوە بۆ سلێمانی، مەهاباد لەگەڕانەوەی بۆ سلێمانی دەترسا، پێشبینی هێرشی ئەنفالی دووی نەدەکرد

دوای بۆردومانی کیمیاوی سێوسێنان و دوکان، جارێکی تر بەمەهابادم وت، دەبێت تۆو شێنی بڕۆنەوە بۆ سلێمانی، مەهاباد قەناعەتی کرد، من و شێرکۆ مرانەیی و رەسوڵ، بڕیارماندا ئەو شەوە خێزانەکان لەسنوری سلێمانی نزیکبخەینەوەو رەوانەیان بکەینەوە، بۆئەوەی ئەوان لەکیمیاباران بپارێزین، خۆشمان بتوانین ئازادانەتر ئەرکەکانمان راپەڕێنین.

ئەو شەوە گەیشتینە ناوچەی بازیان، بۆ رۆژی دوایی هەر سێ خێزانەکە، سێ ژن بەسێ منداڵەوە، لەشاخی گڵەزەردەوە بەتراکتۆر، رەوانەی سلێمانی کرانەوە، من و شێرکۆو رەسوڵ، دڵخۆشبووین، ژن و منالەکەمان لەمردن

رزگاریان بووە، ئەوان بەرەو سلێمانی گەڕانەوە، ئێمەش بەرەو بارەگاکانی مەڵبەند گەڕاینەوە.

سێ مانگ دوای ئەنفالی دوو، لەکاتی ئەنفالی پێنجدا، لەگوندی بۆڵێی بناری قەندیل، مەهابادم بینیەوە، وتی: لەخاڵی پشکنینی سلێمانی دەستگیریان کردین، سواری زیلی عەسکەریان کردین تا ئەنفالمان بکەن، لەو کاتەدا مستەشارێک هاتە پێشەوە، بەدیالۆگی هەولێری قسەی دەکرد، خۆی کرد بەخاوەنی ئێمە، بەسەربازەکانی وت: ئەوانە عایدی منن، سەربازەکان بەگوێی مستەشارەکەیان کرد، لەزیلەکە دایانگرتین، بەسەیارەی خۆی گەیاندینە سلێمانی، هەر یەکەمانی گەیاندە ماڵی باوکی خۆی، لەئەنفال رزگاری کردین.

**تەرمی هووشیار:**

لەگەڵ شێرکۆ و رەسووڵ، لەبازیانەوە بەرەو بارەگاکانی مەڵبەند گەڕاینەوە، شەو لەگوندی چەمی سمۆری نزیک شارۆچکەی قەرەداغ، پشوویەکمان دا، پرسیاری بۆردومانی کیمیاویمان کرد، وتیان: دوێنێ شەو بارەگاکانی مەڵبەند و بەلەکجاڕو گوندەکانی دوەرووبەری، بەچەکی کیمیاوی بۆردومانکران. بۆ بەیانی زوو گەیشتینەوە ناو ماڵەکانی خۆمان، سەیرمان کرد لەو ناوەدا پەپوو دەخوێنیت، هەرچی مریشکم هەبوو هەر هەمووی لەنزیک کولانەکەیانەوە گیانیان دەرچووبوو، تێگەیشتم کە لەم بۆردومانەدا چەکی کیمیاوی گازی دەمارەکان بەکارهاتووە. دەرگای خانووەکەمم کردەوە، چوومە ژورەوە، لەژوورەوە مریشکێکی کڕم نابوەوە، چەند جووجەڵەیەکی هەڵهێنابوو، زیندوو بوون، بۆمدەرکەوت نایلۆنی دەوری خانوەکە، رێگەی نەداوە مادە کیمیاویەکە بچێتە ناو خانوەکەوە، مریشک و جوجەڵەکانی ناو خانوەکەی لەمردن رزگارکردبوو.

لەخانوەکەی خۆم هاتمە دەرەوە، بەرەو خانوەکەی حەمەڕەزا رۆیشتم، لەبەردەم خانوەکەی حەمەڕەزادا، تەرمی هوشیارم بینی، لەتەنشت بەرخە مردارۆبووەکانی حەمەرەزادا کەوتبوو، ئەو دیمەنە زۆر نیگەرانی کردم، دەستم بەگریان کرد.

هوشــیار پێشــمەرگەیەکی کــۆن بــوو، خــەڵکی ســلێمانی بــوو، لەگــەڵ حەمــەڕەحیم عــەدەد جیهازی مەڵبەنـدی یـەک بـوون، هاوڕێیـەکی نـزیکم بـوو، بـەڵام دەربـارەی خۆپاراسـتن لەچـەکی کیمیـاوی، بـەگوێی نـەدەکردم، گرنگـی بەخۆی نەدەدا، بەوهۆیەوە گیانی خۆی بەخشی.

لـەوێوە بـەرەو نەخۆشـخانە رۆیشـتم، سـەیرم کـرد برادەرانـی نەخۆشـخانە هەمویان سەلامەتن، حەمەرەزاو عەلی رەشید دوو کادری یەنک بوون، لـەکاتی رزگـارکردنی برینـدارەکانی سێوسـێناندا، بـەگازی کیمیـاوی برینـدار ببـوون، لــەکیمیابارانی بەلەکجاڕیشــدا، جــارێکی تــر برینــداربوون، هێشــتا چــاک نەبووبونەوە، لەنەخۆشخانە بوون، باسی تەرمەکەی هوشیارم بۆ کردن، وتـم با بیشارینەوە، حەمەرەزاو عەلی و چەند پێشمەرگەیەک هەستان، تەرمەکـەی هوشیاریان ناشت.

بارەگاکـانی ئۆپۆزسـیۆنی عێـراق، لـە بەلـەکجاڕو دەوروبـەری، بەخەسـتی کیمیاباران کرابوون، بەڵام لەو کاتەدا زۆربـەی بارەگاکـان چـۆڵ بـوون، لەبـەر ئەوە زیانی گیانیان نەبوو.

**ئەنفالی دوو:**

دوای بۆردومـانی کیمیـاوی گونـدەکانی ناوچـەی قـەرەداغ، هێرشـی ئـەنفالی دوو، لەچەنـد قۆڵێکـەوە دەسـتیپێکرد، سـەرەتا لـەبناری شـارەزوورەوە هێرش دەسـتیپێکرد، سـوپای عێـراق دەیویسـت، بەرزاییـەکانی پشـت گونـدی نـەوتی بگرێت، دوای بەرگرییەکی قارەمانانەی پێشـمەرگەکانی یەنک و حشـع، سوپای عێـراق درێـژەی بەهێرشــەکانی دا، پێشــمەرگە پاشەکشــەی کــرد، ســوپا بەرزاییەکانی سەر گوندی نەوتی داگیرکرد.

لەقۆڵی دەربەندیخانەوە، سوپای عێراق بـەرەو دێوانـە هێرشـی دەسـتپێکرد، لەوێشـیوە پێشـڕەوی کـرد، لـەو قۆڵـەوە هێـزی پێشـمەرگە و بـەرگری میللـی شەڕیکی قارەمانانەیان کرد، ئەندامێکی کۆمەڵە، بەرگری میلی بوو، ناوی قـادر بـوو، خـەڵکی گونـدێکی ئـەو دەڤـەرە بـوو، تـا فیشـەکی پێمـا شـەڕی کـرد، هـەر لەوێدا شـەهید بـوو، حەمەلـەتیف کـادرێکی کۆمەڵـەبوو، خـەڵکی دەربەنـدیخان

بوو، ئەویش لەو قوڵەوە شانبەشانی پێشمەرگە و بەرگری میللی، شەڕی کرد، بەخەستی بریندار بوو، گەیەنرایە نەخۆشخانە، چارەسەری برینەکەیمان کرد، لەمردن رزگاری بوو. لەگەڵەزەردەشەوە سوپای رژێم بەرەو ناوچەی بازیان پێشرەوی کرد.

**بەراوردی ئەنفال بە شەڕەکانی تر:**

شەڕی ئەم جارەی هێزە چەکدارەکانی عێراق، شەڕی پرۆسەکانی ئەنفال، وەک شەڕی سالانی پێشوی سوپای عێراق نەبوو، لە شەڕەکانی تردا، هێرشەکانی سوپای عێراق، رووبەڕوبونەوەی چالاکی هێزی پێشمەرگە بوو. کاتێک هێزی پێشمەرگە، لەشەڕێکدا، شارۆچکەیەک یان لوتکەی شاخێکی لەدەست هێزەکانی رژێم دەردەهێنا، سوپای عێراق وەک کاردانەوە، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی هێزەکەی، بۆ وەرگرتنەوەی پێگە سەربازییەکەی، هێرشی دەکردەوە، کە ئامانجەکەی بەدەست دەخست، کۆتایی بەهێرشەکە دەهێنا.

بەلام شەڕی ئەمجارە، شەڕی ئەنفالەکان، لەهەموو روویەکەوە لەشەڕەکانی سالانی رابوردوی سوپای عێراق جیاواز بوو، شەڕی ئەمجارەی سوپا، پەرچەکردار نەبوو، کردار بوو، بەرنامەی رژێمی بەعس بوو، بەرنامەی هێزی پێشمەرگە نەبوو. لەشەڕی ئەنفالەکاندا، ئەوەی هێزی پێشمەرگە دەیکرد، پەرچە کردار بوو، لەشەڕەکانی تردا، هێزی پێشمەرگە بەرنامەی دادەنا بۆ ئازادکردنی رەبایەیەک، لوتکەیەک، شارۆچکەیەک، هێزە چەکدارەکانی بەعس وەلامی هێرشەکەی پێشمەرگەیان دەدایەوە، کردار لای ئێمەبوو، پەرچەکردار لای سوپای عراق بوو. لەپرۆسەکانی ئەنفالدا، ئەو هاوکێشەیە پێچەوانە بووەوە، کردار لای رژێم بوو، پەرچەکردار لای هێزی پێشمەرگە بوو.

یەکێک لەبنەماکانی تری شەڕی ئەنفالەکان، بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوو، لەهەر هەشت پرۆسەکانی ئەنفالدا، سوپای عێراق، رۆژێک دوو رۆژ پێش دەستپێکردنی ئەفال، چەکی کیمیاوی گازی دەمارەکانی بەکاردەهێنا.

بۆچی ئەو مادە کیمیاوییەی بەکاردەهێنا؟ لەبەرئەوەی ئەو مادە کیمیاویە زۆر کوشندەیە، لەماوەیەکی کورتدا ژمارەیەکی زۆر خەڵک لەناو دەبات، ورەی خەڵک و پێشمەرگە دەڕووخێنێ، خەڵک و پێشمەرگە ناچار دەکات ناوچەکە چۆڵ بکەن. کاریگەری کیمیاوی گازی دەمارەکان، پاش تێپەربونی کاتێکی کەم، لەناوچەکەدا کۆتایی دێت، وەکو مادەی خەردەل نییە تا ماوەیەکی درێژ کاریگەریەکەی لەناوچەکەدا بمێنێتەوە. رژێم دەیویست پاش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دەمارەکان، هێرش بۆ ئەو شوێنە بکات کە کیمیابارن کراوە، بۆیە چەکی کیمیاوی گازی دەمارەکانی بەکاردەهێنا، تا هێزەکانی خۆی بەچەکی کیمیاوی بریندار نەبن.

تایبەتمەندییەکی دیکەی پرۆسەکانی ئەنفال، کیمیابارانی ئەو گوندانەی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان بوو کەرێژەی دانیشتوانی چڕ بوو، کیمیابارانی ئەو گوندانەش لەکاتێک دابوو کەشەڕو چالاکی سەربازی پێشمەرگە و سوپای رژێم، لەوناوەدا رووی نەدابوو. واتا لەرابوردوودا سوپای عێراق پەلاماری ئەو گوندانەی دەداو ئەو گوندانەی وێران دەکرد، کە لەنزیکیانەوە پێشمەرگە پەلاماری هێزە چەکدارەکانی رژێمی دەدا، بەڵام ئەمجارە، لەپرۆسەکانی ئەنفالدا، ئەو گوندانەی بەئامانج دەگرت کە ئاوەدان بوون، لەشەڕیشەوە دووربوون.

بەرنامەی رژێمی بەعس لەپرۆسەکانی ئەنفالدا، بەتەنیا شکستپێهێنانی هێزی پێشمەرگەو داگیرکردنەوەی ناوچە رزگارکراوەکان نەبوو، بەڵکو لەناوبردنی خەڵکی کوردستانیشی لەبەرنامەی خۆیدا داناوە. بەرنامەی ئەنفالەکانی رژێمی بەعس، تەنیا وێرانکردنی گوندو شارۆچکەکانی کوردستان نەبوو، تەنیا شکستپێهێنانی هێزی پێشمەرگە نەبوو، دەرکەوت ئامانجی دووری پرۆسەکانی ئەنفال ئەوەیە، ناوچە رزگارکراوەکان بکاتە ناوچەی قەدەغەکراو، دوای پرۆسەکانی ئەنفال، ئەو ناوچانەی کردە ناوچەی قەدەغەکراو، بۆ زیندەوەر نەبوو، بەمرۆڤ و ئاژەڵەوە، لەو ناوچانەدا بژیت.

خاڵێکی دیکەی جیاوازیی شەڕی پرۆسەکانی ئەنفال، لەگەڵ شەڕەکانی رابوردوودا، قەبارەی هێزە چەکدارەکانی رژێم بوو، لەچاو شەڕەکانی

رابـوردوودا، ژمـارەی هێزەکـەی رژێـم زۆر بـوو، بێجگـە لـەوەی خۆمـان لەنزیکـەوە دەمـانبینی، لەسـەرچاوەکانی سـوپای عێراقـەوە، لەکەناڵـەکانی ڕاگەیاندنەوە، زانیاریمان بۆ دەهات، کە هێرشـەکانی ئەنفال، لەئاستی فەیلەقی سوپای عێراق و دەیان فەوجی سوکی چەکداردا ئەنجام دراوە.

چەکەکان هەمە جۆربوون، لەشەڕی ئەنفالەکاندا، هاوەن، تۆپی دوورهاوێژ، ساروخی کاتیۆشـا، فڕۆکـە، چـەکی کیمیاوی، چـەکی کلاسـیکی بـەکاردەهێنرا، لەشەڕەکانی رابردودا، ئەو هەمەجۆرییەی چەک نەدەبینرا.

خـاڵێکی تـری جیـاوازی شـەڕەکانی ئـەنفال، بەبـەراورد بەشـەڕەکانی پێش ئەنفال، هێرشی هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراق بوو، بۆ سـەر ناوچەیـەکی فـراوان، لەهێرشـەکانی رابـوردوودا، هێـزە چەکـدارەکانی عێـراق، پـەلاماری بەرزاییـەکیان دەدا، هەوڵیانـدەدا ئـەو رەبایانـە بگرنـەوە کـە پێشـمەرگە ئـازادی کردبـوون، یـان هـەوڵی دەستبەسـەراگرتنی گونـدێک، شـارۆچکەیەکیان دەدا، لەشـەڕی ئەنفالـدا، هێـزە چەکـدارەکانی رژێـم، لەچەنـدان قوڵـەوە پـەلاماری ناوچەیـەکی فراوانیـان دەدا. لەئـەنفالی دوودا، لەچەنـد قوڵێکـەوە، لەسـنوری دەربەندیخانەوە، لەسنوری سلێمانیەوە، لەشارەزورەوە، لەبازیانەوە، پەلاماری ناوچەی قەرەداغی دا.

جیاوازییـەکی تـری هێرشـەکانی ئـەنفال، لەگـەڵ شـەڕەکانی تـردا ئـەوەبوو، هێرشـەکان بـەردەوام بـوون، وەسـتانی بـۆ نـەبوو، لـەرابردوودا کاتێـک رژێـم هێرشـێکی دەکـرد، پـاش سـەرکەوتنێک یـان شکسـتێک، هێزەکـەی پشـوویەکی وەردەگرت، لەکاتی پشووی هێزەکانی رژێمدا، پێشـمەرگەش پشـویەکی دەدا و خۆی رێکدەخستەوە، بەڵام هێرشی ئەنفال، بێ پشوو و بەردەوامبوو، لـەنێوان پڕۆسـەکانی ئەنفالـدا، چەنـد رۆژێـک هێرشـی هێـزە چەکـدارەکانی بـەعس رادەگیـرا، بـەڵام لەهـەر پڕۆسـەیەکی ئەنفالـدا، بـەبێ وەسـتان، شـەڕ درێـژەی دەکێشا، تا ناوچەکە داگیر نەکرایەتەوە، ئەنفالەکە کۆتایی نەدەهات.

لـەڕابردوودا، شـەڕەکانی هێـزی پێشـمەرگە، پـارتیزانی و نیمچـە بـەرەیی بـوون، سـوپای رژێمـیش کـە وەڵامـی شـەڕەکانی پێشـمەرگەی دەدایـەوە، لەشەڕیکی نیمچەبەرەیی کورتخایەن تێپەری نەدەکرد، بەڵام لەشەڕی ئەنفالدا،

شەڕی بەرەیی درێژخایەن بەسەر هێزی پێشمەرگەدا سەپێنرا. هێزی پێشمەرگەش لەرووی چەندایەتیەوە(ژمارە)، لەڕوی چۆنایەتیەوە (پەروەردە و تەکنۆلۆجیا)، ئامادەکاری بۆ شەڕی بەرەیی نەکردبوو، ئێرانی هاوپەیمانیش، بەبیانوی جۆراو جۆرەوە، بەشداری شەڕی ئەنفالەکانی نەدەکرد.

لەشەڕی پرۆسەکانی ئەنفالدا، رژێمی بەعس ستراتیجی سیاسی و سەربازی بەرامبەر بەگەلی کوردستان، بەرامبەر بەهێزە سیاسیەکان، بەرامبەر بەخەڵکی ناوچە رزگارکراوەکان گۆڕیبوو، پێش پرۆسەکانی ئەنفال، ئامانجی سیاسی و سەربازی رژێمی بەعس، لاوازکردنی حزبە سیاسیەکانی کوردستان بوو، تێکشکاندنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، لەڕێگەی چەندان گفتوگۆی سەرنەکەوتووەوە، رژێم هەوڵی دەدا، سوود لەتوانای سیاسی و سەربازیی گەلی کورد وەربگرێت، تا دژی دوژمنەکانی خۆی، بەکاری بێنێت. لەشەڕی ئێران - عێراقدا، دوژمنی سەرەکی عێراق، کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، کاتێک حکوومەتی بەعس بینی، کورد پشتیوانی و هاوکاری ئێران دەکات، هێزە سیاسیەکانی باشوری کوردستان، خەڵکی ناوچە رزگارکراوەکان، پشتیوانی ئێران دەکەن، شانبەشانی سوپای پاسدارانی ئێران، لەقولایی خاکی عێراقدا دژی هێزە چەکدارەکانی عێراق، دژی دەزگا ئابورییە ستراتیجیەکانی عێراق، شەڕ دەکەن، بەناوی ئازادکردنی باشووری کوردستانەوە، ناوچەو شارو شارۆچکەکانی عێراق دەخەنە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ئێرانەوە، کاتێک بۆیدەرکەوت بەبەرچاوی خەڵکی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانەوە، تۆپ و راجیمەو تەقەمەنی ئێرانی، سەدان کیلۆمەتری خاکی عیراق دەبڕیت، لەسنوری شاناخسێوە بەرەو چاڵەنەوتەکانی کەرکوک، بۆ باباگوڕگوڕ و جەبەلبۆرو زەمبور دەڕوات، نەوتی عێراق دەسوتێنن، کەس هەواڵ بۆ حکومەتی عێراق نانێرێت، ئیتر دانیشتوانی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانیشی، لەگەڵ حزبە سیاسیەکان و هێزی پێشمەرگە، وەک خائین و بەکرێگیراوی ئێرانی، دوژمنی پلەیەکی عێراق حساب دەکرد.

له شەڕەکانی تردا، سوپای عێراق تا بۆیبکرایە دەستی لە کوشتن و گرتنی خەڵکی مەدەنی دەپاراست، ئامانجی سەرەکی سوپای عێراق لە شەڕەکانی تردا تەنها لە ناوبردنی هێزی پێشمەرگە بوو.

لەپرۆسەکانی ئەنفالدا، گەلی کورد دوژمنی سەرەکی رژێمی بەعس بوو، لەئەنفالدا رژێمی بەعس لەڕێگەی هێزە چەکدارەکانیەوە بەچەکی کلاسیکی بەچەکی کیمیاوی، شەڕی لەناوبردنی هەموو پێکهاتەکانی گەلی کوردستانی دەستپێکرد.

خاڵێکی تری تایبەتی شەڕی پرۆسەکانی ئەنفال، هەڵویستی چەکدارانی فەوجە سووکەکان بوو، لەبەرئەوەی چەکداری فەوجە سوکەکان کورد بوون، شەڕی پرۆسەکانی ئەنفالیش دژی هەموو گەلی کورد دەکرا، تەنیا دژی پێشمەرگە نەبوو، هەندێک لەفەرماندەی فەوج و سریەی فەوجە سوکەکان و چەکدارەکانیان، هەستی نەتەوایەتی و ئینسانیان دەجووڵا، لەپرۆسەکانی ئەنفالدا، لەچەندان شوێندا، هەوڵی پاراستنی ژیانی هێزی پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانیان دەدا، خەڵکیان لەدەست سەربازەکانی رژێم وەردەگرتەوە، دەیانکردن بەچەکداری خۆیان، یان دەیانوت خزمی نزیکی خۆمانن، بۆئەوەی لەئەنفالکردن رزگاریان بکەن.

**شەڕی مەسۆیی و سێوسێنان:**

کە بینیمان هێزە چەکدارەکانی رژێم رۆژ لەدوای رۆژ تەنگمان پێهەڵدەچنن، نەخۆشخانەم کرد بەدوو بەشەوە، دکتۆر ناسح و دکتۆر ناجحی برام و ژمارەیەکی تری کارمەندی تەندروستی، بەبرێک دەرمان و پێداویستی پزیشکیەوە، رەوانەی قۆپی قەرەداغ کران، خۆم و دوو کارمەندی تەندروستی لەنەخۆشخانە، لەنزیک بەلەکجار ماینەوە، هەندێک دەرمانی زیادەمان هەبوو، لەژێر تاشەبەردێکدا شاردمەوە، بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا سوودی لێوەربگرین.

دوای چەند رۆژێک لەو دابەشکردنە، هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراق، گوندی مەسۆیی قەرەداغیان داگیرکرد، مەسۆیی لەنەخۆشخانەوە نزیک بوو،

هێزەکـەی رژێـم بـۆ داگیرکردنـی گونـدی سێوسـێنان ئامادەکـاری دەکـرد، کەرتێکی تیپی ٥٥ قـەرەداغ، لەشـاخەکەی نێوان گوندی سێوسێنان و گوندی دەلوجەدا سەنگەری گرتبوو، دژی هێزەکـەی مەسـۆیی تەقـەیان دەکرد، مـن و حەمـەڕەزاو عـەلی رەشـیدو مەفرەزەکـەی شـێرکۆ مڕانـەیی، لەمبـەری چـەمی دێوانەوە پەلاماری ئەو هێزەمـان دا، کـە دەیوسـیت بـەرەو سێوسـێنان بڕوات، چەکەکانمان کلاشینکۆف بوو، لەو کاتەدا چـەکێکی بڕنـەومان لابوو، بەحسـاب گولەی بڕنەو مەسافەیەکی زۆرتر دەڕوات، من بڕنەوەکەم هـەڵگرتبوو، بـەرەو رووی هێزەکەی رژێم تەقەمان دەستپێکرد، هێزەکە پاشەکشێی کرد.

پاش ماوەیەک، چەند زیلێکی سەربازی لەگوندی مەسۆییەوە بەرەو گوندی سێوسـێنان جـووڵان، عـەلی رەشـید فەرمانـدەی کـەرتی تیپـی مەڵبەنـد بـوو، لەهـەمومان باشـتر لـەجموجوڵی سـەربازی دەزانـی، کـە زیلـەکانی بینـی وتـی: هەستن با بگەڕێینەوە دواوە، وتم: بۆ بگەڕێینەوە؟ وتی: ئەو هێزەی ئـەمجارە هێـرش دەکـات، هێـزی سـوپایە، جـاش نییـە، سـوپا هـەزار تەقـەی لێبکـەیت پاشەکشـە ناکـات، ئـەو هێـزەی ئێمـە تەقـەمان لێکـردو گەڕایـەوە، ئـەوە هێـزی جاش بـوو، جـاش بـەئارەزووی خۆیـەتی، هێرش بکـات یـان بگەڕێتـەوە، بـەڵام سوپا وا نییە، کە هێرش بکات ناگەڕێتەوە.

بەو شێوەیە عەلی قەناعەتی پێکردین، کە لەو شـەڕەدا بکشێینەوە، هەر ئـەو رۆژە هێزە چەکدارەکانی عێراق گەیشتنە گوندی سێوسێنان، ئـەو گوندەی کـە ٧-٨ هەشـت رۆژ لەوەوبـەر، ئـەو هێـزە چەکـدارە کیمیابـارانی کردبـوو. بـە داگیرکردنـی گونـدی سێوسـێنان، تـەنها دووچـاری شکسـتێکی سـەربازی نەبووین، دووچاری شکستی سیاسی و روحیش بووین. ئەو گوندە پایتەختی ناوچەی رزگارکراوی قەرەداغ و هێزی پێشمەرگە بوو، دەیان ساڵ بوو ئازاد بوو، ئێستا کەوتە دەست سوپای ئەنفال.

**ناشبەتاڵی سەربازی:**

من و حەمەڕەزاو عەلی رەشیدو شێرکۆو چەند پێشـمەرگەیەک، لـەبارەگای کۆنی مەڵبەند مابووینـەوە، شـێرکۆ مڕانـەیی یـەک لەپێشـمەرگەکانی دەسـتەی

خۆی نارد بۆ قۆپی قەرەداغ، بۆئەوەی زانیاری و بڕیاری نوێی مەڵبەند بزانین. کە پێشمەرگەکە گەڕایەوە، وتی: ئێمە دەورمان گیراوە، دەبێت بەزووترین کات بەرەو قۆپیەکان بڕۆین. بەباشمان نەزانی بەشەو بەرەو قۆپی بجووڵێین، نەوەک بکەوینە کەمینەوە. بۆ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو، بەرەو قۆپیەکان بەڕێکەوتین. کە گەیشتینە قۆپی، بەهادین نوریمان بینی، شێرکۆ مرانەیی پرسیاری لێکرد؟ وتی: هاوڕێ بەهادین ڕەئیت چییە بەرامبەر ئەم شکستە، بەهادین نوری بەئەسپایی وتی: ئەمە ئاشبەتاڵێکی سەربازیە، ئاشبەتاڵی سیاسی نییە، ساڵی ١٩٧٥ پێشمەرگە لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوو، بەبڕیاری سیاسی چەکیان پێداناو شەڕی نەکرد، ئەوەی ئەو کاتە ئاشبەتاڵی سیاسی بوو، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ لەساڵی ١٩٨٨دا دەیبینین، سەرکردایەتی سیاسی کورد ئامادەیە شەڕ بکات، بەڵام بەهۆی چەکی کیمیاوییەوە، پێشمەرگە توانای شەڕی نەماوە، ئەمە ئاشبەتاڵی سەربازییە.

**لەگەڵ عومەر فەتاح:**

کاتێک گەیشتینە قۆپی قەرەداغ، مەڵبەند بارەگای پێچابوەوە، بەرەو گەرمیان دەچوون، لەناو هێزەکەدا بە برادەرانی نەخۆشخانە گەیشتمەوە. کەمێک لەبارەگای مەڵبەند دورکەوتینەوە، عومەر فەتاحی جێگیر بەرپرسی مەڵبەندم بینی، بەرامبەر بەدۆشکەکەی پاراستنی مەڵبەند ڕاوەستا، داوای لەپێشمەرگە کرد، دۆشکەی سەر ئەو بەرزاییە داگرن و بیشارنەوە، هیچ کام لەپێشمەرگەکان وەڵامیان نەدایەوە و بەدەم داواکەیەوە نەچوون. منیش کۆڵەپشتێ دەرمانم بەکۆڵەوە بوو، تفەنگێکم لەشاندا بوو، هەردوکیانم دانا، بەرە و لای دۆشکەکە سەرکەوتم، وتم کە ئێوە کەستان ناچن ئەو دۆشکەیە داگرن، وامن دەچم، (نەشمدەزانی چۆن دۆشکەکە بکەمەوە) کاتێک پێشمەرگەکان ئەو هەڵویستەی منیان بینی، چەند پێشمەرگەیەک لەشوێنی خۆیان هەستان، وتیان دکتۆر تۆ مەڕۆ، ئێمە دۆشکەکە دادەگرین و دەیشارینەوە.

بەرەو لوتکەی شاخەکانی قۆپی قەرەداغ کەوتینە رێ، لەرێگەدا قسەم لەگەڵ عومەر فەتاح دەکرد، وتم: خەڵکی ناوچەکە خۆی تەسلیمی حکومەت دەکاتەوە، وتی: چی بکەین؟ نابێت رێگرییان لێبکەین. مەسافەیەکی تر رێگەمان کرد، لەو کاتەدا مام جافری هاورێم پەیدابوو، رابەر سیاسی تیپ بوو، وتی: دکتۆر دوێنێ لەگوندی چەمی سمور، فرۆکەی رژێم بوردمانی کردین، پێشمەرگەیەک شەهید بوو، کاتێک دەستم کرد بەگیرفانیدا، بۆئەوەی پێناس و بەڵگەکانی هەڵگرم، ئەم بەڵگەیەشی پێبوو، لای کەس قسەم نەکردوە، تۆ بیدە بەعومەر فەتاح، کە بەڵگەکەی پیشاندام، بەڵگەی فەوجێکی هەواڵگری سەربازی رژێم بوو، بەگوێرەی ئەو بەڵگەیە بێت، ئەو پێشمەرگەیە کاری بۆ هەواڵگری ئەو فەوجەی رژێم کردوە، بەڵگەکەم دایە دەستی عومەرفەتاح، لێیوەرگرتم و خوێندیەوە، وتی: دکتۆر ئەوە خۆمان رێگەمانداوە، بۆ سوودی خۆمان ئەو کارەی کردوە. ئەگەر ئەو قسەیەی عومەرفەتاح راستیش نەبێ، هەر دەبوو لەو کاتەدا وای بوتایە، بۆئەوەی ورەی من و مام جافر دانەبەزێت.

خەریکبوو شەو دادەهات، گەیشتبووینە لووتکەی قۆپیەکانی قەرەداغ، لەوێوە بەرەو گەرمیان دەرۆیشتین، مقۆمقۆیەک کەوتە ناو هێزەکەوە، وتیان بڕیار دراوە، هەرچی زیندانی عەرەبمان لایە، لەتۆڵەی شەهیدانی هەڵەبجەدا بیانکوژین. پێشمەرگەیەک لەو کاتەدا لەنزیک منەوە بوو، وتی با من برۆم لەتۆڵەی خزمەکانمدا دوو عەرەب بکوژم، لەبەرئەوەی بەلامەوە روونە کە لەهەڵبجە شەهید بوون، ئەو پێشمەرگەیە منی بەجێهێشت، نازانم دیلی عەرەبی کوشت یان نا.

هەر ئەو رۆژە هێزێکی تیپی ٨٥ قەرەچوخ لەخوارووی هەولێر، چووبوونە سەر گوندێکی عەرەب، لەتۆڵەی شەهیدانی هەڵەبجەدا، گوندە عەرەبەکەیان کۆمەڵکوژ کردبوو.

گەیشتینە گەرمیان، نازانم لەکام گوندەی گەرمیان بووین، لەگەڵ عومەر فەتاح وەستابووم، گوێم لەهەواڵەکانی رادیۆی B B C دەگرت، لەو کاتەدا مامجەلال لەدەرەوەی وڵات بوو، BBCچاوپێکەوتنی لەگەڵ مامجەلال دەکرد،

دەربارەی ئەنفالی یەک و داگیرکردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی ینک، پرسیاریان لەمامجەلال کرد، مامجەلال بەوپەڕی ورە بەرزیەوە وەلامی پرسیارەکانی دەدایەوە، وتی: دەربارەی بارەگاکانمان لەبەرگەڵو، ئەوە خۆمان پاشەکشێمان کرد، پاشەکشێیەکی تەکتیکی بووە، ئێستا هێزەکانمان لەدەورووبەری چاڵەنەوتەکانی کەرکوکدان. لەو کاتەدا بەعومەر فەتاحم وت: ئەرێوەڵڵا مامجەلال ئاشکرای کردین، عومەر فەتاح لەو شوێنە دوورەشەوە، بەگاڵتەشەوە رەخنەیەکی لەمامجەلال نەگرت، بێدەنگی هەڵبژارد، بەلام بۆ رۆژی دوایی، هێرشەکانی رژێم لەقوڵی کەرکوک و قادرکەرەم و کەلارو کفریەوە، بەرەو تەختایی گەرمیان دەستیان پێکرد.

لەگوندێکی گەرمیان مابوینەوە، نازانم بەشوێن چیدا دەگەڕام، پێنجسەد دیناری عێراقیم دۆزیەوە، دیسان چوومەوە بۆ لای عومەر فەتاح، وتم: پارەم دۆزیوەتەوە، چی لێبکەم؟ ، وامدەزانی پارەکە دەمخوات، عومەر فەتاح وتی: با لای خۆتبێت، ئێستا خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە. نیوکاتژمێر بەسەر دۆزینەوەی پارەکەدا تێنەپەڕی، دوو پیاو بەهەڵەداوان هاتن بۆ گوندەکە، چوونە ناو ئەو خانوەی پارەکەم لێ دۆزیبوویەوە، دەستیان بەپشکنین کرد، منیش هەر چاودێریم دەکردن، بیرم نایەت کە خۆیان پرسیاریان لێکردم پارەیان ونبوە، یان خۆم وتم: بەشوێن چیدا دەگەڕێن؟ دوای ئەوەی لەسەر جۆرو بڕی پارەکە زانیاریان دامێ، پێنجسەد دینارەکەم تەسلیمکردنەوە.

**کەس نەروات:**

دوای ئەوەی چەند رۆژێک لەگەرمیان ماینەوە، قادری حاجی عەلی بەرپرسی مەڵبەند، لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەند، گەڕایەوە، بەو هۆیەوە ورەی پێشمەرگە بەرزبوەوە. بەلام خەڵکی گەرمیان لەئەنفال دەترسان، دەیانویست گوندەکانیان چۆڵ بکەن، بەرەو شارۆچکەکانی ژێر دەسەلاتی رژێم بڕۆن، تا خۆیان لەئەنفال بپارێزن. لەسنووری سەنگاو، لەنزیک گوندی هەزار کانی، پێشمەرگە بەبێتەل بەرپرسی مەڵبەندی ئاگادار کردەوە، دەیانوت: خەڵکی گوندەکانی ئەو ناوە، خۆیان ئامادە کردوە بەرەو سەنگاو بڕۆن، رێگەیان

بدەین، یان ڕێگریان لێبکەین؟ لەو کاتەدا من لەتەنشتی بەرپرسی مەڵبەندەوە وەستابووم، بەرپرسی مەڵبەند کە تازە لەئەنفالی یەک گەڕابویەوە، بەچاوی خۆی ئەنفالی یەک و ڕەوشی خەڵکی دیبوو، وتی: ڕێگە مەدەن کەس بڕوات بۆ ژێر دەسەلاتی رژێم، وتیان ئەگەر بەقسەی پێشمەرگەیان نەکرد چی بکەین؟ ، وتی: مەهێڵن بڕۆن، ئەگەر هەر سووربون لەسەر رۆیشتن، بۆئەوەی ڕێگەیان لێبگرین، دەتوانن تا چوار کەسیان لێبکوژن.

دواتر دەرکەوت ئەو گوندییانەی ویستبوویان لەهەزار کانیەوە بەرەو سەنگاو بڕۆن، رۆیشتبوون، خۆیان لەئەنفال رزگارکردبوو، هێزی پێشمەرگەی ئەو سنوورەش، بەگوێی بەرپرسی مەڵبەندی نەکردبوو، کەسی لێنەکوشتبوون.

**قوپی قەرەداغ:**

لەئەنفالی دوودا، پێش ئەوەی هێرشی هێزە چەکدارەکانی عێراق بگاتە قۆپیەکانی قەرەداغ، مەڵبەندی یەک، قۆپیەکانی چۆڵکرد، پێشمەرگە ناوچەیەکی سەختی لەکیس دا، کە پێشمەرگە قۆپیەکانی چۆڵکرد، رژێم هێرشی بۆ قۆپیەکان نەکرد، قۆپیەکان ناوچەیەکی سەختی شاخاوی بوون، دەتوانرا بۆ ماوەیەکی درێژ شەڕی تێدا بکرێت، ئەگەر رژێم چەکی کیمیاویشی بەکاربهێنایە، بەهۆی بەرزی شاخەکانەوە، بەهۆی روەکی خۆڕسکەوە، کاریگەری کیمیاویەکە لەسەر پێشمەرگە کەم دەبوو، کەچی مەڵبەند ئەو ناوچە شاخاوییە سەختەی چۆڵکرد، بەرەو تەختایی گەرمیان رۆیشت.

گەرمیان لەڕووی سەربازیەوە، ناوچەیەکی تەخت بوو، پێشمەرگە نەیدەتوانی لەو دەشتەدا ڕووبەڕوی چەکی کیمیاوی و فڕۆکە و تانک و تۆپی دوژمن ببێتەوە، گەرمیان ناوچەیەکی لەبار نەبوو بۆ شەڕی پێشمەرگە، بۆ هێرشی هێزەکانی رژێم ناوچەیەکی لەبار بوو. کاتێک هێزەکەمان گەیشتە گەرمیان، هەم خەڵکی گەرمیان ورەی رووخا، هەم هەندێک لەکادێرەکانی پێشمەرگە ڕووخان، کادرەکان داوایان لەخەڵک دەکرد گوندەکانیان چۆڵ بکەن، نەوەک رژێم وەک گوندەکانی قەرەداغ کیمیابارانیان بکات، ئەمە وای

کرد پێش دەستپێکردنی ئەنفالی سێ، خەڵکی گەرمیان ناوچەکە چۆڵ بکەن، پێشمەرگە تەنها بەجێبهێڵن، بەو شێوەیە لەئاستی دەروونیشەوە، خەڵک رووخا، ناوچەکەی چۆڵ کرد، دەرفەتی شکستی بۆ هێزی پێشمەرگە خۆشتر کرد.

ئەگەر هێزی پێشمەرگە لەقۆپیەکانی قەرەداغدا بمایەتەوە، ورەی خەڵکی گەرمیان بەرزدەبوەوە، ترس لەدڵی هێزەکانی رژێمدا دەمایەوە، لەئەنفالدا دەستیان دەپاراست.

**ئەنفالی سێ:**

هێندە لەگەرمیان نەماینەوە، هێرشی ئەنفالی سێ دەستیپێکرد، لەقۆڵی کەلارو دەربەندیخانەوە، لەقۆڵی سەنگاوەوە، لەقۆڵی قادر کەرەمەوە، لەقۆڵی کفریەوە، هێزەکانی رژێم دەستیان بەهێرش کرد، شەڕ دەستیپێکرد، سەرەتا پێشمەرگە بەرگرییەکی باشی دەکرد، رێگەی نەدەدا هیزەکانی رژێم پێشرەوی بکەن. بەڵام لەگەڵ بەردەوامی هێرشەکانی رژێمدا، تا دەهات سنوری هێزی پێشمەرگە، بەرتەسک دەبوەوە.

بەشی تەندروستی مەڵبەند، بەپزیشک و کارمەندو بریندارەوە، لەگوندی کوردەمیرەکان بووین، ئاگاداری باری سەربازی شەڕگەکان نەبووین، سەر لەبەیانی رۆژی ١٤-٤-١٩٨٨ لەگوندی کوردەمیرەکانەوە، بەرەو گوندی مەسۆیی سەرچەم، بۆ لای بەرپرسەکان رۆیشتم، گەیشتمە لایان، پرسیارم لێکردن: ئێمە وەک نەخۆشخانە چی بکەین، وەڵامێکی ئەوتۆیان نەدامەوە، لەوە دەچوو زانیاری وردیان لەسەر بارودۆخی شەڕەکە نەبوبێت، وتیان: بڕۆرەوە بۆ لای بریندارەکانت تا ئاگادارت دەکەینەوە. کە گەڕامەوە بۆگوندی کوردەمیرەکان، لەسەر رێگاکە پێشمەرگەیەکی دادگای مەڵبەندم بینی، وتی: دکتۆر مەگەڕێرەوە بۆ کوردەمیرەکان، ئەو دەڤەرە مەترسی لەسەرە، منیش وتم: دکتۆرو بریندارم بەجێهێشتووە، چاوەڕوانی من دەکەن، دەبێت بگەڕێمەوە، گوێم بەقسەی ئەو پێشمەرگەیە نەداو گەڕامەوە. کاتێک

گەیشتمەوە کوردەمیرەکان، پزیشکان و برادەرانی نەخۆشخانە و بریندارەکان چاوەڕوانی منیان دەکرد، منیش هیچ بڕیارێکیم پێنەبوو.

کەمێک پشوومدا، خەریکی قسەکردن بووین، لەو کاتەدا عادل شوکرم بینی، لەگەڵ مەفرەزەیەک پێشمەرگەدا، بەرەو بنار دەڕۆیشت، لێی نزیک بوومەوە، جهازێکی بەدەستەوە بوو، بەجهازەکە قسەی دەکرد، پرسیارم لێکرد وتم: کاک عادل ئەوە بۆ کوێ دەڕۆن، وتی: ئێمە کشاینەوە، بەرەو قۆپی قەرەداغ دەڕۆین، وتم: ئەی ئێمە چی بکەین؟ ، وتی: ئەوە جهازە لەگەڵ قادری حاجی عەلی قسە بکە، بەجهازەکەی عادل شوکر، قسەم لەگەڵ قادرکرد، وتم: ئێمە چیی بکەین؟ وتی: ئێوەش لەگەڵ تیپی ٥١ پەنجا و یەکی گەرمیان دا وەرن.

تا ئێستاش لەدڵی خۆمداو لای خەڵکیش دەیڵێمەوە، ئەگەر لەو کاتەدا عادل شوکر[٤٤] لەنزیک نەخۆشخانە کاتیەکەی ئێمەدا نەکشایەتەوە، کیلۆمەترێک لەدووری ئێمەوە بکشایەتەوە، هەر هەموومان بەبریندارو پزیشکەوە، پێکەوە ئەنفال دەکراین. دیسان پرسیار دەکەم، ئایا بەرپرسانی مەڵبەند، بەڕاستی ئاگاداری بەرەکانی شەڕ نەبوون؟ بۆیە بەمنیان وت، لەشوێنی خۆتان بن تا ئاگادارتان دەکەینەوە، یان زانیاریان هەبوو، دەیانویست هەموومان بەر ئەنفال بکەوین و لەناو بچیین.

**بریندارەکان:**

بڕیاردرا گەرمیان چۆڵ بکەین، بەرەو قۆپی قەرەداغ بگەڕێینەوە، (١٠) دە بریندارمان هەبوو، زۆربەی بریندارەکان پێشمەرگەیان لەگەڵدا بوو،

---

٤٤ عادل شوکرد کادرێکی سەربازی لەسەرخۆی هێزی پێشمەرگە بوو، خەڵکی دەڤەری گەرمیان بوو، ئەوە دووەم جار بوو ئاشبەتاڵ ببینێت، لەشۆڕشی ئەیلودا پێشمەرگە بوو، دوای کارەساتی ساڵی ١٩٧٥ خۆی رادەستی رژێمی عێراق نەکردبوەوە، بڕواشی بەسەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول نەمابوو، لەگەڵ ژمارەیەک لەپێشمەرگەکانی هاوڕێیدا، لەئێرانەوە گەشتی دەرەوەی ولاتیان کردبوو. کاتێک گەیشتبووە سوریا، زانیبوی یێک دامەزراوەو خەباتی چەکداری دەستپێکردۆتەوە، لەگەڵ سامان گەرمیانی هاوڕێیدا، بڕیاریاندابوو بگەڕێنەوە کوردستان و بەشداری خەباتی پێشمەرگایەتی بکەن.

بەپێشمەرگەکانم وت: بریندارەکان لەگەڵ خۆتان بهێنن. ئەبو فەلاح کادرێکی خەڵکی کفری بوو، چەند رۆژێک لەوەو پێش لوغم بەلاقیدا تەقیبوو، لەخوار ئەژنۆیەوە لاقیم بۆ برییەوە. سێ تا چوار پێشمەرگەی شارەزا و بەئەزمونی لەگەڵدا بوو، یەکسەر ئەبو فەلاحیان هەڵگرت و لەچاو ونبوون. دوایی دەرکەوت کە نەهاتونەتە قۆپی قەرەداغ، لەگەرمیانەوە بەشارەزایی خۆیان، یان بەهاوکاری دۆستانیان، بریندارەکەیان گەیاندبووە ناوشوان، هەر لەوێشەوە نەوەستابوون، بەرەو سنوری مەڵبەندی سێ رۆیشتبوون، دوای هەفتەیەک گەشتبونە قەندیل و لەوێوە بۆ ئێران.

حەمە لەتیف کادرێکی تر کە لەشەڕی ئەنفالی دوودا بریندارببوو، هێشتا برینەکەی سارێژ نەببوو، هاوڕێی نزیکی مام برایم بوو، مام برایم بەرپرسی کارگێڕی نەخۆشخانە بوو، وتی: دکتۆر با حەمە لەتیف سواری هێسترەکەی نەخۆشخانە بکەین، وتم: زۆر باشە، حەمەلەتیفمان سواری هێستر کرد، لەگەڵ خۆمان هێنامان.

بریندارێکی ترمان هەبوو، پێشمەرگەیەکی خەڵکی کەرکوک بوو، برینەکەی چاک ببووەوە، بەڵام کەمێک دەشەلی، وتم وەرە لەگەڵمان، وتی ناتوانم بێم، ئەگەر چەکێکم هەبێت خۆم بەچەکەوە تەسلیم بکەمەوە نامکوژن. نازانم قسەکەی تا چەند راستبوو، وتی چەکێکم بدەنێ هەر لێرە دەمێنم تا دوژمن دەگاتە ناوچەکە، منیش زۆر لەسەری نەڕۆیشتم، کلاشینکۆفەکەی شانی خۆمم داگرت و دامە دەستی، وتم: ئەگەر ژیانی تۆ بەو چەکە بپارێزرێت، ئەوە چەک، من چەک پەیدا دەکەم.

بریندارێکی ترمان هەبوو، گولە بەر سەری و پشتی کەوتبوو، بێهۆش بوو، هەرچوار پەلی نەدەجولا، کەسی لەگەڵ نەبوو، هەرچیمان کرد نەمانتوانی لەگەڵ خۆمان بیهێنین، بەناچاری هەر لەوێ بەجێمانهێشت، ئەو بریندارە ناوی محەمەد کۆشکی بوو، پێشمەرگەی تیپی ٥١ گەرمیان بوو.

**ناكشێینەوە:**

لەئەنفالی دوودا، هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراق، وەک لەشکری ٩ بەدرو کۆمەڵێک ڕێکخراوی تر، قۆپی قەرەداغیان بەجێ نەهێشت، لەناو قۆپیەکاندا مانەوە، بەر هێرشی ئەنفالی سێ نەکەوتن، ئێمە لەئەنفالی سێدا لەگەرمیان شکاین، گەڕاینەوە بۆ قۆپی قەرەداغ. لەگەڵ عومەر فەتاح سەردانی لەشکری ٩ بەدرمان کرد، عومەر فەتاح بەهادی عامری وت: وەرن لەگەڵماندا، لێرە پاشەکشێ دەکەین، گەرمیان و قەرەداغ چۆڵ دەکەین، عامری بەو داوایەی عومەر فەتاح رازی نەبوو، وتی: ئێمە لێرە دەمێنینەوە پاشەکشە ناکەین. تا چەند رۆژێک دوای پاشەکشێی ئێمە، ئەوان لەقۆپی قەرەداغ مانەوە، دواتر پاشەکشەیان کردو بەدواماندا هاتن.

**عومەر و غەریب ئەنفالکران:**

ئەو رۆژەی لەگەرمیان کشاینەوە، ئێوارەکەی گەشتینەوە قۆپی قەرەداغ، شەو لەقۆپی خەوتین، دنیا ئارام بوو، هێزەکانی رژێم دەنگیان نەبوو. بۆ شەوی دواتر، لەڕێگەی نێوان جافەران و سەگرمەوە، بۆ بەری بازیان پەڕینەوە ، لەگوندی قازانقایە نزیک بووینەوە، خەریک بوو رۆژ دەبوەوە، هەر هێزە لەلای خۆیەوە لەدەرەوەی گوندەکانی ناوچەی بازیان، لەدەشتەکەدا، لەناو دەغڵ و دانی بەهاردا، خۆی پەنادا.

نزیکەی کاتژمێر هەشتی بەیانی رۆژی ١٦-٤-١٩٨٨بوو، لەناو کێڵگەیەکی گەنمدا خەوتبووین، بەدەنگی تەقەی چەکی قورس خەبەرمان بوەوە، لەپڕ دەنگی فڕۆکەش بۆ تەقەکە زیاد بوو، تەقەکردن درێژەی کێشا، تەقەکە لێمانەوە نزیک بوو، نەماندەزانی چیی بکەین، باشترین کارێک کە بیکەین ددان بەخۆدا گرتن بوو، نەجوڵێین و خۆمان ئامادەبکەین بۆ شەڕ. ئەگەر هێزەکانی رژێم هاتنە سەرمان بەرگری لەخۆمان بکەین، خۆمان نەدەین بەدەستەوە.

براکانی شەهید سیروان تاڵەبانی (عومەر و غەریب و پێشمەرگەکانیان) تا ئەو کاتە لەگەڵ ئێمە بوون، لەکاتی دروستبوونی شەڕەکەدا، لای ئێمەیان بەجێهێشت، نەمزانی بەرەو کوێ دەڕۆن، زۆر بەداخەوە دوای کۆتایی هاتنی

ئەنفال و دوای راپەڕین، سۆراغم کردن، بۆمدەرکەوت کە کەوتونەتە دەست هێزەکانی رژێم و بێ سەروشوێن کراون.

دوای چەند کاتژمێرێک، شەڕ کۆتاییهات، هەواڵێک لەناو پێشمەرگەدا بڵاوبووەوە، کە هێزەکانی رژێم هێرشیان بۆ سەر بەرپرسەکانی مەڵبەند کردوە، هەر هەموبەرپرسەکان شەهید بوون. دوایی دەرکەوت کە عومەر فەتاح، کافی خان، شێخ جەعفەر، عومەر غەریب، رەحمەخانی هاوسەری عومەر غەریب، حەمەجەزای هونەرمەند و براکانی، هەمو پێکەوە بوون، چەند مەفرەزەیەک پێشمەرگەیان لەگەڵدابووە، لەشوێنێکی کەمێک سەختدا بوون، چەند ژێربەردێکی تێدابوە، دوژمن گومانی کردبوو پێشمەرگە لەو شوێنەدا خۆی بشارێتەوە، بۆیە هێرشیان بۆ کردبوون.

بە رێکەوت ئەو هێزەی پەلاماری شوێنی بەرپرسەکانی مەڵبەندی دابوو، گەلەجاشێکی سنوری ناوچەی ماوەت بوون، بەرپرسی یەکەمی هێزەکەی ئێمەش (عومەر فەتاح)، خەڵکی ماوەت بوو.

کە شەڕ راگیرا، لەناو کێڵگە گەنمەکە هاتینە دەرەوە، کات بەرەو ئێوارە دەچوو، هەواڵی بەرپرسەکانمان نەدەزانی، نەماندەزانی بەرەو کوێ بڕۆین، کەی بڕۆین، نەماندەزانی ئایا هێزی دوژمن لەگوندەکانی ناوچەی بازیاندا هەیە؟ یان گوندەکان چۆڵن، شەوی ئەو کاتەی ناوچەی بازیان سارد بوو، دوو شەوی ساردمان لەقۆپی قەرەداغ و لەکێڵگە گەنمەکانی بازیاندا بەڕێکردبوو، توانای شەوێکی تری ساردمان نەمابوو، بۆیە دوای کۆبونەوەی هێزە بڵاوەکان، من و جەلال کوڵکنی و سۆران (فەیسەل سیامەنسوری) بڕیارماندا بچینە ناو گوندی قازانقایە، شەو لەوێ بمێنینەوە، چاوەڕوانی هەواڵی بەرپرسەکانی مەڵبەند بکەین.

هەرسێکمان لەپێشی هێزەکەوە بەرەو قازانقایە بەڕێکەوتین، خۆشبەختانە گوندی قازانقایە چۆڵ بوو، هێزی عێراقیی لێنەبوو، هەر مەفرەزەیەک لەخانویەکی چۆڵدا ماینەوەو پشوومان‌دا، ناوی نهێنیمان دانا، ئێشکگرمان دەرکرد.

ئەو شەوە لەگوندی قازانقایە، دوو برادەری کادر هاتن بۆ لام، وتیان: دکتۆر بڕوامان وایە بەرپرسانی مەڵبەند شەهید بوون، ترسی ئەوەمان هەیە لەرۆژانی ئایندەدا ئێمەش تیابچین، ڕێگەیەکمان بۆ دەربازبون دۆزیوەتەوە، حەز ئەکەین تۆش لەگەڵماندا بێیت. دواتر وتیان: ناتوانین هەر هەموو مەفرەزەی نەخۆشخانە لەگەڵ خۆمان ببەین، بەلام دەتوانین تۆو دکتۆر جەبارو د. ناجحی برات لەگەڵ خۆمان ببەین.

من ورەم بەرنەدابوو، بەداواکەی ئەو دوو برادەرەم رازی نەبووم، لەو کاتەدا مەفرەزەی نەخۆشخانە ١٣ سێزە کەس بووین، وتم قەت ئەو برادەرانەی نەخۆشخانە بەجێناهێڵم، لێیان دوورناکەومەوە.

کاتێک دوو کادرەکە ئەو هەڵوێستەی منیان بینی، لەپێشنیارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە، خۆشیان لەهێزەکە دوورنەکەوتنەوە، لەگەڵمان مانەوە.

لەبەرئەوەی من یەکەم کەس بووم چوومە ناو گوندی قازانقایە، یەکەم خانووی گوندەکەم لەڕوی رۆژهەلاتەوە کرد بە بنکەی نەخۆشخانە، کاتژمێر ١١-١٢ شەو، ئێشکگری بنکەی نەخۆشخانە بووم، دەنگەدەنگێک هاتە بەرگوێم، لەوە دەچوو ژمارەیەک خەڵک پێکەوە رێبکەن و قسە بکەن، گوێم راگرت، هەستمکرد دەنگەکان وردە وردە نزیکدەبنەوە، کە زۆرتر نزیکبونەوە، دەنگی شێخ جەعفەرم لەناو دەنگەکاندا ناسییەوە، چەند مەترێکیان مابوو بگەنە دەرگای ئەو خانوەی منی تێدا بوو، وتم: کێن؟ ، شێخ جەعفەر وەلامی دایەوە وتی: خۆمانین، تۆ کێی؟ منیش ناوی خۆمم وت. برادەرانی بەرپرسی مەڵبەندم بینی، سەلامەت بوون، خالد ماوەتی و حەمەڕەئوفی برای عومەر غەریب بریندار بوون، خالد گولەبەرسەری کەوتبوو، کەمێک گێژ بوو، هۆشی لەخۆی بوو، بەلام لایەکی دەست و لاقی لاوازببوو، حەمەڕەئوف گولە بەر قوڵی کەوتبوو، قوڵی شکابوو، شێخ جەعفەر وتی: بەشێوەیەکی کاتی چارەسەری بریندارەکان بکە تا سبەینێ، سبەینێ وەرە بۆ ژێر دارستانەکەی قازانقایە، ئێمە شەو لەناو گوندەکەدا نامێنینەوە، یەکسەر دەچین بۆ ناو دارستانەکە.

ئەو شەوە بۆماندەرکەوت برادەرانی مەڵبەندەد، روبەڕووی شەڕ بوونەتەوە، بەڵام ئەنجامی شەڕەکە بەسوودی پێشمەرگە شکابوەوە، بەرپرسەکان هەر هەموویان سەلامەت بوون، خالدو حەمەڕەئوف بەسوکی بریندار ببوون. لەشەڕەکەدا ژمارەیەک جاش کوژرابوون، یەکێک لەجاشەکان بەبرینداری بەجێمابوو، کەوتبوە دەستی پێشمەرگە، بەپێشمەرگەیەکی وتبوو: ئەگەر نەمکوژیت خۆشکێکی خۆمت لێمارەدەکەم، بەڵام کار لەکار ترازابوو، لەشەڕەکانی رابوردوودا، چەندان چەکداری حکومەت دەستگیر دەکران، نەدەکوژران، زیندانیدەکران، ئەگەر تاوانی گەورەیان ئەنجام نەدابایە، ئازاد دەکران. بەڵام لەشەڕی ئەنفالدا، هەر کەس بەردەستی پێشمەرگە بکەوتایە، یەکسەر بەسزای گەل و شۆڕش دەگەیشت.

**مێوڵی:**

هەر ئەو شەوە، بەشی دووەمی هێزەکەمان کە لەگەڵ قادری حاجی عەلی بوو، لەقۆپی قەرەداغەوە بەرەو لای ئێمە هات، کەڕۆژ بووەوە، گەیشتنە گوندی قازانقایە. هێزەکەمان بەسەر چەند شوێنێکی دەوروبەری قازانقایەدا دابەشکرا، مەفرەزەی نەخۆشخانە لەگەڵ براکانی قادری حاجی عەلی، لە گوندی مێوڵی بووین، پێش ئەنفال گوندی مێوڵی بارەگای تیپی ٥٧ سەگرمەی لێبوو، دکتۆر جەبار پزیشکی تیپی ٥٧ سەگرمە بوو، جارێکی تر لەگەڵ دکتۆر جەبار چوینەوە گوندی مێوڵی، بەڵام ئەمجارەیان گوندێکی چۆڵ، رێکخستن و دسپلینە ئاسنینەکەی ئازادی سەگرمەی لێ نەمابوو، هەواڵی چالاکیەکانی مامە ریشەی فەرماندەی کەرتی چواری جەباری، تێدا بڵاونەدەکرایەوە، تەنیا هەندێک دەرمانی نەخۆشخانەکەی دکتۆر جەباری لێمابوو، لەناو دەرمانەکاندا گەچی گرتنەوەی شکاویم دۆزییەوە، کە گەچەکەم دۆزییەوە، باوەشم پێداکرد، وتم ئەم گەچە بۆ قۆڵە شکاوەکەی حەمەڕەئوف باشە.

دوای نیوەڕۆ، هەندێک دەرمان و گەچم خستە کۆڵەپشتەکەمەوە، لەگەڵ دکتۆر مەحمود ملی رێگەمان گرت، بەرەو دارستانەکەی قازانقایە رۆیشتین،

پزیشکانی تری نەخۆشخانە، لەگەڵ حەمەجەزا و براکانی، لەمیۆلی مانەوە، وتم لەگەڵ دکتۆر مەحمود دەچم تەداوی بریندارەکان دەکەم و دەگەڕێمەوە.

گەیشتینە لای بریندارەکان، گەچم گرتە قوڵە شکاوەکەی حەمەڕەئوف، چارەسەر و ڕێنماییم بۆ برینەکەی خالد نواند، کاتژمێرێکی پێنەچوو، لەگەڵ دکتۆر مەحمود بەرەو گوندی میۆلی گەڕاینەوە، پێش ئەوەی بگەینەوە گوندی میۆلی، کەسێک هاواری لێکردم وتی: دکتۆر بوەستن، نەچن بۆ میۆلی، کە لەکەسەکە وردبوومەوە، سەیرمکرد حەمە جەزایە، وتم: بۆ نەڕۆین؟ ئەی تۆ بۆ کوێ دەڕۆیت؟ وتی:جاش هێرشیان کرد بۆ گوندی میۆلی، ئێمە کشاینەوە، من بۆ گوندی قازانقایە دەرۆین.

دوای ئەو ئاگاداریە، من و دکتۆر مەحمود ڕێرەوی خۆمان گۆڕی، کەوتینە شوێن حەمەجەزا، کە گەیشتینەوە قازانقایە، برادەرانی نەخۆشخانەم بینی، باسی ئەوەیان بۆ کردم چۆن جاشەکان هێرشیان کردووە، ئەوانیش بەپەلە گوندی میۆلیان چۆڵکردوە، بەدکتۆر ناجحم وت: پەستەکەکەی منت هێناوە؟ وتی: فریای هیچ نەکەوتین. لەناو پەستەکەکەمدا دەفتەرێکی یادەوەریم هەبوو، چەندان یادەوەری و شیعرم تێدا نوسیبوو، بەلامەوە گرنگ بوو ئەو یادەوەری و شیعرانەم بپارێزم، بەڵام لەبەرئەوەی حسابم بۆ روداوی کتوپڕنەکردبوو، پەستەکەکەم و یادەوەریەکانم لەمیۆلی بەجێمان، جاشەکان دەستیان بەسەردا گرت.

**پێشمەرگە دەکرێ بە جاش:**

کە گەیشتمەوە گوندی قازانقایە، بەرپرسەکان سەرژمێری پێشمەرگەی مەفرەزەکانیان دەکرد، بزانن هەموو هێزەکە ئامادەیە، دەرکەوت دو کادری مەکتەبی ڕێکخستنی یشک دیار نین، هەواڵیان لەو پێشمەرگانە پرسین کە لەگەڵیاندا بوون، وتیان: بەخۆیان نەزانی کەوتنە ناو ئەو جاشانەوە کە بەرەو ڕوومان دەهاتن، دەستگیر کران. ئەو فەوجەی هێرشی بۆ گوندی میۆلی و قازانقایە کرد، فەوجی شێخ محەمەدی باساکی بوو، ئەو دوو پێشمەرگەیە لەلایەن چەکدارەکانی ئەو فەوجەوە دەستگیرکرابوون. دوای ڕاپەڕین هەردو

پێشمەرگەکەم بینیەوە، وتیان مستەشارەکە وەک پێشمەرگە نەیدابن بەدەست سوپای عێراقەوە، وەک چەکداری خۆی ناوی نووسین، پێناسی بۆ دەرکردین، لەدوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخەکە، وەک هاولاتی ئاسایی دەژیاین.

**هێزەکە دابەشکرا:**

ئێــوارەی رۆژی ١٧-٤-١٩٨٨ هێزەکــەی مەڵبەنــد کــرا بــەدوو بەشــی ســەرەکییەوە، بەشـێکی لـەژێر فەرماندەیی بەرپرسـی مەڵبەنـدا، لەبازیانـەوە لەرێگەی سەرەکی بازیان چەمچەماڵـەوە، هـەر ئـەو شـەوە پەڕییـەوە، گەیشتە ناوشــوان و قــەڵاسـێوکە، لەگــەڵ ئــەو هێــزەی مەڵبەنـدا، هێزەکـانی پـارتی، بەفەرماندەیی ئازاد قەرەداغی و قادر قادر پەڕینەوە.

بەشــی دووەمــی هێــزی مەڵبەنــد، کــە نەخۆشخانەشــی لەگەڵــدا بــوو، بەسەرپەرشـتی شـێخ جەعفـەر، بەشـاخی سـەگرمەدا سـەرکەوتین، ئـاودیوی ناوچـەی سـەنگاو و هەمەوەند بووین، نەمدەزانی بۆ ئەو هێزە بەو شێوەیە دابەشکرا، بەڵام دابەشکردنێکی ناخۆش بوو.

بەشی سێهەمی هێزی پێشـمەرگە، وەک مـەفرەزەی پارتیزان، لەقـەرەداغ و گــەرمیان مانــەوە، عومــەر غــەریب لەگــەڵ هــەردوو بریندارەکــە، خالــدو حەمەڕەئوف، لەقۆپی قەرەداغ مایەوە. دواتر کە باری ناوچەکە ئاسایی بوەوە، بەرێگەیەکی ئاسان گەیشتنە قەندیل، لەوێوە ئاودیوی ئێران بوون.

مەفرەزەیەکی پارتیزان، بەفەرماندەی هەردوو هاوڕێی خۆشەویستم، مـەلا ئەحمەدی کەلاری و سەید محەمەدی کفری مابیەوە، ئەو مەفرەزەیە بوون کە دوای سـاڵێک ئەشـکەوتی داری خلـە بەسـەریاندا رووخـا و هـەر هـەموویان شـەهید بـوون. عوسـمانی حـاجی مـەحمود لەگـەڵ مەفرەزەیـەکی پـارتیزان، مایـەوە، بـەهادین نـوری لەگەڵ ژمارەیـەک پێشـمەرگەدا مایـەوە، لـەهاوڕێیـانی حشـع، هـاوڕێ جەوهـەر، بەرپرسـی هێزی پێشـمەرگەی لقی سلێمانی حشـع، لەگەڵ هێزێکدا مایەوە.

بـەو شـێوەیە قسـەکەی بـەهادین نـوری راسـت دەرچـوو، کـە وتـی: ئـەم ئاشــبەتاڵە، ئاشــبەتاڵیکی ســەربازییە، سیاســی نییــە. ئیــرادەی بــەرخودان و

بەرەنگاربونەوەی سیاسەتەکانی رژێمی بەعس، لەناخی دڵی پێشمەرگە و لەبڕیاری سیاسی ینک و حزبەکانی تردا، بەردەوام بوو، مانەوەی مەفرەزە پارتیزانەکان سەلمێنەری ئەو راستییە بوو.

**بەسام رادەکات:**

ئەو ماوەیەی لەنەخۆشخانەی بەلەکجار بووین، بەسام کاری چێشتخانەی بۆ دەکردین، بەسام گەنجێکی گەرمیانی بوو، پێشتر جاش خەفیفە بوو، لەشەڕێکدا خۆیدابوو بەدەست پێشمەرگەوە، پێشمەرگەش گەیاندبوویانە مەڵبەند. ماوەیەک زیندان کرابوو، دوای ماوەکە بەهۆی کەسانی دەستڕۆشتوی ناو ینکەوە، لەزیندان ئازادکرا، بەمەرجێک لەنەخۆشخانە کاری چێشتخانە بکات. ماوەیەک لەنەخۆشخانە مایەوە، کارەکانی بەباشی بەڕێوەدەبرد، وای لێهاتبوو وەک پێشمەرگە سەیرمان دەکرد، لەئەنفالەکاندا لەگەڵماندا بوو، بەڵام چەکی پێنەبوو.

کاتێک هێزەکەی ئێمە بەسەر لوتکەی شاخی سەگرمەدا سەردەکەوت، شێخ جەعفەر وتی: دکتۆر ئەو پێشمەرگە بێ چەکە لەگەڵ ئێوەدایە؟ وتم: بەڵێ، وتی: با ئەو کلاشینکۆفەم بۆ هەڵگرێت، منیش وتم: ئەوە حاڵ و حسابی وایە، پێمباش نییە تفەنگی کەس هەڵگرێت، ترسی ئەوەم هەیە رابکات. دواتر وتم: ئەگەر ماندوویت بێنە با خۆم تفەنگەکەت بۆ هەڵگرم، وتی: سوپاس پێویست ناکات.

دوای ئەوەی بەشەو شاخی سەگرمەمان بڕی، لەکوێرە گوندێکی چۆڵی نزیک شارۆچکەی سەنگاو پشووماندا، ناوی نهێنی دانرا، کەمین دەرکرا، نازانم خەوم لێکەوتبو یان نا، کاتژمێر چواری سەرلەبەیانی رۆژی ١٨-٤ - ١٩٨٨بوو، دکتۆر ناجحی برام هاتە لام، وتی: کاکە هەستە، بەسام رایکردوە، وتم: دڵنیایت، وتی: بەڵێ، ماوەیەکە بۆی دەگەڕێین دیارنییە. منیش یەکسەر چوم بۆ لای شێخ جەعفەر، ئاگادارم کردەوە، وتم ئەو کەسەی ئێوارە دەتویست تفەنگت بۆ هەڵگرێت، رایکردوە.

بەرنامەی ئەو هێزەی ئێمە ئەوە بوو، بەرۆژ لەو کوێرە گوندەی نزیک شارۆچکەی سەنگاو خۆمان بشارینەوە، تا ئێوارە، بۆ ئێوارە حەمەرەش بێت بۆ لامان، لەئاوی باسەرە بمانپەڕێنێتەوە، راکردنی بەسام، بەرنامەکەی لێتێکداین. دوای ئەوەی هەواڵی راکردنی بەسامم گەیاند، شێخ جەعفەر لەگەڵ بەرپرسی تیپ و مەفرەزەکان کۆبوەوە، وتی دەبێت هەر ئێستە ئەم شوێنە بەجێبهێڵین، نەوەک بەسام، زانیاری بدات بەرژێم و بێنە سەرمان.

یەکسەر ئەو شوێنەمان چۆڵکرد، چوینە دەرەوی گوند، لەژێر بەرد و درخت، لەناو کێڵگە گەنمەکاندا تا ئێوارە خۆمان شاردەوە، خۆشبەختانە ئەو رۆژە هیچ رووینەدا، نازانم بەسام هیچ زانیاری لەسەر نەدابووین، یان هێزەکانی رژێم بۆ خۆیان ئامادەکاری هێرشیان نەکردبوو. دوای راپەرین رۆژێک لە بازاری هەولێر بەسامم بینیەوە، سەلامەت بوو.

### گریانی منداڵەکە:

بۆ ئێوارەی رۆژی ١٨-٤-١٩٨٨ هێزەکەمان بەرەو ئاوی باسەرە بەرێکەوت، لەبەرئەوەی بەهاربوو، ئاوی چەم و جۆگەکان زۆربوو، لەهەمو شوێنێکەوە نەماندەتوای لەئاوی چەمی باسەرە بپەڕینەوە، حەمە رەش شارەزای ناوچەکە هەبوو، نازانم لەو کاتەدا لەکوێ بوو؟ هێزەکەمان چاوەڕوانی ئەو بوو، بۆئەوەی بەسەلامەتی بمانپەڕێنێتەوە.

ئەو هێزەی ئێمە لەمانە پێکهاتبوو، دکتۆرو کارمەندی نەخۆشخانە، حاکمەکان و کارمەندانی دادگا، حەمەجەزاو براکانی تری قادری حاجی عەلی، چەندان مەفرەزەی تری پێشمەرگە. پێش ئەوەی لەئاوی باسەرە بدەین، چەندان خێزانی عەرەب و تورکمان، بەژن و منداڵەوە هاتنە ناو هێزەکەی ئێمە، بۆمدەرکەوت هۆکاری هاتنی ئێمە بۆ دیوی سەنگاو، بۆ ئەوە بووە خێزانی بەرپرس و پێشمەرگەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، لەگەڵ خۆمان ببەین، لەئەنفال رزگارییان بکەین.

بە شەو گەیشتینە سەر ئاوی باسەرە، لەسەر بەرزاییەکانی نزیک ئاوەکە، رەبایەی سوپای عێراقی لێبوو، کە نزیک بووینەوە لەرەبایەکان، منداڵێکی

ساوا دەستی بەگریان کرد، ژیرنەدەبوەوە، لەو کاتەدا بەزەییم بەمناڵەکەدا نەدەهاتەوە، رقم لێی دەبوەوە، دەترسام سەربازەکان گریانی مناڵەکە ببیستن و تەقەمان لێبکەن، شەهید و بریندار بدەین، لەسەر ئەو رێگەیە بکەوینە کیشەی چارەسەری بریندارەوە.

ئاگاداریان کردمەوە، ئەگەر دەرمانی ئارام بەخشم پێیە، بیدەم بەو مناڵە تا گریانەکەی بوەستێنێ، لەو کاتەدا هیچ دەرمانێکی ئارامبەخشم پێنەبوو، وتم: بەداخەوە دەرمانی وام لانییە. خۆشبەختانە مناڵەکە خۆی گریانەکەی کۆتایی پێهێنا، بەبێ کیشە ئاوی باسەرەمان بڕی، گەیشتینە ناوچەی هەمەوەند.

**کاوە رادەکات:**

ئەو رۆژە دڵخۆشبووین، لەبەرئەوەی بۆ شەوی داهاتوو دەپەڕینەوە بۆ ناوچەی ناوشوان و قەلاسێوکە، لەئەنفال رزگارمان دەبێ، بەلام هەواڵێکی ناخۆش بلاو بوەوە، وتیان کاوە رایکردوە. کاوە ملازمێکی سوپای عێراق بوو، خەڵکی کەرکوک بوو، دەیانوت برازای شێخ ستاری حزبە کارتۆنیەکەی رژێمی بەعسە. ساڵی ١٩٨٧، بەهێزێکی سەربازی سوپای عێراقەوە، پەلاماری چەند گوندێکی ناوچەی گەرمیانی دابوو، بۆئەوەی گوندەکان بروخێنێت و بەهاولاتیانی چۆڵ بکات. بەرگری میلی و هێزی پێشمەرگە پەلاماری هێزەکەی کاوەیان دابوو، هێزەکەی شکابوو، خۆشی دەستگیرکرا، نزیکەی ساڵێک لەمەڵبەند زیندان کرا. دادگای مەڵبەندی یەک سزای کوشتنی بەسەردا سەپاند، مامجەلال سزاکەی ڤیتۆ کرد، داوای کرد نەیکوژن، مەڵبەند کاوەی لەزیندان هێشتەوە و نەیکوشت. بەلام هەموو پێشمەرگەو بەرپرسی مەڵبەند، بەو ڤیتۆیەی مامجەلال نیگەران بوون، دەیانوت دەبێت بکوژرێت، بۆیە راکردنی کاوە لەکاتی ئەنفال و شکستی هێزی پێشمەرگەدا، هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو.

لەبەرئەوەی کاوە تاوانبار بوو، سزای کوشتنی بۆ بڕابوەوە، حەرەسی هەبوو، راکردنی بەو شێوەیە، گومانی دروستکرد، دەوترا بەرپرسەکان بەخۆیان کاوەیان ناردۆتەوە، بەرامبەر بەدەستکەوتی گشتی، یان دەستکەوتی تایبەتی.

**پارووە گۆشتەکە:**

ڕۆژی ١٩-٤ -١٩٨٨گەیشـتینە ناوچـەی هەمەوەنـد، لەگونـدی خاڵخـاڵان نزیکبووینـەوە، زۆر برسـیمان بـوو، بـەبێ ئـەوەی هـیچ زانیاریـەکمان لەسـەر باری سەربازی گوندەکە هەبێت، بەو ئامانجەی شتێک بۆ خواردن پەیدابکەین، بەپەلە بەرەو گوندەکە بەڕێکەوتین، من و شوانی یاریدەدەری پزیشک، لەپێش ئـەو پێشـمەرگانەوە بـووین کـە بـەرەو گوندەکـە دەڕۆیشـتین، شـوان خـەڵکی گوندی خاڵخاڵان بوو، شارەزای ناوچەکە بـوو. یەکـەم کـەس ئێمـە گەیشـتینە نـاو گونـد، بەتـەمابووین فەردەیـەک ئـارد، نانێـک، چایـەک، کیلۆیـەک برنجمـان دەستبکەوێت و بیخۆین، بـەڵام لـەو گونـدەدا هـیچ جـۆرە خۆراکێـک نـەمابوو. دواتر بۆماندەرکـەوت کـە خـەڵکی ئـەو گونـدە، پێش ئـەوەی پرۆسـەی ئەنفالی بگاتێ، گوندەکەیان چۆڵکردوە، بەرەو چەمچەماڵ کۆچیان کـردووە، هـەرچیان هەبووە لەگەڵ خۆیان بردووە، هیچیان بۆ ئێمە نەهێشتبوەوە.

تـا برادەرانـی تـری نەخۆشـخانە گەیشـتن، مـن و شـوان هـەمو گونـدمان پشکنی، هیچمان دەست نەکـەوت، کە برادەرانی نەخۆشـخانە گەیشـتنە لامـان، بڕیارمانـدا بچینـە دەرەوەی گونـد، نـەوەک هێزەکـانی ڕژێـم گوندەکـە بکەنـە ئامانج و هێرشمان بۆ بکەن.

زۆر برسـیمان بـوو، بیرمـان لەپەیـداکردنی خـواردن دەکـردەوە، هیچمـان دەست نەدەکەوت، لەدەرەوەی گوندی خاڵخالان، ڕانە مەڕێکمان بینی، بـەرە و لامان دەهات، بەرخیشی لەناودا بوو، هەر لەوێ بەرخێکمان کڕی و سـەرمان بڕی، لـەو کاتـەدا ژمارەمـان ١١ یـانزە کـەس بـوو، بەسـام ڕایکردبـوو، دکتـۆر جەبار نەگەیشتبوو، گۆشتەکەم بەسەر برادەرەکاندا دابەشکرد، بەشێکیشـم بۆ دکتۆر جەبار دانا، گۆشتەکەمان برژاند، تا بڵێی گۆشتیکی ناسک و بەتام بـوو، بـــەڵام لەبەرئـــەوەی نانمـــان پێنـــەبوو، گۆشـــتەکەمان بـــەبێ نـــان دەخـــوارد، هەرچیمان دەکرد تێر نەدەبووین. زۆر چاوەڕوانمان کرد دکتۆر جەبار بگات، بەشە گۆشتەکەی خۆی وەربگرێت و بیبرژێنێت و بیخوات، بەڵام دەرنەکەوت، بۆیـە بەشـە گۆشـتەکەی ئەویشـم برژاند، خسـتمە نـاو نایلۆنێکـەوە و خسـتمە

گیرفانم، وتم: ئێواره کاتی پەڕینەوه لەسەر جاده دکتۆر جەبار دەبینم، بەشە گۆشتەکەی خۆی دەدمێ.

درەنگـانی ئێـواره، لـەجادەی بازیـان- چەمچـەماڵ نزیـک بووینـەوه، ئامادەکاریمان بۆ پەڕینەوه دەکرد، دکتۆر جەبارم بینیەوه، بردمه کەنارێکەوه، وتـم: ئـەوه بگره بیخۆ، ئـەوه بەشـە گۆشتی خۆتـە، تێنەدەگەیشت، چیرۆکی کـڕین و سـەربڕین و برژانـدی بەرخەکـەم بـۆ گێڕایـەوه، لـەو کاتـەدا زۆری برسـیبوو، لەبەرئـەوەی ئـەو رۆژه هیچـی نـەخواردبوو، دەسـتی بـەخواردنی گوشتەکه کرد، گوڕێکی بەبەردا هاتەوه.

ئەو پارووه گۆشته زۆر کاریگەری لەسەر دکتۆر جەبار بەجێهێشت، دوای راپەڕین لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا، یادەوەری ئەو پارووه گۆشـته بـرژاوەی، وەک خۆشترین یادەوەری سەردەمی پێشمەرگایەتی خۆی گێڕایەوه.

**ناوچەی شوان:**

لەڕێگەی سەرەکی نێوان بازیـان – چەمچـەماڵ نزیک بووبوینـەوه، نـازانم لەکوێوه، لەکێوه؟ ، ئەو چەند فەردە نانەمان بۆ هـات، شـێخ جەعفـەر نـانەکەی بەسـەر پێشـمەرگەدا دابەشـکرد، پێشـمەرگه ترسـی ئـەوەی هـەبوو نـانی بەرنەکەوێت، هەر یەک لـەلای خۆیـەوه پـەلاماری نانەکـەی دەدا، خۆشبەختانه هەر هەموو هێزەکه نانی بەرکەوت، بۆ ماوەیەک سکمان تێر بوو.

کـە شـەو بەسـەردا هـات، بـەبێ کێشـە لەڕێگـەی سـەرەکی سـلێمانی – چەمچەماڵ پەڕینەوه، ئەو ناوچەیە کە بۆیدەچوین، دەکەوته نێوان چەمچـەماڵ و سلێمانی و دوکان، تا ئەو کاته بەر هێرشی کیمیاباران و ئەنفال نەکەوتبوو. لەگونـدێک ماینـەوه، کـەمێک پشـوومانـدا، دوای پشـوودان هەنـدێک لەپێشمەرگەکان هـەواڵی خۆیـان بـۆ کەسـوو وکاریـان نـارد، منیش کەسـێکی خەڵکی گوندم پەیداکرد، ناردم بۆ سلێمانی، ناونیشـانی خـەزورم پێدا، نـازانم نامەم نارد یان هەر بەقسە پەیامی خۆمم نـارد، سـەرەتا پێمڕاگەیاندن کە مـن سەلامەتم، گەیشتومەتە ئـەو گونـدە، پـەیامی دووەم هـەواڵی مـەهاباد و شـێنێ بـوو، پـەیامی سـێیەم هـەواڵی مـاڵی دایک و براکـەم و کەسـو کـاری تـرم بـوو

لەهەڵەبجە، ئایا لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا کەسمان شەهید بووە، هەواڵی دایک و براکەم هەیە؟

ئێوارەی هەمان رۆژ، پەیامنێرەکە گەڕایەوە، وەڵامی بۆ هێنامەوە، وتی هەموو لایەک سەلامەتن، تەنیا خەمی منیان بووە، بەو وەڵامە دڵخۆشبووم.

**ئەنفالی چوار:**

چەند رۆژێک لەگوندەکانی ناوچەی شوانماینەوە، دواتر بەرەو گوندی قوزلو رۆیشتین، گوندی قوزلو دەکەوێتە سەر زێی دوکان، سەر بەسنوری دەشتی کۆیەیە، بۆ ماوەی چەند رۆژێک لەو گوندە ماینەوە، لەگەڵ بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگە، لەماڵی باوکی شێخ عومەر پشوومان دا، کەمێک بەخۆماندا هاتیینەوە.

هەندێک لەپزیشک و کارمەندی مەڵبەندمان رەوانەی مەڵبەندی سێ کرد. دکتۆر ناسح و دکتۆر جەبارو دکتۆر ناجح و دکتۆر مەحمودو برادەرانی تری کارمەندانی تەندروستیم رەوانەی مەڵبەندی سێ کرد، بەدکتۆر ناجحم وت، لەوێوە برۆ بۆئێران، هەواڵی ماڵی خۆشمان بزانە، بزانە شەهید بوون، یان لەژیاندا ماون.

من و دکتۆر جەلال وجووتیار، لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەندی یەک ماینەوە. هەواڵێکم پێ گەیشت، ماڵی مام جافر لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا شەهید بوون، لەبەر ئەوە داوام لەبەرپرسانی مەڵبەند کرد، کە رێگە بدەن مام جافر زوو بگەرێتەوە بۆ سنور، تا هەواڵی کەسو کاری بزانێت، مام جافریش بەرەو سنووری ئێران بەڕێکەوت، کەچی وا دەنەرچوو، کەسوکاری مام جافر سەلامەت بوون.

ماوەی چەند رۆژێکمان لەگوندی قوزلو و گوندەکانی دەورووبەری بەرێکرد، پشووماندا، خەڵک سەردانی دەکردین، بەرپرسەکانی مەڵبەندی یەک و دوو، لەو ناوچەیەدا یەکیانگرتەوە، پێشمەرگەی هەردوو مەڵبەند، تێکەڵ بوون.

ئـەنفالی یـەک، دوو، سـێ، کۆتاییـان هـاتبوو، هـەزاران مـەدەنی لەناوچـە رزگارکراوەکانـدا، ئـەنفال کرابـوون، سـەدان پێشـمەرگە ئـەنفال کرابـوون، بەرنامەیـەک دانـەنرا بۆئـەوەی لەئـەنفالی چـواردا، خـەڵکی مـەدەنی زیـانی بەرنەکـەوێت، پێشـمەرگە بتوانیـت بەکـەمترین زیـان، بـەرەنگاری هێرشـەکانی سوپای عێراق ببێتەوە.

ئەو پێشمەرگانەی، کیمیابارانی ناوچەی چافایەتی و قەرەداغ وگـەرمیانیان دیبوو، بەپێچەوانەی بەرپرسـەکانەوە، بیریان لەچارەنوسی خەڵکی مەدەنی ئەو سنوورە دەکردە، بـەنهێنی گوندنشینەکانییان، لەمەترسـی کیمیابـاران و ئـەنفال ئاگاداردەکردەوە، دەیانوت گوندەکانتان چۆڵبکەن، بـڕۆن بـۆ نـاو شـارەکان، بـا وەک خـەڵکی گونـدەکانی تـری کوردسـتان، رووبـەرووی کیمیابـاران و ئـەنفال نەبنەوە.

زانیـاری بـە بەرپرسـەکان گەیشـتەوە، کە پێشـمەرگە بـە نهێنـی بـە خـەڵکی گوندەکان دەڵێن، باربکـەن، ناوچەکـە چـۆڵ بکـەن، بـا وەک خـەڵکی ناوچـەکانی ترتان بەسـەر نەیەت. بەرپرسـەکان زویر بوون، بەسـەر خەڵکی ئـەو گوندانـەدا دەگـەران کـە ئـەم قسـانەیان بۆکرابـوو، قسـەیان بـۆ دەکـردن، ورەیـان بـەرز دەکردنەوە، هەڕەشەیان لەو پێشمەرگانە دەکرد، کە ئەو قسانەیان کردووە.

لەگـەڵ بەرپرسـانی هـەردوو مەڵبەنـد، سـەردانی گونـدی هـەنجیرەمان کـرد، فـەخرەدینی بـرای شـەهید مامەڕیشـە لـەو گونـدە بـوو، زانیـاری گەیشـتبوو، یەکێک لەو کەسـانەی بەخـەڵک دەڵێت بڕۆن و گونـد چـۆڵ بکـەن، فەخرەدینـە، فـەخرەدینیان بانـگ کـرد، پێیـانوت: تـۆ بـەناو گوندەکانـدا دەگـەڕێیت، خـەڵک بەکیمیاوی و ئەنفال دەترسێنی، بەو شێوەیە ورەی خـەڵک دادەبـەزێنیت، ئەمـە تاوانـە بەرامبـەر بەشـۆڕش دەیکـەیت، ئەگـەر بـرای شـەهید مامـە ڕیشـە نەبوویتایـە، دەمانکوشـتی، لەبـەر خـاتری مامـە ریشـە تـا ئێـرە لێت قبـووڵ دەکەین، ئەگەر واز لەو قسانە نەهێنیت، لەمەو دوا یەک وشەت لێقبوڵ ناکەین. فەخرەدین بێدەنگ وەستا، هێچی نەوت.

**زێی بچووك ، زێی دوكان:**

قادر حاجی عەلی و عومەر فەتاح ناوچەکەیان بەجێهێشت، بەرەو سنوری مەڵبەندی سێی ناوچەی خۆشناوەتی رۆیشتن، شێخ جەعفەر وەک بەرپرسی هیزەکانی مەڵبەندی یەک، عەلی بچکۆل وەک بەرپرسی هیزەکانی مەڵبەندی دوو، لەسنورەکەدا مانەوە.

من و دکتۆر جەلال وەک پزیشکی مەڵبەندی یەک مابوینەوە، دکتۆر دڵشاد پزیشکی مەڵبەندی دوو بوو، سنوری مەڵبەندی دوو فراوان بوو، ئەگەر شەڕ دروستبوایە، دکتۆر دڵشاد خۆی بەتەنها نەیدەتوانی هاوکاری پێشمەرگە بکات، بەباشمزانی دکتۆر جەلال هاوکاری دکتۆر دڵشاد بکات، لەو کاتەدا هێزەکەمان ببوو بەدوو بەشەوە، بەشی زۆرینەی هێزەکە، لەخوارووی زێی بچووک(دووکان)وە بوو، چەند تیپێکی مەڵبەندی یەک و هەموو هێزەکەی مەڵبەندی دوو، لەو سنورەدا بوو، دکتۆر جەلال و دکتۆر دڵشاد کەوتنە ئەو سنوورە، من و جوتیاریش لەگوندی قوزلو ماینەوە، بۆ هاوکاری ئەو پێشمەرگانەی مەڵبەندی یەک، کە لەباکوری زێی بچووک و دەشتی کۆیەو تەقتەق بوون.

لەکۆتا رۆژەکانی مانگی چوار و سەرەتاکانی مانگی پێنجدا، هیزێکی سوپای عێراق، شاخی کەلکەسماقی داگیرکرد، رۆژانە بۆردومانی گوندەکانی نزیک قوزلوی دەکرد، جمووجوڵی هێزەکەی ئێمەی سنوردار کردبوو.

رۆژێکیان لەنزیک جهازەکەی مەڵبەندی یەک دانیشتبووم، شێخ جەعفەر راستەوخۆ قسەی لەگەڵ بەرپرسێک دەکرد، دەیوت: دۆستەکەمان هەواڵی بۆم ناردووم، هێرشێکی قورس و فراوانتان بۆ دەکرێت، پێمباشە خۆتان نەدەن بەدەم ئەو هێرشەوە، بەرپرسەکەش وەلامی دایەوە، وتی: بە شەڕکردن پاشەکشێ بکەن.

**تەسلیمبوونەوە:**

پێش دەستپێکردنی ئەنفالی چوار، ئەو کاتەی هێزەکەی مەڵبەندی یەک لەسنوری دەشتی کۆیە و قەڵاسێوکە و عەسکەر بوو، ناو بەناو کادر و

پێشمەرگە تەسلیم دەبونەوە. ئەو دوو کادرەی کە دوو هەفتە لەوەوبەر لەگوندی قازانقایە بەمنیان وت وەرە لەگەڵمان، تۆ و دکتۆر جەبار و دکتۆر ناجحی برات دەپارێزین، پێش دەستپێکردنی ئەنفالی چوار بەچەند رۆژێک، هەردووکیان پێکەوە دیار نەمان، دەرچووتەسلیم بوونەتەوە، ئەو کاتە تێگەیشتم کە مەبەستیان لەپاراستنی من بردنەوەی منیش بووە بۆ باوەشی رژێم. لەدوای تەسلیمبونەوەی ئەو دوو برادەرە، زۆر دڵخۆشبووم کە لەئەنفالی سێدا، بڕوام پێنەکردن و لەگەڵیاندا نەرۆیشتم ونەکەوتمە داوەکەیانەوە، وتم بەخوا باش بوو لەجاشێتی و خیانەت، یان لەئەنفالکردن رزگارم بوو. دوای راپەڕین ئەو دوو برادەرەم بینییەوە، لەو کاتەوە تا ئێستا، لەناو ڕیزەکانیی ینکدا کار دەکەن.

دوای تەسلیمبونەوەی ئەو دوو کادرە، رۆژێک بەرپرسی مەفرەزەی نەخۆشخانە هاتە لام، وتی: دکتۆر من چیتر توانای ئەوەم نیە لەم بارودۆخە ناخۆشەدا پێشمەرگایەتی بکەم، رێگەم بدە بگەڕێمەوە، منیش وتم: ئەگەر بگەڕێیتەوە ژیانت پارێزراو دەبێت؟ ئەنفال ناکرێیت؟ وتی: نا ئەنفال ناکرێم، وتم: تۆ ئازادی، ئەویش وازیهێناو خۆی تەسلیم کردەوە، دوای راپەڕین ئەو برادەرەشم بینیەوە.

لەکارمەندو پزیشک و پێشمەرگەکانی نەخۆشخانە، ئەوە دووەم کەس بوو تەسلیم ببێتەوە، لەبەرئەوەی دوای کیمیابارنی سێوسێنان بەچەند رۆژێک، یاریدەدەرێکی پزیشکمان لەگەڵ بوو، خەڵکی سێوسێنان بوو، باوکی هات بەشوێنیدا، داوای لێکردم نیگەران نەبم کوڕەکەی بباتەوە بۆ سلێمانی، منیش رێگریم نەکرد، ئەو برادەرەشم دوای راپەڕین بینیەوە، پەیوەندی بەینک کردەوە، تا ئێستا لەدەزگا حزبیەکانی ینک دا کار و چالاکی دەکات.

**شێرکۆ و هەڵکەوت:**

بێجگە لەشیخ جەعفەر، بەرپرس و ئەندامانی مەڵبەندی یەک، پێش ئەنفالی چوار، ناوچەکەیان بەجێهێشت، چوون بۆ مەڵبەندی سێ، بەهۆی دابەشکردنی یارمەتی بەسەر پێشمەرگەدا، شێرکۆ مرانەیی بەرپرسی بەشی دارایی

مەڵبەند، گەڕایەوە بۆ لای ئێمە، کە ئەنفالی چوار دەستپێکرد، شێرکۆ یارمەتی بەسەر پێشمەرگەدا دابەشدەکرد، لەباشووری زێی بچووک بوو، لەگەڵ هێزێکی مەڵبەندی یەک گیریان خوارد، نەیانتوای دەربازی دەشتی کۆیە ببن، جارێکیتر گەڕانەوە بۆ ناوچەی گەرمیان، لەگەڵ پارتیزانەکان مانەوە. لەشەڕیکی پێشمەرگەو سوپای رژێمدا، بەبۆردومانی فڕۆکەکانی رژێم، لەگەرمیان لەگەڵ هەڵکەوتی ئەندازیاردا، هەردووکیان شەهید بوون. شێرکۆ و هەڵکەوت، هاوڕێی نزیکم بوون.

**مەلاریا چارەسەر دەکا:**

سەرلەبەیانی رۆژی ٣-٥-١٩٨٨ لەگوندی قوزلو بووم، دوو پێشمەرگە هاتنە لام، دووچاری لەرزووتا هاتبوون، بەپێی شارەزایی پزیشکیم، نەخۆشی مەلاریایان بوو. دەرمانی نەخۆشی مەلاریام پێنەمابوو، دەرمانی نەخۆشی مەلاریام بۆ نووسین، وتم: ئەگەر کەسووکارتان سەردانی کردن، ئەو وەسفە پزیشکیەیان بدەنێ، با لەشار دەرمانتان بۆ بکڕن و بۆتان بنێرن. ئەو دوو پێشممەرگەیە لەتیپی ٣٢ سلێمانی بوون، خەڵکی پێنجوێن بوون. بۆ ئێوارەی ئەو رۆژە، فڕۆکە جەنگیەکانی سوپای عێراق، بەچەکی کیمیاوی بۆردومانی گوندی عەسکەرو دەورووبەریان کرد، ئەو دوو پێشمەرگەیە بە چەکی کیمیاوی برینداربوون. پاش یەک مانگ، لەئەنفالی پێنجدا، لەنەخۆشانەکەی مەلەکان ئەو دوو پێشمەرگەیەم بینیەوە، وتیان: دکتۆر ئەو رۆژەی لەلای تۆ دەرچووین، گەڕاینەوە بۆ گوندی عەسکەر، بۆ ئێوارەکەی بەر بۆردومانی کیمیایی فڕۆکەکانی عێراق کەوتین، هەر کە بە کیمیاوی برینداربووین، یەکسەر لەرزووتامان لەکۆڵ بوەوە.

**تۆ پۆلا نیت ، تەنەکەیت:**

سەر لەبەیانی رۆژی ٣-٥-١٩٨٨، پۆلای رابەر سیاسی تیپی ٢١ کەرکوک، لەگوندی قوزلو، سەردانی مەڵبەندی کرد، دوای نیوەڕۆ، رژێم ئاوی بەنداوی دوکانی بەردایەوە، ئاوی زێی دوکان زۆر زیادیکرد، وای لێهات ئەو بەلەمە

بچوکانەی لەمبەرو ئەوبەری زێکەوە خەڵکیان دەگواستەوە، لەبەر زۆربوونی ئاوەکـە، هـاتوو چۆیـان بـۆ نـەکرا، پـۆلا نـەیتوانی بگەڕێتـەوە لای تیپەکـەی، تیپەکەی لەباشوری زێی بچووک بوو، خۆی لـەباکوری زێـی بچـووک مایـەوە، کـە ئـەنفال دەسـتپێکرد، لەگـەڵ هێزەکـەی ئێمـە هـات و ئـاوارەی ئێـران بـوو. لـەلای بەرپرسـانی سیاسـی ینـک، وا حسـاب لەگـەڵ پـۆلا کـرا، لـەکاتی شـەردا تیپەکـەی بەجێهێشـتوە، بـەلام سـزاکەی هێنـدە نـەبوو، لەسـەقز نەوشـیروان مستەفا بانگی کردبوو، هەندێک قسەی پێوتبوو، یـەک لـەو قسانە کە پێوتبوو: تۆ پۆلا نیت تۆ تەنەکەیت.

**کیمیابارانی عەسکەر:**

پـێش هـەر ئـەنفالێک، سـوپای عێـراق، بەچـەکی کیمیـاوی ئـەو ناوچەیـەی بۆردومان دەکرد کە هێرشـی بۆ دەکرد، ئێوارەی رۆژی٣-٥-١٩٨٨، کاتژمێر شەش و چارەک، دەنگی فڕینی فڕۆکە، ئاسمانی ناوچەی عەسکەر و گۆپتەپەو گوندەکانی دەوروبەری گرتـەوە، پاش کـەمێک لـەدەنگی فڕینـی فڕۆکـە، دەنگـی تەقینەوەش بەرگوێم کەوت، لەدڵی خۆمدا وتـم بـەخوا ئـەمجارەش بۆردومـانی کیمیاویـە، نیوکـاتژمێری نەخایانـد، بۆمـان ڕوونبـوەوە، فڕۆکـە جەنگیـەکانی سوپای عێراق، بەچەکی کیمیاوی، گوندەکانی عەسـکەرو گۆپتەپـەو هـەنجیرەو دەوروبـەریانی بۆردومـان کـردووە، لەبەرئـەوەی ئـەو گوندانـەی بـەکیمیاوی بۆردومان کران، لەباشووری زێی بچووکەوە بـوون، منیش لەبـەری دەشـتی کۆیـە، لـەباکووری زێـی بچـووک بـووم، یـەک برینـدار نـەبێت، لەبرینـدارەکانی بۆردومانی کیمیاوی ئەو ناوچەیە، کەسی ترم نەبینی.

لـەکاتی بۆردومانەکـەدا، لەگـەڵ ئـازادی رابـەر سیاسـی تیپـی ٩٣ کۆیـە، لەدەرەوەی بارەگا بووین، دوای تێپەربوونی کـەمتر لـەنیوکاتژمێر، دووچاری چاوخوران بووین، کە سـەیری یـەکترمان کرد، بینیم چاومـان سـووربۆتەوە، بۆمدەرکەوت کە بـا، برێک لـەگازە کیمیاویەکەی ئەو گوندانـەی بۆ لای ئێمـە هێنـاوەو برینـداری کـردووین، دوای دەم و چـاو شـتن، هـەمومان چوینـە

ژورەوە، دەرگــای ژورەکــەمان داخســت، بۆئــەوەی لــەوە زیــاتر کیمیــاوی هەڵنەمژین.

گونـدی قوزلـو لـەو گونـدانە نزمتـر بـوو، کـە بۆردومـانی چەکـی کیمیـاوی کرابوون، ئاڕاستەی بایەکەش گازە کیمیاوییەکەی بـەرە و لای ئێمـە دەهێنـا، بۆیـە هـەر هـەمووومان بەسـووکی، بەچـەکی کیمیـاوی برینـدار بـووین، بێجگـە لـەچاوخوران وچاوسـووربونەوە، دوچـاری کۆکـەی وشـک و تەنگەنەفەسـیش بووین. بۆ رۆژی دوایی کە پاشەکشەمان کرد، شێخ جەعفـەر هـەر دەکۆکی، دەیـوات نـازانم بـۆچی توشـی ئـەم کۆکەیـە بـووم، منـیش دەمزانـی بـەهۆی کیمیاویــەوە تووشــی کۆکــە بــووە، بــەڵام دەنگــم نــەکرد، بۆئــەوەی ورەی پێشمەرگە دانەبەزێت.

**کشانەوە:**

جێگـری فەرمانـدەی تیـپ و رابـەری سیاسـی و بەرپرسـی کاروبـاری کۆمەڵایەتی تیپی ٩٣ کۆیە، لەگونـدی قوزلـو لەگـەڵ شـێخ جەعفـەر مابوونـەوە، لەبەرئـەوەی شـێخ جەعفـەر چەنـد سـاڵێک لەوەوبـەر، فەرمانـدەی پێشـمەرگەی مەڵبەندی سێی ینک بوو، دۆستایەتی لەگەڵ بەرپرسەکانی مەڵبەندی سێ باش بـوو. ئـەو بەرپرسـانەی تیپـی ٩٣، بەباشـی شـارەزای ناوچەکـە بـوون، بـۆ کشانەوە سودی زۆرمان لیوەرگرتن، ئەگەر ئەوان نەبوونایـە مەترسـی جدی لەسەر ژیانمان درووستدەبوو.

تیپی ٥٣ شیروانە لەبناری شاخی کەڵکەسماق بـوو، بـۆ هێرشـی سـوپاکەی سـەر شـاخی کەلکەسماق خـۆی ئامـادە کردبـوو، تیپـی ٥٥ قـەرەداغ، لەسـەر رێگەی کۆیە بوو، بۆ روبەروبونەوەی هێرش خۆی ئامادە کردبوو. تیپەکانی تـری مەڵبەنـدی یـەک لەباشـووری زێـی بچـووک بـوون، لەگـەڵ تیپـەکانی مەڵبەندی دوو بوون، هەر یەکەو لەشوێنێکدا سەنگەریان گرتبوو.

سـەر لەبـەیانی رۆژی ٤-٥-١٩٨٨، سـوپای رژێـم گۆپتەپـەو عەسـکەری داگیرکـرد، ئـەو هێزەی لەباشـوری زێی بچـووک بـوو، بـەرگری نـەکرد، ئـەوە لەکاتێکدا بووعەلی بچکۆلی بەرپرسی مەڵبەندی دوو، خۆی لەگۆڕەپانی شەڕدا

بـوو، پـەیمانی بەسـەرکردایەتی دابـوو، هێـزی رژێـم ناتوانێـت گونـدێکی ناوچەکـەش داگیربکـات. وتبـوی: ئـەو ناوچەیـە دەکەینـە گۆڕسـتانی بـەعس، تۆڵەی بەزرو کۆتایی لەسوپای عیراق دەکەینەوە.

کاتێـک ئــەو دیمەنــەمان بینــی، شـێخ جەعفــەر بڕیــاری کشــانەوەی دا، بەچاوسـاخی بەرپرسـەکانی تیپـی ۹۳ کۆیـە، گونـدی قوزلومـان بەجێهێشـت، بـەرەو سـنوری کۆیـەو تەقتـەق پاشەکشـەمان کـرد، ئـەو کاتـە مـن نەمـدەزانی بەرەو کوێ دەڕۆین، نزیکە ۱۹-۲۰ کـاتژمێر بـەپێ ڕۆیشـتین، شـەو گەیشـتینە شوێنێک، لەڕۆژئاوای کۆیە بـوو، کاتێک پشتمانکردە گڵۆپ و روونـاکی شـاری کۆیە، تێگەیشتم کە لەو ئەنفالەش رزگارمان بووە.

لەئــەنفالی چــواردا ســوپای عێــراق لەهــەموو قۆڵەکانــەوە، لەدوکانــەوە، لەکەڵکەسماقەوە، لەچەمچەماڵ و ئاغجەلـەرەوە، لەتەقتـەق و کۆیـەوە، هێرشـی کرد. لەسنوری دەشتی کۆیـەوە، پێشمەرگەکانی تیپی ٥٥ قەرەداغ، شـەڕێکی قارەمانانەیان کرد، بەرەنگاری هێرشی سوپای عێراق بوونـەوە، شـەڕی تیپـی ٥٥ قـەرەداغ، بـەگیانی ۹ پێشـمەرگەی شـەهید تـەواوبوو، دوانیـان بەفڕۆکـەی هەلیکۆپتـەر لـەقوولایی ئاسـمانەوە بەردرانـەوە. دەتـوانم بڵێیم ئـەنفالی چـوار لــەماوەی کــەمتر لەبیســتوچوار کــاتژمێردا کۆتــایی هــات، بــۆ ســوپای عێــراق کورترین ئەنفال بوو، بەکەمترین کـات، بەکـەمترین زیـان، ناوچەیـەکی فراوانـی داگیرکـرد، سـەدان کەسـی لەخــەڵکی مــەدەنی ناوچەکــە، بەچــەکی کیمیــاوی شەهیدو بریندار کرد، دەیان هەزارایش ئەنفال کران.

ئەو هێزەی مەڵبەندی یـەک کـە لەگـەڵ شـێخ جەعفـەر بـووین، پەڕینـەوە بـۆ سنوری دەشتی هەولێر، چوینە گوندێک، ماڵی فاروقی عـەلی مـەولودی لێبـوو، فــاروق پێشــمەرگەیەکی دێرینــی ینــک بــوو، فەرمانــدەی تیــپ بــوو، ســاڵێک لەوەوبەر، لەشـەڕی ئازادکردنی شـارۆچکەی تەقتـەق دا، دەم و چـاوو سـەرو گــوێی بەخەســتی برینــداربوو، مــاوەی چەنــد کاتژمێرێــک لــەماڵی فــاروق پشووماندا. دوای ئەوە شێخ جەعفەر رەئی پێشمەرگەی ناوچەکەی وەرگرت، داوای پلانی رزگارکردنی هێزەکەی بەری ناوشوان و قەلاسێوکەی کرد، پاش ئەوەی شارەزاکان لە سەر بارودۆخی سەربازی ناوچەکە لێکۆڵینەوەیان کرد،

بینیان هیچ دەرفەتێک بۆ رزگارکردنی ئەو هێزە نییە، ناتوانرێت ئەو هێزە بپەڕێنرێتەوە بۆ دەشتی هەولێر، وتیان: هێزە چەکدارەکانی عێراق، لەهەموو قۆڵەکانەوە هێرشیان کردوە، ناوچەکەیان تەنیوە، دەرفەتی پەڕینەوەی هێزەکە نەماوە.

شێخ جەعفەر بەبێتەل لەگەڵ فەرماندەی ئەو هێزەدا قسەی کرد کە چواردەوریان گیرابوو، ئاگاداری کردن کە دەرفەت نییە بپەڕنەوە بۆ دەشتی هەولێر، لەسەر ئەوە رێکەوتن کە جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ بەری قەرەداغ و گەرمیان، هێزەکەی مەڵبەندی یەک، جارێکیتر بەرەو گەرمیان و قەرەداغ گەڕایەوە.

**کۆپتەرەکان نەیانبینین:**

شێخ جەعفەر بەمنی وت: لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک برۆ بۆ مەڵبەندی سێ، لەوێ قادری حاجی عەلی ببینە، پێیبڵێ با هێزی پێشمەرگەی مەڵبنەدی یەک، لەسنوری مەڵبندی سێ نەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی هێزەکەی ئێمە شکاوە، ورەی بەرداوە، ئەگەر لەسنوری مەڵبەندی سێ بمێنێتەوە، تێکەڵی هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی سێ ببێت، کاریگەری خراپ لەسەر ورەی پێشمەرگەکانی ئەوانیش درووستدەکات.

منیش بۆ ئێوارەکەی، لەگەڵ سێ پێشمەرگەی دەستەی پاراستنی شێخ جەعفەرو جوتیاری هاوکارمدا، لەدەشتی کۆیەوە بەرەو ناوچەی خۆشناوەتی بەرێکەوتین.

لەگەڵ جوتیارو سێ پێشمەرگەکەدا، دەشتی کۆیەمان بەجێهێشت، لەجادەی سەرەکی کۆیە- دێگەڵە نزیکبووینەوە، هێندەی نەمابوو خۆر ئاوابێت، سەیری سەر رێگاکەمان دەکرد، بزانین رەبایەو کەمینی دوژمن لەسەر جادەکە نییە، لەو کاتەدا کە لەدڵەڕاوکێی هێزی زەمینی دوژمندا بووین، دەنگی فڕۆکە هاتە گوێمان، دوو فڕۆکەی کۆپتەر، لەئاسمانی ناوچەکەدا، لەکۆیەوە، بەسەر رێگەکەدا بەرەو دێگەلەو هەولێر دەفڕین، یەکسەر خۆمان گرمۆڵەکرد، لەژێر بەردو پووشوپەڵاشی نزیک رێگەکەدا، خۆمان شاردەوە.

ئێمە پێنج کەس بووین، هیچ چەکێکی قورسمان پێنەبوو، تا دژی فڕۆکە بەکاری بێنین، لەو کاتەشدا ورەی پێشمەرگە دابەزیبوو، چەند رۆژێک لەوەوبەر کۆپتەرەکانی رژێم دوو پێشمەرگەی تیپ ٥٥ قەرەداغیان هەڵگرتبوو لەئاسمانەوە بەریاندابونەوە، لەبەرئەوە باشترین کار ئەوە بوو کە خۆمان بشارینەوە. خۆشبەختانە فڕۆکەکانی رژێم ئێمەیان نەبینی، شوێنەکەیان دیاری نەکردین، لەئێمە تێپەڕین و بەبێ هیچ گیروگرفتێک رزگارمان بوو.

ترسی ئەوەمان هەبوو، ئەو فرۆکانە بگەڕێنەوە، یان فڕۆکەی تر بێنە سەر ئاسمانی ناوچەکە، بۆیە تا تاریکی نەکرد، لەشوێنی خۆمان هەڵنەساین، کە تاریکی ئاسمان رێگەکەی داپۆشی، رێگەکەمان بڕی، شاخی پشت رێگەکەشمان بڕی. حسابی ئەوەمان نەکردبوو کە رێگاکە دوورودرێژو بێ ئاو بێت، ئاومان لەگەڵ خۆمان هەڵنەگرتبوو، تینوێتی زۆری بۆهێنابووین.

شەو گەیشتینە دۆڵی سماقولی، نازانم مەفرەزەیەکی تیپی ٥٥ قەرەداغ یان تیپی ٥٣ شێروانە بوو، لەناو باخێکدا بارەگایان خستبوو، چووینە لایان، کەمێک پشوماندا، بەرپرسی هێزەکە فائیقی مامە عەزەی ئەوبەری بوو، شەو لایان ماینەوە، بۆ بەیانی کە لەخەو هەستاین، فایقی مامە عەزە وتی، ژمارەیەک پێشمەرگە دیار نەماون، یەکسەر وتی بەخوا تەسلیم بوونەتەوە. کاتی ئەنفالەکان وابوو، ناوبەناو پێشمەرگە تەسلیم دەبوونەوە، هەندێکیان ئەنفال دەکران، هەندێکیان بەزیندویی دەمانەوە.

**لە سماقوڵی:**

کە گەیشتینە دۆلی سماقوڵی ناوچەی خۆشناوەتی، هەرەتی بەهاربوو، بەهاری ئەو ساڵەش تەڕوو ئاودار بوو، دیمەنی بەهاری گوندی سماقولی، هێندە سەرنجی راکێشام، خەریک بوو ئەنفال و کمیابارانی لەبیردەبردمەوە، لەدڵی خۆمدا دەموت خۆزگە رۆژێک لەم ناوچەیەدا بەئاشتی دەژیام، دواتر دەموت بمزانیبایە ئەو سنورەی مەڵبەندی سێ هێندە خۆشە، زوو دەهاتم بۆ ئیرە، خۆم دەکرد بەپزیشکی مەڵبندی سێ.

لەگوندی سماقوڵی قادری حاجی عەلیم بینی، ئەو شوێنەی قادرم تێدا بینی ئێجگار خۆشبوو، ژێردارێکی گەورە بوو، ئاوێک بەبەردەمیدا دەڕۆیشت، کاتێک پەیامەکەی شێخ جەعفەرم پێدەگەیاند، نیوەی هەستم لای بەرپرسی مەڵبەند بوو، بزانم چۆن وەڵامم دەداتەوە، نیوەکەی تری هەستم، لەلای دیمەنە جوانەکانی گوندی سماقوڵی بوو.

دوای ئەوەی قادری حاجی عەلی پەیامەکەی شێخ جەعفەری لێوەرگرتم، وتی: تۆ بڕۆ بۆ نەخۆشخانەی سماقوڵی، لەوێ بمێنەرەوە. وتم: باشە، لەگەڵ جوتیار نەخۆشخانەکەمان دۆزیەوە، لەو کاتەدا کە ئێمە گەیشتین، دکتۆر حسەینی برازای مام جەلالم بینی، مەرحەبایەکی سەرپێیی کردین و ئەو ناوەی بەجێهێشت. من و دکتۆر حسەین ساڵی ١٩٨١ لەنەخۆشخانەکانی هەولێر، ماوەی چەند مانگێک پێکەوە کارمان کردبوو، پەیوەندیەکی باشمان هەبوو. دکتۆر حسەین خۆی حەزی لەسیاسەت نەدەکرد، بەڵام ئەو کاتەی من بووم بەپێشمەرگە، سێ برای پێشمەرگە بوون، دوای ماوەیەک، جاشەکانی هەباس هێرشیانکردە سەر ماڵی باوکی، لەگوندی کەڵکانی بناری کۆسرەت، شێخ حەمەساڵحی باوکی، دایکی و دوو خۆشکیان شەهید کرد، ئەویش بەناچاری هاتە دەرەوەو بوو بەپێشمەرگە. لەساڵی ١٩٨١ بەدواوە، یەکەم جار بوو دکتۆر حسەین ببینم، حەزم دەکرد کەمێک لەلام بمایەتەوە، کەمێک بەیادی جارانەوە دوو قسەی خۆشمان بکردایە، بەڵام ترسی کیمیاوی و ئەنفال، ئەو دەرفەتەی لەکیس داین، ئەو زۆر بەپەلەبوو، وتی: دەڕۆم نەخۆشخانەکە بۆ ئێوە بەجێدێڵم.

نەمزانی قادری حاجی عەلی بۆچی منی نارد بۆ نەخۆشانەی سماقوڵی؟ ماوەی چەند کاتژمێرێک لەنەخۆشخانە چۆڵەکەداماینەوە، سەیرمان کرد دنیا بەرەو چۆڵەوانی دەڕوات، کەس لەکارمەند و پزیشکی مەڵبەندی سێ نایەن بەو ناوەدا، نەخۆش و بریندار لەو نەخۆشخانەیە نیە، زیندانی مەڵبەند لەنزیک نەخۆشخانەکەوە بوو، سەیرمان کرد زیندانیشیان گواستەوە، ئەو ناوەیان تەواو چۆڵ کرد.

لەگەڵ جوتیار کەوتینە گفتوگۆ، دەمانوت: ئەمە چییە؟ خۆ کەس لەدەورمان نەما، ئەی بۆچی ئێمەیان ناردە ئێرە، ئێستا چی بکەین؟

**سەفینی مەلا قەرە:**

دوای ئەوەی بۆماندەرکەوت کەس لەدەورووبەرمان نەماوە، ئێمەش نەخۆشخانەمان بەجێهێشت، بەرەو گوندی سماقولی گەڕاینەوە، بەتەمابووین بەرپرسەکانی خۆمان، یان ئەوانەی مەڵبەندی سێ ببینین، پرسیاریان لێبکەین ئەمە چیە؟ بۆ بەتەنیا ئێمەتان نارد بۆ ئەو شوێنە چۆڵە؟ کە گەیشتینە سماقوڵی، لەوێش کەسمان نەبینی، مەڵبەندی سێ گوندی سماقوڵیان چۆڵکردبوو. شارەزای ناوچەکە نەبووین، نەماندەزانی بەرەو کوێ بڕۆین؟ . لەگوندی سماقوڵی چوینەدەرەوە، بەرەو شاخەکانی پشتی گوند جووڵاین، لەڕێگەدا چەند هاولاتیەکمان بینی، پرسیارمان کرد مەڵبەند بۆ کوێ رۆیشت؟ ، وتیان: مەڵبەند گواستیانەوە بۆ دۆڵی بالیسان، دوای ئەوەی چەند جارێک پرسیارمان کرد، تێگەیشتین کە دەبێت سەرەتا بچینە دۆڵی هیران و نازەنین، دواتر بڕۆین بۆ دۆڵی بالیسان.

ناوچەی خۆشناوەتی لەسێ دۆڵی ئێجگار خۆش و دلڕفێن پێکهاتوە، دۆڵی سماقوڵی، دۆڵی هیران و نازەنین، دۆڵی بالیسان، درەنگانێکی ئێوارە گەشتینە نازەنین، ئەوێش چۆڵ بوو، هەواڵی بارەگای پێشمەرگەمان پرسی، وتیان: بارەگای تیپی سەفین لەگوندێکی نزیک نازەنینە، سەفینی مەلا قەرە فەرماندەی تیپە. بە جوتیارم وت با بچین بۆ بارەگای تیپی سەفین، فەرماندەی تیپەکە برادەرمە.

بارەگاکەی سەفینمان دۆزیەوە، شەو لەلایان ماینەوە، کەمێک پشووماندا، دەربارەی شوێنی مەڵبەندی یەک و مەڵبەندی سێ، پرسیارم لەسەفینی مەلا قەرە کرد، وتی: بڕیاردراوە بارەگای مەڵبەندی یەک لەقەندیل بێت. بارەگای مەڵبەندی سێ لە خەتێ و بالیسان بێت. دواتر رێنماییکردین کە بۆ رۆژی دوایی بچینە هیران، لەوێوە شاخی هەورێ ببرین، بڕۆین بۆ گوندی شیوە، لەوێوە بەرەو قەندیل بڕۆین.

بۆ رۆژی دوایی شاخی هەورێمان بری، بارەگای تیپی ٨٣ هەورێ لەگوندی شیوەی سەروو بوو، شەوێک لەوێ لەگەڵ پێشمەرگەکانی تیپی

کیلۆمەترێک لەبەرەی شەڕەوە، چاوەڕوانی برینداریێک نەکات. بۆئەوەی لەمردن رزگاری بکات، لەئێش و ئازار دووری بخاتەوە؟ .

جوتیار بەگوێی نەکردم، منیش بەگوێی جوتیارم نەکرد، ئەو ملی ڕێگەی قەندیلی گرت، منیش ملی ڕێگەی مەلەکانم گرت، چوومە نەخۆشخانەی مەلەکان، دکتۆر هەڤاڵم بینی، وتم من لێرە لەگەڵ تۆ، لەسنوری مەڵبەندی سێ دەمێنمەوە.

ئەو هەڵویستەی من، لەلایەن بەرپرسانی مەڵبەندی سێوە بەباشی بینرا، پێیانخۆشبوو، بەو بۆنەیەوە حەسەن کوێستانی جیگری بەرپرسی مەڵبەندی سێ هاتە لام، دەستخۆشی لێکردم. دوای چەند ڕۆژ مانەوەم لەنەخۆشخانەی مەلەکان، برادەرانی مەڵبەند وتیان وەرە بۆ نەخۆشخانەی خەتێ، لەبەرئەوەی نەخۆشخانەی خەتێ چۆڵە. مەڵبەندی سێ لەسماقولّی و خەتێ و مەلەکان، نەخۆشخانەی هەبوو، سماقولّی و خەتێ چۆڵکرابوون، دکتۆر هەڤاڵ لەمەلەکان بوو، منیش لەنەخۆشخانەی خەتێ مامەوە.

## گوندەکان چۆڵدەکەن:

بارەگای مەڵبەندی سێ و مەکتەبی عەسکەری ینک، لەنێوان گوندی خەتێ و توتمێ دا بوو، کۆسرەت رەسول بەرپرسی مەڵبەندی سێ بوو، ملازم عومەر بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری بوو. سەردانی بارەگای مەڵبەندم کرد، ملازم عومەرو کۆسرەت رەسوڵ، پێیانخۆشبوو لەگەڵ پێشمەرگەکانی مەڵبەندی سێ مامەوە. قادری حاجی عەلی وشێخ جەعفەریشم لەبارەگای مەڵبەندی سێ بینییەوە.

ئەو ماوەیەی لەنەخۆشخانەکەی گوندی خەتێ مامەوە، جاروبار سەردانی بارەگای مەڵبەندم دەکرد، لەگەڵ کارمەندانی نەخۆشخانەدا دۆستایەتیم پەیداکرد، جارجارەش پێشمەرگەی نەخۆش سەردانی دەکردین، لەو هاتوچۆو تێکەڵاویەدا بۆمدەرکەوت، بەرپرسانی مەکتەبی عەسکەری و مەڵبەندی سێ، خۆیان بۆ هێرشی ئەنفالێکی ترئامادە دەکەن.

پێش ئەنفالی پێنج، مەکتەبی عەسکەری و مەڵبەند، لەگەڵ بەرپرسانی هێزی پێشــــمەرگەو کادرانـــدا، کۆبونـــەوەیان کردبـــوو، داوایـــان لەبەرپرســـان و کادرەکانیان کردبوو، هەر کەس ئارەزووی هەیە شەڕ بکات، با بمێنێتەوە، ئەو کەسەشـی ئـارەزووی شـەڕی نییـە، بـا لەسـنووری مەڵبەنـد نـەمێنێ، بـەرەو قەنـدیل و ئێران بـڕوات. بـەو شـێوەیە ئـەو کـادرو بەرپرسـانەی کـە حـەزیان لەشـەڕ نـەدەکرد، یـان دەیـانوت نەخۆشـین، سنوری مەڵبەنـدیان چۆڵ دەکـرد، ئەوبەرپرسانەی مابوونەوە، ئامادەی شەڕکردن و گیانبەختکردن بوون.

مـلازم عومـەر، کۆسـرەت رەسـول، حەسـەن کوێسـتانی، چـەتۆ حـەوێزی، عەبـدولڕەزاق محەمـەد، وەک بەرپرسـی ناوچەکـە لەگـەڵ هێـزی پێشـمەرگەدا بوون.

پێش پرۆسەی ئەنفالی پێنج، بەرپرسـانی مەکتـەب عەسـکەری و مەڵبەنـدی سێ، خەڵکی گوندەکانی سنوری مەڵبەنـدیان ئاگادارکردەوە، لـەپێناو پاراسـتنی سـەرو ماڵیانـدا، باشـترە گوندەکانیان چۆڵبکـەن، بۆئـەوەی بەرشـاڵاوی چـەکی کیمیـاوی و ئـەنفال نەکـەون. خـەڵکیان سـەرپشـک دەکـرد، کـە بـەرەو شـارو ئۆردوگاکانی ژێر دەسەڵاتی رژێم بڕۆن، یان بـەرەو قەنـدیل و سـنوری ئێـران بڕۆن، ئەوانەی بـەرەو سنوری ئێران دەڕۆیشـتن، بـڕی ٣٠٠ سێسـەد دینـاری عێراقی هاوکاریان دەکردن.

**د. ئاسۆ خۆیدەکوژێ:**

دکتۆر جەلال یـەکێک لەپزیشـکانی مەڵبەنـدی یـەک بـوو، بەرپرسـانی هێـزی پێشمەرگە باسی ئازایەتی و چاو نەترسی دکتۆر جەلالیان دەکرد، لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٨ وە، وەک مـەفرەزەی پزیشکی، لەگـەڵ هێزەکـەی مەڵبەنـدی یەکدا بـوو، بەشـداری شـەڕی ئـەنفالی یـەکی کـرد، دوای ماوەیـەک لەگـەڵ هێزەکـەدا گەڕایـەوە، هاتـەوە لامـان، بەشـداری ئـەنفالی سـێی کـرد. لەئـەنفالی چـواردا لەگونـدی هـــەنجیرەی ناوچـــەی عەســـکەر لەگـــەڵ دکتـــۆر دڵشـــاد مایـــەوە. سەرلەبەیانی رۆژی ٤-٥-١٩٨٨ ئەنفالی چوار دەستی پێکرد، هێزی پێشمەرگە شکا، پەرتەوازە بوو، دکتۆر جەلال و دکتۆر دڵشاد لەئێمە دابڕان، نەماندەزانی

لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەندی یەک گەڕاونەتەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ، یان لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەندی دوو خۆیان حەشارداوە، یان شەهید بوون.

دوانیوەڕۆیەک لەنەخۆشخانەی خەتێوە، سەردانی بارەگای مەڵبەندم دەکرد، کە گەیشتمە سەر ڕێگاکە، سوارڕۆیەکی گەورەی پێشمەرگە(زیلی سەربازی) لەبەردەممدا وەستا، کەسێک لەپشتی سوارڕۆکە دابەزی، سەیرئەکەم خۆ ئەوە دکتۆر دڵشادە، یەکسەر ئەملاولاییم ماچ کرد، زۆر پێمخۆشبوو کە شەهید نەبووە، دوای چاک و چۆنییەکی گەرم، هەواڵی دکتۆر جەلالم پرسی؟ وتی: ئەویش ماوە، دواتر باسی خۆیانی بەو شێوەیە بۆ کردم وتی: ڕۆژی یەکەمی ئەنفال، من و دکتۆر جەلال و دکتۆر ئاسۆ، لەهێزی پێشمەرگە دابڕاین، جاش لێمان نزیکبوەوەو دەوری گرتین، دکتۆر ئاسۆ کە ئەو دیمەنەی بینی، لەوە زیاتر خۆی پێڕانەگیرا، بەدەمانچەکەی، فیشەکێکی بەخۆیەوە ناو خۆی شەهید کرد[٤٥]، جاشەکان کە بینیان دکتۆر ئاسۆ خۆی کوشت، بەزەییان پێماندا هاتەوە، وتیان: خۆتان مەکوژن، وەرنە لای ئێمە ژیانتان دەپارێزین، وتی: بڕوامان پێنەدەکردن، بەرپرسی جاشەکان سوێندی بەگۆڕی مەلا مستەفا خوارد، وتی: ئەگەر خۆتان بدەن بەدەستەوە، ژیانتان دەپارێزین و دەتانئێرینەوە بۆ لای پێشمەرگە. د. دڵشاد وتی: ئێمەش بڕوامان پێکردن، چووینە لایان، لەلای بەرپرسانی سوپای عێراق ئێمەیان بەجاشی خۆیان ناساند. پەیمانییاندا کاتێک بارودۆخی ناوچەکە ئارام بووەوە، بمانگوازنەوە بۆ سنوری ناوچە ڕزگارکراوەکان. وتی: لەو کاتەوە ئێمە لەڕەبایەداین، ئەمڕۆ هەینی منیان هێنایە نزیک گوندی وەرێ، لەوێوە خۆم هاتم تا گەیشتمە سنوری پێشمەرگە، لەگەڵ پێشمەرگەکانی ڕێکخراوی کۆمەڵە هاتم بۆ ئێرە. د. دڵشاد وتی: هەینی ئایندە دکتۆر جەلالیش ڕەوانە دەکەن. قسەکەی دکتۆر دڵشاد ڕاست دەرچوو، یەک هەفتە دواتر بەهەمان شێوە، دکتۆر جەلالیش ڕەوانە کرا، گەیشتەوە لامان، هەمان باسی دکتۆر دڵشادی بۆ گێڕامەوە.

---

٤٥ دکتور ئاسۆ یاریدەدەری پزیشک بوو، خەڵکی شاری سلێمانی بوو، دکتوری تیپی ٢٣ سورداش بوو، دوو برای تری لە پێشمەرگایەتیدا شەهیدبوون.

**ئەنفالی پێنج**

**کیمیابارانی وەرێ:**

ماوەیەک لەنەخۆشخانەکەی گوندی خەتێ مامەوە، رۆژ بەرۆژ هاورێیەتیم لەگەڵ کارمەندو پێشمەرگەکانی نەخۆشخانە باشتر دەبوو، عەبدولقادر، خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدین بوو، دەستی لەخوێندن هەڵگرتبوو، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کردبوو، لەنەخۆشخانەی خەتێ، شانبەشانی هاورێکانی، لەژێر چاودێری دکتۆر زریاندا کاری پزیشکی دەکرد. هاوتا یاریدەدەری پزیشک بوو، پێشتر دکتۆری تیپی ٩٣ کۆیە بوو، دوای ئەنفالی چوار هاتە مەڵبەند، لەنەخۆشخانەی خەتێ مایەوە، ژمارەیەک پێشمەرگەی تر، بۆ جێبەجێکردنی کاروباری کارگێری نەخۆشخانە مابوونەوە.

ئێوارەیەکی درەنگی رۆژە کۆتاییەکانی مانگی پێنجی ١٩٨٨ بوو، لەنزیک نەخۆشخانەوە دانیشتبووم، جارێکی تر گوێم بەدەنگی فرۆکە جەنگیەکانی سوپای عێراق زرنگایەوە، دەنگی فرۆکەکان لەو کاتەدا، بەواتای بۆردومانی کیمیاوی ناوچەیەکی تردەهات. لەپرۆسەکانی ئەنفالدا، کیمیابارانی سوپای عێراق، لە کاتژمێر شەشی ئێوارانی کاتی زستانە دەستپێدەکرد، لەو کاتەدا، خەڵکی گوندەکان دەست لەکار هەڵدەگرن و لەماڵەوە پشوودەدەن، پسپۆرانی کەش و هەوا پێیانوایە، لەو کاتەشدا جوڵەی هەوا کەمدەبێتەوە، بەو هۆیەوە گازە کیمیاوییەکە بڵاونابێتەوە، لەشوێنی بۆردومانەکەدا رێژەکەی بەچڕی دەمێنێتەوە، بەچڕی بەر ژمارەیەکی زۆر خەڵک دەکەوێت، زۆرترین زیان دەگەیەنێت.

تا کاتژمێر ١١ یانزەی شەو، نەمدەزانی فرۆکەکانی رژێم، کام گوندەیان بۆردومان کردووە؟ ، لە دڵەراوکێدا بووم، خەوم لێنەدەکەوت، دەموت فرۆکەکان هاتونەتە سەر ناوچەکە، بەدڵنیاییەوە بۆردومانیان کردووە، ئایا کەس بەرکەوتووە؟ ، ئایا ئەمشەو بریندارى کیمیاویم بۆ دێنن؟

کاتژمێر یانزەو نیوی شەو بوو، لەناو پێخەفدا راکشابووم، پێشمەرگە هاتن بۆ لام، وتیان: دکتۆر هەستە برینداریان هێناوە، یەکسەر هەستام، چوومە خوارەوە بۆ سەر کانیاوو حەوزەکەی گوندی خەتێ، تراکتۆرێک بەعەرەبانەوە

لەنزیک حەوزەکەی گوندی خەتێ راوەستابوو، چەند پێشمەرگەیەک لەدەوری وەستابوون، وتیان: دکتۆر ئەمانە بریندارى گوندی وەرێ-ن، فرۆکەکانی عێراق ئەو گوندەیان کیمیاباران کردوە. دەسکێشی نایلۆنم لەدەست کرد، چوومە ناو عەربانەی تراکتۆرەکە، دەستم بەپشکنینی بریندارەکان کرد، بریندارەکان نیشانەی چەکی کیمیاوی گازەکانی دەماریان لەسەر بوو، یەکسەر بانگی عەبدولقادرو هاوتام کرد، بۆئەوەی هاوکاریم بکەن، من و هاوتا بریندارەکانمان لەعەرەبانەکە دادەگرت، جلەکانمان لێدادەکەندن، لەئاوی حەوزەکەدا دەمانشتن، جلووبەرگی پاکمان لەبەردەکردن، عەبدولقادریش دەرزی ئەترۆپینی بۆ دەکردن، مغەزی بۆ هەڵدەواسین.

ئەو شەوە زیاتر لە٣٠ سی بریندارمان چارەسەر کرد، بۆ رۆژی دوایی پڕ بەعەرەبانەیەکی تر بریندارى هەمان گوندیان هێنا، بەهەمان شێوەی شەو، لەگەڵ عەبدولقادر و هاوتا چارەسەی بریندارەکانمان کرد. لەکۆتاییدا منداڵێک و ژنێکی بەتەمەن لەناو عەرەبانەکەدا مابوونەوە، هەردووکیان بەخەستی بریندارببوون، ژیانیان لەمەترسیدابوو، نەمدەزانی کامیان پێش ئەویتر داگرم، بڕیارمدا یەکەم جار منداڵەکە داگرم، منداڵەکەم داگرت، شتمان، جلەکانمان گۆڕی و دەرزیمان بۆ کرد. گەڕامەوە ناو عەرەبانەکە بۆئەوەی ژنە بەتەمەنەکە داگرم، سەیرمکرد ژنەکە ژیانی لەدەستداوە. بۆ رۆژی دوایی، یەکێکی تر لەبریندارەکان ژیانی لەدەستدا، ئەوانی تر چاکبوونەوە.

گوندی وەرێ یەکێک لەگوندەکانی ناوچەی خۆشناوەتی بوو، لەڕوی کارگێڕیەوە لەژێر دەسەڵاتی رژێمی عراقدا بوو، بۆیە خەڵکی گوند لەکیمیاباران و ئەنفال نەدەترسان، لەگوندەکەیان مابونەوە و چۆڵیان نەکردبوو. بەڵام لەبەرئەوەی گوندێکی قەرەباڵغ بوو، رژێم کیمیابارانی کرد، ژمارەیەک لەخەڵکی گوند شەهید بوون، ئەوانی تر برینداربون، هێنرانە نەخۆشخانەی خەتێ، چارەسەرمان کردن.

دوای بۆردومانەکە، خەڵکی گوند زانیبوویان فرۆکەی عێراق کیمیابارانی کردوون، نەیانوێرابو بۆ چارەسەری، سەردانی نەخۆشخانەکانی شار بکەن، نەوەک ئەنفال بکرێن.

**گولانیش بوردومان کرا:**

ڕۆژی دوای کیمیابارەنەکە ئاشکرابوو، فڕۆکەکانی سوپای عێراق، بەچەکی کیمیاوی گوندەکانی (وەرێ، وەرتێ، نازەنین و گولان) یان بۆردومان کردوە، لەوەرتێ و نازەنین، زیان کەمتر بوو، تەنیا کەسێک شەهید بوو، لەبەرئەوەی بەبڕیاری مەڵبەندی سێ، پێشتر گوندەکانی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگە چۆڵ کرابوون. گوندی وەرێ و گولان، لەژێر دەسەلاتی حکومەتی عێراقدا بوون، بارەگای کۆمەڵەی زەحمەتکێشان لەگولان بوو، لەوێ شەهید وبریندار زۆربوو.

کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان، حزبێکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بوو، دژی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی، خەباتی سیاسی و پێشمەرگانەی دەکرد، حکومەتی عێراق و کۆمەڵە پەیوەندی سیاسیان هەبوو، بەڕەزامەندی و بەهاوکاری حکومەتی عێراق، کۆمەڵە لەگولان بارەگای کردبۆوە، کەچی سوپای عێراق، ئەندامانی ئەو حزبە ئۆپۆزسیۆنەی ئێرانیشی نەپاراست، کیمیابارانی کردن. لەکیمیابارانی بارەگاکانی کۆمەڵەدا، ۳۰ سی پێشمەرگە شەهید بوون، یەک لەو پێشمەرگانە عەدنان مەحمود خوامراد بوو، عەدنان خەڵکی گوڵپ بوو، پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگە، ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، لەشار لەڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەدا کاری دەکرد، کە بوو بەپێشمەرگەی ینک، بڕوای سیاسی گۆڕا، وازی لەینک هێنا، پەیوەندی بەکۆمەڵەی زەحمەتکێشانەوە کرد.

**گازی دەمارەکان (گازی ئەعساب):**

جۆری چەکی کیمیاوی هەرە کوشندەیە، لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا بەرهەمهێنراوە، لەو کاتەوە، بەڵگە نییە لەهیچ شەڕێکدا بەکارهاتبێت. کەچی ڕژێمی بەعس، دژی گەلی کورد ئەو چەکە کوشندەیەی بەکارهێنا، ئەم چەکە کیمیاویە چەند جۆرێکی هەیە، تابۆن، سارین، زۆمان، ڤی ئێکس. هەر کەسێک بڕی کوشندەی گازی دەمارەکان وەربگرێت، لەماوەی چەند چرکەیەکدا کۆتایی بەژیانی دێت. ماددە کیمیاویەکە لەڕێگەی هەناسەدان و پێست و

چاوو کۆئەندامی هەرسەوە، هەڵدەمژرێت و دەگاتە ناو خوێن. لەناو خوێندا دەگاتە کۆتایی دەمارەکانی لەشی مرۆڤ، ئەنزیمێکی کۆتایی دەمارەکان لەکار دەخات، ئەو ئەنزیمە ماسولکەکانی لەشی مرڤ خاو دەکاتەوە، ئەگەر ئەو ئەنزیمە لەکار بکەوێت، ماسولکەی لەشی مرۆڤ بەکرژی دەمێنێتەوەو خاو نابێتەوە. کاتێک دڵ لێدەدات، کرژدەبێت و خاو دەبێتەوە، ئەگەر ئەو ئەنزیمە لەکار بکەوێت، ماسولکەی دڵ خاونابێتەوەو خوێن وەرناگرێت، یان ماسوولکەکانی هەناسەدان کرژدەکاتەوەو هەناسەدان دەوەستێنێت، بەو شێوەیە خوێن بەخانەکانی لەش ناگات و مرۆڤەکە دەمرێت.

بۆ یەکەمجار لەمێژوودا، سوپای عێراق، ساڵی ١٩٨٨ لەکیمیابارانی هەڵەبجە، شاناخسێ، سێوسێنان، بەلەکجار، عەسکەر، وەرێ و گوڵان، ئەو چەکەی بەکارهێنا. ئەترۆپین باشترین دەرمانە بۆئەوەی کاریگەری ئەم مادە کیمیاوییە لەسەر لەشی بریندار کەم بکاتەوە و لەمردن رزگاری بکات. لەو شوێنانەی کە ئاماژەم پێدان، چەکی کیمیاوی گازی دەمار بەکارهاتوە، دەرزی ئەترۆپینمان بۆ بریندارەکان دەکرد، سودیان لێوەردەگرت و چاک دەبوونەوە.

**ئەشکەوتەکەی مەلەکان:**

مەلەکان یەکێک لەگوندەکانی سنوری مەڵبەندی سێ بوو، گوندێکی گەورە بوو، چەند جارێک بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کراوە، زۆرینەی خەڵکی گوند ئاوارە بوون، لەنزیک گوندەکەوە، ئەشکەوتێکی گەورە هەبوو، مەڵبەندی سێ ئەشکەوتەکەی کردبوو بەنەخۆشخانە.

کە ئەنفالی ٥ پێنج دەستیپێکرد، مەڵبەندی سێ ئاگادریان کردم، نەخۆشخانەی خەتێ چۆڵبکەم و برۆم بۆ نەخۆشخانەی مەلەکان، دکتۆر هەڤاڵ لەنەخۆشخانەی مەلەکان بوو، دکتۆر هەڤاڵ ناوی راستی ئیبراهیمە، خەڵکی شاری هەولێرە، دەرچوی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغدادیە، لەسنوری مەڵبەندی سێ پێشمەرگە بوو، دوای ئەنفال بەماوەیەک، گەشتی دەرەوەی وڵاتی کرد، لەبەریتانیا نیشتەجێ بوو.

لەگەڵ دکتۆر هەڤاڵ لەنەخۆشخانەکەی مەلەکان مامەوە، رۆژانە پێکەوە کارەکانمان بەڕێوەدەبرد، کە ئەنفالی پێنج دەستیپێکرد، بریندارەکان رەوانەی نەخۆشخانەی مەلەکان دەکران، چارەسەرمان دەکردن.

شوێنی حەوانەوە و خەوتنی پزیشک و کارمەندەکان، لەدەرەوەی ئەشکەوتەکە بوو، نیوەرۆیەک دوای نان خواردن، لەگەڵ دکتۆر هەڤاڵ قسەمان دەکرد، وتی با بچم بۆ ئەشکەوتەکە سەردانی بریندارەکان بکەم، منیش وتم تۆ برۆ منیش دەست دەشۆم و دوای تۆ دێم، هەردوکمان لەیەک کاتدا هەستاین و لەشوێنی نانخواردن دورکەوتینەوە، لەو کاتەدا دوو فڕۆکەی جۆری پیلاتۆس هاتنە سەر ئاسمانی ناوچەکە، یەکسەر بۆردومانیان دەستپێکرد، یەک لەساروخەکان بەر شوێنی نانخواردنی من و دکتۆر هەڤاڵ کەوت، ساروخی دووەم بەر دیواری ئەشکەوتەکەی مەلەکان کەوت، خۆشبەختانە بێ زیان دەرچووین. ئەگەر من و دکتۆر هەڤاڵ پێش چەند چرکەیەک لەشوینی خۆمان هەڵنەساینایە، بەدڵنیاییەوە هەردوکامان شەهید دەبوین یان بە خەستی بریندار دەبووین.

**ئاسۆس هەردی:**

لەئەشکەوتەکەی مەلەکان، پێشمەرگەو رۆژنامەنوس، ئاسۆس هەردیم ناسی، ئاسۆس پێشمەرگەی پاسۆک بوو، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی نەخۆش هاتە نەخۆشخانەکەی مەلەکان، وتی: ئەو پێشمەرگەییەمان نەخۆشە، نازانم چی لێبکەین؟ دوای پشکنین، بۆمدەرکەوت پێشمەرگەکە تووشی نەخۆشی ریخۆڵەکوێرە بووە، بەئاسۆسم وت: ئەم نەخۆشە تووشی ریخۆڵەکوێرە بووە، باشترین چارەسەر نەشتەرگەریە، بەڵام لەم بارودۆخەدا، ئێمە ناتوانین نەشتەرگەری بۆ بکەین، بیبەن بۆ سنور بەڵکو لەوێوە بیبەنە شارێکی ئێران، تا نەشتەرگەری بۆ بکەن، ئەگەر ئەوەشتان پێناکرێت، دەرفەتێکی دەدەمێ، بەڵکو بەدەرمانی ئەنتیبایۆتیک چاک ببێتەوە. ئاسۆس وتی: ناتوانین بیگەیەنینە ئێران. ناچار بەدەرزی ئەنتیبایۆتیک و موغەزی، دەستمان بەچارسەری نەخۆشەکە کرد، خۆشبەختانە سودی لەدەرمانەکان وەرگرت و چاک بوەوە.

**برووسکەکە:**

ناوەراستی مانگی حوزەیرانی ١٩٨٨بوو، گەرمەی شەڕی ئەنفالی پێنج بوو، لەنەخۆشخانەکەی ئەشکەوتی مەلەکان لەگەڵ دکتۆر هەڤاڵ و کارمەندەکانی تردا، رۆژانە بریندارى شەڕەکەمان دەبینی و چارەسەرمان دەکردن. بارەگای مەڵبەندی سێ و مەکتەبی عەسکەری نزیک گوندی خەتێ بوو، لەوێوەو لەلایەن ملازم عومەر و کۆسرەت رەسوڵەوە، بروسکەیەکم بۆ هات، بروسکەکە دەڵێت: "تۆ لەگەڵ بریندارەکان بەرەو سنور برۆ، لەوێشەوە پشوویەک بدە، هێزێکی پێشمەرگە بەرێوەن، بەو زوانە دەگەنە لامان، دکتۆر ئازاد لەگەڵ ئەو هێزەدایە، دکتۆر ئازاد لەشوێنی تۆ دەمێنێتەوە".

دوای خوێندنەوەی برووسکەکە، دەستمان بەئامادەکاری کرد بۆ گواستنەوەی بریندارەکان، فەرهاد کە یەکێک لەکارمەندەکانی نەخۆشخانەی مەڵبەندی سێ بوو، بۆ کۆکردنەوەو گواستنەوەی بریندارەکان هاوکاری کردم.

دوای تەواو بوونی ئامادەکاری، بەرەو قەندیل بەرێکەوتین، سەرەتا بەشاخی گولاندا سەرکەوتین، شاخی گولانمان بڕی، گەیشتینە قەندیل، بارەگای حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران(حدکا) لەگوندی بۆلێی بناری قەندیل بوو، بریندارەکانمان بردنە نەخۆشخانەکەی حدکا، لەوێ پشوویەکمان دا، بریندارەکانمان لەلایەن پزیشکانی نەخۆشخانەی حدکا وە بینران و کاری پێویستیان بۆ کرا.

پێش ئەوەی بەرەو قەندیل بەرێبکەوم، بەبروسکەیەک وەڵامی کۆسرەت رەسوڵ و ملازم عومەرم دابوەوە، ئاگادارم کردبوونەوە کە بڕیارەکەیان جێبەجێدەکەم، هەروەها داوامکرد رەزامەند بن: "کاتێک گەیشتمە لای برادەرانی حدکا، لەوێ بۆ ماوەیەک دەمێنمەوە، دەنێرم بەشوێن هاوسەرەکەم و کچەکەمدا، لەناو شارەوە بێن بۆ لام، ئەوانیش لەگەڵ خۆم بەرەو سنور دەبەم ".

دوای تەداوی بریندارەکان و پشودان، فەرهاد لەگەڵ بریندارەکان بەرەو سنوور رۆیشت، من لای برادەرانی حدکا مامەوە.

**بارەگای حدکا:**

هەرچەندە من ئەو کاتە کۆمەڵەبووم، حدکام وەک حزبێکی بورجوازی سەیر دەکرد، بەڵام ئەو چەند رۆژەی لای برادەرانی حدکا مامەوە، هەندێک دیمەنی جوانی سیاسی و رێکخراویی ئەو حزبە سەرنجیان راکێشام. ئەوەی لای حدکا بینیم، ئەوسفاتانە بوون کە پێشمەرگەی ئەو کاتەی کوردستان، خەڵکی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان، لەسەرکردایەتی حزبەکانی باشوری داوا دەکەن، بەڵام ئامادە نین ئەنجامی بدەن.

یەکەم خاڵ کە بەلامەوە جوان بوو، نانخواردنی بەکۆمەڵی پێشمەرگەو بەرپرسەکانی حدکا بوو، بارەگای سەرکردایەتی حدکا، یەک چێشتخانەی هەبوو، لەچێشتخانەکەدا مێزێکی گەورە دانرابوو، هەموو بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارەیەک، بەرپرس و پێشمەرگەو میوان، پێکەوە نانیان دەخوارد. لەو کاتەدا عەبدولڕەحمانی قاسملۆ لەبارەگا بوو، جارێکیان من لەتەنیشتییەوە نانم خوارد، جارێکیش لەبەرامبەریدا نانم خوارد، چەندە بیرم لای خواردن بوو، هێندەش بیرم لای هەڵسوکەوت و قسەخۆشەکانی سەر مێزی نانخواردنی، قاسملۆ بوو. ئەوە چوارەم جار بوو قاسملۆ ببینم، یەکەمجار پایزی ١٩٨٢ لەگوندی ساوانی رۆژهەڵاتی کورستان بینیم، دووەم جاربەهاری ساڵی ١٩٨٤ لەنەخۆشخانەی سورداش بینیم، سێهەم جار هاوینی ١٩٨٤ لەکۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا لەمێرگەپان بینیم، ئەمجارەش هاوینی ساڵی ١٩٨٨ لەگوندی بۆڵێ بناری قەندیل دەیبینم.

ئەو چەند رۆژەی لای حدکا مامەوە جوانییەکی ترم بینی، وەک لای خۆمان نەبوو هەر بەرپرسێکی حزبی مەفرەزەی پاراستنی تایبەتی خۆی هەبێت، تیپێکی تایبەتی پاراستنیان هەبوو، هەر بەرپرسێک لەبارەگا دەرچووبایە، مەفەرەزەیەکیان لەتیپی پارستن بۆ ئامادە دەکرد، لەگەڵیدا دەڕۆیشت، دوای ئەوەی ئەرکەکەی ئەنجامدەدا، مەفرەزەکە دەگەڕایەوە شوێنی خۆی. رۆژێکیان قاسملۆ لەبارەگا دەرچوو، مەفرەزەیەکییان بۆ ئامادە کرد.

حەزم دەکرد چاوم بەقاسملۆ بکەوێت، لەنزیکەوە وتووێژی لەگەڵدا بکەم، نەمدەزانی ئەو چاوپێکەوتنە چۆن رێکبخەم، چوومە لای بەرپرسی کارگێڕی

بارەگای سەرکردایەتی حزب، وتم دەمەوێت سکرتێری حدکا ببینم، وتی: کاکە دکتۆر تۆ ئەندامی ینکی، پەیوەندی نێوان حدکا و ینک لەڕێگەی مەکتەبی سیاسی وە دەبێت، ئەبێ مەکتەبی سیاسی حزبەکەت رازی بێت، داوا بکات تۆ سەردانی دکتۆر قاسملۆ بکەیت، ئەگەر نا ئێمە ناتوانین داواکەت جێبەجێبکەین. منیش بێدەنگ بووم، لەئاست دسپلینی حدکا دا تەریق بوومەوە، وازم لەداواکاریەکەم هێنا.

ئەو کلتووره جوان و بەدسپلینەی حدکا، وا کاری لێکردم، کە خۆم پێنەگیرا، لەلای بەرپرسی کارگێڕی بارەگای حدکا، گلەییم لەخۆمان(ینک) کرد، وتم: بۆچی ئێوە لەبەڕێوەبردنی کارەکانتاندا هێندە دادپەروەرو بەدسپلینن؟ بەڵام حزبەکانی ئێمە لەباشور، گوێ بەم پێوانانە نادەن؟ بەرپرسەکەی حدکا دەستی بەپێکەنین کرد، لەسەرخۆ وتی: ئێوە لەگەڵ عەرەب دەژیین، ئێمە لەگەڵ فارس دەژیین، عەرەب گەلێکی هەمەجییە، فارس گەلێکی شارستانییە.

دوای ئەوەی وەک ئاوارەیەک گەیشتمە ئێران، لەنزیکەوە کلتوری جوان و دسپلینی خەلکی ئێرانم بینی، کە بەکلتوور و دسپلینی خەلکی عێراق بەراوردم دەکرد، راستی قسەی بەرپرسەکەی حدکام بۆ دەرکەوت.

**کۆستە جەرگبڕەکان:**

ئەو کاتە پەیوەندیی نێوان ینک و حدکا، پەیوەندییەکی هاوسەنگ بوو، ئەگەرچی هەردوولا لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان پەیوەندییان هەبوو، ینک لەگەڵ ئێران، حدکا لەگەڵ عێراق، بەڵام تا دوای راپەڕینیش، پەیوندی نەتەوەییی نێوان ئەو دوو حزبە، پەیوەندییەکی ستراتیجی بوو، دژایەتی یەکترییان نەدەکرد، لەکاتی تەنگانەدا هاوکاری یەکتریان دەکرد. لەکاتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا، هێزی پێشمەرگەی ینک ئەوپەڕی هەوڵیدا، پێشمەرگەکانی حدکا لەهێرشی سوپای پاسدارانی ئێران بپارێزێت. حەمە سیاسی کادیرێکی ینک بوو، لەکاتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا، رێنمایی پێشمەرگەکانی حدکای کرد، لەهێرشی پاسدار دوورییخستنەوە، بەو هۆیەوە لەئێران بڕیاری دەستگیرکردن بۆ حەمە سیاسی دەرچوو، ئەو ساڵانەی ئێمە

لەئێران ئاوارە بووین، حەمە سیاسی نەیدەتوانی بەئاشکرا بچێتە ناو خاکی ئێرانەوە، حەمە سیاسی یەک لە هاوڕێکانم بوو، دوای ڕاپەڕین لەشەڕی ناوخۆدا شەهیدبوو.

لەکاتی ئەنفالەکاندا، حدکا هاوکاری باشیی پێشمەرگەکانی ینکی کرد، چەندان بریندارو پێشمەرگەو خێزانی پێشمەرگەی، لەدەڤەری گەرمیانەوە، لەناو شارەکانەوە، گەیاندە ناوچە رزگارکراوەکان، رادەستی هێزی پێشمەرگەی کردنەوە.

لەڕێگەی پەیوەندیەکانی حدکاوە، هەواڵم بۆ خزمەکانم نارد، بەڵکو هەوڵبدەن پەیوندی بەهاوسەرەکەمەوە بکەن، لەگەڵ منداڵەکەمدا، رەوانەی لای خۆمی بکەن، بە هاوکاری محەمەدی وەڵلاد بەگی، بەرپرسی پەیوەندیەکانی حدکا، دوای چەند رۆژێک چاوم بە چاوی مەهاباد و شێنێ شاد بووەوە.

بۆ ئێوارەکەی بارەگای حدکا-مان لە بۆڵێ بەجێهێشت، بەرەو گوندی لێوژێ رۆیشتین، ماڵی پێشمەرگەکانی حدکا لە لێوژێ بوو، بووینە میوانی ماڵی بەرپرسێکی سەربازی حدکا، بەرپرسەکە ناوی مەنسوری رەشە هەورامی بوو. لەو کاتەدا لەماڵەوە نەبوو، لەبەرەی شەڕ بوو، بەهرۆزی ژنبرای مەنسوری رەشە هەورامی، ئێمەی گەیاندە ماڵی خۆشکەکەی.

دوای کیمیابارانی سێوسێنان، مەهابادو شێنێم ناردبۆوە بۆ ناو شار، نزیکەی سێ مانگ بوو نەمدیبون، کە هاوسەرەکەم و منداڵەکەمم بینییەوە، هەستم بەخۆشیەکی لەڕاددەبەدەر کرد. کاتێک هەواڵی ماڵی خۆمانم لەمەهاباد پرسی، وتی زانیارییم لەسەر ماڵی دایکت نییە، قسەکانی مەهاباد و بێدەنگی ناجحی برام، کە ماوەیەک بوو گەشتبوە ئێران، گومانی شەهید بوونی دایک و براو خزمەکانمی لەلا زیاد کردم. مەهاباد هەواڵی کۆچی دوایی باوکیشی پێڕاگەیاندم، وتی مانگێک لەمەوبەر، باوکم دوچاری نەخۆشیەکی کتوپر هات و کۆچی دوایی کرد. دواتر مەهاباد چیرۆکی چۆنیەتی رزگاربونی خۆی و شێنێ و هاوڕێکانی لەئەنفال بۆ گێرامەوە.

خۆم و هاوسەرەکەم و منداڵەکەم، چەند جارێک لەلێواری مەرگ نزیک بووبینەوە، بەیەک گەیشتنەوەمان دوای سێ مانگ، لەگوندی بۆڵێی بناری

قەندیل، بۆنەییەکی زۆر خۆش بوو، بەڵام بەهەمان رادە، گومانی زیاتر لەشەهیدبونی دایکم وبراکەم، لەگەڵ کۆچی دوایی باوکی مەهاباد، هەواڵی ناخۆش و جەرگبربوون.

دایکم ژنێکی رەشبین بوو، بەردەوام بیری لەژیان و گوزەرانی رۆژانەی منداڵەکانی دەکردەوە، تا باوکم مابوو، ترسی هەتیوکەوتنی ئێمەی هەبوو، پێشبینیەکەی راستدەرچوو، باوکمان شەهید بوو، ئێمە هەتیوکەوتین، دوای هەتیووی، دایکم دەترسا منداڵەکانی لەبرساندا بمرن، من کەسێکی ورە بەرزوو گەشبینم بووم، بڕوای دایکمم بەسەرکەوتن و بەدوارۆژێکی گەش بەرزدەکردەوە، پەیمانم پێدەدا لەدوارۆژدا خزمەتی بکەم، بەڵام کە دەمبینی رۆژ لەدوای رۆژ ئەگەری شەهیدبونی دایکم زیاتر دەبێ، بەو بڕوایە دەگەییشتم کە دایکم لەژیاندا نەماوە، هەستم بەرەشبینی دەکرد، دەموت لەبەر خزمەتی نیشتمان و نەتەوەکەم، خزمەتی خانەوادەم فەرامۆش کرد، دەموت ئیتر بۆ هەتا هەتایە، ناتوانم بەرامبەر بەدایکم بەوەفا بم، پەیمانەکەم جێبەجێبکەم و خزمەتی بکەم.

شێخ حەمەئەمین عەبابەیلێی باوکی مەهاباد، کەسایەتیەکی ناسراو بوو، لەپەنجاکانی سەدەی بیستدا، مامۆستای قوتابخانەی گوندی گوڵپ بوو، لەشۆڕشی ئەیلولدا فەرماندەی دەستەی یەکەمی پێشمەرگەکانی ناوچەی هەورامان بوو، لەسەردەمی جەلالیەکاندا، قائیمقامی هەڵەبجەو کەلارو چەمچەماڵ بوو، لەشۆڕشی نوێدا، لەرێکخستنە نهێنەکانی ینکدا، لەناو شاردا رۆڵی کاریگەری هەبوو، زۆرم حەز دەکرد رۆژێک لەرۆژان، لەنزیکەوە بیبینم، گفتوگۆی لەگەڵ بکەم، بەڵام مەرگی لەناکاوی، ئەو ئاواتەشمی لەگۆڕنا.

# ١٢

# لە ئاوارەییدا

**رەزا قورس:**

شـەوێک لەگونـدی لێوژێ ماینـەوە، بـۆ رۆژی دوایـی هێسـترێکمان بـەکرێ گرت، مەهابادو شێنێ سواری هێستر بوون، منیش لەگەڵ ولاخدارەکەدا بەپێ، شـوێن هێتسـر کـەوتم، بەسـەر لووتکـەی شـاخەکانی قەندیلـدا، بـەرەو ئێـران بەرێکەوتین. دەبوو بەرێگەی قرناقەو پشتئاشـاندا بـەرەو ئێران برۆشـتینایە، حەزم دەکرد لەسـەر رێگەدا، گونـدی قرناقـەو پشتئاشـان ببینم. لەبـەر شـەڕە خوێناویەکـەی قرناقـە و پشتئاشـانی بـەهاری ١٩٨٤، نـاوی ئـەو گونـدە لەکـەی نێوچاوانی ینک بـوو، بۆیـە سـەرباری ئـەو رۆژە ناخۆشـانەی ژیـانم، قرناقـە و پشتئاشانم بیرمابوو، حەزم دەکرد لەنزیکەوە ببینم.

لەگـەڵ منداڵەکـەم و هاوسـەرەکەم لـەماڵێکی گونـدی قرناقـەو پشتئاشـان نزیکبوومەوە، پیاوێکی بەتەمەن دانیشتبوو، سڵاومان لێکرد، بەفەرموو وەڵامی

داینەوە، دانیشتین، بەتەمابووم لەو ماڵە ژەمێک نان بخۆین، پشویەک بدەین، دواتر لەسەر شەڕی قرناقە و پشتئاشان، پرسیار لەو پیاوە بکەم، بەڵکو لەدەمی جوتیارێکی گوندەوە، زانیاری راست لەسەر شەڕە خوێناویەکە وەربگرم. لەقووڵایی بیرکردنەوەدا بووم، ژنێکی ڕەشتاڵەی لاواز، شەرواڵێکی کوردی پیاوانەی بەسەر جلەکانیدا هەڵکێشابوو، بەوپەری تورەبوونەوە خۆی کرد بەماڵدا، هاواری کرد، هەر ئێستا بڕۆن، ماڵەکە چۆڵبکەن، هیچمان بەدەستەوە نەما، هەمووتان خوارد، خواردنمان نییە بیدەین بەکەس، هەستن بڕۆن. لەو کاتەدا سەیری مێردەکەییم دەکرد، دەموت بەڵکو دژی ژنەکەی هەڵوێست نیشانبدات، داکۆکیمان لێبکات، پیاوەکە هیچ وەڵامێکی ژنەکەی نەدایەوە، بێدەنگ مایەوە، کە بینیم پیاوەکە هیچ ناڵێت، بەمەهابادم وت: هەستە با بڕۆین، ئەو ماڵەمان بەجێهێشت، بەرەو ئێران ملی ڕێگەمان گرت.

ئەوە یەکەمجار نەبوو بکەومە دۆخیکی واوە، خاوەن ماڵ میوانی رەزا قورس دەربکات و خواردنی نەداتێ، لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، لەگوندی خۆمان، چەندانجار بەچاوی خۆم دیبووم، پێشمەرگە بەسەر ماڵاندا دابەشدەکران، خاوەن ماڵ ئامادەنەدەبوو میوانداریان بکات، پێشمەرگەی دەردەکرد. ساڵی ١٩٨٣ لەگوندی سکتانی ناوچەی خۆشناوەتی، دوو ماڵ لەسەر یەک وتیان هیچمان نیە بتاندەینێ، میوانداریان نەکردین، بەڵام ئەو ژنە هەر تەنها بەوەوە نەوەستا کە خواردنمان نەداتێ، بەڵکو قسەی ناشیرینیشی پێوتین.

**لەگەڵ هاورێکاندا:**

دووسەد مەترێک لەو ماڵە دوورکەوتینەوە، مەلا ئەحمەدی دیسکەرە و ماڵ و منداڵەکەیم بینی، لەگەڵ مەلا ئەحمەد لەناوچەی قەرەداغ پێکەوە پێشمەرگە بووین، خۆی و سێ برای پێشمەرگە بوون، براگەورەکەی لەئەنفالی چواردا لەگەڵ نۆ پێشمەرگەی تیپی ٥٥ قەرەداغدا شەهید بوو. مەلا ئەحمەد لەئەنفالی یەکدا بریندار بوو، پاش چەند مانگێک کە برینکەی سارێژبوو، لەئێرانەوە گەڕابوەوە، ناردبووی بەشوێن هاوسەر و منداڵەکانیدا، ئەوانیش بەرەو ئێران

دەڕۆیشتن، کاتێک لەکەناری ڕێگاکەدا ئەوانمان بینی، زۆر دڵخۆش بووین، لەلای ئەوان پشوومان دا، نانمان خوارد، جارێکی تربەرەو ئێران ملی ڕێگەمان گرتەوە.

شاخەکانی قەندیل هێندە سەخت و سارد بوون، تا مانگی شەش بەفری سەر ڕێگاکەی نەتوابوەوە، بۆیە نزیکەی کاتژمێرێک، بەسەر بەفردا ڕێگەمان کرد، بۆ ئێوارەکەی گەیشتینە شارۆچکەی خانێ لەڕۆژهەڵاتی کوردستان، لەوێ چوینە ماڵی محەمەد سوڵتان کە یەکێک لەهاوڕێکانم بوو، ئەو شەوە لەماڵی مامۆستاماینەوە، خۆی و عائیشە خانی خیزانی خزمەتێکی باشیان کردین، بەو هۆیەوە کەمێک حەساینەوە.

**بە کیمیاوی شەهیدبوون:**

بۆ ڕۆژی دوایی، شارۆچکەی خانێمان بەجێهێشت بەرەو قاسمەڕەش ڕۆشتین، بارەگای سەرکردایەتی ینک لەوێبوو، بەڵگەنامەیان بۆ کردین بۆئەوەی بەرەو قوڵایی ئێران بڕۆین، ئێوارەی ئەو ڕۆژە، گەیشتینە سەقز، لەهۆتێلێک دابەزین و پشووماندا.

چەند ڕۆژێک لەسەقز ماینەوە، هەندێک پێشمەرگەی ناسراوم بینی، هەرچی پرسیارم لەسەر ماڵی دایکم دەکرد، چییان بەسەر هاتووە؟ ، شەهید بوون؟ لەکوێ نێژراون؟  کەس وەڵامی نەدەدامەوە، بەناچاری بەرەو شارۆچکەی پاوە بەڕێکەوتین، لەوێ چوینە ماڵی مامۆستا شاهۆ. لەگوندی هاوارو لەناوچەی قەرەداغ، دۆستایەتیم لەگەڵ مامۆستا شاهۆ پەیداکردبوو، لای ئەویش هەواڵی کەسوکارم پرسی، هیچ وەڵامێکم وەرنەگرت.

بۆ ڕۆژی دوایی چووم بۆ نوسینگەی ینک لەپاوە، قادر کۆکۆییم بینی، ئەو کاتە قادر کۆکۆیی فەرماندەتی تیپ بوو، قادر وتی: ماڵی دایکت و براکەت دراوسێی ئێمە بوون، دەمناسین، تەرمی هەموویانم بەشەهیدی بینی، خوا عەفوویان بکات. دوای ئەو زانیارییانەی لەقادر کۆکۆییم وەرگرت، گەڕامەوە بۆ لای خزمەکانم، لەئۆردوگایەکی نزیک گوندی بارام ئاوا، سەر بەشارۆچکەی مەریوان، ماتەمینیم بۆ گێڕان.

**گومان و هەڵوێست:**

دوای ئەنفالی پێنج، ئاوارەی ئێران بووم، دڵنیابووم کە دایکم و براو خزمەکانی ترم شەهید بوون، ماتەمینیم بۆ دانان و قوناغەکەم تێپەراند.

هەستمدەکرد شکستی ئەمجارەمان لە هەندێک ڕووەوە لە شکستی ساڵی ١٩٧٥ گەورەترە، ساڵی ١٩٧٥ هێزی پێشمەرگە شەڕی ڕاگرت و ئاشبەتاڵی کرد، هۆکارەکەی پیلانێکی نێودەوڵەتی بوو، مەلامستەفا گوێی لە ڕێنمایی و بریای پیلانگێران گرت، پیلانەکەی دژی شۆڕشی ئەیلول جێبەجێکرد.

بەڵام ئەمجارە، ساڵی ١٩٨٨، هۆکاری سەرەکی شکستەکە لە خودی کوردەوە بوو، سەرکردایەتی حزبە سیاسیەکانی باشووری کوردستان، بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیان خستە ناو بەرداشی شەڕی ئێران-عێراقەوە، بەو شێوەیە کێشەی کورد کرا بە بەشێک لە شەڕی ئێران و عێراق، ئەگەر ئێران سەرکەوتایە، کورد قازانجی دەکرد، ئەگەر عێراق سەرکەوتایە کورد زیانی دەکرد، وەک ئەوەی ڕوویدا، ئێران شکا وکورد شکستیخوارد. کورد کاتێک بوو بە هاوپەیمانی کۆماری ئیسلامی ئێران، کە هەموو جیهان دژی ئێران بوو، لە شەڕی ئێران-عێراقدا هەموو جیهان پشتیوانی عێراقی دەکرد.

ساڵی ١٩٧٥ لە ڕووی سیاسییەوە شکاین، بەڵام کیمیاباران و ئەنفال نەکراین، پێنج هەزار کەس لە هەڵەبجە بە کیمیاوی شەهید نەبوون، سەدان هەزار کەس لە ناوچەکانی تری کوردستان ئەنفال نەکران، بەشێکی زۆری( گوند و ناحیە وقەزا) پارێزگای سلێمانی و هەولێر و دهۆک و کەرکوک وێران نەکرا، وەک ناوچەی قەدەغەکراو ڕانەگەیەنرا، ئەو گۆڕانکاریە نەرێنیانە لە ڕووی ئابووری و کلتووری و جیوسیاسیەوە، زیانی زۆر گەورەی بە گەلی کورد گەیاند، تا ئەمڕۆش کاریگەریەکانی کۆتاییان نەهاتوە.

تەنها لایەنی ئەرێنی شکستی ساڵی ١٩٨٨ لە چاو شکستی ساڵی ١٩٧٥دا، ئەوەبوو، ساڵی ١٩٨٨ پێشمەرگە ئاشبەتاڵی نەکرد، ژمارەی کەمبوەوە، بەڵام سەنگەری بەرنگاربوونەوەی ڕژێمی بەعسی چۆڵنەکرد.

زۆر بیرم لەهۆکارو ئەنجامی کیمیابارانی هەڵەبجەو ئەنفال دەکردەوە، لەسەر ئەو کارەساتانە، هەڵسەنگادنم بۆ هەڵویستی بەرپرسانی ینک دەکرد. بەرامبەر بەهەڵویستی نا بەرپرسانە و خێڵەکیانەی بەرپرسەکانی ینک و حزبەکانی تر، بێدەنگ نەبووم، نەک هەر دژییان وەستامەوە، گۆڕانکارییەکی چۆنایەتیش، لەبیرکردنەوەمدا دروستبوو. چیتر وەک پێشمەرگە گوێڕایەڵەکەی جاران بیرمنەدەکردەوە، لەوەو پێش وامدەزانی سەرکردەکانم هەڵەناکەن، وام دەزانی سەرکردەکان دڵسۆزی دۆزی رەوای گەلەکەیانن، بۆ هەموو بڕیارو سیاسەتێکی حزبەکەم بەڵێم دەکرد، ئەمڕۆ دوای رووداوەکانی ئەنفال و هەڵەبجە، دوای شکستی سەربازی و سیاسی ساڵی ١٩٨٨، گومان لەزانایی ودڵسۆزی و هەڵوێستی سەرکردەکانم دەکەم، گومان لەسیاسەتی حزبەکەم دەکەم، لەهەموو شتێک بەگومانم، ئەو رووداوانە وایان لێکردم، لەپێشمەرگەیەکی دڵسۆزی دڵسافەوە، بەرەو سیاسییەکی بەگومان، رەخنەگر، یاخی و کۆڵنەدەر هەنگاو بنێم.

کە گەیشتمە رۆژهەلاتی کوردستان، لەگوندو شارۆچکەو ئۆردوگاکاندا، بەشوێن دایک و براو خزماندا دەگەڕام، لەئەنجامی پرسیارو وەلامەوە، لەسەر چۆنیەتی کیمیابارانی هەڵەبجە، لەسەر لەناوچوونی سەرومالی خەڵکی هەڵەبجە، لەسەر ئاوارەبوونی خەڵک، لەسەر هەڵسووکەوتی بەرپرسەکان، بەرامبەر بەو ڕووداوانە، پرسیارم دەکرد، لە وەلامی پرسیارەکاندا چەند راستیەکی تاڵم بۆ دەرکەوت:

١. پێش ئەوەی شەڕی رزگارکردن، یان داگیرکردنی هەڵەبجە دەستپێبکات، پێشمەرگەو بەرپرسە هەڵەبجەییەکانی هەموو حزبەکان، هەواڵیان بۆ خزم و بنەماڵەکانیان ناردبوو، هەڵەبجە چۆڵ بکەن، بچن بۆ سلێمانی، یان بچن بۆ ئێران، تا سەر و مالی خۆیان لە کاریگەری شەڕێکی گەورە بپارێزن. لەوەدا دەردەکەوێت کە پیلانی جینۆسایدی هەڵەبجە حەتمی بووە، پێش رووداوەکە حزبە کوردیەکان بەو کارەساتەیان زانیوە. بەو شێوەیە ئەو خێزانە هەڵەبجەیەی، کوڕی یان کەسی نزیکی پێشمەرگە بووبێت،

لەئەگەری کارەساتی هەڵەبجە ئاگادار کرابوەوە، لەهەڵەبجە دەرچوبوو، بەرەو ئێران یان بەرەو سلێمانی رۆیشتبوو، سەرو ماڵی پارێزراوبوو. ئەو خانەوادەیەشی کوڕی پێشمەرگە نەبووبێت، یان کوڕەکەی پێشمەرگە بووبێت، بەڵام لەو کاتەدا لەدەڤەری هەڵەبجە نەبووبێت، نمونەی خانەوادەی ئێمە، بەسەرو ماڵەوە تیاچوبوو.

٢. هێزی پێشمەرگەی زۆربەی حزبەکانی باشوری کوردستان، لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێران، بەشداری شەڕی ئازادکردنی هەڵەبجەیان کردبوو، بیریان لەپاراستنی سەرو ماڵی خەڵکی هەڵەبجە نەکردبوەوە، چەکی دژە فڕۆکەیان لە دەڤەری هەڵەبجە دانەمەزراندبوو، کە فڕۆکەکانی سوپای عێراق، بەوپەری ئازادییەوە، بەچەکی کلاسیکی و بەچەکی کیمیاوی، خەڵکی مەدەنی هەڵەبجەیان بۆردومان کردبوو، نە هێزی پێشمەرگە، نە سوپای پاسداران، بەرگریان لەو شارە نەکردبوو، بەو شێوەیە هەردوو لایەنی شەڕکەر، مەنجەنیقیان بۆ خەڵکی هەڵەبجە داخستبوو.

٣. هێزی پێشمەرگە و سوپای پاسداران، جلوبەرگی کیمیاویان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو، کاتێک سوپای عێراق چەکی کیمیاوی بەکارهێنابوو، جل و بەرگی پاراستنی چەکی کیمیاوییان لەبەر کردبوو، خۆیان پاراستبوو، بۆیە یەک کەس، نە پێشمەرگەو نەپاسدار لەهەڵەبجەدا بەچەکی کیمیاوی نەکوژرا، بەڵام خەڵکی هەڵەبجەیان بەبێ رێنمایی خۆپاراستن لەچەکی کیمیاوی، بەبێ جلوبەرگی دژە کیمیاوی، لەبەر دەمی فڕۆکەکانی سوپای عێراقدا بەجێهێشت، بەو هۆیەوە هەزاران کەس شەهید بوون، دەیان هەزارکەس بریندار بوون، ئەوانی تریش ئاوارەی ئێران و عێراق بوون.

٤. دوای ئەوەی هەڵەبجە کەوتبوە دەست هێزە کوردییەکان و سوپای پاسدارانی ئێران، خەڵکی هەڵەبجە هەوڵیاندابوو شارەکە چۆڵ بکەن، بەرپرسەکانی پێشمەرگە، رێگریان لەخەڵکی مەدەنی کردبوو لەشارەکە بچنە دەرەوە، وەک چۆن لەئەنفالی سێ و چواردا، رێگەیان نەدەدا خەڵکی مەدەنی

گەرمیان گوندەکانیان چۆل بکەن و خۆیان لەبۆردومانی کیمیاوی و ئەنفالی سوپای عێراق بپارێزن، هەمان کاریان لەهەڵەبجە دووبارەکردبوەوە، بەوهۆیەوە لەکیمیابارانی هەڵەبجەو گەرمیاندا، خەڵکێکی زۆر شەهید بوون.

٥. بانقی هەڵەبجە لەلایەن بەرپرسەکانی پێشمەرگەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، پارەکەیان تالان کردبوو، بۆئەوەی نیشانەی تالانیەکە ونببێت، بانقەکەیان تەقاندبوەوە. هاوڕێیەکی بەرێوەبەری بانقی هەڵەبجە بۆی گێڕامەوە کە بەرپرسی یەکەمی هێزەکەی ینک، کلیلی بانقەکەی هەڵەبجەی لەبەرپرسی بانق وەرگرت، سەرەتا پارەکەیان دەرکرد، دوای ئەوە بانقەکەیان تەقاندەوە، پارەی بانقی هەڵەبجە سەرمایەی خەڵکی هەڵەبجە بوو، بەو شێوەیە خەڵکی هەڵەبجە سەرو ماڵی تێداچوو.

٦. خەڵکێکی زۆر لەهەڵەبجەییەکان سکالایان دەکرد، ماڵەکانیان لەلایەن هەندێک بەرپرسی ناسراوەوە تالان کراوە. هەندێک لەسەرمایەدارەکانی هەڵەبجە، وەک کورەکانی رەشید عەزیز ، لەمەرگەساتەکە رزگاریان ببوو، برێک ئالتون و پارەیان لەگەڵ خۆیان دەرکردبوو، گەیشتبوونە ناوچە رزگارکراوەکان، بەلام لەو کاتەوە کەس نازانێت ئەو سەرمایەدارانە چییان بەسەر هات، گومان دەکرا ئەو کەسانە لەلایەن هەندێک بەرپرسەوە کوژرابن، بۆئەوەی پارەو ئالتونەکانییان بۆ خۆیان ببەن.

٧. کاتێک خەڵکی هەڵەبجە ئاوارە بوون، سەرو ماڵیان تیاچوو، بەرپرسانی حزبە سیاسییەکانی هەرێم، نەک هەر سەردانیان نەدەکردن، جۆرەها سووکایەتیان بە خەڵکی هەلەبجە دەکرد، مامۆستا شاهۆ بەرپرسێکی ینک ی خەڵکی هەڵەبجەیە، سەردانی نەوشیروان مستەفای کردبوو، وتبوی: کاک نەوشیروان بۆچی سەردانی ئاوارەکانی هەڵەبجە ناکەن و دڵیان نادەنەوە، نەوشیروان مستەفا بەتووڕییەوە بەشاهۆی وتبوو: سەردانی کێ بکەین؟ بۆ سەردانیان بکەین؟ خەڵکی هەڵەبجە یان ئاشن یان جاشن، مەبەست لەئاش، برادەرانی ئالای شۆڕش بوو.

٨. دوای جینۆسایدی هەڵەبجە، خەڵک و پێشمەرگە پەنجەی تاوانیان بۆ شەوکەتی حاجی موشیر رادەکێشا[٤٦]، کە هۆکاری سەرەکی شەڕ و ماڵویرانی هەڵەبجە بووە. کاتێک مامجەلال لە ئەوروپا گەڕایەوە، ئەندامانی سەرکردایەتی ینک لە فرۆکەخانەی تاران پێشوازیان لێکرد، مامجەلال هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی فەرمامۆشکردبوو، بەرەورووی شەوکەتی حاجی موشیر چووبوو، ئەمەلاوئەولای ماچکردبوو، سوپاسی کردبوو کە لە شەڕی هەڵەبجەدا رۆڵی قارەمانی دیوە.

٩. مانگێک بەسەر ئاوارەبوونمدا تێپەڕی بوو، بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی و کادرانی ینک بانگ کرام، کۆبونەوەکە لەسەقز بوو، نەوشیروان مستەفا و فوئاد مەعسوم سەرپەرشتی کۆبونەوەکەیان دەکرد. پێش ئەوەی بچمە هۆڵی کۆبونەوە، نەوشیروان مستەفا و فوئاد مەعسومم بینین، سڵاوم لێکردن، دەستم برد تەوقەیان لەگەڵ بکەم، بەڕوویەکی گرژو مۆنەوە، لەژێر لێوەوە، وەڵامی سڵاوەکەیان دامەوە، بەزۆری زۆرداری دەستیان بەرزکردەوە تا تەوقەم لەگەڵ بکەن، بەبۆنەی شەهیدبونی کەسوکاریشمەوە، نە ئەو کاتە و نە پێشتریش، ئەو دوو سەرکردەیەی ینک، سەرەخۆشیان لێنەکردم.

لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی زۆرم لەسەر هەڵسووکەوتی تایبەتی نەوشیروان مستەفا هەبوو، بەڵام کە بووم بەکۆمەڵە تا ئەو رۆژە، نەوشیروان مستەفام بەمەرجەعی فکری و سیاسی خۆم دەزانی، کە بینیم لەپای ئەو قارەمانێتیەی لەئەنفال و کیمیاباراندا نیشانمدا، هەڵوێستی نییە، لەپای ئەوەی دایکم و براو

٤٦ ساڵی ١٩٨٧ کاتێک شەوکەتی حاجی موشیر بەرپرسی مەڵبەندی یەک بوو، رۆژێکیان سەردانم کرد، بەرپرسێکی سوپای پاسدارانی لەلابوو، شەوکەت پێیوتم، ئەم کابرایە هاتوە داوام لێدەکات لە سنووری هەڵەبجە شەڕێکی هاوبەش بکەین، وتم ئێران لەو شەرەدا چی قازانج دەکات، وتی بۆ لێدانی بارەگاکانی پێشمەرگەی حدکا و کۆمەڵەی ئێرانە.شەوکەت وتی من ئامادەنیم ئەو شەڕە بکەم.

براژن و برازاکەم لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا شەهید بوون، سەرخۆشی لێنەکردم، بەخەڵکی هەڵەبجەش دەڵیت یان ئاشن یان جاشن، ئیتر لەو رۆژەوە، گۆڕانکاریەکی چۆنایەتی رەش، لەناخمدا، بەرامبەر بەنەوشیروان مستەفا درووستبوو، بڕوام بەنەوشیروان مستەفا نەما، بڕوام بە کۆمەڵە و بە ینک نەما.

**بڕیارێکی هەستیار:**

رۆژی ١٤-٧-١٩٨٨ لەسەقز، سەرکردایەتی ینک کۆبونەوەی لەگەڵ ئەو کادرانەدا دەکرد، کە لەئێران بوون، منیش بۆ کۆبوونەوەکە بانگ کرابووم، ئەگەرچی گومانم لەینک کردبوو، بەڵام پێش کۆبونەوەکە، دەنگووباسێک هەبوو کە ینک مەفرەزەی پارتیزان دەنێرێتەوە بۆ ناوخۆی کوردستان، بیرم لەوەشدەکردەوە، لەگەڵ مەفرەزی پارتیزانەکاندا بگەرێمەوە بۆ کوردستان.

لەدرێژەی کۆبوونەوەدا، بینیم نەوشیروان مستەفا و فوئاد مەعسوم بڕوایان بەهیچ نەماوە، بەراستەوخۆ و ناراستەخۆ دەڵێن با لەئێران نەمێنینەوە، گەڕانەوە بۆ عێراق بەچارەسەری گونجاو دەزانن، هێندەی تر لەسەرکردایەتی ینک رەشبین بووم. لەکاتی کۆبونەوەکەدا دەستم بەرزکردەوە، وتم: کاک نەوشیروان راستە لەڕووی سەربازیەوە پاشەکشەمان کردووە، بەڵام لەڕووی سیاسییەوە، بەهۆی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەوە، لەئاستی نێونەتەوەییدا کێشەی کورد، هەنگاوێکی باشی بۆ پێشەوە ناوە، دەبێت سوود لەو پێشکەوتنە وەربگرین. نەوشیروان مستەفا وەڵامی دامەوە، وتی: ئەوەی تۆ دەیڵێیت قسەی برادەرانی دەرەوەی وڵاتە، وا نییە. لەو کاتەدا مام جەلال لەدەرەوەی وڵات بوو.

کۆبونەوەکە تەواو بوو، بەهەندێک لەکادرو بەرپرسی ینکم وت، من چیتر وەک یەکێتی کار ناکەم، وازدەهێنم، هەر واشم کرد.

**ژیان لە سنە:**

**فرمێسکی عەریزە نووس**

دوای ئەوەی ئاودیوی ئێران بووم، بێجگە لە پشتگیری ینک و بەڵگەی قەرارگای رەمەزان، هیچ بەڵگەیەکی فەرمیم نەبوو بیسەلمێنێ من هاوولاتی عێراقیم، لەبەر ئەوەی بەڵگەکانم لە جینۆسایدی هەڵەبجەدا تیاچووبوون. دەبوو داوا لە بەرپرسانی پەیوەندیداری شاری سنە بکەم، وەک پەنابەرێکی عێراقی لە ئێران وەربگیرێم. بۆ ئەو مەبەستە لە سەر شەقامێکی شارەکە داوام لە عەریزەنووسێک کرد، داواکاریەکم بۆ بنووسیت، عەریزەنووس دەستی بە نوسسینی داواکەم کرد، کە باسی ئەوەم بۆ کرد خەڵکی هەڵەبجەم و کەسوکارم بە بوردومانی چەکی کیمیاوی شەهید بوون، هەموو بەڵگەکانم لە هەڵەبجە لە ناوچوون، عەریزە نووسەکە لە نووسین وەستا، دەستیکرد بە گیرفانیدا، دەسەسرێکی دەرهێنا، دەستی بە گریان کرد و بە دەسەسرەکە فرمێسکەکانی خۆی سڕیەوە.

**دکتوری ساختە:**

دوای ئاوارەبوونم لەئێران، نزیکەی ساڵێک لەشاری سنە مامەوە، بەشێوەیەکی کاتی لە بیمارستانی تەوحید دامەزرام، موچەیەکی کەمم وەردەگرت. سیستەمی تەندروستی کۆماری ئیسلامی ئێران، پزیشکانی بۆ سێ پلە دابەشکردبوو، پزیشکانی ئێرانی پلە یەک بوون، هەمو مافێکیان هەبوو، مووچەیەکی بەرزیان هەبوو، بۆیان هەبوو عیادە بکەنەوە، بۆیان هەبوو لەزانکۆکانی ئێران لەهەر بەشێکی پزیشکیدا دەیانەوێت بخوێنن. پزیشکانی بیانی، ئەوپزیشکانە بوون، ئێران پەیمانی لەگەڵ بەستبوون تا بۆماوەیەک لەئێران کار بکەن، وەک پزیشکی هندی و پاکستانی، پزیشکی پلەدوو بوون، مافیان لەپزیشکە ئێرانیەکان کەمتر بوو، بەڵام مووچەیەکی باشیان هەبوو. ئەو پزیشکە عێراقیانەی بەهۆی شەڕەوە لەئێران ئاوارە بوون، پزیشکی پلەسێ بوون، پزیشکی پلەسێ موچەیان کەم بوو، مافیان

نەبوعیادەی تایبەت بکەنەوە، مافی ئەوەیان نەبوو لەزانکۆکانی ئێران خوێندنی باڵای کلینیکی تەواوبکەن.

بـۆ ئەوەی لە ئێـران وەک پزیشـک وەربگیـرێین و کـاربکەین، دەبـوو پزیشـکێکی عێراقـی ناسـراو پشـتگیریت بکـات کە تـۆ پزیشـکی، دوای ئەوە سەندیکای پزیشکانی ئاوارەی عێراقی پشتگیرت بکەن، دوای ئەوە وەزارەتـی تەندرووسـتی ئێـران لە رێـگەی لیـژنەی تـاقیکردنەوەی تـایبەتی خـۆیەوە هەلسـەنگاندنی بـۆ ئاسـتی زانسـتیت دەکـرد، ئەگەر لە تـاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو بوویتایە، دەرفەتی کارکردنت دەبوو، لە نەخۆشخانەکانی ئێراندا کارت دەکرد.

لە شـاری سـنە کەسێک هەبـوو بە نـاوی دکتـور عەبدولرەحمان، عیادەی هەبـوو، دەیـانوت دکتـورێکی عێـراقیە ، پشـتگیری بـۆ چەنـد دکتـورێکی تـر کردبـوو. رۆژێکیـان لەگەڵ دوو دکتـوری تـری ئـاوارەی خەڵکـی سـلێمانی سەردانی عیادەکەیمان کرد، بۆ ئەوەی داوای پشتگیری لێبکەین، دوای ئەوەی یەکترمان ناسی، وتم دکتور دەرچووی کام کۆلێژەی، وتـی کۆلێژی پزیشـکی بەغدا، کە پرسیاری ساڵی دەرچوونیم لێکرد، وەڵامی نەدایەوە. ئەو رۆژە لەوە زیـاتر قسـەمان نەکـرد، دکتـور عەبـدولرەحمان کـاری ئـێمەی جێبەجیکـرد، پشتگیری بۆ نووسین بۆ لایەنی پەیوەندیدار.

دوای مـاوەیەک وتیـان عەبـدولرەحمان دکتـور نـیە، دکتـوری سـاختەیە، کادرێکی پێشمەرگە لە سنە سەردانی کردم، باسی دکتورم بۆ کرد، وتی: ئەوە خزمی نزیکی منە، دکتور نییە، کاتی خۆی لە سـەردەمی شۆڕشـی ئەیلولـدا پێشـمەرگەبووە، دووچـاری نەخۆشـی سـیل بـووە، دەرمـان و دەرزیـان بـۆ نووسـیوە، کەس نەبـووە دەرزیەکـانی لێبـدات ، خـۆی دەرزی لە خۆیـداوە، لەسەر خۆی فێری دەرزلێدان بووە و لەوێوە ناوی دکتوری بەسـەردا براوە. لە مەریـوانیش برادەرێکـی تـر قسـەکانی خـزمەکەی دکتـوری بـۆ پشتراستکردمەوە، ئەو برادەرە دەیوت بە دکتور عەبدولرەحممانمان وتووە، هەموو دکتورەکان بە زمانی ئینگلیزی دەرمان دەنووسن بۆچی تۆ بە زمانی

کوردی دەرمان بۆ نەخۆشەکانت دەنووسی، لە وەڵامدا دکتور عەبدولرەحمان وتبووی ئەو دکتورەی بە کوردی دەرمان نەنووسێت ئەوە خائینە.

**گلەیی خەڵکی سنە:**

خەڵکی سنە زۆر گلەییان لەهێزە سیاسیەکانی باشوری کوردستان دەکرد، دەیانوت بوونەتە پیاوی رژێمی ئاخوندی ئێران، زۆرتر گلەییان لەینک بوو، لەبەرئەوەی لەگەڵ سوپای پاسداراندا چالاکی هاوبەشی دەکرد. لەشەڕی هەڵەبجەدا، نزیکەی نەوەد پێشمەرگەی کۆمەڵە، بەدەستی سوپای پاسداران شەهید ببوون، زۆربەی پێشمەرگە شەهیدەکان، خەڵکی سنە بوون، بۆیە ئەو ماوەیەی لەسنە ژیام، ڕوویەکی خۆشی سنەییەکانم نەدی.

تراژیدیای کیمیابارانی هەڵەبجە، تەنیا جینۆسایدی هەڵەبجە نەبوو، لەکاتێکدا سوپای رژێمی بەعس پەلاماری خەڵکی هەڵەبجەی دەدا، سوپای پاسدارانی ئێرانیش، پەلاماری بارەگاکانی حدکا و کۆمەڵەی دەدا، کادرەکانی ینک هاوکاری پێشمەرگەکانی حدکا یان کرد، لەپەلاماری سوپای پاسداران دوریانخستنەوە و رزگاریان کردن. هەندێک لەکادرەکانی ینک، داوایان لەهێزەکەی کۆمەڵە کردبوو لەشوێنەکانی خۆیان دووربکەونەوە، بۆئەوەی لەگەڵ سوپای پاسداراندا رووبەرووی شەڕ نەبنەوە، بەرپرسە سەربازیەکانی کۆمەڵە، پێشنیارەکەی ینکیان بەهەند وەرنەگرتبوو، وتبوویان: ئەگەر سوپای پاسداران هێرش بکات، تێکی دەشکێنین، بەو شێوەیە لەشەڕی نێوان سوپای پاسداران و کۆمەڵەدا، زۆربەی هێزەکەی کۆمەڵە شەهیدبوون، زۆربەشیان خەڵکی سنە بوون.

**کورد چیە؟**

نازانم بۆچی سەردانی مەریوانم کرد، لەمەریوانەوە بۆ سنە دەگەڕامەوە، سواری سوارڕۆیەکی تاکسی بووم، سێ نەفەر لەکورسیەکەی پشتەوە بووین، یەکێک لەو نەفەرانە، جانتایەکی گەورەی پێبوو، شۆفێری سوارڕۆکە

بــەو نەفــەرەی دەوت: دەبێــت جانتاکــەت بخەیتــە ســندوقی ســوارڕۆکەوە، نەفەرەکــەش دەیــوت: دەبێــت جانتاکــە بەدەســتی خۆمــەوە بێــت، نایخەمــە سندوقەکە. لەسـەر ئـەو جانتایـە کـەمێک پرسـیارو وەڵامیـان لەیەکدی کـرد، دەرکـەوت ئـەو کابرایـە کـە جانتاکـەی پێیـە، بازرگـانێکی هەورامییـە، خـەڵکی پاوەیە. کابرای شۆفێر کە زانی نەفەرە لاسارەکە هەورامییە، دەستی بەگاڵتە و نوکتەی سەرهەورامی کرد، هەرچی قسەی نابەجێ و نوکتەی هەجوو هـەبوو، هـەموی بە سـەر هەورامیدا باراند، کـابرای هـەورامیش نەیدەتوانی داکۆکی لەخۆی بکات. هێرشی شۆفێری تاکسی بەردەوام بوو، تا گەیشتە ئەو ئاستەی شۆفێر وتی: هەورامی کورد نییە، کە شۆفێرەکە وای وت: ڕەگی هەستیاری منیشـی گـرت، لـەدڵی خۆمـدا دەمـوت، دەیخـوا ئەمـە چـۆن ژیانێکـە بـەمنت بەخشـیوە، ئـەو هـەمو قوربانیـەم بـۆ کـورد داوە، کەسـم نـەماوە، ئەو هەمـوو مـاڵوێرانیەت بەسـەردا هـاتوە بـۆ کـورد، بەکوردیشـت نـەزانن، خـۆ ئەمـە یەکـەمجار نییـە ڕووبـەڕوی قسـەی وا دەبمـەوە. چیتـر خـۆم پێرانەگیـرا، بەتووڕەبوونێکی ڕەشبینانەوە بەشۆفێرەکەم وت: کاکی شۆفێر بۆ کورد چییە تـا هـەورامی کـورد بێـت یـان کـورد نـەبێت؟ مـن لەپشـتی شـۆفێرەکەوە دانیشتبووم، شۆفێر لەئاوێنەکەوە سەیری دەموو چاوی کردم، ترس سیمای داگرتبوو، بەدەنگێکی بەزیوەوە وتی: بۆ تۆ هەورامیت؟ وتم بەڵێ هـەورامییم، وتـی: قوربـان داوای لێبـوردن دەکـەم، نەمزانیـوە تـۆ هەورامیـت، مـن هەر شوخیم لەگەڵ ئەو ئاغایەدا کرد، مەبەستم خروا نەبوو. هەر کە ئەو گفتوگۆیە لـەنێوان مـن و شـۆفێردا دروسـتبوو، کـابرای هـەوارمیش وتـی: بەڕاسـت تـۆ هەورامیت، وتـم: ئەرێ هەورامیەنـا، بەهـەورامی قسـەم لەگـەڵ کـرد، یـەکترمان ناسـی. ئـەو کاتـەی مـن بەتووڕەییـەوە وەڵامـی شـۆفێرەکەم دایـەوە، نیـوەی ڕێگـەی نێوان مـەریوان و سنەمان بڕیبوو، تـا ئـەو کاتـە، لەنوکتـە و هێرشـدا، شۆفێر سەرکەوتوو بوو، کاتێک هەورامیەکە زانـی مـن هـەوارامیم و داکۆکی لێدەکـەم، تـا گەیشـتینە سـنە، هەورامییەکـە تـەنگی بـەکابرای شـۆفێر هـەڵچنی، هەرچی نـوکتەی ناشـیرین بـوو، دای بە کۆڵی خەڵکی سنەدا و تۆڵـەی خـۆی کردەوە.

**له سنەوە بۆ لەندەن:**

له مەیدانی ئیقبال کرێچی مالیک بووم ناوی ئاغای قوتبی بوو، زۆربەی منالەکانی نەخۆش بوون ، رۆژێکیان ئاغای قوتبی وتی: دکتور تۆ ئینگلیزی دەزانی؟ ، وتم بەلی، وتی: دەتوانی لەگەل دکتورێکی ئینگلیز لەسەر نەخۆشی کورەکەم قسە بکەیت، وتم ئامادەم، چی بلێم، باسی نەخۆشی کورەکەی بۆ کردم، کورەکەی دووچاری نەخۆشیەک هاتبوو، پێویستی بە نەشتەرگەری بوو، پزیشکێکی بەریتانی دەیتوانی ئەو نەشتەرگەریەی بۆ بکات، قوتبی وتی: قسە لەگەل دکتورەکە بکە بزانە رێژەی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکە چەندە، نرخەکەی چەندە، کاتی مانەوەمان لە لەندەن چەندە؟ کاتێک باسی نەخۆشی کوری خاوەن مالەکەمم بۆ دکتورە بەریتانیەکە کرد کە پلەی کۆنسەلتانتی لە نەشتەرەگەری چاودا هەبوو، دواتر ئەو پرسیارانەم لێکرد کە ئاغای قوتبی پێیوتم، دکتورە بەریتانیەکە وتی: تانەخۆشەکە نەبینم ناتوانم وەلامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە.

دوای ئەوەی پەیامی ئاغای قوتبیم بە پزیشکە بەریتانیەکە گەیاند، باسی خۆمم بۆ پزیشکە بەریتانیەکە کرد، وتم پزیشکێکی عێراقی خەلکی هەلەبجەم، دەمەوێت سەردانی بەریتانیە بکەم و لەوێ بخوێنم، ئایا دەتوانیت هاوکاریم بکەیت؟ وتی بەسەرچاو، نامەیەکم بۆ بنێرە با دەعوەت نامەت بۆ بنێرم، ڤیزەی پیوەربگرە و وەرە بۆ لای خۆم. نامەم بۆ پزیشکە بەریتانیەکە نارد، ناونیشانم بۆ نارد، دوای دوو هەفتەیەک، وەلامی نامەکەی دامەوە، دەعوەتنامەیەکی بۆ سەفارەتی بەریتانیا لە ئێران بۆ ناردبووم، نووسیبووی فایق دووچاری نەخۆشی شێرپەنجەی میشک بووە، پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە، دەبێت وەک مرافق خێزانەکەشی لەگەلیدا بێت، کچێکی بچووکیشیان هەیە نابێ لە غەریبیدا ئەو بەجێبهێلن، بۆیە دەبێت کچەکەشیان لەگەلدا بێت. ئەو رۆژەی دەعوەتنامەکە بە من گەیشت، لە سەر کتێبی ئایات شەیتانیەکەی سەلمان روشدی نووسەری بەریتانی، پەیوەندی نێوان ئێران و بەریتانیە تێکچوو، سەفارەتی بەریتانیا لە تاران داخرا.

**تۆ لە دڵ و لە مێشکمدای:**

دوای ئەوەی باوکم بوو بەپێشمەرگە، بەماوەیەکی کەم ناوی مامجەلالم لە دەمی باوکمەوە بیست، رۆژێکیان باوکم لە گەشتی پێشمەرگایەتی گەڕایەوە، باسی کۆبونەوەیەکی بۆ من و دایکم کرد، مامجەلال قسەی بۆ کردبوون. باوکم دەیوت: مام جەلال کەسێکی زۆر زیرەک و قسە زانە.

لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا، مام جەلال، وەک سەرکردەیەکی خۆشەویستی خەڵک و پێشمەرگە دەرکەوت، کوتاڵفرۆشەکانی ئەو کاتە، بۆئەوەی کڕیاری قوماشەکانیان زۆر ببێت، بازاڕیان هەبێت، قوماشێکی رەنگاورەنگیان ناونابوو ریشی مام جەلال، ئەو قوماشە لەناو ژناندا بازاری گەرم بوو.

کە جیابوونەوەی پدک روویدا، لەگەڵ ئەوەشدا مام جەلال کەسی یەکەمی باڵی مەکتەبی سیاسی نەبوو، لەبەر توانا و چالاکیە زۆرەکانی، باڵی مەکتەبی سیاسی پدک، بەناوی مامجەلالەوە بە (جەلالی) ناسرا.

لەجۆشدان و کۆکردنەوەی خەڵکدا، مام جەلال توانایەکی لەڕادەبەدەری هەبوو، تا بڵێی ورە بەرزبوو، دوای مانگێک شکستی ١٩٧٥، ینکی درووستکرد، ساڵیک بەسەر تەمەنی ینکدا تێنەپەڕی، شۆڕشی نوێی بەرپاکرد. لەکاری دبلۆماسی و درووستکردنی پەیوەندیدا، زۆر سەرکەوتوو بوو.

لە سەرکەوتنەکانیدا، پشتی بەتواناکانی خۆی دەبەست، پێش خۆی بنەماڵەکەی سیاسەتی نەکردبوو، تا مامجەلال سوود لەمێژوی سیاسی بنەماڵەکەی وەربگرێت. لە رووی هزرییەوە، مام جەلال لەبنەماڵەیەکی ئاینی بوو، خۆی کەسێکی چەپ بوو، لە رووی هزرریەوە نەک هەر سوودی لە بنەمالەکەی وەرنەگرت، دژی هزری بنەماڵەکەی وەستایەوە، خۆی کاریگەری لەسەر بنەماڵەکەی دانا، بنەماڵەکەی سوودی لەو وەرگرت، هزریی ئایینداری لە سیمای شیخانی تاڵەبانیدا کاڵکردەوە، هزریی نەتەوەیی و علمانیی لە ناو بنەماڵەی تاڵەبایندا رواند و بڵاویکردەوە.

لەکار و چالاکی حیزبدا، مامجەلال هەمیشە یاخی بوو، پابەندی پێوانە چەقبەستووەکانی سیاسەتی حزبایەتی نەدەبوو، لەسەر ئەو سفەتە یاخییەی،

لەناو پدکدا دژایەتی کراوە. لەسەر یاخیبونی لەسیاسەتی کلاسیکی حزب، ڕووبەڕوویی کێشە بۆتەوە. دوای ئەوەی خۆی حزبی درووستکرد، خۆشی رابەرایەتی حزبەکەی دەکرد، هەر نەیتوانی دەستبەرداری یاخیبوون ببێت، زۆر جار لەسیاسەتی حزبەکەی و لەحزبایەتی یاخی دەبوو و لایدەدا.

لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە کەسێکی ڕووخۆش و قسە خۆش بوو، دڵپاک و سادە بوو، خۆی بەگەورە نەدەزانی، زوو هەڵدەچوو، زوو ئاشت دەبوەوە.

لەبواری کاری سیاسی و چالاکی ڕێکخستندا، مامجەلال خاوەنی بۆچوونی تایبەتی خۆی بوو، ئەو بۆچوونە تایبەتیانەی مام جەلال سیاسەتی ینکی دیاریدەکرد، بەباشی و بەخراپی کاریگەری لەسەر سیاسەتی ینک و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان دەکرد، ئەو بۆچوونە تایبەتەی مامجەلال بە ئەرێنی وبە نەرێنیش بەسەر ینک و بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردا دەشکایەوە. شوێنکەوتوانی مام جەلال ئەو سیاسەتە تایبەتەی مام جەلال بە بەهرە دەزانن، ڕکەبەرەکانی مامجەلال، ئەو جۆرە سیاسەتە تایبەتەی مامجەلال، بەسەرکێشی و لەڕێ لادانی سیاسی دەزانن. مامجەلال سیستەم و ڕێنمایی جێگیری سیاسی بە گرنگ نەدەزانی، سیاسیەکی تەکتیکی بوو، ستراتیجی نەبوو، ستراتیجی ئەو تاکتیک بوو، ڕۆژانە بە گوێرەی بارووددۆخ، لەسەر بابەتە سیاسیەکان بریاری دەدا. لە ئاستی ناوخۆی ینکدا، زۆر بە وریایی دەجوولایەوە، لەو ڕۆژەوە کە بوو بە سکرتێری ینک، هیچ سەرکردەیەکی ینک نەیتوانی لەسەر پێگەی سیاسی و ڕێکخستنی ینک کێبڕکێیی لەگەڵ بکات، لە ئاستی کوردستاندا تەنها سەرکردەی باشووری کوردستانە کە توانی بەرامبەر بە ماڵی مەلامستەفا و پدک بوەستێتەوە. نەک هەر ئەوە، توانی کاریگەری سیاسی و کلتووری تایبەتی خۆشی بەسەر شانی بنەماڵەی بەرزانیدا بدات وهەندێک لە نەوەکانی بەرزانی وەک نێچیروان بەرزانی جەلالاوی بکات.

لەبۆنەیەکدا سامی عەبدولڕەحمانم بینی، لەسەر مام جەلال قسەی دەکرد، دەیوت:

جەلال سەرۆکی حزبە، بەڵام وەک سەرۆکی وڵات سیاسەت دەکات.

جارێکی تر سامی عەبدولڕەحمان لەسەر مام جەلال قسەی کرد و وتی: جەلال وزەی تێکدانی لەوزەی بنیاتنان زیاترە، لەتێکداندا زۆر بەتوانایە.

کە بووم بەپێشمەرگە، چەند جارێک لەنزیکەوە مامجەلالم بینی، ساڵی ١٩٨٢کە لەنەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار بووم، مام جەلال بانگی دەکردم، قسەی بۆ دەکردم، چەند جارێک هاوکاری مادی کردم. کە سەردانی نەخۆشخانەشی دەکرد ڕێنمایی دەدامێ، لە سەرەتای پێشمەرگایەتیمدا ریشم هێشتبوویەوە، جارێک مامجەلال سەردانی نەخۆشخانەی کرد، کە بینی من ریشم هێشتۆتەوە، وتی ریشهێشتنەوە بۆ دکتور جوان نییە، پێمباشە ریشت بتاشی ، دوای ئەوە ریشم تاشی و درێژم نەکردەوە.

مامجەلال و مەکتەب سیاسیەکانی ینک، حەزیان دەکرد لەنزیکیانەوە بمێنمەوە، ئاگایان لێمبێت، کاتێک مەڵبەندەکانی ینک درووستکران، بە بێ ڕەزامەندی مامجەلال و مەکتەب سیاسی، بریارمدا ببم بە پزیشکی مەڵبەندی دوو، لە مامجەلال دوورکەوتمەوە.

لەهاوینی ساڵی ١٩٨٣ دا، لەگەڵ بەرپرسانی مەڵبەندی دوو گەشتی ناوچەی خۆشناوەتیم کرد، مام جەلال بانگی کردم، دوو ڕۆژ لای خۆی هێشتمیەوە، وتی: لەگەڵ من لەسکرتاریەت بمێنەرەوە، مەڕۆرەوە بۆ مەڵبەندی دوو. ئەمجارەش بەگوێی مام جەلالم نەکرد، وتم: حەز دەکەم بڕۆمەوە بۆ سەرگەڵو، کاری پزیشکی بکەم، بەوشێوەیە ئەوجارەش دڵی مام جەلالم رەنجاند.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٣ دا، لەگەڵ بەرپرسی مەڵبەندی دووی ینک لەسەرگەڵو بەینمان تێکچو، چوومە گوندی ئاوەژێ، لەبارەگای نەوشیروان مستەفا مامەوە، مام جەلالیش هاتە ئەوێ، کە گفتوگۆی ینک و حکومەتی عێراق دەستیپێکرد، من نەدەچومەوە ناو شار، هەر خەریکی چارەسەری نەخۆش و کۆبونەوەی خەڵک و پێشمەرگە بووم، مامجەلال خۆشیدەویستم و

گرنگی پێدەدام، لەکۆبونەوەیەکی فراوانی کادراندا، لەمزگەوتەکەی مەرگە، مام جەلال بانگیکردم و لەڕیزی خۆی و نەوشیروان مستەفاو مامۆستا عەبدوڵلادا دایانم، هەستم کرد مام جەلال دەیەوێت من بە کادرانی ینک بناسێنێ، بەلام کێشەکە ئەوەبوو، من لەو کاتەدا هیچ جۆرە تموحێکی سیاسیم نەبوو، تەنیا بیرم لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانم دەکردەوە، بیرم لەمافە سیاسیەکانم نەدەکردەوە. پەیوەندیەکانم لەگەڵ مام جەلال ڕۆژبەڕۆژ گەشەی دەکرد، تاوەکو روداوەکەی ساڵی ١٩٨٤سورداش، لەو کاتەوە مام جەلال لەمن زویر بوو. لەمام جەلال دوورکەوتمەوە، نزیکەی چوار ساڵ دوور لە مامجەلال، لە مەڵبەندی یەک مامەوە، لەناوچەی قەرەداغ و گەرمیان، جێگەی خۆمم کردەوە، دوای ئەوەی لەکارەساتەکانی ئەنفال و کیمیابارانـدا، رۆڵێکی باشم بینی و ورەم بەرنەدا، لەکارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا کەسووکارم شەهید بوون، کە مامجەلال لەئەوروپا گەڕایەوە، ناردی بەدوامدا، لە قاسمە رەش سەردانم کرد، نیگەرانی خۆی بۆ شەهدبوونی کەسوکارم دەربڕی، وتی: تۆ لەدڵم و لەمێشکمدای، دەستخۆشیت لێدەکەم وەک پزیشک و پێشمەرگە لەئەنفال و کیمیابارانـدا رۆڵـی جوامێرانـەت دیـووە، بـەو شـێوەیە دوای چـوار سـاڵ دورکەوتنەوە لـەمام جـەلال، جـارێکی تـر بینیمـەوەو ئاشـتی کردمـەوەو لێـی نزیکبوومەوە.

**گەشتەکەی ئەوروپا:**

ساڵی ١٩٨٩ مام جەلال سەردانێکی سنەی کرد، ناردی بەشوێنمدا، لەوێ پێیوتم: لـە٢٤، ٢٥، ٢٦-٥-١٩٨٩لـەوڵاتی سویسـرا، کۆنگرەیـەک لەسـەرچەکی کیمیاوی دەبەستریت، ئێرانیەکان ئۆپۆزسیۆنی عێراقیان راسپرادوە وەفدێک بۆ ئەو کۆنگرەیە ئامادە بکەن، ئۆپۆزسیۆنی عێراقیش منیان راسپاردوە کەسێک دەستنیشان بکەم. لەبەرئەوەی تۆ خەڵکی هەڵەبجەیت، کەسوکارت لەکارەساتی کیمیابارنـدا شـەهید بـوون، خـۆت پزیشـکیت و لەئەنفالەکانـدا بەشـداریت کـردوە، برینـدارت چارەسـەر کـردوە، لەسـەر چـەکی کیمیـاوی شارەزاییت هەیە، بۆیە منیش تۆم بۆ ئەو کارە هەڵبژاردوە. بەو بڕیارەی

مامجەلال دڵخۆش بووم، خەریکبوو نیگەرانیەکانم لەبیر کەم ببنەوە، وتم بەسەرچاو ئامادەم.

دوای گفتووگۆیەکی زۆر مام جەلال رەزامەندی نیشاندا، هاوسەرەکەم و منداڵەکەشم لە خۆمدا ببەم، وتی دوای تەواوبوونی کۆنفرانسەکە، لەسویسرا، لەئیسپانیا، یان لەئەڵمانیای رۆژهەلات بمێنمەوە، کارو چالاکی سیاسی و دبلۆماسی بکە، وتی: لەئەڵمانیەی رۆژهەلات، یان لەئیسپانیا، ببە بەنوێنەری ینک، یان لە سویسرا بمێنەرەوە لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان ببە بەنوێنەری ینک، دواتر وتی: کەسێک لەسویسرا لای رێکخراوە جیهانیەکان نوێنەری ینکە، بەدڵم نییە، تۆ برۆ جێگەی ئەو نوێنەرە بگرە و لەوێ کار بکە. نامەیەکی بۆ بەرپرسی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ینک، شازاد صائیب بۆنووسیم. بەڵام جارێکی تر بە تەواوی بە گوێی مامجەلالم نەکرد ، وتم: مامجەلال من دمەوێت دوای تەواوبوونی کۆنفرانسەکە، برۆم بۆ بەریتانیا، لەوێ خوێندنی باڵای پزیشکی تەواو بکەم، مامجەلال ئەو قسەیەی منی پێناخۆش بوو، وتی: ئەوە چییە خەڵکی ئێمە هێندە حەزیان لەبەریتانیاییە.

تا ئێستە نەمتوانیوە لێکدانەوەیەکی راست بۆ ئەو بارە سیاسی و دەروونیەی خۆم بکەم، کە ئەندام و پێشمەرگەی هێزێکی سیاسی وەک ینک بووم، لەو پێناوەدا قوربانیم بەژیانی خۆم و بە بەرژەوەندی بنەماڵەکەم داوە، ئامادەبووم بۆ ینک گیانی خۆم ببەخشم، کەچی نەمدەتوانی بریارو پێشنیاری سەرۆکی حزبەکەم جێبەجێبکەم، ئاخۆ لە ناخەوە هەر حەزم بە سیاسەت نەبووبێت و ویستبێتم وەک پزیشکێک کار بکەم، یان بروام بە چەمک و هەڵویستەکانی مام جەلال نەبووە، تا ئەمرۆ وەلامی ئەو پرسیارەم بە تەواوی نەداوەتەوە.

دوای ئەوەی لە تاران خۆمان بۆ گەشت ئامادە کرد، بە هۆی هەڵەی تەکتنیکیەوە، لە کاتی خۆیدا و بە پاسەپۆرتی عێراقی گەشتمان نەکرد، دوای دوو رۆژ بەپاسەپۆرتی تایبەتی وەزارەتی دەرەوەی ئێران گەشتییان بۆ رێکخستین، کاتێک پاسپۆرتەکەمان بۆ هات، بینیم وەک ئێرانی گەشت دەکەین، ئەزموونی گەشتم نەبوو، تەکتیکی کاری پەنابەریم نەدەزانی، بیرم لەوە

کردەوە کە دوای تەوابوونی کۆنفرانسەکە، ئەگەر وەک ئێرانی خۆمان بدەین بە دەستی پۆلیسی سویسراوە، یان لە هەر وڵاتێکی تری ئەوروپی خۆمان بدەین بە دەستەوە، فارسی نازانین، دوچاری کێشە دەبین. لەلایەکی تریشەوە وامدەزانی ئەگەر بەو پاسپۆرتەوە گەشت بکەین ونەگەڕێینەوە، کێشە لەنێوان مام جەلال و ینک و ئێراندا درووست دەبێت.

لەهەفتەیەکدا یەک جار فڕۆکە لەتارانەوە بۆ سویسرا (بێرن) دەفڕی، لەبەرئەوەی ئێمە نەمانتوانی لەکاتی ئاسایی خۆیدا گەشت بکەین، نەدەکرا راستەخۆ بچینە سویسرا، دەبوو گەشتی رۆمامان بکردایە، لەوێوە بەفڕۆکەیەکی تر گەشتی سویسرەمان بکردایە.

کە گەیشتینە رۆما، کێشەیەکی تر هاتە پێشەوە، پاسپۆرتەکەی ئێمە ڤیزەی لەسەر نەبوو، پاسپۆرتی تایبەتی وەزارەتی دەرەوەی ئێران بوو، تا ١-٥-١٩٨٩ دەکرا بەو پاسپۆرتە بە بێ ڤیزە، گەشتی سویسرا بکەیت، بەڵام لەو بەروارە بە دواوە، حکومەتی سویسرا بڕیاری دابوو، ئەگەر هەر کەسێکی ئێرانی ڤیزەی نەبێت، بەو پاسپۆرتەش ناتوانێت گەشتی سویسرا بکات. ئیتر دەستێکم کەوتە ئەملاو دەستێکم کەوتە ئەولا.

ئەو وەفدەی گەشتی سویسرەمان دەکرد، من و هاوسەرەکەم و منداڵەکەم و دوو کەسی ئۆپۆزسیۆنی عێراق (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق) بووین، پەیوەندیمان بەقونسلی ئێرانیەوە کرد، قونسلی ئێران لەڕۆما هاتە فڕۆکەخانە، هەوڵیدا کێشەکەمان بۆ چارسەر بکات، بەڵام بۆینەکرا. بۆیە هەر ئەو رۆژە، بەفڕۆکەیەکی ئێرانی گەڕاینەوە بۆ تاران، دواتر گەڕاینەوە بۆ سەقز. مامجەلال بە شکستی گەشتەکەمان زۆر نیگەران بوو، منی بەهۆکاری شکستی گەشتەکە دەزانی، منیش بەرپرسانی ئێرانیم بەهۆکاری سەرنەکەوتنی گەشتەکە دەزانی.

پێش ئەوەی گەشت بکەین، هەرچی ناوماڵمان بوو فرۆشتمان، کە گەڕاینەوە سەرمان لێ تێکچوو، نەماندەزانی چی بکەین، ماڵ دروستبکەینەوە یان نا جارێکی تر هەوڵی گەشتی ئەورووپا بدەین. سنەمان بەجێهێشت چووینە سەقز، لەسەقز هەر رۆژەو لەماڵی یەکێک لەبرادەرەکانمان دەماینەوە، ماوەیەکی زۆر لەماڵی عومەر فەتاح ماینەوە، ماوەیەک لەماڵی سامی برای شەهید ئازاد هەورامی ماینەوە.

**تەقینەوە:**

شەویکیان لەماڵی هەڤاڵ کویستانی میوان بووین، هاوسەرەکەم وتی: بۆ بێخەم دانیشتوویت، هیچ کاریک ناکەیت، بۆ سەردانێکی مامجەلال ناکەیت و قسەی لەگەڵ ناکەیت، با چارەنووسی ئێمە یەکلا بکاتەوە، لێرە بمێنینەوە یان گەشتیی دەرەوە بکەین. منیش دەمزانی مامجەلال لێمان نیگەرانە، نەمدەویست راستەوخۆ مام جەلال ببینم، لای خۆشمەوە نەدەمویست جاریکیتر لەگەڵ ینک کار بکەم، نە دەمویست گەشتی دەرەوەی وڵات بکەم، حەزم دەکرد دوور لەو جەنجاڵیە بژیم، بۆیە بەتەلەفۆن لەگەڵ دلێری سەید مەجید قسەم کرد، بارودۆخەکەم تێگەیاند. دلێری سەید مەجید وتی: سبەینێ مامجەلال لەگەڵ ژناندا کۆبونەوەی هەیە، با مەهاباد بێت بۆ کۆبونەوەکە، دەربارەی کیشەی خۆتان قسەی لەگەڵدا بکات. لەنەستما(لا شعوورم)دا، حەزم دەکرد هاوسەرەکەم مامجەلال نەبینێت، بۆئەوەی پەیوەندیمان لەگەڵ ینک بەهێزنەبێتەوە، بۆیە ئالۆزییەکم دروستکرد، تا کۆبوونەوەکە دروست نەبێت. حامدی حاجی غالی هاوڕیم بوو، تا بڵیی کەسێکی قسەخۆشە، زۆر حەزی لە گاڵتەوگەپە، لەو کاتەدا حامد و مام رۆستەم، لەگەڵ مامجەلال بوون، وتم با لەگەڵ حامد گاڵتەیەک درووستبکەم، بەشکوو ئامانجەکەی خۆم بپێکم، یان گاڵ دێنێ یان پەموو. بەناوی حامدی حاجی غالی، تەلەفۆنم بۆ سەرجەم ژنانی سەقزی سەر بە ینک کرد، داوام لێکردن سبەینێ لەکات و شوێنی دیریکراودا، ئامادەی کۆبوونەوەی مامجەلال بن، ژنەکان گومانیان لەڕاستی ئەو قسەیەی من کردبوو، بۆ دڵنیابوون لە راستی هەواڵەکە، تەلەفۆنیان بۆ حامد کردبوو، نزیکە ٣٠-٤٠ تەلەفۆن بۆ حامد کرابوو، حامد مام جەلالی لەو ئاڵۆزکاریەی من ئاگادارکردبوەوە، هێندەی تر مامجەلالی لە من تووڕە کردبوو، مامجەلال کۆبوونەوەکەی دواخست، سەقزی بەجێهێشت بەرەو قاسمە رەش رۆیشت. *

منیش تەنیا لەڕێگەی ئاشتکردنەوەی مامجەلال و گەشتەکەی ئەوروپاوە، بەینک وە بەسترابوومەوە، وا خەریکە جاریکی تر پەیوەندیم لەگەڵ مامجەلال

تێکدەچێتەوە، تێکچوونی ئەو پەیوەندییە، بەواتای دابرانی تەواوەتی منە لەیەنک. هاوسەرەکەم حەزی دەکرد پەیوەندیەکانم لەگەڵ مامجەلال ئاسایی بکەمەوە، ئەگەرچی من لەڕواڵەتدا دژی ئاساییکردنەوەی ئەو پەیوەندییە نەبووم، بەڵام لەنەستمدا(لەلاشعور)مدا دژی دروستکرنەوەی پەیوەندی بووم . هۆکارەکەشی ئەوەبوو بڕوام بەیەنک نەمابوو، بیانووم دەگرت، حەزم دەکرد بەزووترین کات، بەتەواوی لەیەنک دووربکەومەوە، وەک چۆن لەسەردەمی منالیمدا، بەو ئەنجامە گەیشتم کە دەبێت لەپدک دووربکەومەوە، لەبەر ئەوەی پدک کار بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد ناکات، لەسەردەمی گەنجیمدا هەمان هەستم بەرامبەر بەیەنک لەلا دروستبوو، دەبێت لە یەنک دووربکەومەوە، لەبەر ئەوەی یەنک وەک پدک، کار بۆ چارەسەری دۆزی کورد ناکات.

دوایی دەرکەوت مام جەلال لەبەرنامەیدا بووە، کۆبونەوە لەگەڵ ژمارەیەک ژنی دیاریکراودا بکات، بۆئەوەی بڕیار لەسەر دامەزراندنی یەکێتی ژنانی کوردستان(ی ژ ک) بدەن.

هاوسەرەکەم نەیتوانی مامجەلال ببینێت، مامجەلال کۆبونەوەکەی لەگەڵ ژناندا نەکرد، کۆبونەوەی دامەزراندنی ی ژ ک دواخرا، بەو هۆیەوە مام جەلال هێندەی تر لەمن نیگەران بوو. مامجەلال دەستی بەتەشهیرکردنم کرد، ئەو کەسانەی لە ناو یەنکدا بە سیاسەتی مامجەلال رازی نەبوون، بە زیادەوە، بە ترش و خوێوە، قسەکانی مامجەلالیان بۆ دەگێرامەوە، منیش لەلای ئەوان، وەڵامی قسەکانی مام جەلالم دەدایەوە، لەچەند شوێنێک وتبوی: دکتۆر فایق م نارد بۆ ئەورووپا بۆ گەشتێک ، کەچی داوای پەنابەری کردووە، منیش بەئەندام و کادرانی یەنک م دەوت: مامجەلال خۆی نامەی بۆ نوسیووم کە دوای تەواوکردنی ئەرکەکەم، نەگەڕێمەوە ، لەوڵاتێکی ئەورووپی داوای پەنابەری بکەم و لەوێ کاری دبلۆماسی بکەم.

حامدو مام رۆستەم هێندەی تر مام جەلالیان لەمن تووڕە کردبوو، کار بەوە گەیشت کە لەکۆبونەوەیەکی فراوانی کادراندا، لەقاسمە رەش، مامجەلال قسەی زۆری لەسەر کردبووم، ژمارەیەک لەئامادەبوانی کۆبوونەوەکە هاتنە

لام، قسەکانی مام جەلالیان بۆ گێرامـەوە، ئەو برادەرانـەش هێندەی تر منیان لەمام جەلال تووڕە کرد.

منیش چووم بۆ سەر جیهازەکـەی ینک لە سـەقز، بروسکەیەکی توندم بۆمـام جـەلال کـرد، نوسـیم: "مـام جـەلال وڵاتـت وێـران کـردین، کەسـوکارت لەناوبردین، هەر حەیامان ماوە، حەیاشمان مەبە"

لەو کاتەدا ئێمە لەسەقز لـەماڵی عومـەر فـەتاح بـووین، نـەمزانیبو مامجـەلال وەڵامی بروسکەکەی منی داوەتەوە، جیهازەکە نزیک ماڵی عومـەر فـەتاح بـوو، عـەدەد جیهازەکە کـە دەبینـێ مامجـەلال وەڵامـی بروسکەکەی منـی داوەتـەوە، وەڵامەکە دەبات بۆ ماڵی عومەر فەتاح، عومەر فەتاح و کافی خـان و مـەهاباد، بروسکەکە دەخوێننەوە، نیگەران دەبـن. کاتێک گـەڕاماوە ماڵـەوە، سـەیرمکرد هەمویان نیگەرانن، وتم: ئەوە چییە بـۆ وا نیگـەران دیـارن، نـازانم کامیـان بـوو وتی: مام جەلال بروسکەیەکی توندی بۆ کردوویت، منیش وتم: دیارە وەڵامـی برووسـکەکەی خۆمـه، وتیـان: بـۆ برووسـکەت بـۆ کـردوە؟ وتـم: بەڵێ:برووسکەکەیان دایە دەستم و خوێندمەوە، ئەمە دەقی بروسکەکەی مـام جەلال بوو "ئەگەر واز لەهیچووپووچی نەهێنیت، بەیانت لەسەر دەردەکەم".

لـەدڵی خۆمـدا وتـم: بـەخوا سـاڵی ١٩٨٢ لـەناوزەنگ، مـام جـەلال راسـتیکرد وتی من و تۆ هەردوکمان زۆر تووڕەین.

ئەو هەڵویستەی مـام جەلال بەرامبەر بە مـن، دوای شکسـتی گەشـتەکەی ئەورووپـا، راسـت نەبـوو، بەڵام لە چـاو ئەو هەڵویسـتەی مـامجەلال کە سـاڵی ١٩٨٤ لە سـورداش بەرامبەر بە مـن و هاورێکانم نیشـانیدا، هەر هـیچ نەبـوو، کەچـی مـن هەمـوو شـتێکی سـاڵی ١٩٨٤ی مـامجەلالم قبـوڵکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی سـاڵی ١٩٨٨بـروام بە ینـک نەمـابوو، لە شکسـتی دوای ئـەنفال و کیمیاباراندا بووین، بنەماڵەکم شەهید ببوون، رەشبین بووم، لەبەر ئەو هۆیـانە هیچم لە مامجەلال قبووڵ نەکرد، حەزم دەکرد زۆرتـرین کێشـە درووستبکەم و بە زووترین کات لەینک دووربکەومەوە.

دوای دوو مانگ، بەبۆنـەی کـۆچی دوایـی دوو هـاوڕێی خۆشەویستمەوە، دکتۆر ئازادو فەریدون محەمەد، سـەردانی قاسمە رەشـم کرد، مـلازم عومـەر بردمیە لای مام جەلال، جارێکی تر مام جەلال ئاشتی کردمـەوە، دوای ئـەوە ملازم عومەر پێیوتم: با بتنێرین بۆ عەرەبستانی سعودی بۆ خوێندن، من وتم: سوپاسـتان دەکـەم حـەز ناکـەم بچـم بـۆ سـعودیە. ئـەو ئاشـتبونەوەیە، ئاشتبونەوەیەکی کۆمەڵایەتی بوو، ئاشتبونەوەی سیاسی نەبوو، بەو ئەندازەیە دڵم لەبەرپرسانی ینک شکابوو، نەمتوانی جارێکی تر لـەڕیزەکانی ئـەو حزبـەدا کار بکەم.

## یەکێتی:

ینـک لـە بۆشـایی سیاسـی و سـەربازی و روحـی گەلـی کوردسـتاندا دروستبوو، دوای شکستی شۆڕشی ئەیلولی ١٠٠ سەد هەزار پێشمەرگەیی، خەڵکی کوردستان لەو بڕوایەدا بوو، تا پەنجا ساڵی تر، خەباتی سیاسـی و بـەرخودانی گـەلی کـورد، ناکەوێتـەوە سـەرپێی خـۆی. کـەچی دوای چەنـد مانگێک، ینک وەک حزبێکی سیاسـی باشووری کوردستان، دامـەزرا، ساڵێک بەسەر دامەزراندنیدا تێنەپەری، خەباتی چەکداری دەستپێکردەوە.

دامەزراندنی ینک و دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لەماوەی ساڵێکدا، لە کاتێکدا بـوو، بێهیـوایی زەمـین و ئاسمانی کوردەواری تەنیبوو، ئەمە وای لەخەڵکی کوردستان کرد ینک لەئامێز بگرن، لـەدڵی خۆیاندا جێگـەی بکەنـەوە، بەهـەزاران جوتیـارو کرێکـارو رۆشـنبیری کوردسـتان، بەئاشـکراو بـەنهێنی، پەیوەندییان بەڕیزەکانی ینک وە کرد، لەگەڵ ینکدا دەستیان بەخەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتی کرد.

هێندە بەسـەر تەمەنی ینکدا تێنەپەری، ساردبوونەوە لە تێکۆشـان، گەڕانەوە بـۆ لای رژێـم، دابـڕان و دورکەوتنـەوەی تـاک و دەسـتە، جیابونـەوەی بـاڵی سیاسـی و رێکخـراوی سیاسـی، لـەناو ینـک بـوو بـەدیاردە، وایلێهـات کێشـە ناوخۆییەکانی ینک، ئاستەنگی بۆ ئامانجـە سیاسیەکانی دروستکرد. ئەگـەر

بەراوردی کێشەی ناوخۆیی سیاسی ینک و پدک بکەین، دەبینین لەساڵی ١٩٧٩وە، ینک رووبەڕوی سێ جیابونەوەی گەورە بووەتەوە، بەڵام پدک یەکجار جیابونەوەی بەخۆوە دیووە.

من وەک یەکێک لەو کەسانەی، کە دوای چوارده ساڵ خەباتی سیاسی ، وەهەشت ساڵ خەباتی پێشمەرگایەتی، لەساڵی ١٩٨٩ لەریزی رێکخستنی ینک دوورکەوتمەوە، بەگرنگی دەزانم، لەدیدی خۆمەوە، ئاماژە بەو هۆکارانە بدەم کە دەبنە هۆی دورکەوتنەوەی کادر و پێشمەرگەی ئەو حزبە، وە دەبنە هۆی دروستبونی دەستەگەری و ململانێی ناڕەوا و جیابونەوە، بەو هیوایەی ینک و حزبەکانی ترسوود لە هەڵەکانیان وەربگرن.

١. ینک ڕێکخراوێکی نیمچە بەرەیی بوو، حزب نەبوو، لەچەند ڕێکخراوێکی سیاسی و ژمارەیەک کەسایەتی پێک هاتبوو، ئەو فرە پێکهاتەیە بەواتای ئەوە دەهات، یەکێتی بیروڕا لەناو ینکدا درووست نەبێت. ئەگەرچی دوای راپەڕین کۆمەڵەو یەکێتی شۆڕشگێران یەکیان گرت و ینک بوو بە حیزب، بەڵام تا ینک بوو بە حزب، دروستنەبوونی یەکێتی بیروڕا، لەناو ینکدا بوو بەکڵتوور. هەر هێزێکی سیاسی، ئەگەر یەکێتی بیروڕا، ئەندام و کادرو پێکهاتەکانی پێکەوە کۆنەکاتەوە، لەدابڕان و لێکترازان و جیابونەوەی تاک و دەستە، قوتاری نابێت.

٢. ینک خاوەنی ئایدۆلۆجیایەکی تایبەت نەبوو، هێزێکی سیاسی فرە مینبەر بوو، بەڵام ئەندام و کادری ئەو ڕێکخراوە، بەو سیاسەتە تایبەتە، بەو فرەمینبەریە پەروەردە نەدەکران، لەسیاسەتی ینک تێنەدەگەیندران، ئەمە وای کرد هەر ئەندامێک، هەر پێشمەرگەیەک، هەر ڕێکخراوێکی ناو ینک، خاوەنی بۆچونی تایبەتی خۆی بێت، بەگوێرەی دنیابینی خۆی، بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی، سیاسەت بکات، نەک بەگوێرەی دنیابینی و بەرژەوەندی گشتی ینک.

٣. ینک ڕێکخراوێکی پۆپۆلیستییە، لەباتی ئەوەی ببێتە پێشرەوی خەڵکی کوردستان، کەوتە دوای خەڵکی کوردستان، بەحوکمی ئەوەی گۆڕەپانی سەرەکی تێکۆشانی خەباتی پێشمەرگایەتی ینک، گوندەکانی کوردستان بوو،

ینک کەوتە دوای هێزری گوندیتی کۆمەڵگای کوردستان، ئیتر ئەو کادرو بەرپرسانەی، کە خێڵەکی بوون، هێندەی تر لەهزری خێڵەکیدا چەقین، زیاتر متمانەیان بەخۆیان پەیدا دەکرد، ئەو تاک و پێکهاتانەش، کە رێساو هزریی خێڵەکیان تێپەڕاندبوو، یان بەرەو دواوە بۆ ناو هزری خێڵەکی گەڕانەوە، یان یاخی دەبوون و ینکیان بەجێدەهێشت.

٤. کێشەی سەرەکی تێکۆشانی گەلی کورد لەباشوری کوردستان، وە بەتایبەت ینک، نەبونی ستراتیجی سیاسی بووە، هەموو شۆڕشەکانی(بەرخودانی) باشوری کوردستان، وەک پەرچەکرداری سیاسەتی شۆڤێنی، حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق دەستیان پێکردوە، دوای دەستپێکردنی شۆڕش، سەرکردایەتی حزب هەستی بەگرنگی ستراتیج نەکردوە. بەو هۆیەوە، تێکۆشانی گەلی کورد، لەسەر بنەمای پەرچەکرداری رۆژانەی، سیاسەتی شۆڤێنی رژێمەکانی عێراق بووە، کاتێک شۆڕش دەستیپێکردوە، بەگوێرەی کات و شوین، بەگوێرەی باری سیاسی و سەربازی عێراق و کوردستان، درووشمی بەرزکردۆتەوە، بەو شێوەیە دەبینین خەباتی شۆڕشەکانی باشوور تەنها پشتی بە تەکتیک بەستوە، ستراتیجی فەرامۆش کردوە.  ئەگەر تێکۆشان بەتەنیا پشت بەتاکتیک ببەستێ، ئەندام و کادرو جەماوەر، بەرچاوی روون نابێت، ناتوانن هەڵسەنگاندنی راست بۆ رووداو پێشهاتەکان بکەن، رووبەڕوی گێروگرفتی سیاسی دەبنەوە.

٥. سەرکردەکانی ینک، بەتایبەت، مامجەلال و نەوشیروان مستەفا، بە زۆری گرنگیان بە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە دەدا، گرنگیان بەکادری سیاسی نەدەدا، ئەتوانم بڵێم لەبڕیاری سیاسی ینکدا، قسەی فەرماندەکانی پێشمەرگە، لە بۆچونی ئەندامانی مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتی و رۆشنبیرەکانی ناو ینک، کاریگەری زۆر زیاتربووە، بۆیە رۆشنبیران و سیاسیەکانی ناو ینک خۆیان بە نامۆ دەزانی و رەشبین دەبوون و لە خەبات سارد دەبوونەوە.

٦. فەلسەفە و رێبازی سیاسی و شێوەی خەباتی ینک، تەنها  لەمێشک و دڵی مام جەلال و نەشیروان مستەفادا بوو، ینک سیاسەتێکی ئاشکراو

نووسراوی نەبوو، سیستەمێکی روونی رێکخستنی نەبوو، بەرپرس و کادرو ئەندامی ینک، بەباشی ئاگاداری سیاسەتی ینک نەبوون، لەسیاسەتی ینک تێنەدەگەیشتن، ئەو دوو بەرپرسە، نەک هەر ئەندامەکانی خۆیانیان بەسیاسەتی حزبەکەیان پەروەردە نەدەکرد، ئاسانکاریان بۆ ئەندامەکانی ینک نەدەکرد، تا فێری سیاسەت ببن، کەسێک بەرپرس و ئەندامی رێکخراوێک بێت، سیاسەتی حزبەکەی شارەزا نەبێت، سیاسەتی گشتی فێرنەبێت، چۆن دەتوانێت بەبێ کێشە، لەناو حزبەکەیدا خزمەتی دۆزی رەوای گەلەکەی بکات.

٧. یەکێک لەکێشە هەستیارەکانی تری ینک، ناڕوونی دارایی بوو، سەرچاوەو بڕی دارایی ینک، بەتەنیا مامجەلال دەیزانی، لەلایەن کەسانی نزیکیی مام جەلالەوە هەڵدەگیراو دەپارێزرا، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، بە نەوشیروان مستەفاشەوە، ئاگاداری دارایی ینک نەبوون، جارێکیان نەوشیروان مستەفا وتی: من ئاگاداری دارایی ینک نیم، هەموو دارایی ینک لەلای ئاوەڵزاواکەی مامجەلالە. ئەمە بێمتمانەیی لەنێوان مام جەلال و ئەندامانی مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتیدا درووست دەکرد، ئەو بێمتمانەییە، کیشەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

٨. هەندێک تایبەتمەندی نەوشیروان مستەفا هەبوون، زیانی لەکوردستانیبوون و پێشکەوتنی ینک دەدا، ئەگەرچی نەوشیروان مستەفا کەسێکی رۆشنبیرو سیاسیەکی بەتواناو محەنەک بوو، بەڵام خاوەنی هەندێک چەمکی تایبەت بەخۆی بوو، نەیتوانی هەندێک چەمکی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی و خێڵەکی لە کۆڵ خۆیبکاتەوە، ناوچەگەری و پەراویزخستنی ژن و پشتیوانی ئاغاو دەرەبەگ لەسیاسەتیدا دەبینرا. کار کردن بەچەمکی قۆناغی دەرەبەگایەتی، لەکاتی خەباتی رزگارکردنی نەتەوەییدا کە لەقۆناغی سەرمایەداریدایە، ناکۆکی و دژبەری لێدەکەوێتەوە. ینک و شۆڕشی نەتەوەیی گەلی کورد پێویستی بەوەبوو، تاک و پێکهاتەکانی هەموو ناوچەکانی کوردستان لەناو ریزی رێکخستندا کۆبکرێنەوە، بەژن و بەپیاوەوە، کەچی نەوشیروان مستەفا، بە بەردەوامی دەیوت بڕوام بەخەڵکی هەولێرو بادینان و خانەقین و هەورامان و هەڵەبجەو کەرکوک نییە، جارێکیان لە ئاوەژێ وتی:من بادینانی و هەولێری بە کورد نازانم. جیاکردنەوەی خەڵک، هەڵوێستوەرگرتن

بەرامبەر بە خەڵک لەسەر بنەمای شار و ناوچە، هێزی سەردەمی دەرەبەگایەتییە، هێزی پێش نەتەوەبوونە، کورد لە سەردەمی رزگاری نەتەوەییدا بوو، بەکارهێنانی ئەو چەمکانە لەو قۆناغەدا، زیانی زۆری بە نەتەوەبوونی کورد و کوردستانیبوونی ینک دەگەیاند. لەبواری کۆمەڵایەتیدا، نەوشیروان مستەفا بۆچونێکی دەرەبەگانەی لەسەر ژن هەبوو، رێگەی نەدەدا ژنان لەپرۆسەی سیاسی و حزبایەتیی و پێشمەرگایەتیدا بەشداری بکات، هەر هەمووی بۆ رازیکردنی کۆمەڵگەی خێڵەکی و دەرەبەگایەتی کوردستان بوو.

ئەگەرچی نەوشیروان مستەفا سکرتێری رێکخراوێکی مارکسی بوو، بەڵام دۆستایەتی ئاغاو دەرەبەگ و دەوڵەمەندی، لەدۆستایەتی کرێکارو رەنجدەرانی کوردستان و هەژارەکانی کوردستان پێخۆشتربوو.

٩. یەکێک لەکێشە سەرەکی و تایبەتەکانی تری ینک، بەگوێرەی پرۆگرام و پەیرەوی ناوخۆ، کارەکانی خۆی بەڕێوە نەدەبرد، بەبەردەوامی، هەڵوێست و سیاسەتی وای بەڕێوەدەبرد، کە لەگەڵ پرۆگرام و پەیڕەودا ناکۆک بێت. بۆچارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکان، بۆ سزادانی ئەندام و کادرو بەرپرسە سەرپێچیکەرەکان، پەنای بۆ بەندەکانی پەیڕەوی ناخۆ نەدەبرد، لیژنەی لێکۆڵینەوەی بۆ چارەسەری کێشەکان پێک نەدەهێنا، سەرپێیی، تاکلایەنی، هەر بەرپرسەو لەلای خۆیەوە، بەتووڕەبوون، بەقسەی زبرو سوێر، بەردەبوونە گیانی ئەو کادر و پێشمەرگانە، یان ئەو دەستەیەی، کە هەڵەی دەکرد، ئەو جۆرە سزادانە، کاردانەوەی سەرپێچیکەری بەدوادا دەهات، بۆیە لەباتی چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی ینک، کێشەکان قوڵتر دەبوونەوە، کێشەی تریان لێدەکەوتەوە.

١٠. یەکێک لەهۆکارەکانی دامەزرندنی ینک، وەک حزبێکی نوێ، بۆ بەگژاچونەوەی سیاسەت و کلتووری خێڵایەتی پدک بوو، بەڵام بەتێپەربونی کاتێکی کەم، بەدەمامک و میکیاجەوە، ینک دەستی بەلاساییکردنەوەی پدک کرد، هەر لەپەیوەندی بەوڵاتانی داگیرکەری کوردستانەوە، تا فەرامۆشکردنی رای گشتی خەڵکی کوردستان. . . . ، ئەمە وای لەکادرو ئەندامانی ینک

کرد، بەزەحمەت جیاوازی لەنێوان ئەو دووحزبەدا بەدی بکەن، بۆیە خەڵکە چەپ و دیموکراتەکانی ناو ینک، گومانیان لەسیاسەتی ینک کرد، وردە وردە لێی دوورکەوتنەوە.

١١. بەو هەموو کەموکوڕیانەوە، ینک هەر لەسەر پێی خۆی دەوەستاو گەشەی دەکرد، لەبەرئەوەی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا، پێکەوە، وەک یەک گیان لەدوو جەستەدا دەجووڵانەوە، پێکەوە سەرکردایەتی ینکیان دەکرد. مام جەلال لەبواری جەماوەری و دبلۆماسی و دابینکردنی سەرچاوەی داراییدا سەرکەوتو بوو، نەوشیروان مستەفاش لەبواری ڕێکخستن و دانانی پلان و خۆپارستندا سەرکەوتوبوو، بەهەردوکیانەوە، ینکیان دامەزراند و پێشیانخست.

لەدوای کیمیاباران و ئەنفالەکان، بیروبۆچوونی جیاواز لەنێوان مامجەلال نەوشیروان مستەفادا دروستبوو، ئەو ناکۆکیە تا ساڵی ٢٠٠٩ درێژەی کێشا، بەجیابونەوەی نەوشیروان مستەفا کۆتایی هات.

### ئەڵتەرناتیف:

باوکم و برایەکم و مامێکم شەهیدی پدک بوون، بەڵام هەر لەمنداڵیمەوە بڕوام بە پدک نەمابوو، گەیشتبوومە ئەو بڕوایە کە پدک ناتوانێت کێشەی کورد چارەسەر بکات.

ساڵا١٩٧١-١٩٧٤ لەهەڵەبجە خوێندکاری دواناوەندی بووم، ئیسلامیەکان و نەتەوەییەکان هەوڵیان دەدا بەرەو لای خۆیان رامبکێشن، لەئیسلامیەکان دوورکەوتمەوە، لەکاژیک نزیکبوومەوە، ساڵی ١٩٧٤ بووم بەئەندامی کاژیک، کاتێک شکستیی ١٩٧٥بەسەرگەلی کوردا هات، لەو باوەڕەدابووم دەرفەت بۆ کاژیک هاتۆتە پێشەوە، بۆئەوەی رابەرایەتی شۆڕش بکات، بەڵام وا دەرنەچوو، سەرکردەکانی کاژیک لەگەڵ سەرکردەکانی پدک، بەیەکەوە ئاشبەتاڵیان کرد.

من یەک لەو کەسانە بووم کە دوای شکستی ١٩٧٥، بەدوای جوڵانەوەیەکی سیاسیدا دەگەڕام، لەڕێگەی رادیۆوە هەواڵی دروستبوونی ینکم بیست، حەزم دەکرد بەزووترین کات پەیوەندی بەینک وە بکەم. ساڵی ١٩٧٥ لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەرگیرام، هەموو گیانم کردبو بەچاو و گوێ و بەدوای جوڵەیەکی سیاسیدا دەگەڕام، دوای ماوەیەک توانیم رێکخستنەکانی ینک بدۆزمەوە، ببم بەئەندامی ئەو حزبە نوێیە.

لەشار و لەشاخ، لە ناو ینکدا کەموکوڕی هەبوو، بەڵام لەگۆڕەپانەکەدا لەینک باشتر نەبوو، بۆیە لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٦ تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٩ ئەندامی ینک بووم، بەڵام کە دەمبینی وا خەریکە ینک وەک پارتی لێدێت، لەبەر ئەو گیروگرفتانەی دوای ئەنفال و کیمیاباران و ئاوارەیی، لەناو ینکدا هاتە بەردەمم، بڕوام بەینک نەما، بەو بڕوایە گەیشتم کە ینکیش ناتوانێت کێشەی کورد چارەسەر بکات، راپۆرتی دەست لەکارکێشانەوەم پێشکەش بەینک کرد.

بڕوام بەینک نەما، دەستم لەکار کێشایەوە، بەڵام ئیرادەی کار و چالاکی سیاسیم تا دەهات زیاتر دەبوو، توانام نەبوو رێکخراوێکی سیاسی دابمەزرێنم، لەبەر ئەوە بیرم دەکردەوە ببمە ئەندامی یەک لەحزبە سیاسیەکانی تری کوردستان. ئەو کاتە خاوەن بیروڕایەکی چەپ بووم، خۆم بەمارکسی دەزانی، بۆیە قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە ببمە ئەندامی حزبە ئیسلامیەکان.

لەبەرئەوەی بەتەواوی لەسیاسەتی هەردوو رێبازی جەلالی و مەلاییش وەڕەس بووم، قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە ببم بەئەندامی پدک. لەبەر ئازارە گەورەکەی هەڵەبجەش، نەمدەتوانی ببمە ئەندامی ئەو حزبانەی تر(وەک حسک)کە بەشداریان لەشەڕی هەڵەبجەدا کردبوو. ناوی حزبی زەحمەتکێشانم بیستبوو، بەڵام لەبەرئەوەی لەو کاتەدا، قورسایی زەحمەتکێشان لەسنووری پارێزگای هەولێردابوو، ئاگاداری سیاسەت و بەرنامەی نەبووم. دوای کارەساتی ١٩٧٥ بڕوام بەسەرکردایەتی پاسۆکیش نەمابوو، بۆیە بیرم لەوە نەدەکردەوە، ببمە ئەندامی پاسۆک.

بەو شێوەیە تەنها حزبی شیوعی عێراق(حشع) و پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان(پگدک) مابوونەوە، بتوانم لێیان نزیک ببمەوە، کەسەیری حزبی شیوعیم دەکرد، وەک پیرە پیاوێک دەهاتە بەرچاوم توانای خۆ گەنجکردنەوەی لەدەستدابێت، پاشەرۆژی روون نەبێت، بەحوکمی بیروباوەڕی کۆمەنیستیشی، مەودای جوڵەو چالاکی سیاسیان لەئێراندا سنورداربوو، لەو کاتەشدا حشع، حزبێکی چینایەتی عێراقی بوو، هزری سەرەکی منیش بیروباوەڕی نەتەوایەتی بوو.

هەرچی پارتی گەل بوو، ساڵی ١٩٧٩ لەپدک جیابووەوە، پارتێکی عەلمانی نەتەوەیی بوو، بەشداری شەڕی هەڵەبجەی نەکردبوو، هەڵویستی سیاسی و بیروڕای سیاسیم لەپارتی گەلەوە نزیک بوو. هاوینی ساڵی ١٩٨٧ کاتێک مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی پارتی گەل، هاتنە قەرەداغ، سەردانی نەخۆشخانەیان کرد، هاوکاریم کردن، کتێبێکی سامی عەبدولڕەحمانیان پێشکەش کردم، خوێندمەوە، بیروڕاو هەڵویستە سیاسیەکانی سامی عەبدولڕەحمانم پێباشبوو.

لەهێڵی سیاسی مەلایی و جەلالی ناو جووڵانەوەی کوردی، بێزار بووم، وام دەبینی کە بەهۆی سیاسەتە هەڵەکانی ئەو دو هێڵە سیاسیەوە، گەلی کورد زیانی زۆری بەرکەوتوە. پارتی گەل، لەپارتی جیابووەوە، حەزم دەکرد کە کۆمەڵەکەسێکیش لەینک جیاببنەوە، پەیوەندی بەپارتی گەلەوە بکەین، لەچوارچێوەیەکی نوێدا، هێڵێکی سیاسی نوێ، واتە هێڵی سێیەم، لەجوڵانەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردا پێکبێنین، دوو هێڵە کۆنەکە پەراوێز بخەین، کاریگەرییە خراپەکانی شەڕی براکوژی بسڕینەوە، گەلی کورد لەچنگی ئەو دوو مەقاشەی دەستی داگیرکەران رزگار بکەین.

بەو بۆچونانەوە لەپارتی گەل نزیک بوومەوە، دوای چەند جارێک گفتوگۆ لەگەڵ سامی عەبدولڕەحمان و هەندێک بەرپرسی تردا، لەسەر ئەوە رێکەوتین کە پەیوەندی بەپارتی گەلی دیموکراتی کوردستانەوە بکەم، لەناو ڕیزەکانی ئەو حزبەدا درێژە بەخەباتی سیاسی بدەم. لێرەدا دەرگای بەشی یەکەمی یادەوەریەکانم دادەخەم، لەبەشی دوەمی یادەوەریمدا بەدرێژی باسی ئەو قۆناغە نوێیەی ژیانی سیاسی خۆم دەکەم.

٢٠١٨-٤-٤

**کورتکراوەکان:**

١. ینک: یەکێتی نیشتمانی کوردستان
٢. پدک: پارتی دیموکراتی کوردستان
٣. حدکا: حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران
٤. حشع: حزبی شیوعی عراق
٥. حسک:حزبی سوسیالیوت کوردستان
٦. یشک:یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان
٧. یقک:یەکێتی قوتابیانی کورستان.
٨. کۆمەڵە:کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان
٩. پاسۆک:پارتی سۆسیالیست کورد




**شەهید حەمە گوڵپی- باوکی د. فایەق**



**لەڕاستەوە: حەمید - فوئاد - د. فایەق**



مام جافر- (جەعفەری حاجی ئەولە)



حەمە شەریف ئەحمەد - مامی د. فایەق



پوره عوزرا و خاڵۆ حەمە



Sulayman Moeini 17 February 1933 - 15 May 1968

سولەیمان موعینی ١٧ مانگی شوبات ساڵی ١٩٣٣ - ١٥ مانگی ئایار ساڵی ١٩٦٨

تەرمی شەهید سولەیمان موعینی، ڕۆژهەڵاتی کوردستان ١٧ مانگی مانگی ئایار ١٩٦٨



Sulayman Moeini 17 February 1933 - 15 May 1968

سولەیمان موعینی ١٧ مانگی شوبات ساڵی ١٩٣٣ - ١٥ مانگی ئایار ساڵی ١٩٦٨

South Kurdistan - Sulayman Moeini, 1960s

سولەیمان موعینی، باشووری کوردستان لە ساڵانی ١٩٦٠دا

**شەهید سلێمان موعینی**



**فەتاح ئاغا - فەرماندەی هێزی خەبات**



شەهید نامیق



شەهید فازل



د. فایەق لەگەڵ دوو پێشمەرگە - سەرگەڵو ١٩٨٣



هاوڕێ جەبار



د. فایەق لەگەڵ تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون



مام جەلال لەگەڵ دەستەی زیندان



شەهید

کاکە سوور قۆریتانی



سورداش - ١٩٨٤

د. فوئاد بابان - د. نەوزاد عەتار - د. فایەق - شێخ حەمەئەمین



(مەلا عوسمان - مەلا عەلی - شێخ دلێر - مام جەلال) سنە ١٩٨٩



(فایەق - مهاباد) سێوسێنان ١٩٨٥



(فایەق - مهاباد) قەرەداغ ١٩٨٥



(د. فایەق لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگە) ١٩٨٤

کەسێک وەک پزیشک و پێشمەرگە، لە ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨دا، کیمیاباران و ئەنفالی دیبێت، خانەوادەکەی بە چەکی کیمیاوی کۆمەڵکوژ کرابێت، هەزاران برینداری چەکی کیمیاوی چارەسەرکردبێت، خۆی چەند جارێک بەچەکی کیمیاوی بریندار بووبێت، شاهیدێکی زیندووی جینۆسایدی گەلی کورد بێت، وردبوونەوە لە ژیانی ئەو کەسە، بەقۆناغێکی هەستیاری خەباتی گەلی کوردت ئاشنات دەکات.

کەسێک ساڵی ١٩٧٥ شکستی شۆڕشی ئەیلولی دیبێت، ساڵی ١٩٨٨ پاشەکشەی سەربازی و سیاسی شۆڕشی نوێی دیبێت، ئاگاداری هۆکارەکانی ئەو شکستانە بێت، بەهەستی خۆی تامی هەڵسانەوە و دووبارەکردنەوەی شکستەکانی کردبێت، خوێندنەوەی لاپەڕەکانی ژیانی، شارەزابوونە لەمێژووی سەرکەوتن و شکستی خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد، هەوڵدانە بۆ رێگری لەدووبارەبوونەوەی شکستەکان.

**دکتور فایق محەمەد گوڵپی**

ئەم کتێبە لە سەر ئەرکی
(مهاباد شێخ حەمەئەمین) هاوسەری دکتۆر فایق محەمەد گوڵپی
چاپکراوە